# معالم السنة النبوية

## مەشخەڵی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ

پوختەی (١٤) کتێبە، کە بنچینەی کتێبەکانی فەرموودەن


کۆکردنەوەی

صالح أحمد الشامي

وەرگێڕانی

عبدالکریم فتاح


بەرگی سێیەم

# مەشخەڵی سوننەتی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

## "پوختەی (١٤) کتێبە، کە بنچینەی کتێبەکانی فەرموودەن"

کۆکردنەوەی

صالح احمد الشامي

وەرگێڕانی

عبدالكريم فتاح

بەرگی سێیەم

مەبەستی چوارەم: حوکمەکانی خێزان / مەبەستی پێنجەم: پێویستییە زەروورەکان

مەبەستی شەشەم: مامەڵەکان / مەبەستی حەوتەم: ئیمامەت و کاروباری حوکم

نووری حەقیقەت

٢٥

نووری حەقیقەت

٥٠

ڕێکخراوی خاڵ

- بابەت: مەشخەڵی سوننەتی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"
- کۆکردنەوە: صالح احمد الشامي
- وەرگێڕان: عبدالكريم فتاح
- دیزاینەری ناوەوە: هەردی زیاد صالح
- دیزاینەری بەرگ: جمعه هموندی
- ساڵی چاپ: 2022
- چاپخانە: ڕێدار بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
- تیراژ: 1000 دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکانە گشتییەکان
ژمارە سپاردنی (٣٤٨) ساڵی ٢٠٢٢ی پێدراوە

تێبینی: لەسەر وەرگرتنی مۆڵەت لە شێخ صاڵح ئەحمەد شامی و بنەماڵەکەی هەستاین بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە

# بەشی یەکەم

# حوکمەکانی هاوسەرگیری

## ١- دەروازەی: هاندان لە هاوسەرگیریدا

**٢٣٣٢-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا: وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَدْ غَفَرَ الله لَهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ. قالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَداً، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلاَ أُفْطِرُ، وَقَالَ آخرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبَداً. فَجَاءَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا؟ أَمَا والله، إِنِّي لأَخْشَاكُمْ للهِ، وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي)**. [خ ٥٠٦٣/ م١٤٠١]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: سێ کەس هاتن بۆ ماڵەکانی هاوسەرانی پێغەمبەر(ﷺ)، پرسیاری عیبادەتی پێغەمبەریان دەکرد، کاتێك هەواڵیان پێدرا[1] وەك ئەوەی بە کەم تەماشای بکەن، بۆیە وتیان: ئێمە لە کوێی پێغەمبەرین؟ خودا لە گوناهی پێشین و پاشینی خۆشبووە، یەکێکیان وتی: من بەردەوام بە شەو نوێژ دەکەم، یەکێکی تریان وتی: من ڕۆژووی دەهر دەگرم و نایشکێنم[2]، ئەوەکەی تریان وتی: من کۆچ لە ئافرەتان دەکەم و هەرگیز هاوسەرگیری ناکەم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات و فەرمووی: (ئێوە بوون ئاوا و ئاواتان وت؟ سوێند بە خودا من لە هەمووتان زیاتر ترس و خەشیەم بۆ خودایە و لە**

---

[1] واتە: کاتێ هاوسەرەکانی پێغەمبەر هەواڵیان پێدان دەربارەی عیبادەتی پێغەمبەری خودا-و.

[2] واتە: هەموو ڕۆژێ بەڕۆژوو دەبم-و.

**هەمووتان زیاتر بۆ خودا تەقوادارترم، بەڵام بەرۆژوو دەبم و دەیشکێنم و نوێژ دەکەم و رادەکشێم و هاوسەرگیری ئافرەتان دەکەم، هەر کەس بێنیازە لە سوننەتی من لە من نییە).**

**٢٣٣٣-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قال: كنَّا مَعَ النبيِّ صلّى الله عليه وسلّم شَبَاباً لا نَجِدُ شَيئاً، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**يَا مَعْشَرَ الشَّبَاب، مَنِ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرَجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجاءٌ** ).

[خ٥٠٦٦ (١٩٠٥)/ م١٤٠٠]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: کۆمەڵێك گەنج بووین لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) هیچ شتێکمان نەبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی کۆمەڵی گەنجان، هەر کەس دەتوانێ بچێتە ژێر باری هاوسەرگیری با هاوسەرگیری بکات، چونکە ئەوە زیاتر چاو خامۆش دەکات و زیاتر داوێن پاك رادەگرێت، هەر کەس نەیتوانی لەسەریەتی بەرۆژوو بێت، چونکە ئەوە حەزی دەشکێنێت).**

**٢٣٣٤-** عَنْ أَبِي نَجِيحٍ المكِّيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ قَدَرَ عَلَى أَنْ يَنْكِحَ، فَلَمْ يَنْكِحْ، فَلَيْسَ مِنَّا**). [مي٢٢١٠]

* رجاله ثقات، مرسل.

لە ئەبی نەجیحی مەکییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بتوانێ هاوسەرگیری بکات و هاوسەرگیری نەکات لە ئێمە نییە).**

## ٢- دەروازەی: ناپەسەندی دابڕان و خۆ خەساندن

**٢٣٣٥-** (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: رَدَّ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ التَّبَتُّلَ، وَلَوْ أَذِنَ لَهُ لاخْتَصَيْنَا. [خ٥٠٧٣/ م١٤٠٢]

(ق) لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دابڕانی[1] عوسمانی کوڕی مەزعوونی ڕەد کردەوە، گەر مۆڵەتی ئەوی بدابا خۆمان دەخەساند.

## ٣- دەروازەی: جۆرەکانی هاوسەرگیری لە سەردەمی نەفامی

**٢٣٣٦**- (خ) عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ: أَنَّ النِّكَاحَ فِي الجَاهِلِيَّةِ كَانَ على أَرْبَعَةِ أَنْحَاءٍ:

فَنِكَاحٌ مِنْهَا نِكَاحُ النَّاسِ الْيَوْمَ: يَخْطُبُ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ وَلِيَّتَهُ أَوِ ابْنَتَهُ، فَيُصْدِقُهَا، ثُمَّ يَنْكِحُهَا.

وَنِكَاحٌ آخَرُ: كانَ الرَّجُلُ يَقُولُ لامْرَأَتِهِ إذَا طَهُرَتْ مِنْ طَمْثِهَا: أَرْسِلِي إِلَى فُلاَنٍ فَاسْتَبْضِعِي مِنْهُ، وَيَعْتَزِلُهَا زَوْجُهَا وَلاَ يَمَسُّهَا أَبداً، حَتَّى يَتَبَيَّنَ حَمْلُهَا مِنْ ذَلِكَ الرَّجُلِ الَّذِي تَسْتَبْضِعُ مِنْهُ، فَإذَا تَبَيَّنَ حَمْلُهَا أَصَابَهَا زَوْجُهَا إذَا أَحَبَّ، وَإِنَّمَا يَفْعَلُ ذلِكَ رَغْبَةً في نَجَابَةِ الْوَلَدِ، فَكَانَ هذَا النِّكَاحُ نِكَاحَ الاسْتِبْضَاعِ.

وَنِكَاحٌ آخَرُ: يَجْتَمِعُ الرَّهْطُ ما دُونَ الْعَشْرَةِ، فَيَدْخُلُونَ عَلَى المَرْأَةِ، كُلُّهُمْ يُصِيبُهَا، فَإذَا حَمَلَتْ وَوَضَعَتْ، وَمَرَّ عَلَيْهَا لَيَالٍ بَعْدَ أَنْ تَضَعَ حَمْلَهَا، أَرْسَلَتْ إِلَيْهِمْ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ رَجُلٌ مِنْهُمْ أَنْ يَمْتَنِعَ، حَتَّى يَجْتَمِعُوا عِنْدَهَا، تَقُولُ لَهُمْ: قَدْ عَرَفْتُمُ الَّذِي كانَ مِنْ أَمْرِكُمْ وَقَدْ وَلَدْتُ، فَهُوَ ابْنُكَ يَا فَلاَنُ، تُسَمِّي مَنْ أَحَبَّتْ بِاسْمِهِ فَيَلْحَقُ بِهِ وَلَدُهَا، لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَمْتَنِعَ مِنْهُ الرَّجُلُ.

وَنِكَاحُ الرَّابِعِ: يَجْتَمِعُ النَّاسُ الْكَثِيرُ، فَيَدْخُلُونَ عَلَى المَرْأَةِ، لاَ تَمْتَنِعُ مِمَّنْ جاءَهَا، وَهُنَّ الْبَغَايَا، كُنَّ يَنْصِبْنَ عَلَى أَبْوَابِهِنَّ رَايَاتٍ تَكُونُ عَلَماً، فَمَنْ أَرَادَهُنَّ دَخَلَ عَلَيْهِنَّ، فَإذَا حَمَلَتْ إحْدَاهُنَّ وَوَضَعَتْ حَمْلَهَا جُمِعُوا لَهَا، وَدَعَوْا لَهُمُ القَافَةَ، ثُمَّ أَلْحَقُوا وَلَدَهَا بِالَّذِي يَرَوْنَ، فَالْتَاطَ بِهِ، وَدُعِيَ ابْنَهُ، لاَ يَمْتَنِعُ مِنْ ذلِكَ.

فَلَمَّا بُعِثَ مُحَمَّدٌ صلّى الله عليه وسلّم بِالْحَقِّ، هَدَمَ نِكَاحَ الجاهِلِيَّةِ كُلَّهُ؛ إلاَّ نِكَاحَ النَّاسِ الْيَوْمَ. [خ٥١٢٧]

---

[1] دابڕان لە هاوسەرگیری و یەکلابوونەوە بۆ عیبادەت.

(خ) لە عائیشەوە –هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)–: هاوسەرگیری لە نەفامیدا چوار جۆر بوو:

هاوسەرگیرییەکیان وەك هاوسەرگیری ئەمڕۆی خەڵك: پیاوێك داوای خوشك یان کچی پیاوێکی دەکرد و مارەیی دەدا و پاشان هاوسەرگیری لەگەڵ دەکرد.

هاوسەرگیرییەکی تر: پیاوێك بە ژنەکەی خۆی دەوت –کە لە حەیزی پاك دەبوویەوە– بنێرە بەدوای فلان و داوای جووتبوونی لێ بکە، پیاوەکەی لێی کەنارگیر دەبوو و نەدەچووە لای تا سکەکە لەو پیاوەی داوای جووتبوونی لێ کرد بوو ئاشکرا دەبوو، کاتێ سکەکەی دەردەکەوت گەر پیاوەکەی پێیخۆشبوایە دەچووە لای، وەك حەزی مندالی نەجیب ئەو کارەی دەکرد، ئەم هاوسەرگیرییە هاوسەرگیری "داوای جووتبوون" بوو.

هاوسەرگیرییەکی تر: خوار دە کەس کۆدەبوونەوە دەچوونە لای ئافرەتێك، هەموویان دەچوونە لای، کاتێ سکی پڕ دەبوو و سکەکەی دادەنا و چەند شەو بەسەر دانانی سکەکەیدا تێدەپەڕی لەدووی دەناردن، هیچ پیاوێك نەیدەتوانی نەچێت تا لای کۆدەبوونەوە، پێی دەوتن: ئێوە دەزانن چ کارێکتان کردووە و ئێستا من منداڵەکەم بووە، ئەمە کوڕی تۆیە ئەی فلان، کێی خۆشبویستبا منداڵەکەی بە ناوی ئەوەوە ناودەنا و دەدرایە پاڵ ئەو، پیاوەکەش نەیدەتوانی ڕێگری بکات لێی.

هاوسەرگیری چوارەم: خەڵکێکی زۆر کۆدەبوونەوە و دەچوونە لای ئافرەتێك، ڕێگری نەدەکرد لەوەی دەهات بۆ لای، ئەوانە لاشەفرۆش بوون، ئەوان بەیداخیان لە دەرگاکانیان هەڵدەکرد و دەبووە ئالا و هەر کەس بیویستبا دەچووە ژوورەوە بۆ لایان، کە یەکێکیان سکی پڕ دەبوو و منداڵەکەی دادەنا پیاوەکانی بۆ کۆدەکرایەوە و ڕەچەڵەکناسیان بۆ بانگ دەکرد، پاشان منداڵەکەیان دەدایە پاڵ ئەوەیان پێیدەچوو، منداڵەکەی پێوە پەیوەست دەبوو و بە منداڵی ئەو بانگ دەکرا، ئەویش[1] ڕێگری نەدەکرد لەو کارە.

کاتێ محەمەد(ﷺ) بە حەق ڕەوانە کرا هەموو جۆرەکانی هاوسەرگیری نەفامی ڕوخاند جگە لە هاوسەرگیری ئەمڕۆی خەڵك.

---

[1] واتە: ئەو پیاوەی منداڵەکەی دراوەتە پاڵ–و.

## ٤- دەروازەی: (زەفەر ببە بە خاوەن دینێك)[١]

**٢٣٣٧**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا؛ فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ، تَرِبَتْ يَدَاكَ). [خ٥٠٩٠/ م١٤٦٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئافرەت بۆ چوار شت هاوسەرگیری لەگەڵ دەکرێت: بۆ ماڵ و سامانەکەی، و بۆ بنەماڵەکەی، و بۆ جوانییەکەی، و بۆ دینەکەی، زەفەر ببە بە خاوەن ئاینێك دەستت بە خێردا دەچێت).**

## ٥- دەروازەی: باشترین مەتاع[٢] ئافرەتێکی صاڵحە

**٢٣٣٨**- (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ). [م١٤٦٧]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دنیا مەتاعە، باشترین مەتاعی دنیا ئافرەتێکی صاڵحە).**

**٢٣٣٩**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: أَيُّ النِّسَاءِ خَيْرٌ؟ قَالَ: (الَّتِي تَسُرُّهُ إِذَا نَظَرَ، وَتُطِيعُهُ إِذَا أَمَرَ، وَلاَ تُخَالِفُهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهَا بِمَا يَكْرَهُ). [ن٣٢٣١]

* حسن صحيح.

---

[١] واتە: ئەم فەرموودە پێمان دەفەرموێت دەبێ خێزان لەسەر بنچینەی ئاین دروست بکرێت و یەکەمین کارێك بێت بیری لێ دەکرێتەوە، بەڵام فەرموودەکە ئەوە ناگەیەنێت پیاو و ژن جگە لە ئاین بیر لە شتی تر نەکەنەوە، بەڵکو پێویستە پیاو و ژن یەکتریان بە دڵ بێت و بۆ یەکتر گونجاو و شیاو بن، تەماشای فەرموودەی (٢٣٣٧ و ٢٣٤١) بکە-و.

[٢] مەتاع(امتاع) هەر شتێك سوودی لێ ببینی و حەز بکەی بەدەستی بهێنی، وەك خۆراك و ئەساسی ناوماڵ و شمەك و ئامراز و ئامێر و کەرەستە و ماڵ و سامان-و

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وترا: چ جۆرە ئافرەتێك باشترینە؟ فەرمووی: **(ئەو ئافرەتەی گەر تەشای بکات دڵخۆشی دەکات، کاتێ فەرمان دەکات گوێڕایەڵی دەبێت، لە خۆیدا و لە ماڵ و سامانەکەی–بە شتێك مێردەکەی پێیناخۆشە– سەرپێچی لێ ناکات).**

## ٦- دەروازەی: هاوشانی لە ئاییندا

**٢٣٤٠**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ؛ فَزَوِّجُوهُ، إِلاَّ تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ)**.

* حسن. [ت١٠٨٤/ جه١٩٦٧]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر کەسێك لە دین و ڕەوشتی ڕازی بوون و ئافرەتی لێ داوا کردن هاوسەرگیری بۆ بکەن، گەر ئەو کارە نەکەن فیتنە و فەسادێکی بەرین لە زەوی بەرپا دەبێت).**

## ٧- دەروازەی: هاوسەرگیری لەگەڵ کچ

**٢٣٤١**– (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ الله رضي الله عنهما قَالَ: هَلَكَ أَبِي وَتَرَكَ سَبْعَ بَنَاتٍ . أَوْ تِسْعَ بَنَاتٍ . فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً ثَيِّباً، فَقَالَ لِي رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(تَزَوَّجْتَ يَا جَابِرُ)** ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: **(بِكْراً أَمْ ثَيِّباً)** ؟ قُلْتُ: بَلْ ثَيِّباً، قالَ: **(فَهَلاَّ جارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاعِبُكَ، وَتُضَاحِكُهَا وَتُضَاحِكُكَ)**. قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ عَبْدَ الله هَلَكَ، وَتَرَكَ بَنَاتٍ وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَجِيئَهُنَّ بِمِثْلِهِنَّ، فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً تَقُومُ عَلَيْهِنَّ وَتُصْلِحُهُنَّ، فَقَالَ: **(بَارَكَ الله لَكَ، أَوْ قَالَ : خَيْراً)**.

[خ٥٣٦٧ (٤٤٣)/ م: المساقاة. ٧١٥ (١١٠)]

(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: باوکم تیاچوو و حەوت کچی–یان نۆ کچی– بەجێهێڵا، ئافرەتێکی بێوەژنم هێنا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: **(ئەی جابر، ژنت هێنا؟)**، وتم: بەڵێ، فەرمووی: **(کچ یان بێوەژن؟)**، وتم: بێوەژن، فەرمووی: **(ئەی بۆچی کچێکت نەهێنا یاری لەگەڵ بکەی و**

**یاریت لەگەڵ بکات و لەگەڵی پێبکەنی و لەگەڵت پێ بکەنێ)**، وتی: وتم: عەبدوڵا تیاچوو و کچی بەجێهێڵاوە من پێمباش نەبوو یەکێك وەك ئەوان بهێنم، هاوسەرگیریم لەگەڵ ئافرەتێ کرد سەرۆکارییان بکات و باش و چاکیان بکات، فەرمووی: (**"بارك الله لك"**-یان فەرمووی: -**خێرە**).

**٢٣٤٢-** (خ) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، أَرَأَيْتَ لَوْ نَزَلْتَ وَادِياً وَفِيهِ شَجَرَةٌ قَدْ أُكِلَ مِنْهَا، وَوَجَدْتَ شَجَراً لَمْ يُؤْكَلْ مِنْهَا، فِي أَيِّهَا كُنْتَ تُرْتِعُ بَعِيرَكَ؟ قَالَ: (**فِي الَّتِي لَمْ يُرْتَعْ مِنْهَا**). تَعْنِي: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم لَمْ يَتَزَوَّجْ بِكْراً غَيْرَهَا. [خ٥٠٧٧]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، باشە گەر لە دۆڵێك دابەزیت درەختێکی تێدا بێت لێی خورا بێت، درەختێکیش ببینیتەوە لێی نەخورابێت لە کامیان حوشترەکەت دەلەوەڕێنی؟ فەرمووی: (**لەوەیان لێی نەخوراوە**)، واتە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) جگە لە ئەو کچی نەهێناوە.

## ٨- دەروازەی: بە هاوسەرگیری ئافرەت و پووری لەگەڵ یەکتر کۆناکاتەوە

**٢٣٤٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (**لا يُجْمَعُ بَيْنَ المرأةِ وعمَّتِهَا، وَلاَ بَيْنَ المَرْأَةِ وَخَالَتِهَا**). [خ٥١٠٩/ م١٤٠٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئافرەت و پووری لە باوکەوە و ئافرەت و پووری لە دایکەوە پێکەوە کۆ ناکرێنەوە)**.

## ٩- دەروازەی: حەرام کردنی هاوسەرگیری ژن بە ژن

**٢٣٤٤-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم نَهى عَنِ الشِّغَارِ. وَالشِّغَارُ أَنْ يَزَوِّجَ الرَّجُلُ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يَزَوِّجَهُ الآخَرُ ابْنَتَهُ، لَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ. [خ٥١١٢/ م١٤١٥]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە "الشِّغار"، "الشِّغار" ئەوەیە پیاوێك کچەکەی بدات بە یەکێك و ئەویش کچەکەی خۆی بدات بە ئەو و مارەیی لە نێوانیان نەبێت.

## ١٠- دەروازەی: هاوسەرگیری کەسێك لە ئیحرامدا بێت

**٢٣٤٥**- (م) عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ عُبَيْدِ اللهِ أَرَادَ أَنْ يُزَوِّجَ طَلْحَةَ بْنَ عُمَرَ، بِنْتَ شَيْبَةَ بْنِ جُبَيْرٍ، فَأَرْسَلَ إِلَى أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ يَحْضُرُ ذَلِكَ، وَهُوَ أَمِيرُ الْحَجِّ. فَقَالَ أَبَانٌ: سَمِعْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ، وَلاَ يُنْكَحُ، وَلاَ يَخْطُبُ**).

[م١٤٠٩]

(م) لە نوبەیهی کوڕی وەهبەوە: عومەری کوڕی عەبدوڵا ویستی کچەکەی شەیبەی کوڕی جوبەیر بدات بە تەلحەی کوڕی عومەر، ناردی بۆ لای ئەبانی کوڕی عوسمان لەوەدا ئامادە بێت، ئەو ئەمیری حەج بوو، ئەبان وتی: گوێم لە عوسمانی کوڕی عەففان بوو دەیوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کەسی ئیحرامگر نە ئافرەت بە شوو دەدات و نە ئافرەتی لێ مارە دەکرێت و نە ئافرەت داوا دەکات)**.

## ١١- دەروازەی: دوایینجار نەهی لە هاوسەرگیری موتعە

**٢٣٤٦**- (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ وَسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، قَالاَ: كُنَّا فِي جَيْشٍ، فَأَتَانَا رَسُولُ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُمْ أَنْ تَسْتَمْتِعُوا، فَاسْتَمْتِعُوا.

[خ٥١١٧، ٥١١٨/ م١٤٠٥]

(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵا و سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە، وتیان: لە سوپایەکدا بووین، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لامان و فەرمووی: **(مۆڵەتتان دراوە هاوسەرگیری موتعە بکەن، بۆیە موتعە بکەن)**.

- زاد في مسلم: يَعْنِي: مُتْعَةَ النِّسَاءِ.

لە موسلیمدا ئەم زیادە هاتووە: واتە: موتعەی ئافرەت.

■ وفي رواية لمسلم: عَنْ سَلَمَةَ قَالَ: رَخَّصَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم، عَامَ أَوْطَاسٍ، فِي الْمُتْعَةِ ثَلاَثاً. ثُمَّ نَهَى عَنْهَا.

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا: لە سەلەمەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ساڵی "أوطاس"[1] سێ جار روخسەتی موتعەی دا، پاشان نەهی لێکرد.**

**٢٣٤٧**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَمَّا وَلِيَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَذِنَ لَنَا فِي الْمُتْعَةِ ثَلاَثاً، ثُمَّ حَرَّمَهَا. وَاللهِ لاَ أَعْلَمُ أَحَداً يَتَمَتَّعُ وَهُوَ مُحْصَنٌ؛ إِلاَّ رَجَمْتُهُ بِالْحِجَارَةِ، إِلاَّ أَنْ يَأْتِيَنِي بِأَرْبَعَةٍ يَشْهَدُونَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَحَلَّهَا بَعْدَ إِذْ حَرَّمَهَا. [جه١٩٦٣]

* حسن.

[وانظر: **٣٦٦٥**].

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: کاتێ عومەری کوڕی خەتاب کارەکەی گرتە دەست، وتاری بۆ خەڵك دا و وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سێ جار مۆڵەتی موتعەی داوین و پاشان حەرامی کردووە، سوێند بە خودا، کەسێك ببینم موتعە بکات و ئەو هاوسەردار بێت بە بەرد رەجمی دەکەم، مەگەر چوار شایەتم بۆ بهێنێت پێغەمبەری خودا حەڵاڵی کردووە لەدوای حەرام کردنی.**

## ١٢- دەروازەی: هاوسەرگیری ئافرەتی نەصرانی و یەهوودی

**٢٣٤٨**– (خ) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كانَ إِذَا سُئِلَ عَنْ نِكاحِ النَّصْرَانِيَّةِ وَالْيَهُودِيَّةِ قَالَ: إن الله حَرَّمَ المشْرِكَاتِ عَلَى المؤْمِنِينَ، وَلاَ أَعْلَمُ مِنَ الإِشْرَاكِ شَيْئاً أَكْبَرَ مِنْ أَنْ تَقُولَ المرْأَةُ: رَبُّهَا عِيسى، وَهُوَ عَبْدٌ مِنْ عِبَادِ اللهِ. [خ٥٢٨٥]

**[1] ساڵی "أوطاس" ساڵی هەشتی کۆچییە کە غەزوەی "أوطاس"ی تێدا کراوە، هەمان ئەو ساڵەی فەتحی مەککەی تێدا کرا–و**

(خ) لە نافیعەوە: گەر پرسیار بکرابا لە عومەری کوڕی خەتاب دەربارەی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتی نەصرانی و یەهوودی دەیوت: خودا هاوەڵدانەرانی لەسەر باوەڕداران حەرام کردووە، لە هاوبەشدانانەدا شتێك نابینم گەورەتر لەوەی ئافرەت بڵێ: "پەروەردگارم عیسایە"، لە کاتێکدا ئەو بەندەیەکە لە بەندەکانی خودا.

**٢٣٤٩**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَوْلُهُ: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ [البقرة: ٢٢١] نُسِخَتْ، وَأُحِلَّ مِنَ الْمُشْرِكَاتِ نِسَاءُ أَهْلِ الْكِتَابِ. [هق٧/١٧١]

لە ئیبن عەباسەوە، ئایەتی: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ [البقرة: ٢٢١] نەسخ کراوەتەوە، لە هاوەڵدانەران ئافرەتانی ئەهلی کیتاب حەلاڵ کران.

**٢٣٥٠**- عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ الله رضي الله عنهما يُسْأَلُ عَنْ نِكَاحِ الْمُسْلِمِ الْيَهُودِيَّةَ وَالنَّصْرَانِيَّةَ، فَقَالَ: تَزَوَّجْنَاهُنَّ زَمَانَ الْفَتْحِ بِالْكُوفَةِ مَعَ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، وَنَحْنُ لاَ نَكَادُ نَجِدُ الْمُسْلِمَاتِ كَثِيراً، فَلَمَّا رَجَعْنَا طَلَّقْنَاهُنَّ، وَقَالَ: لاَ يَرِثْنَ مُسْلِماً وَلاَ يَرِثُهُنَّ، وَنِسَاؤُهُمْ لَنَا حِلٌّ، وَنِسَاؤُنَا عَلَيْهِمْ حَرَامٌ. [هق٧/١٧٢]

لە ئەبی زوبەیرەوە ئەو لە جابری کوڕی عەبدوڵای بیست-پرسیاری هاوسەرگیری پیاوی موسڵمانی لێکرا لە ئافرەتی یەهوودی یان نەصرانی- وتی: لە سەردەمی فەتح لە کوفە لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هاوسەرگیریمان لەگەڵ ئەو ئافرەتانە کرد، ئێمە ئافرەتی موسڵمانی زۆرمان نەدەبینییەوە، کاتێك گەڕاینەوە تەڵاقماندان، هەروەها وتی: ئەو ئافرەتانە میرات لە موسڵمان نابەن و پیاوی موسڵمانیش میرات لەوان ناگرن، ئافرەتانی ئەوان بۆ ئێمە حەڵاڵە، و ئافرەتانی ئێمە لەسەر ئەوان حەرامە.

**٢٣٥١**- عن عبد الله بْنِ السَّائِبِ مِنْ بَنِي الْمُطَّلِبِ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ نَكَحَ ابْنَةَ الْفَرَافِصَةِ الْكَلْبِيَّةَ ـ وَهِي نَصْرَانِيَّةٌ ـ عَلَى نِسَائِهِ، ثُمَّ أَسْلَمَتْ عَلَى يَدَيْهِ. [هق٧/١٧٢]

لە عەبدوڵای كوڕی سائیبەوە لە بەنی موتەلیب: عوسمانی كوڕی عەفان(خوا لێی ڕازی بێت) كچەكەی فەرافیصەی كەلبی بەسەر ژنەكانیدا مارە كرد–ئەو نەصرانی بوو– پاشان لەسەر دەستی عوسمان موسڵمان بوو.

## ١٣- دەروازەی: بەسەر داوای براكەیدا داوا ناكات

**٢٣٥٢–** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: نَهَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَبِيعَ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلاَ يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، حَتَّى يَتْرُكَ الخَاطِبُ قَبْلَهُ، أَوْ يَأْذَنَ لَهُ الخَاطِبُ. [خ٥١٤٢ (٢١٣٩)/ م١٤١٢]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) نەهی كرد یەكێكتان بەسەر كڕین و فرۆشتنی یەكێكی ترتان كڕین و فرۆشتن بكات، هەروەها یەكێكتان بەسەر داخوازی براكەیدا داخوازی بكات، تا داخوازیكەرەكەی پێش ئەو وازدەهێنێت، یان داخوازیكەرەكە مۆڵەتی دەدات.

## ١٤- دەروازەی: تەماشا كردنی ئەو ئافرەتەی داخوازی دەكرێت

**٢٣٥٣–** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا**) ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: (**فَاذْهَبْ؛ فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّ فِي أَعْيُنِ الأَنْصَارِ شَيْئاً**). [م١٤٢٤]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: لای پێغەمبەر(ﷺ) بووم، پیاوێك هات بۆ لای و هەواڵی پێدا ئەو هاوسەرگیری كردووە لەگەڵ ئافرەتێكی ئەنصار، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**تەماشات كرد؟**)، وتی: نەخێر، فەرمووی: (**بڕۆ و تەمشای بكە، چونكە لە چاوی ئەنصاردا شتێك هەیە**).

**٢٣٥٤**– عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: خَطَبْتُ امْرَأَةً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا)** ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: **(فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا)**. [ت١٠٨٧/ ن٣٢٣٥/ جه١٨٦٦/ مي٢٢١٨]

* صحيح.

**لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئافرەتێکم داوا کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئایا تەماشات کرد؟)، وتم: نەخێر، فەرمووی: (تەماشای بکە، چونکە باشترە بۆ بەردەوامی نێوانتان).**

## ١٥- دەروازەی: پیاو کچەکەی خۆی بۆ پیاوێکی صاڵح بخاتە روو

**٢٣٥٥**– (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ، حِينَ تَأَيَّمَتْ حَفْصَةُ بِنْتُ عُمَرَ مِنْ خُنَيْسِ بْنِ حُذَافَةَ السَّهْمِيِّ ـ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم قَدْ شَهِدَ بَدْراً، تُوُفِّيَ بِالمدِينَةِ ـ قَالَ عُمَرُ: فَلَقِيتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ حَفْصَةَ، فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ أَنْكَحْتُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ، قَالَ: سَأَنْظُرُ فِي أَمْرِي، فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ، فَقَالَ: قَدْ بَدَا لِي أَنْ لاَ أَتَزَوَّجَ يَوْمِي هَذَا. قَالَ عُمَرُ: فَلَقِيتُ أَبَا بَكْرٍ، فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ أَنْكَحْتُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ، فَصَمَتَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئاً، فَكُنْتُ عَلَيْهِ أَوْجَدَ مِنِّي عَلَى عُثْمانَ، فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ، ثُمَّ خَطَبَهَا رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم، فَأَنْكَحْتُهَا إِيَّاهُ.

فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: لَعَلَّكَ وَجَدْتَ عَلَيَّ حِينَ عَرَضْتَ عَلَيَّ حَفْصَةَ فَلَمْ أَرْجِعْ إِلَيْكَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَرْجِعَ إِلَيْكَ فِيمَا عَرَضْتَ؛ إِلاَّ أَنِّي قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَدْ ذَكَرَهَا، فَلَمْ أَكُنْ لإِفْشِيَ سِرَّ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، وَلَوْ تَرَكَهَا لَقَبِلْتُهَا. [خ٤٠٠٥]

**(خ) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): کاتێ حەفصەی کچی عومەر لە خونەیسی کوڕی حوزافەی سەهمی بێوەژن کەوت–خونەیس یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و بەدری بینی بوو و لە مەدینە کۆچی دوایی کرد– عومەر وتی: بە عوسمانی کوڕی عەففان گەیشتم و حەفصەم بۆ خستە روو، و وتم:**

گەر دەخوازی حەفصەی کچی عومەرت لێ مارە دەکەم، وتی: لە حاڵ و باری خۆم وردەبمەوە، چەندین شەو مامەوە و عوسمان وتی: بۆم دەرکەوتووە لەم ڕۆژانەدا ژن نەهێنم، عومەر وتی: بە ئەبوبەکر گەیشتم و وتم: گەر دەخوازی حەفصەی کچی عومەرت لێ مارە دەکەم، ئەبوبەکر بێدەنگ بوو و هیچ وەڵامی نەدامەوە، لە ئەو زیاتر تورە بووم تا لە عوسمان، چەندین شەو مامەوە پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) داخوازی کرد و لێم مارە کرد.

ئەبوبەکرم پێگەیشت و وتی: لەوانەیە شتێکت لە دڵدا دروست بووبێت کاتێ حەفصەت بۆ من خستمە روو و وەڵامی تۆم نەدایەوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەوەی ڕێگری لێ کردم لە وەڵامدانەوەت ئەوە بوو زانیبووم پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناوی هێناوە، نەمویست نهێنییەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بڵاوە پێ بکەم، گەر ئەو وازیلێبهێنابا من قبووڵم دەکرد.

## ١٦- دەروازەی: ئافرەتێك خۆی بۆ پیاوێکی صالح بخاتە روو

**٢٣٥٦**- (خ) عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ أَنَسٍ، وَعِنْدَهُ ابْنَةٌ لَهُ، قَالَ أَنَسٌ: جاءَتِ امْرَأَةٌ إلى رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم تَعْرِضُ عَلَيْهِ نَفْسَهَا، قَالَتْ: يَا رَسُولَ الله، أَلَكَ بِي حاجَةٌ؟ فَقَالَتْ بِنْتُ أَنَسٍ: ما أَقَلَّ حَيَاءَهَا، وَاسَوْأَتَاهْ! وَاسَوْأَتَاهْ!، قَالَ: هِيَ خَيْرٌ مِنْكِ، رَغِبَتْ فِي النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَعَرَضَتْ عَلَيْهِ نَفْسَهَا. [خ٥١٢٠]

(خ) لە سابیتی بونانییەوە، وتی: لای ئەنەس بووم، کچێکی خۆی لە لا بوو، ئەنەس وتی: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆی بۆ خستە روو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، تۆ پێویستییەکت بە من هەیە؟ کچەکەی قەیس وتی: چەند کەم حەیایە، هاوار لەم بێشەرمییە، هاوار لەم بێشەرمییە! ئەنەس بە کچەکەی خۆی وت: ئەو ئافرەتە لە تۆ باشترە، حەزی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد[1] و نەفسی خۆی بۆ خستەڕوو.

---

[1] واتە: پێیخۆش بوو کرد هاوسەرگیری بکات لەگەڵ پێغەمبەری خودا-و

## ١٧- دەروازەی: ئافرەت تەنها بە رازیبوونی مارە دەكرێت

**٢٣٥٧-** (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الأَيِّمُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْذَنُ فِي نَفْسِهَا، وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا**). [م١٤٢١]

**(م) لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بێوەژن لەپێشترە بە خۆی تا سەرپەرشتیارەكەی، كچ مۆڵەتی لێ وەردەگیرێ و بێدەنگبوونەكەی مۆڵەتدانییەتی).**

■ وفي رواية: (**الثَّيِّبُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا..**).

**لە ریوایەتێكدا: (بێوەژن لەپێشترە بە خۆی).**

**٢٣٥٨-** (خ) عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِدَامٍ الأَنْصَارِيَّةِ: أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهْيَ ثَيِّبٌ فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَتَتْ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم فَرَدَّ نِكَاحَهُ. [خ٥١٣٨]

**(خ) لە خەنسای كچی خیدامی ئەنصارییەوە: باوكی دای بە مێرد ئەو بێوەژن بوو، ئەوەی لا گران بوو، بۆیە هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و پێغەمبەر هاوسەرگیرییەكەی رەد كردەوە.**

**٢٣٥٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ جَارِيَةً بِكْراً أَتَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَذَكَرَتْ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ، فَخَيَّرَهَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم. [د٢٠٩٦، ٢٠٩٧/ جه١٨٧٥]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە: جاریەیەكی كچ هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەوەی كرد باوكی بە مێردی داوە ئەو پێیناخۆشە، پێغەمبەر ئافرەتەكەی سەرپشك كرد.**

**٢٣٦٠-** عَنْ أَنَسٍ قَالَ: جَاءَتْ جَارِيَةٌ بِكْرٌ بين أبويها إلى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: إِنَّ أَبَوِيَّ زَوَّجَانِي وَلَمْ يَسْتَأْمِرانِي، فَهَلْ لِي مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**)، قَالَتْ: قَدْ خَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهِ. فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم. [مخ٥/١٧٣٥]

* إسناده حسن.

لە ئەنەسەوە، وتی: جاریەیەکی کچ لە نێوان باوك و دایکی هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: باوك و دایکم منیان بە مێرد داوە و داوای مۆڵەتیان لە من نەکردووە، ئایا من شتێکم لەم کارە بۆ هەیە؟ فەرمووی : (بەڵێ)، کچەکە وتی: کەوابوو من لای ئەو پیاوە چوومە دەرەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لە یەکتری جیاکردنەوە.

## ١٨- دەروازەی: مارەیی

**٢٣٦١-** (م) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمنِ أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ . زَوجَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم .: كَمْ كَانَ صَدَاقُ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَتْ: كَانَ صَدَاقُهُ لأَزْوَاجِهِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً وَنَشّاً. قَالَتْ: أَتَدْرِي مَا النَّشُّ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَتْ: نِصْفُ أُوقِيَّةٍ، فَتِلْكَ خَمْسُمِائَةِ دِرْهَمٍ، فَهَذَا صَدَاقُ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم لأَزْوَاجِهِ. [م١٤٢٦]

(م) لە ئەبی سەلەمەی کوڕی عبدالرحمانەوە، ئەو وتی: پرسیارم لە عائیشە- هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- کرد: مارەیی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چەند بوو؟ وتی: مارەییەکەی بۆ ژنەکانی دوازدە ئۆقە[1] و نەشێك بوو، وتی دەزانی "النَّش" چییە؟ وتی: وتم: نەخێر، عائیشە وتی: نیو ئۆقەیە، بریتی بوو لە پێنجسەد درهەم، ئەوە بریتی بوو لە مارەیی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ ژنەکانی.

**٢٣٦٢-** عَنْ أَبِي الْعَجْفَاءِ السُّلَمِيِّ قَالَ: خَطَبَنَا عُمَرُ رحمه الله فَقَالَ: أَلاَ لاَ تُغَالُوا بِصُدُقِ النِّسَاءِ، فَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ مَكْرُمَةً فِي الدُّنْيَا، أَوْ تَقْوَى عِنْدَ اللهِ، لَكَانَ أَوْلاَكُمْ بِهَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، مَا أَصْدَقَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ، وَلاَ أُصْدِقَتِ امْرَأَةٌ مِنْ بَنَاتِهِ أَكْثَرَ مِنْ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً. [د٢١٠٦/ ت١١١٤م/ ن٣٣٤٩/ جه١٨٨٧/ مي٢٢٤٦]

* حسن صحيح.

لە ئەبی عەجفای سولەمییەوە، وتی: عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) وتاری بۆ داین و وتی: پێڕامەکێشن لە مارەیی ئافرەتان، چونکە گەر ئەوە رێزداری

[1] یەك ئۆقە نزیك بە ٢٠٠ گرامە-و

بووە لە دنیا یان تەقوا بوایە لای خودا لە ئێوە لەپێشتر پێغەمبەر(ﷺ) بوو، پێغەمبەر زیاتر لە دوازدە ئۆقەی نەکردووەتە مارەیی ژنەکانی، و نەکردووەتە مارەیی کچەکانی.

**٢٣٦٣**– عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ مِنْ يُمْنِ الْمَرْأَةِ: تَيْسِيرَ خِطْبَتِهَا، وَتَيْسِيرَ صَدَاقِهَا، وَتَيْسِيرَ رَحِمِهَا). [حم٢٤٤٧٨]

* إسناده حسن.

له عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە فەڕ و بەرەکەتی ئافرەت: ئاسانی داخوازییەکەی، و ئاسانی مارەکەیی، و ئاسانی رەحمەکەیەتی[1])**.

■ وفي رواية: (إِنَّ أَعْظَمَ النِّكَاحِ بَرَكَةً، أَيْسَرُهُ مُؤْنَةً). [حم٢٤٥٢٩]

له ریوایەتێکدا: (**مەزنترین بەرەکەتی هاوسەرگیرییەك ئاسانی تێچوونەکەیەتی**).

## ١٩- دەروازەی: وەلیمە و وەڵامدانەوەی بانگهێش بۆی

**٢٣٦٤**– (ق) عَنْ أَنسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَأَى عَلَى عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَوْفٍ أَثَرَ صُفْرَةٍ قَالَ: (**ما هَذَا**)؟ قَالَ: إِنِّي تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: (**بَارَكَ الله لَكَ، أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ**). [خ٥١٥٥ (٢٠٤٩)/ م١٤٢٧]

**(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری(ﷺ) ئەسەری زەردی زەعفەرانی لەسەر عبدالرحمانی کوڕی عەوف بینی، فەرمووی: (ئەمە چییە؟)، وتی: ئافرەتێکم مارە کردووە لەسەر کێشی ناوکە خورمایەك لە زێڕ، فەرمووی: ("بارك الله لك"، بە کاوڕێکیش بێت وەلیمەی بۆ بکە).**

**٢٣٦٥**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ، يُدْعَى لَهَا الأَغْنِيَاءُ وَيُتْرَكُ الْفُقَرَاءُ، وَمَنْ تَرَكَ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى الله تَعَالى وَرَسُولَهُ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٥١٧٧/ م١٤٣٢]

---

[1] واتە: ئاسانی رەحمەکەی: ئەوەیە زۆر و زوو منداڵی ببێت–و

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، ئەو دەیوت: خراپترین خواردن خواردنی وەلیمەیە، دەوڵەمەندانی بۆ بانگ دەکرێت و هەژاران وازلێدەهێنرێن، هەر کەس واز لە بانگهێش بهێنێت[1] لە خودا(سبحانه وتعالى) و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) یاخی بووە.

■ وهو مرفوع عند مسلم.

لای موسلیم ئەم فەرموودە بەرزکراوەیە(مرفوع).

**٢٣٦٦**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيُجِبْ، فَإِنْ كَانَ صَائِماً فَلْيُصَلِّ، وَإِنْ كَانَ مُفْطِراً فَلْيَطْعَمْ**). [م١٤٣١]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە بانگهێش کرا با وەڵام بداتەوە، گەر بەڕۆژوو بوو با دوعا بکات، گەر بەڕۆژوو نەبوو با خواردن بخوات).**

**٢٣٦٧**– (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ فَلْيُجِبْ. فَإِنْ شَاءَ طَعِمَ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ**). [م١٤٣٠]

(م) لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە بۆ خواردنێك بانگهێش کرا با وەڵام بداتەوە، گەر ویستی بخوات و گەر نەیویست وازیلێبهێنێت[2]).**

**٢٣٦٨**– عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: صَنَعْتُ طَعَاماً، فَدَعَوْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَجَاءَ، فَرَأَى فِي الْبَيْتِ تَصَاوِيرَ، فَرَجَعَ. [ن٥٣٦٦/ جه٣٣٥٩]

* صحيح.

لە عەلییەوە، وتی: خواردنێکم دروست کرد و پێغەمبەری خودام(ﷺ) بانگهێش کرد، هات، لە ماڵەکە وێنەی بینی گەڕایەوە.

---

[1] واتە: بۆ وەلیمەیەك بانگهێش بکرێت و نەچێت بە دەم بانگکردنەکەوە—و

[2] واتە: بچێت بۆ وەلیمەکە، ویستی بخوات دەخوات و نەیویست بخوات وازیلێدەهێنێ—و

## ٢٠- دەروازەی: لەهو و لێدانی دەف لە هاوسەرگیریدا

**٢٣٦٩-** (خ) عَنْ خَالِدِ بْنِ ذَكْوَانَ، عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم غَدَاةَ بُنِيَ عَلَيَّ، فَجَلَسَ عَلَى فِرَاشِي كَمَجْلِسِكَ مِنِّي، وَجُوَيْرِيَاتٌ يَضْرِبْنَ بِالدُّفِّ، يَنْدُبْنَ مَنْ قُتِلَ مِنْ آبَائِهِنَّ يَوْمَ بَدْرٍ، حَتَّى قالَتْ جارِيَةٌ: وَفِينَا نَبِيٌّ يَعْلَمُ ما فِي غَدٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَقُولِي هكَذَا، وَقُولِي ما كُنْتِ تَقُولِينَ)**. [خ٤٠٠١]

**(خ) لە خالیدی کوڕی زەکوانەوە، لە روبەییعی کچی موعەویزەوە، وتی: ئەو بەیانییەی پێغەمبەر(ﷺ) گواستمییەوە هاتە ژوورەوە بۆ لام، لەسەر جێگەکەم دانیشت وەك دانیشتنی تۆ لەسەر ئەم جێگەیەم، چەند جارییەیەك دەفیان لێ دەدا، باب و باپیرانی خۆیان دەلاواندەوە کە لە بەدردا کوژرابوون، تا جاریەیەك وتی: پێغەمبەرێکمان لەناودایە دەزانێ سبەینێ چی لە دووتوێدایە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەو جۆرە مەڵێ، ئەوە بڵێ پێشتر دەتوت).**

**٢٣٧٠-** (خ) عَنْ عائِشَةَ: أَنَّهَا زَفَّتِ امْرَأَةً إِلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ نَبِيُّ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(يَا عائِشَةُ، ما كانَ مَعَكُمْ لَهْوٌ؟ فَإِنَّ الأَنْصَارَ يُعْجِبُهُمُ اللَّهْوُ)**. [خ٥١٦٢]

**(خ) لە عائیشەوە: ئەو ئافرەتێکی گواستەوە بۆ پیاوێك لە ئەنصار، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عائیشە، چ جۆرە لەهوێکتان لەگەڵ بوو؟ چونکە ئەنصار بە لەهوەوە سەرسامن).**

**٢٣٧١-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ حَاطِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(فَصْلُ مَا بَيْنَ الْحَلاَلِ وَالْحَرَامِ: الدُّفُّ، وَالصَّوْتُ فِي النِّكَاحِ)**. [ت١٠٨٨/ ن٣٣٦٩/ جه١٨٩٦]

* صحيح.

لە محەمەدی کوڕی حاتیبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(جیاکەرەوەی نێوان حەلاڵ و حەرام[1]: دەف لێدان و دەنگە دەنگی هاوسەرگیرییەکەیە)**.

## ٢١- دەروازەی: مەرج لە هاوسەرگیریدا

**٢٣٧٢-** (ق) عَنْ عَقْبَةَ بْنِ عامِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**أَحَقُّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ ما اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ**). [خ٢٧٢١/ م١٤١٨]

(ق) لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لەپێشترین مەرجێك وەفای پێ بکەن ئەوەیە داوێنتان پێ حەلاڵ کردووە[2])**.

## ٢٢- دەروازەی: ڕەچاوکردنی گونجاویی و شیاویی تەمەنی نێوان ژن و پیاو

**٢٣٧٣-** عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: خَطَبَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ رضي الله عنهما فَاطِمَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّهَا صَغِيرَةٌ**)، فَخَطَبَهَا عَلِيٌّ فَزَوَّجَهَا مِنْهُ. [ن٣٢٢١]

* صحيح الإسناد.

لە بورەیدەوە، وتی: ئەبوبەکر و عومەر(خوایان لێ رازی بێت) داوای فاتیمەیان کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەو بچووکە)**، عەلی داوای کرد و لێی مارە کرد.

## ٢٣- دەروازەی: ڕاوێژکردن بە ئافرەت[3] دەربارەی هاوسەرگیری کچەکەی

**٢٣٧٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**آمِرُوا النِّسَاءَ فِي بَنَاتِهِنَّ**). [د٢٠٩٥]

* ضعفه الألباني، وحسنه شعيب.

---

[1] جیاکەرەوەی نێوان حەلاڵ و حەرام: واتە خەڵکی بۆیان ئاشکرابێت ئایا ئەو پیاوە بە حەلاڵی دەچێتە لای ئەو ئافرەتە یان بە حەرامی-و

[2] واتە: ئەو مەرج و مارەییەی لە نێوان ژن و پیاوەکەدا بریاری لەسەر دراوە-و

[3] واتە: پیاو راوێژ بە ژنەکەی خۆی بکات دەربارەی بەشوودانی کچەکەی-و

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(راوێژ بە ئافرەتان بکەن دەربارەی کچەکانیان).**

**٢٣٧٥**– عَنْ أَنَسٍ قَالَ: خَطَبَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى جُلَيْبِيبٍ امْرَأَةً مِنَ الْأَنْصَارِ إِلَى أَبِيهَا، فَقَالَ: حَتَّى أَسْتَأْمِرَ أُمَّهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(فَنَعَمْ إِذاً)**. قَالَ: فَانْطَلَقَ الرَّجُلُ إِلَى امْرَأَتِهِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهَا، فَقَالَتْ: لَاهَا اللهِ إِذاً، مَا وَجَدَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلاَّ جُلَيْبِيباً؟!... وذكر الحديث. [حم١٢٣٩٣]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ئافرەتێکی لە ئەنصار بۆ جولەیبیب لە باوکی کچەکە داوا کرد، پیاوەکە وتی: با راوێژ بە دایکی بکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (کەوابوو کارێکی باشە)، وتی: پیاوەکە رۆیشت بۆ لای ژنەکەی و ئەوەی بۆ باس کرد، ژنەکە وتی: نە، سوێند بە خودا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەسی نەبینییەوە جولەیبیب نەبێت؟...فەرموودەکەی باس کرد.**

## ٢٤- دەروازەی: وەلی لە هاوسەرگیریدا

**٢٣٧٦**– عَنْ أَبِي مُوسَى: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ)**.

* صحيح. [د٢٠٨٥/ ت١١٠١/ جه١٨٨١/ مي٢٢٢٨]

لە ئەبی موساوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هاوسەرگیری تەنها بە وەلییە[1])**.

**٢٣٧٧**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَعَائِشَةَ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ)**.

لە ئیبن عەباس و عائیشەوە، وتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هاوسەرگیری تەنها بە وەلییە).**

[1] "وەلی" واتە: باوك و باپیر و برا–و

- وَفِي حَدِيثِ عَائِشَةَ: (وَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لاَ وَلِيَّ لَهُ). [جه١٨٨٠]

* صحيح.

**لە فەرموودەكەی عائیشەدا: (سوڵتان[١] وەلی كەسێكە وەلی نەبێت).**

## ٢٥- دەروازەی: شایەتگرتن لە هاوسەرگیریدا

**٢٣٧٨**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ. [ت١١٠٤]

* قال الترمذي صحيح موقوفاً.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: هاوسەرگیری تەنها بە بەڵگەوەیە[٢].**

**٢٣٧٩**- عَنِ الْحَسَنِ وَسَعِيدِ بْنِ الْمسَيَّبِ أَنَّ عُمَرَ ﷺ قَالَ: لا نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ وشَاهِدَيْ عَدْلٍ.

* إسناده صحيح. [هق٧/١٢٦]

**لە حەسەن و سەعیدی كوڕی موسەییەبەوە: عومەر(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: هاوسەرگیری تەنها بە وەلی و دوو شایەتی دادپەروەرەوەیە.**

## ٢٦- دەروازەی: وتاری هاوسەرگیری

**٢٣٨٠**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: عَلَّمَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خُطْبَةَ الْحَاجَةِ: (إِنْ الْحَمْدَ لِلَّهِ، نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، مَنْ يَهْدِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا﴾ [النساء:١].

---

[١] "سوڵتان" واتە: قازی، یان وەلی ئەمری موسڵمانان–و

[٢] "بە بەڵگەوە" واتە: شایەت–و

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ١٠٢﴾ [آل عمران: ١٠٢].

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ٧٠ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ٧١﴾ [الأحزاب: ٧٠- ٧١]، واللفظ لأبي داود. [د٢١١٨/ ت١١٠٥/ ن١٤٠٣/ جه١٨٩٢/ مي٢٢٤٨]

* صحيح.

له عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری پێویستی فێر کردین: (**"إنِ الحمد لله، نستعينه ونستغفره، ونعوذ به من شرور أنفسنا، من يهد الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله"**).

**ئەی كۆمەڵی باوەڕداران:** ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ [النساء:١].

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ١٠٢﴾ [آل عمران: ١٠٢].

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ٧٠ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ٧١﴾ [الأحزاب: ٧٠- ٧١]، **لەفزەكە بۆ ئەبی داود دەگەڕێتەوە.**

## ٢٧- دەروازەی: پیرۆزبایی هاوسەرگیری

**٢٣٨١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا رَفَّأَ الْإِنْسَانَ إِذَا تَزَوَّجَ قَالَ: (بَارَكَ اللهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ).

* صحيح. [د٢١٣٠/ ت١٠٩١/ جه١٩٠٥/ مي٢٢٢٠]

**لە ئەبی هورەیرەوە: گەر پێغەمبەر(ﷺ) پیرۆزبایی لە مرۆڤێك بكردبایە هاوسەرگیری كردبێت دەیفەرموو: ("بارك الله لك، وبارك عليك، وجمع بينكما في خير").**

## ٢٨- دەروازەی: ئەوەی پیاوەکە دوعای پێ دەکات کاتێ دەچێتە ژوورەوە بۆ لای خانەوادەکەی

**٢٣٨٢**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا تَزَوَّجَ أَحَدُكُمْ امْرَأَةً، أَوْ اشْتَرَى خَادِماً، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا، وَخَيْرَ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ). [د٢١٦٠/ جه١٩١٨]

* حسن.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك کرد، یان خزمەتکارێکی کڕی، با بڵێت: خودایە من داوای خێری ئەم کەسە دەکەم و داوای ئەو خێرە دەکەم ئەوت لەسەر بارهێناوە، پەنات پێ دەگرم لە شەڕی ئەم کەسە و ئەو شەڕەی ئەوت لەسەرلا بارهێناوە).**

## ٢٩- دەروازەی: کەسێك هاوسەرگیری بکات و ناوی مارەیی نەهێنێت

**٢٣٨٣**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: فِي رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً، فَمَاتَ عَنْهَا، وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا، وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا الصَّدَاقَ، فَقَالَ: لَهَا الصَّدَاقُ كَامِلاً، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ، وَلَهَا الْمِيرَاثُ.

فَقَالَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَضَى بِهِ فِي بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ.

* صحيح. [د٢١١٤/ ت١١٤٥/ ن٣٣٥٤/ جه١٨٩١/ مي٢٢٩٢]

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە: دەربارەی پیاوێك هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك کردبێت و پیاوەکە مردبێت و نەچووبێتە لای و مارەیی بۆ دیاری نەکردبێت، وتی: مارەیی تەواوی بۆ هەیە و عیددەی لەسەرە و میراتی دەکەوێت.**

**مەعقیلی کوڕی سینان وتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەوە قەزاوەتی کرد دەربارەی بیروەعی کچی واشیق.**

## ٣٠- دەروازەی: هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتی سك و زاكەر

**٢٣٨٤-** عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: إِنِّي أَصَبْتُ امْرَأَةً ذَاتَ حَسَبٍ وَجَمَالٍ، وَإِنَّهَا لاَ تَلِدُ، أَفَأَتَزَوَّجُهَا؟ قَالَ: (**لاَ**)، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ فَنَهَاهُ، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ، فَقَالَ: (**تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ، فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ**). [د٢٠٥٠/ ن٣٢٢٧]

* حسن صحيح.

**لە مەعقیلی كوڕی یەسارەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: مـن تووشـی ئـافرەتێكی خـاوەن بنەماڵـە و جـوانی بـووم، ئـەو منـداڵی نابێـت، ئایـا هاوسەرگیری لەگەڵ بكەم؟ فەرمووی: (نـەخێر)، بـۆ جـاری دووەم هاتـەوە بـۆ لای و دیسان نەهی لێكردەوە، بۆ جاری سێیەم هاتەوە و فەرمووی: (هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتی بەسۆز و بەزەیی و سك و زاكەر بكەن، چونكە من بە زۆری ئێوە شانازای دەكەم بەسەر ئومەتاندا).**

## ٣١- دەروازەی: هاوسەرگیری ئافرەتی زیناكار

**٢٣٨٥-** عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما: أَنَّ امْرَأَةً كَانَ يُقَالُ لَهَا أُمُّ مَهْزُولٍ، وَكَانَتْ تَكُونُ بِأَجْيَادَ، وَكَانَتْ مُسَافِحَةً، كَانَتْ يَتَزَوَّجُهَا الرَّجُلُ وَتَشْتَرِطُ لَهُ أَنْ تَكْفِيَهُ النَّفَقَةَ، فَسَأَلَ رَجُلٌ عَنْهَا النبي صلّى الله عليه وسلّم أَيَتَزَوَّجُهَا؟ فَقَرَأَ نَبِيُّ الله صلّى الله عليه وسلّم أَوْ أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً﴾ [النور: ٣]. هذا لفظ البيهقي.

* حسن صحيح. [د٢٠٥١/ت٣١٧٧/ن٣٢٢٨/هق١٥٣/٧]

**لە عەبدوڵای كوڕی عەمرەوە(خوایان لێ رازی بێـت): ئافرەتێـك پێـی دەوتـرا "أم مهزول"، ئەو لە "أجیاد" بوو، ئەو ئافرەتێكی لەشفرۆش بـوو، پیاوێـك هاوسـەرگیری لەگەڵ دەكرد و مەرجی خەرجی بۆ كردنی تەواوی لەسەر دەگرت، پیاوێـك دەربـارەی ئـەو ئافرەتـە پرسـیاری لـە پێغەمبـەر(ﷺ) كـرد، ئایـا هاوسـەرگیری لەگـەڵ بكـات؟ پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی خوێندەوە یان ئەم ئایەتەی بۆ سەر دابەزی: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً﴾ [النور: ٣]. ئەمە لەفزی بەیهەقییە.**

## ٣٢- دەروازەی: "المُحَلِّل والمُحَلَّل لَه"[(١)]

**٢٣٨٦**– عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَعَنَ اللهُ الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ)**. [د٢٠٧٦/ ت١١١٩/ جه١٩٣٥]

**لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خودا نەفرەتی کردووە لە "المُحَلِّلَ والمُحَلَّلَ له").**

- ولفظ الترمذي وابن ماجه: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ.

* صحيح.

**لەفزەکەی ترمزی و ئیبن ماجە: (پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەفرەتی کرد لە "المُحَلِّلَ والمُحَلَّلَ له").**

## ٣٣- دەروازەی: ئەو پیاوەی موسڵمان دەبێت و زیاتر لە چوار ژنی هەیە، یان دوو خوشك ژنەیەتی

**٢٣٨٧**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ غَيْلَانَ بْنَ سَلَمَةَ الثَّقَفِيَّ، أَسْلَمَ وَلَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَسْلَمْنَ مَعَهُ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَتَخَيَّرَ أَرْبَعاً مِنْهُنَّ. [ت١١٢٨/ جه١٩٥٣]

* صحيح.

**لە ئیبن عومەرەوە: غەیلانی کوڕی سەلەمەی سەقەفی موسڵمان بوو و دە ژنی لەسەردەمی نەفامی لە لا بوو، ئەوانیش لەگەڵی موسڵمان بوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد چوار لە ژنەکانی هەڵبژێرێت.**

---

[(١)] **"المحلل" ئەو کەسەیە ژنی پیاوێك مارە دەکات کە سێ بە سێ تەڵاقیداوە تاکو تەڵاقی بداتەوە و مێردی یەکەم مارەی بکاتەوە، "المحلل له" بریتییە لە مێردی یەکەمی ژنەکە کە سێ بە سێ تەڵاقی ژنەکەی خۆی داوە، لە کوردەواریدا بەم جۆرە هاوسەرگیرییە دەوترێت مارە بە جاش.**

**٢٣٨٨**- عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ فَيْرُوزٍ الدَّيْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَسْلَمْتُ وَتَحْتِي أُخْتَانِ، قَالَ: (**طَلِّقْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ**).

لە زەحاکی کوڕی فەیروزی دەیلەمییەوە، لە باوکییەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، من موسڵمان بووم و دوو ئافرەتی خوشك ژنمن، فەرمووی: **(کامیان دەخوازی تەڵاقی بدە)**.

- ولفظ الترمذي: (**اخْتَرْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ**).　　　　[د٢٢٤٣/ ت١١٣٠/ جه١٩٥١]

* حسن.

لەفزەکەی ترمزی: **(کامیان دەخوازی هەڵیبژێرە)**.

## بەشی دووەم

# هاوسەری و تێکەڵاوی نێوان دوو هاوسەرەکە

## ١- دەروازەی: دادپەروەری لە نێوان ژنەکان

**٢٣٨٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ، فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ**).

* صحيح. [د٢١٣٣/ ت١١٤١/ ن٣٩٥٢/ جه١٩٦٩/ مي٢٢٥٢]

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**هەر کەس دوو ژنی هەبێت و مەیلی بە لای یەکێکیاندا هەبێت لە رۆژی قیامەت دێت و لایەکی خواربووەتەوە**).

**٢٣٩٠-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقْسِمُ فَيَعْدِلُ، وَيَقُولُ: (**اللَّهُمَّ هَذَا قَسْمِي فِيمَا أَمْلِكُ، فَلاَ تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ وَلاَ أَمْلِكُ**)؛ يَعْنِي: الْقَلْبَ.

* قال شعيب: رجاله ثقات. [د٢١٣٤/ ت١١٤٠/ ن٣٩٥٣/ جه١٩٧١/ مي٢٢٥٣]

لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دابەشی دەکرد[١] و دادپەروەری ئەنجام دەدا و دەیفەرموو: (**خودایە، ئەمە دابەش کردنمە لەوەی لە توانا و دەسەڵاتدایە، لۆمەم مەکە لەوەدا لە توانا و دەسەڵاتی تۆدایە و لە توانا و دەسەڵاتی مندا نییە**)، واتە: دڵ.

---

[١] واتە: شەوەکانی دابەش دەکرد، خەرجی و رووپێدان و سۆز و رێزی وەك یەك بۆ دابەش دەکردن-و.

## ٢- دەروازەی: ژن بە مۆڵەتی مێردەکەی بەڕۆژوو دەبێت

**٢٣٩١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إلاَّ بِإذْنِهِ، وَلاَ تَأْذَنَ فِي بَيْتِهِ إلاَّ بِإِذْنِهِ، وَمَا أَنْفَقَتْ مِنْ نَفَقَةٍ عَنْ غَيْرِ أَمْرِهِ، فَإِنَّهُ يُؤَدَّى إِلَيْهِ شَطْرُهُ**). [خ٥١٩٥ (٢٠٦٦)/ م١٠٢٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(حەڵاڵ نییە بۆ ژنێك بەڕۆژوو بێت و مێردەکەی ئامادە بێت[1] مەگەر بە مۆڵەتی ئەو، مۆڵەت نادات بە هاتنە ژوورەوەی کەسێك مەگەر بە مۆڵەتی ئەو، هەر خەرجییەك خەرج بکات بەبێ فەرمانی ئەو نیوەی[2] بۆ مێردەکەی دەگەڕێتەوە).**

## ٣- دەروازەی: کردنی "بسم الله" کاتی جووتبوونی ژن و مێرد

**٢٣٩٢-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ فَقَالَ: بِاسْمِ الله. اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذلِكَ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَداً**).

[خ٧٣٩٦ (١٤١)/ م١٤٣٤]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچێتە لای خانەوادەکەی و وتی "بسم الله، اللهم جنبنا الشیطان وجنّب الشیطان ما رزقتنا" گەر لەوەدا منداڵیان بۆ بڕیار درابێت هەرگیز شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێت).**

---

[1] واتە: مێردەکەی لە ماڵەوە بێت-و.

[2] واتە: نیوەی خێرەکەی-و.

## ٤- دەروازەی: مافی ژن لە مانەوەی شەو لە هاوسەرگیریدا

**٢٣٩٣-** (ق) عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ إِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ الْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعاً وَقَسَمَ، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى الْبِكْرِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثاً ثُمَّ قَسَمَ.

قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: وَلَوْ شِئْتُ لَقُلْتُ: إِنَّ أَنَساً رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم.

[خ٥٢١٤ (٥٢١٣)/ م١٤٦١]

**(ق) لە ئەبی قیلابەوە، لە ئەنەسەوە، وتی: لە سوننەتە گەر پیاو هاوسەرگیری کرد لەگەڵ کچ بەسەر بێوەژندا حەوت شەو لای بمێنێتەوە و پاشان شەوەکان دابەش بکات، گەر هاوسەرگیری لەگەڵ بێوەژن کرد بەسەر کچدا سێ شەو لای دەمێنێتەوە و پاشان شەوەکان دابەش دەکات.**

**ئەبو قیلابە وتی: گەر بمەوێت دەڵێم: ئەنەس بەرزی کردەوە[1] بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).**

## ٥- دەروازەی: ژن رۆژەکەی خۆی بدات بە هەوێکەی

**٢٣٩٤-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا لِعَائِشَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَقْسِمُ لِعَائِشَةَ بِيَوْمِهَا وَيَوْمِ سَوْدَةَ.

[خ٥٢١٢ (٢٥٩٣)/ م١٤٦٣]

**(ق) لە عائیشەوە: سەودەی کچی زەمعە رۆژەکەی خۆی دا بە عائیشە، پێغەمبەر(ﷺ) رۆژەکەی خۆی و رۆژەکەی سەودەی دەدا بە عائیشە.**

- وفي رواية للبخاري: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَرَادَ سَفَراً، أَقْرَعَ بينَ نسائه، فأيَّتُهنَّ خرجَ سَهْمُهَا خرجَ بها مَعَهُ، وَكَانَ يَقْسِمُ لِكلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ يَوْمَها وَلَيْلَتَها، غيرَ أن سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا لِعَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، تَبْتَغِي بِذلِكَ رِضَا رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم. [خ٢٥٩٣]

---

[1] واتە: فەرموودەکە قسەی ئەنەس نییە و ئەو بۆ لای پێغەمبەر بەرزیکردەوە—و.

**لە ریوایەتێكی بوخاریدا: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیویستبا سەفەرێك بكات لە نێوان ژنەكانی قورعەی دەكرد، كامیان قورعەكەی بۆ دەرچووبا لەگەڵ خۆی دەیبردە دەرەوە، بۆ هەریەك لە ژنەكانی رۆژەكە و شەوەكەی بۆ دادەنا، بەڵام سەودەی كچی زەمعە رۆژەكە و شەوەكەی خۆی بە عائیشە –هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)– بەخشی، بەوە دەیویست رازی بوونی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەدەست بهێنێت.**

## ٦- دەروازەی: غیرەی هەوێساری

**٢٣٩٥**– (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ: أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ لِي ضَرَّةً، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ إِنْ تَشَبَّعْتُ مِنْ زَوْجِي غَيْرَ الَّذِي يُعْطِينِي؟ فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ، كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ**).　　[خ٥٢١٩/ م٢١٣٠]

**(ق) لە ئەسمای كچی ئەبوبەكری صدیقەوە: ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من هەوێیەكم هەیە، ئایا گوناهم لەسەرە گەر زۆرتر لەوە نیشان بدەم مێردەكەم پێم دەدات؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەو كەسەی زیاتر لەوەی پێیدەدرێت نیشان دەدات وەك ئەو كەسە وایە دوو پۆشاكی زووری[1] پۆشیوە).**

**٢٣٩٦**– (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ، فَأَرْسَلَتْ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ بِصَحْفَةٍ فِيهَا طَعَامٌ، فَضَرَبَتِ الَّتِي النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي بَيْتِهَا يَدَ الْخَادِمِ، فَسَقَطَتِ الصَّحْفَةُ، فَانفَلَقَتْ، فَجَمَعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِلَقَ الصَّحْفَةِ، ثُمَّ جَعَلَ يَجْمَعُ فِيهَا الطَّعَامَ الَّذِي كَانَ فِي الصَّحْفَةِ، وَيَقُولُ: (**غارَتْ أُمُّكُمْ**) ! ثُمَّ حَبَسَ الْخَادِمَ حَتَّى أُتِيَ بِصَحْفَةٍ مِنْ عِنْدِ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا، فَدَفَعَ الصَّحْفَةَ الصَّحِيحَة إِلَى الَّتِي كُسِرَتْ صَحْفَتُهَا، وَأَمْسَكَ الْمَكْسُورَةَ فِي بَيْتِ الَّتِي كَسَرَتْ.　　[خ٥٢٢٥ (٢٤٨١)]

---

(١) واتە: دوو پۆشاكی درۆ–و.

(خ) لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لای یەکێك لە ژنەکانی بوو[1]، یەکێك لە دایکانی باوەڕداران قاپێکی بۆ نارد خواردنی تێدا بوو، ئەو ژنەی پێغەمبەری(ﷺ) لە لا بوو کێشای بە دەستی خزمەتکارەکەدا و قاپەکە بەربوویەوە و بوو بە چەند پارچەیەك، پێغەمبەر(ﷺ) پارچەکانی قاپەکەی کۆکردەوە و خواردنەکەی تێدا کۆدەکردەوە کە لە قاپەکەدا بوو و دەیفەرموو: **(دایکتان غیرەت گرتی)**، پاشان خزمەتکارەکەی راگرت تا پێغەمبەر قاپێکی لای ئەو ژنە بۆ هێنا لە ماڵەکەیدا بوو، قاپە نەشکاوەکەی دا بەو ژنەی قاپەکەی شکابوو و شکاوەکەی لە ماڵی ئەو ژنە دانا قاپەکەی شکاند.

## ٧- دەروازەی: وەسێت کردن بە چاکە لەگەڵ ئافرەتان و باش مامەڵە کردنیان

**٢٣٩٧-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ، فَإِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاَهُ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ، فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ)**. [خ٣٣٣١/ م١٤٦٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(وەسێتتان بۆ دەکەم بە ئافرەتان، ئافرەت لە پەراسوو دروستکراوە، لارترین شت لە پەراسوودا سەرەوەیەتی، گەر بچی راستی بکەیەوە دەیشکێنی، گەر وازیلێبهێنی بەردەوام خوار دەبێت، بۆیە وەسێتتان بۆ دەکەم بە ئافرەتان)**.

**٢٣٩٨-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً، إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقاً رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ)، أَوْ قَالَ: (غَيْرَهُ)**. [م١٤٦٩]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پیاوی باوەڕدار ئافرەتی باوەڕدار نابوغزێنێت، گەر لێیەوە رەوشتێك ناپەسەندە، لێیەوە رەوشتێك پەسەندە[2])**.

---

[1] ئەو ژنە بریتی بوو لە خاتوو عائیشە-و.

[2] واتە: گەر رەوشتێکی ئەوت بە دڵ نییە، رەوشتێکی تری ئەوت بە دڵە-و.

**٢٣٩٩**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَاناً أَحْسَنُهُمْ خُلُقاً، وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِهِمْ خُلُقاً**). [د٤٦٨٢/ ت١١٦٢/ مي٢٨٣٤]

* حسن صحيح.

له ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کامڵترین باوەڕدار لە رووی ئیمانەوە ئەو کەسەیانە رەوشتی جوانتر و باشترە، باشترینی ئێوە باشترینتانە بۆ ئافرەتەکانتان لە رووی رەوشتەوە)**.

**٢٤٠٠**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ، وَأَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي**). [جه١٩٧٧]

* صحيح.

له ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(باشترینی ئێوە باشترینتانە بۆ خانەوادەکەی، من باشترینی ئێوەم بۆ خانەوادەکەم)**.

## ٨- دەروازەی: باشترین ئافرەت ئەو ئافرەتەیە گرنگی بە مێردەکەی و منداڵەکانی دەدات

**٢٤٠١**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**نِسَاءُ قُرَيْشٍ خَيْرُ نِسَاءٍ رَكِبْنَ الإِبِلَ، أَحْنَاهُ عَلَى طِفْلٍ، وَأَرْعَاهُ عَلَى زَوْجٍ فِي ذَاتِ يَدِهِ**).

يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ عَلَى إِثْرِ ذلِكَ: وَلَمْ تَرْكَبْ مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ بَعِيراً قَطُّ. [خ٣٤٣٤/ م٢٥٢٧]

(ق) له ئەبی هورەیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(ئافرەتانی قورەیش باشترین ئافرەتێکن سواری حوشتر بووبن، بەسۆزترینن بۆ منداڵ و زۆرترین چاودێرییان هەیە بۆ بەری رەنجی هاوسەر)**.

ئەبو هورەیرە دەیوت: لەسەر ئەوە: مەریەمی کچی عیمران هەرگیز سواری حوشتر نەبووە.

## ٩- دەروازەی: خزمەتی پیاو لە خانەوادەکەیدا

**٢٤٠٢-** (خ) عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ: مَا كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَصْنَعُ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَكُونُ فِي مَهْنَةِ أَهْلِهِ ـ تَعْنِي: خِدْمَةَ أَهْلِهِ ـ فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ، خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ. [خ٦٧٦]

**(خ) لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە، وتی: پرسیارم کرد لە عائیشە: پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵەوە چی دەکرد؟ وتی: ئەو لە کاری خانەوادەکەیدا بوو-واتە خزمەتی خانەوادەکەی- گەر نوێژ ئامادەبوایە دەچووە دەرەوە بۆ نوێژ.**

**٢٤٠٣-** عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قِيلَ لِعَائِشَةَ: مَا كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَصْنَعُ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: كَمَا يَصْنَعُ أَحَدُكُمْ، يَخْصِفُ نَعْلَهُ وَيُرَقِّعُ ثَوْبَهُ. [حم٢٤٧٤٩]

* صحيح.

**لە هیشامەوە، لە باوکییەوە، وتی: بە عائیشە وترا: پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵەوە چی دەکرد؟ وتی: ئەوەی دەکرد یەکێك لە ئێوە دەیکەن، نەعلەکەی خۆی چاك دەکرد و پۆشاکەکەی پینە دەکرد.**

## ١٠- دەروازەی: بەسەرهاتی ئوم زەرع

**٢٤٠٤-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَلَسَ إِحْدَى عَشْرَةَ امْرَأَةً، فَتَعَاهَدْنَ، وَتَعَاقَدْنَ أَنْ لاَ يَكْتُمْنَ مِنْ أَخْبَارِ أَزْوَاجِهِنَّ شَيْئاً.

[فَذَكَرَتْ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ طَرِيْقَةَ مُعَامَلَةِ زَوْجِها لَهَا، وَكَانَ أَفْضَلَ هَؤُلاءِ الأَزْواجِ: أَبُو زَرْعٍ].

قَالَتْ عَائِشَةُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(كُنْتُ لَكِ كَأَبِي زَرْعٍ لأُمِّ زَرْعٍ)**.

[خ ٥١٨٩/ م٢٤٤٨]

**(ق) لە عائیشەوە، وتی: یازدە ئافرەت دانیشتن و پەیمانیانبەست و بەڵێنیان دا شتێك لە هەواڵی مێردەکانیان لە یەکتر نەشارنەوە.**

[هەریەك لەوانە ڕێگەی مامەڵەکردنی مێردەکەی بۆ ئەو باس کرد، باشترین مێرد لەناو ئەوانەدا بریتی بوو لە ئەبو زەرع].

عائیشە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(من بۆ تۆ وەك ئەبو زەرع وام بۆ ئوم زەرع).**

## ١١- دەروازەی: حیجاب و ڕۆیشتنە دەرەوەی ئافرەتان بۆ پێویستییەکانیان

**٢٤٠٥**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم كُنَّ يَخْرُجْنَ بِاللَّيْلِ، إِذَا تَبَرَّزْنَ، إِلَى الْمَنَاصِعِ. وَهُوَ صَعِيدٌ أَفْيَحُ. فَكَانَ عُمَرُ يَقُولُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: احْجُبْ نِسَاءَكَ، فَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يَفْعَلُ. فَخَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ، زَوْجُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم لَيْلَةً مِنَ اللَّيَالِي، عِشَاءً، وَكَانَتِ امْرَأَةً طَوِيلَةً، فَنَادَاهَا عُمَرُ: أَلاَ قَدْ عَرَفْنَاكِ يَا سَوْدَةُ! حِرْصاً عَلَى أَنْ يُنْزَلَ الْحِجَابُ، فَأَنْزَلَ اللهُ آيةَ الحِجَاب. [خ١٤٦/ م٢١٧٠]

[وانظر في فرض الحجاب: **٣٦٤٦**.

وانظر في الكاسيات العاريات: **٢٧٩٢**].

**(ق) لە عائیشەوە: هاوسەرانی پێغەمبەر(ﷺ) بە شەو بۆ چوونە سەر ئاو دەردەچوون بۆ "المصانع"-ئەوەش بریتییە لە "صعید أفیح"- عومەر بە پێغەمبەری(ﷺ) دەوت: ڕێگری بکە لە ژنەکانت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی نەدەکرد، سەودەی کچی زەمعە، هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) عیشای شەوێك لە شەوەکان ڕۆیشتە دەرەوە، ئەو ئافرەتێکی درێژ بوو، عومەر بانگی لێکرد: دەزانی ئێمە تۆمان ناسی، ئەی سەودە، ئەوەش وەك پێداگری لەسەر ئەوەی حیجاب دابەزێت، خودا ئایەتی حیجابی دابەزاند.**

## ١٢- دەروازەی: حەرامکردنی کۆچکردن لە جێگەی نووستنی هاوسەر

**٢٤٠٦**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ، فَأَبَتْ، فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا، لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ).**

[خ٣٢٣٧/ م١٤٣٦]

(ق) لـە ئـەبی هورەیرەوە (خـوا لێـی رازی بێـت)، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر پیاو ژنەکەی بۆ سەر جێگە بانگ بکات و بە گوێی نەکات ئەو شەوە خەشم و تووڕەیی لەسەرە، فریشتەکان نەفرەتی لێ دەکەن تا ڕۆژ دەبێتەوە)**.

**٢٤٠٧**– عَنْ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا الرَّجُلُ دَعَا زَوْجَتَهُ لِحَاجَتِهِ، فَلْتَأْتِهِ، وَإِنْ كَانَتْ عَلَى التَّنُّورِ)**. [ت١١٦٠]

* صحيح.

له تەلقی کوڕی عەلییـەوە، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: **(گـەر پیـاو ژنەکەی بانگ بکات بۆ پێویستی خۆی با بچێت بۆ لای، با لەسەر تەنووریش بێت)**.

## ١٣- دەروازەی: ئەوەی ناپەسەندە لە لێدانی ئافرەتان

**٢٤٠٨**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زمعة قَالَ: خطب رَسُول اللهِ صلّى الله عليه وسلّم... وَذَكَرَ النِّسَاءَ فَقَالَ: **(يَعْمَدُ أَحَدُكُمْ يَجْلِدُ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ، فَلَعَلَّهُ يُضَاجِعُهَا مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ)**!

[خ٤٩٤٢ (٣٣٧٧)/ م٢٨٥٥]

(ق) له عەبدوڵای کوڕی زەمعـەوە، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) وتـاری دا... و باسی ئافرەتانی کرد و فەرمووی: **(یەکێك لە ئێوە دەچێت ژنەکەی بە قەمچیکاری بەندە قەمچیکاری دەکات، لەوانەیە لە کۆتایی ڕۆژەکەدا سەرجێیی لەگەڵ بکات[1])**.

**٢٤٠٩**– عَنْ إِيَاسِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَضْرِبُوا إِمَاءَ اللهِ)**، فَجَاءَ عُمَرُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: ذَئِرْنَ النِّسَاءُ عَلَى أَزْوَاجِهِنَّ، فَرَخَّصَ فِي ضَرْبِهِنَّ، فَأَطَافَ بِآلِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نِسَاءٌ كَثِيرٌ، يَشْكُونَ

[1] واتە: ڕۆژەکەی لێیدەدات و شـەوەکەی دەچـێتە لای، ئـەوە کـارێکی ناپەسـەندە، چـونکە هاوسەری کردنی ژن و پیاو لەگەڵ یەکتر سۆز و خۆشەویستی پێویستە-و.

أَزْوَاجَهُنَّ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (لَقَدْ طَافَ بِآلِ مُحَمَّدٍ نِسَاءٌ كَثِيرٌ، يَشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ، لَيْسَ أُولَئِكَ بِخِيَارِكُمْ). [د٢١٤٦/ جه١٩٨٥/ مي٢٢٦٥]

* صحيح.

[وانظر في أن المرأة لا تضرب إلا إذا أدخلت رجلاً غريباً إلى بيتها، أو أتت بفاحشة: **٢٤٢٥**. وانظر: **٢٤٢٤**].

**لە ئیاسی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەبی زوبابەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (مەدەن لە کەنیزەکەکانی خودا)، عومەر هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: ئافرەتان بۆ سەر پیاوەکانیان بوێرییان داوەتە بەر خۆیان، بۆیە مۆڵەتی لێدانیانی دا، ئافرەتانێکی زۆر ئالی پێغەمبەری خودایان(ﷺ) دەورەدا سکاڵایان لە مێردەکانیان هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئافرەتانێکی زۆر سەردانی ئالی محەمەد دەکەن و سکاڵایان هەیە لە مێردەکانیان، ئەو پیاوانە لە چاکانی ئێوە نین).**

## ١٤- دەروازەی: فیتنەی پیاوان بە هۆی ئافرەتانەوە

**٢٤١٠**- (ق) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قال: (**مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ**). [خ٥٠٩٦/ م٢٧٤٠]

**(ق) لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (لەدوای خۆم فیتنەیەکم بەجێنەهێڵاوە زیانبەخشتر بۆ سەر پیاوان لە ئافرەتان).**

**٢٤١١**- (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ: (**إِنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ، وَإِنَّ الله مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيهَا، فَيَنْظُرُ كَيْفَ تَعْمَلُونَ؟ فَاتَّقُوا الدُّنْيَا، وَاتَّقُوا النِّسَاءَ فَإِنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَتْ فِي النِّسَاءِ**). [م٢٧٤٢]

**(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (دنیا شیرین و سەوزە، خودا ئێوەی تێدا کردووە بە جێنشین تا تەماشا بکات ئێوە چی دەکەن،**

**بۆیە خۆتان لە دنیا بپارێزن، و خۆتان لە ئافرەت بپارێزن، چونکە یەکەم فیتنەی بەنی ئیسرائیل لە ئافرەتەوە بوو).**

## ١٥- دەروازەی: ئاگادارتان دەکەمەوە لە چوونەژوورەوە بۆ لای ئافرەتان

**٢٤١٢-** (ق) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ**)، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَرَأَيْتَ الحَمْوَ؟ قَالَ: (**الحَمْوُ: المَوْتُ**). [خ٥٢٣٢/ م٢١٧٢]

(ق) لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئاگادارتان دەکەمەوە لە چوونەژوورەوە بۆ لای ئافرەتان)**، پیاوێك لە ئەنصار وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی ئەگەر هێوەر بێت؟ فەرمووی: **(هێوەر مردنە)**.

**٢٤١٣-** (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَلاَ لاَ يَبِيتَنَّ رَجُلٌ عَنْدَ امْرَأَةٍ ثَيِّبٍ؛ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ نَاكِحاً، أَوْ ذَا مَحْرَمٍ**). [م٢١٧١]

(م) لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئاگادار بن نابێت پیاوێك لای ئافرەتێکی بێوەژن بمێنێتەوە، مەگەر هاوسەرگیرکەر بێت یان مەحرەمی بێت)**.

## ١٦- دەروازەی: هەر کەس ئافرەتێکی بینی با بچێتە لای خانەوادەکەی

**٢٤١٤-** (م) عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَأَى امْرَأَةً، فَأَتَى امْرَأَتَهُ زَيْنَبَ، وَهِيَ تَمْعَسُ مَنِيئَةً لَهَا، فَقَضَى حَاجَتَهُ. ثُمَّ خَرَجَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: (**إِنَّ الْمَرْأَةَ تُقْبِلُ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ، وَتُدْبِرُ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ، فَإِذَا أَبْصَرَ أَحَدُكُمُ امْرَأَةً فَلْيَأْتِ أَهْلَهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ يَرُدُّ مَا فِي نَفْسِهِ**). [م١٤٠٣]

(م) لە جابرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئافرەتێکی بینی، بۆیە هات بۆ لای خێزانەکەی، زەینەب، ئەو پێستەیەکی خۆشە دەکرد، پێغەمبەر پێویستی خۆی جێبەجێ کرد، پاشان ڕۆیشتە دەرەوە بۆ لای هاوەڵانی و فەرمووی: **(ئافرەت لە شێوەی شەیتان**

**دێت و لە شێوەی شەیتان دەڕوات، گەر یەکێك لە ئێوە ئافرەتێکی بینی با بچێت بۆ لای خانەوادەکەی، چونکە ئەو کارە بەرپەرچی ئەوە دەداتەوە لە نەفسیدایە).**

- وفي رواية: (إِذَا أَحَدُكُمْ أَعْجَبَتْهُ الْمَرْأَةُ، فَوَقَعَتْ فِي قَلْبِهِ، فَلْيَعْمِدْ إِلَى امْرَأَتِهِ؛ فَلْيُوَاقِعْهَا، فَإِنَّ ذَلِكَ يَرُدُّ مَا فِي نَفْسِهِ).

لە ریوایەتێکدا: **(گەر یەکێك لە ئێوە ئافرەتێك سەرسامی کرد و شتێك کەوتە ناو دڵییەوە با بچێت بۆ لای ژنەکەی و لەگەڵی جووت بێت، چونکە ئەو کارە بەرپەرچی ئەوە دەداتەوە لە نەفسیدایە).**

## ١٧- دەروازەی: ئافرەت ئافرەتی تر بۆ مێردەکەی وەسف ناکات

**٢٤١٥-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تُبَاشِرِ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ، فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا، كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا).** [خ٥٢٤٠]

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر ئافرەتێك بە ئافرەتێکی تر تێکەڵ بوو و بۆ مێردەکەی وەسفی کرد وەك ئەوە وایە مێردەکە تەماشای بکات).**

## ١٨- دەروازەی: دروستی "الغِيلَة"[1]

**٢٤١٦-** (م) عَنْ جُدَامَةَ بِنْتِ وَهْبٍ، أُخْتِ عُكَّاشَةَ قَالَتْ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي أُنَاسٍ، وَهُوَ يَقُولُ: **(لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الْغِيلَةِ، فَنَظَرْتُ فِي الرُّومِ وَفَارِسَ، فَإِذَا هُمْ يُغِيلُونَ أَوْلاَدَهُمْ، فَلاَ يَضُرُّ أَوْلاَدَهُمْ ذَلِكَ شَيْئاً).** [م١٤٤٢]

(م) لە جودامەی کچی وەهبەوە، خوشکی عوکاشە، وتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەناو کۆمەڵێك خەڵك ئامادە بووم، ئەو دەیفەرموو: **(ویستم نەهی لە**

[1] "الغيلة" بریتییە لە جووتبوون لەگەڵ ئافرەت کاتێك شیر بە منداڵ دەدات، ئیبن سەکیت دەڵێت: "الغيلة" ئەوەیە منداڵ شیر بدات و سکپڕیش بێت.

**"الغيلة" بکەم، تەماشای ڕۆم و فارسم کرد بینیم ئەوان غیلەی منداڵەکانیان دەکەن[1] و شتێك زیان بە منداڵەکانیان ناگات).**

## ١٩- دەروازەی: حەرامی بڵاوە پێکردنی نهێنی ئافرەت

٢٤١٧- (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ مِنْ أَشَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، الرَّجُلَ يُفْضِي إِلَى امْرَأَتِهِ، وَتُفْضِي إِلَيْهِ، ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا). [م١٤٣٧]

(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خراپترین مەنزیلەتی خەڵك لای خودا لە ڕۆژی قیامەت مەنزیلەتی پیاوێکە دەچێتە لای ژنەکە و ژنەکە دەچێتە لای[2] و پاشان نهێنی ژنەکەی بڵاوە پێ دەکات).**

- وفي رواية: (إِنَّ مِنْ أَعْظَمِ الأَمَانَةِ عِنْدَ اللهِ..) الحديث.

لە ڕیوایەتێکدا: (**مەزنترین ئەمانەت لە لای خودا**...فەرموودەکە).

## ٢٠- دەروازەی: حوکمی عەزل کردن[3]

٢٤١٨- (ق) عَنْ جابِرٍ قَالَ: كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٥٢٠٧/ م١٤٤٠]

**(ق) لە جابرەوە، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) عەزلمان دەکرد.**

- وفي رواية لهما: كُنَّا نَعْزِلُ والْقُرْآنُ يَنْزِلُ. [خ٥٢٠٨]

**لە ڕیوایەتێکی هەردووکیاندا: ئێمە عەزلمان دەکرد و قورئان دادەبەزی.**

---

[1] غیلەی منداڵەکانیان دەکەن: واتە کاتێك منداڵ لە سکی دایکدایە باوکەکە دەچێتە لای ئافرەتەکە.

[2] مەبەست باس کردنی ئەو خۆشی و چێژەیە لە کاتی جووتبوون لە نێوان ژن و پیاو ڕوودەدات.

[3] عەزل کردن: بریتییە لە دانەنان و نەڕژانی تۆوی پیاوەکە لە ڕەحمی ئافرەتەکەدا-و.

- وزاد في رواية لمسلم: لَوْ كَانَ شَيْئاً يُنْهَى عَنْهُ، لَنَهَانَا عَنْهُ الْقُرْآنُ.

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا ئەمە زیاد بووە: گەر شتێك نەهی لێبکرابا قورئـان نـەهی لێ دەکردین.**

- وفي رواية لمسلم: قَالَ: كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَبَلَغَ ذَلِكَ نَبِيَّ الله صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمْ يَنْهَنَا.

**لە ریوایەتێکی تری موسلیمدا: وتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خـودا(ﷺ) عـەزلمان دەکرد، ئەوە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتەوە و نەهی لێ نەکردین.**

**٢٤١٩**– عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّا كُنَّا نَعْزِلُ، فَزَعَمَتِ الْيَهُودُ: أَنَّهَا الْمَوْؤُودَةُ الصُّغْرَى، فَقَالَ: (**كَذَبَتِ الْيَهُودُ! إِنَّ اللهَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْلُقَهُ، فَلَمْ يَمْنَعْهُ**). [ت١١٣٦]

* صحيح.

**لە جابرەوە، وتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە عـەزلمان دەکـرد، یـەهوود بانگەشەی ئەوەیان کرد ئەوە زینـدە بـە چـاڵ کردنـی بچـووکە، فـەرمووی: (یـەهوود درۆی کرد، گەر خودا ویستی دروستی بکات ئەوە رێگری لێ ناکات).**

## ٢١- دەروازەی: ئامۆژگاری ئافرەتان

**٢٤٢٠**– عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا صَلَّتِ الْمَرْأَةُ خَمْسَهَا، وَصَامَتْ شَهْرَهَا، وَحَفِظَتْ فَرْجَهَا، وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا، قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتِ**). [حم١٦٦١]

* حسن لغيره.

لە عبدالرحمانی کوڕی عەوفەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئافرەت پێنج نوێژەکـەی بکـات و مانگەکـەی بـەڕۆژوو ببێـت و داوێـنی بپـارێزێ و گوێڕایـەڵی مێردەکەی بێت، پێی دەوترێت: بچۆ ژوورەوە لە هەر دەرگایەکی بەهەشت دەتەوێ).**

**٢٤٢١**- وعَن أَبِي هُرَيْرَةَ مثله مرفوعاً. [حب٤١٦٣]

* حديث صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە هەروەك ئەوە بە بەرزکراوەیی.**

## ٢٢- دەروازەی: مافی پیاو لەسەر ژن

**٢٤٢٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَوْ كُنْتُ آمِراً أَحَداً أَنْ يَسْجُدَ لِأَحَدٍ، لأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا)**. [ت١١٥٩]

* حسن صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (گەر فرمانم بکردبا کەسێك بۆ کەسێك سوژدە ببات فرمانم دەکرد ژن سوژدە ببات بۆ پیاوەکەی).**

**٢٤٢٣**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: لَمَّا قَدِمَ مُعَاذٌ مِنَ الشَّامِ، سَجَدَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ: **(مَا هَـذَا يَا مُعَاذُ)** ؟ قَالَ: أَتَيْتُ الشَّامَ فَوَافَقْتُهُمْ يَسْجُدُونَ لِأَسَاقِفَتِهِمْ وَبَطَارِقَتِهِمْ، فَوَدِدْتُ فِي نَفْسِي أَنْ نَفْعَلَ ذَلِكَ بِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(فَلاَ تَفْعَلُوا، فَإِنِّي لَوْ كُنْتُ آمِراً أَحَداً أَنْ يَسْجُدَ لِغَيْرِ اللهِ، لأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لاَ تُؤَدِّي الْمَرْأَةُ حَقَّ رَبِّهَا حَتَّى تُؤَدِّيَ حَقَّ زَوْجِهَا، وَلَوْ سَأَلَهَا نَفْسَهَا، وَهِيَ عَلَى قَتَبٍ، لَمْ تَمْنَعْهُ)**. [جه١٨٥٣]

* حسن صحيح. وقال شعيب: مضطرب.

[وانظر: الباب قبله].

لە عەبدوڵای کوڕی ئیبن ئەبی ئەوفاوە، وتی: کاتێ مەعاز لە شام گەڕایەوە، سوژدەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) برد، پێغەمبەر فەرمووی: **(ئەمە چییە؟)**، وتی: لە شامەوە هاتمەوە ڕێمکەوت لەوان سوژدەیان بۆ ئەساقیفە و بەتاریقە دەبرد، لە ناخەوە ئاواتم خواست ئەوە بۆ تۆ بکەین، پێغەمبەری خود(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوە مەکەن، من گەر فرمان بکەم بە کەسێك سوژدە بۆ غەیری خودا ببات فرمانم دەکرد ژن سوژدە بۆ**

**پیاوەکەی ببات، سوێند بەو کەسەی نەفسی محەمەدی بەدەستە، ئافرەت حەقی پەروەردگاری نادات تا حەقی پیاوەکەی دەدات، گەر داوای نەفسی بکات و ئەو لەسەر کۆڵ و بار بێت ڕێگری لێ نەکات).**

## ٢٣- دەروازەی: مافی ئافرەت لەسەر مێردەکەی

**٢٤٢٤-** عَنْ مُعَاوِيَةَ الْقُشَيْرِيِّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا حَقُّ زَوْجَةِ أَحَدِنَا عَلَيْهِ؟ قَالَ: **(أَنْ تُطْعِمَهَا إِذَا طَعِمْتَ، وَتَكْسُوَهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ. أَوِ اكْتَسَبْتَ. وَلاَ تَضْرِبِ الْوَجْهَ، وَلاَ تُقَبِّحْ، وَلاَ تَهْجُرْ إِلاَّ فِي الْبَيْتِ).** [د٢١٤٢/ جه١٨٥٠]

* حسن صحيح.

لە موعاوییەی قوشەیرییەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، مافی ژنی یەکێك لە ئێمە چییە لەسەر مێردەکەی؟ فەرمووی: **(خواردنی پێ بدەی کاتێ خواردن دەخۆی، پۆشاکی بۆ بکەی کاتێك پۆشاك دەکەی-یان کاتێ کەسابەت دەکەی- لە ڕوخسار نەدەی و ناشیرین نەکەی[1]، و تەنها لە ماڵەوە کۆچی لێ بکەی).**

**٢٤٢٥-** عَنْ عَمْرِو بْنِ الْأَحْوَصِ: أَنَّهُ شَهِدَ حَجَّةَ الْوَدَاعِ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَذَكَّرَ وَوَعَظَ، فَذَكَرَ فِي الْحَدِيثِ قِصَّةً فَقَالَ: **(أَلاَ وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْراً، فَإِنَّمَا هُنَّ عَوَانٌ عِنْدَكُمْ، لَيْسَ تَمْلِكُونَ مِنْهُنَّ شَيْئاً غَيْرَ ذَلِكَ؛ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ، فَإِنْ فَعَلْنَ، فَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ، وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْباً غَيْرَ مُبَرِّحٍ، فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً.**

**أَلاَ إِنَّ لَكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ حَقّاً، وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقّاً:**

**فَأَمَّا حَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ، فَلاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ، وَلاَ يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ.**

**أَلاَ وَحَقُّهُنَّ عَلَيْكُمْ، أَنْ تُحْسِنُوا إِلَيْهِنَّ فِي كِسْوَتِهِنَّ وَطَعَامِهِنَّ).** [ت١١٦٣/ جه١٨٥١]

* حسن.

---

[1] واتە: پێی نەڵێی: "قبحكِ الله-خودا ناشیرینت بکات "-و.

لە عەمری کوڕی ئەحوەصەوە: ئەو لە حەجیماڵئاوایی لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئامادە بوو، پێغەمبەر حەمدی خودای کرد و مەدح و سەنای لەسەر کرد، بیرخستنەوەی ئەنجامدا و ئامۆژگاری کرد، لە فەرموودەکەدا چیرۆکێکی باس کرد، فەرمووی: **(ئاگادارتان دەکەم باش بن لەگەڵ ئافرەتان، ئەوان دیلی دەستی ئێوەن، جگە لەوە لە ئەواندا خاوەن شتێك نین**[1]**، مەگەر هەستن بە فاحیشەیەکی ئاشکرا، گەر ئەوەیان ئەنجامدا لە جێگەی نوستن جێگەیان لێ جیابکەنەوە و لێیان بدەن بە لێدانێك توند و ئازاربەخش نەبێت، گەر گوێڕایەڵییان لێکردن ڕێگەی تریان لێ مەگرنەبەر.**

**دەزانن ئێوە مافتان هەیە لەسەر ژنەکانتان، و ژنەکانتان مافیان هەیە لەسەر ئێوە:**

**مافی ئێوە لەسەر ژنەکانتان کەسێك نەهێننە سەر جێگەی نوستنتان لاتان خراپ و ناپەسەندە، هەروەها مۆڵەت بە کەسێك نەدەن بێنە ماڵەکانتان بە باشی نازانن.**

**دەزانن حەقی ئەوان لەسەر ئێوە ئەوەیە لەگەڵیان چاك بن لە پۆشاك و خۆراك).**

## ٢٤- دەروازەی: نەهی لە چوونە لای ئافرەت لە دواوە

**٢٤٢٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَلْعُونٌ مَنْ أَتَى امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا). [د٢١٦٢/ جه١٩٢٣/ مي١١٨٠]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(مەلعوونە ئەو کەسەی لەدواوە دەچێتە لای ژنەکەی).**

---

[1] واتە: خاوەن مافێکی تر نین-و.

## ٢٥- دەروازەی: خۆداپۆشین لە كاتی جووتبوون

**٢٤٢٧**– عَنِ عُتْبَةَ بْنِ أَبِي حَكِيمٍ: أَنَّهُ سَأَلَ سُلَيْمَانَ بْنِ مُوسَى عَنِ الرَّجُلِ يَنْظُرُ إِلى فَرْجِ امْرَأَتِهِ، فَقَالَ: سَأَلْتُ عَنْهَا عَطَاءً، فَقَالَ: سأَلْتُ عَنْهَا عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَحِبِّي صلّى الله عليه وسلّم مِنَ الإِنَاءِ الوَاحِدِ تَخْتَلِفُ فِيْهِ أَكُفُّنَا، وأَشَارَتْ إِلى إِنَاءٍ فِي البَيْتِ قَدْرَ سِتَّةِ أَقْسَاطٍ.

* إسناده حسن. [حب٥٥٧٧]

**لە عوتبەی كوڕی ئەبی حەكیمەوە: ئەو پرسیاری لە سولەیمانی كوڕی موسا كرد دەربارەی پیاو كە تەماشای عەورەتی ژنەكەی خۆی دەكات، وتی: دەربارەی ئەوە پرسیارم لە عەتا كرد و وتی: دەربارەی ئەوە پرسیارم لە عائیشە كرد، وتی: من و خۆشەویستەكەم لە یەك تەشت خۆمان دەشۆری دەستمان تیایدا تێكەڵ دەبوو، ئاماژەی كرد بۆ دەفرێك لەماڵەكە بە ئەندازەی شەش "أقساط[1]".**

**٢٤٢٨**– عَنْ عُتْبَةَ بْنِ عبدٍ السُّلمي قال: قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم : (إذا أتَى أحَدُكم أهلَهُ فليَسْتَتِرْ ولا يَتَجَرَّدْ تَجَرُّدَ العَيْرَيْنِ). [جه١٩٢١]

* ضعيف.

**لە عوتبەی كوڕی عەبد سولەمییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەكێك لە ئێوە چووە لای خانەوادەكەی با خۆی داپۆشێت و وەك دوو گوێدرێژی وەحشی خۆیان رووت نەكەنەوە).**

---

[1] واتە: سێ "صاع"، چونكە هەر "قسط"ێك نیو "صاع" دەگرێت، لای جمهوور یەك "صاع" ٢.٠٣٥ كیلۆگرامە–و.

# بەشی سێیەم

## خەرجییەکان

### ١- دەروازەی: پلە و پایەی خەرجی کردن بۆ خانەوادە

**٢٤٢٩-** (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا أَنْفَقَ الْمُسْلِمُ نَفَقَةً عَلَى أَهْلِهِ، وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا، كانَتْ لَهُ صَدَقَةً)**. [خ٥٣٥١ (٥٥)/ م١٠٠٢]

(ق) لە ئەبی مەسعوودی ئەنصارییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر موسڵمان خەرجییەکی بۆ خانەوادەکەی کرد و ئەو بۆ خودا ئەنجامی بدات بۆی دەبێتە صەدەقە)**.

**٢٤٣٠-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(دِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي سَبِيلِ الله، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي رَقَبَةٍ، وَدِينَارٌ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَى مِسْكِينٍ، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ، أَعْظَمُهَا أَجْراً الَّذِي أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ)**. [م٩٩٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دینارێك لە ڕێگەی خودا خەرجت کردبێت، دینارێك بۆ کۆیلەیەك خەرجت کردبێت، دینارێکت بۆ گەدایەك کردبێت بە صەدەقە و دینارێکیش بۆ خانەوادەکەت خەرجت کردبێت، مەزنترین پاداشت ئەوەیانە بۆ خانەوادەکەت خەرجت کردووە)**.

**٢٤٣١-** عَنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم تَبُوكاً، فَمَرَّ بِنَا شَابٌّ نَشِيطٌ، يَسُوقُ غُنَيْمَةً لَهُ فَقُلْنَا: لَوْ كَانَ شَبَابُ هَذَا وَنَشَاطُهُ فِي سَبِيلِ الله كَانَ خَيْراً لَهُ مِنْهَا، فَانْتَهَى قَوْلُنَا حَتَّى بَلَغَ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: **(مَا قُلْتُمْ؟)**، قُلْنَا: كَذَا وَكَذَا، قَالَ: **(أَمَا إِنَّهُ إِنْ كَانَ يَسْعَى عَلَى وَالِدَيْهِ أَوْ أَحَدِهِمَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ الله، وَإِنْ كَانَ يَسْعَى عَلَى عِيَالٍ يَكْفِيهِمْ فَهُوَ فِي سَبِيلِ الله، وَإِنْ كَانَ يَسْعَى عَلَى نَفْسِهِ فَهُوَ فِي سَبِيلِ الله عزّ وجل)**.

[هق٧/٤٧٩]

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت)، ئەو وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەزوەی "تەبوك"مان کرد، گەنجێکی چالاك بە پاڵماندا گوزەری کرد، مەرێکی دابووەبەر، وتمان: گەر گەنجێتی و چالاکی ئەوە لە رێگەی خودا بوایە بۆ ئەو باشتر بوو لەو کارە، قسەکەمان بڵاوەی کرد تا گەیشتەوە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، فەرمووی: **(چیتان وت؟)**، وتمان: ئاوا و ئاوا، فەرمووی: **(گەر ئەو لەپێناو دایك و باوکی، یان یەکێکیان بکۆشێت ئەوە لە رێگەی خودایە، گەر بۆ ماڵ و منداڵێك بکۆشێت دەستەبەریان بێت ئەوە لە رێگەی خودایە، گەر بۆ خۆی بکۆشێت ئەوە لە رێگەی خودایە(عز وجل))**.

## ٢- دەروازەی: خەرجی خانەوادە بەسەر صەدەقەدا پێشدەخرێت

**٢٤٣٢**- (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: بَلَغَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِهِ أَعْتَقَ غُلاَماً لَهُ عَنْ دُبُرٍ، لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرَهُ، فَبَاعَهُ بِثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ، ثُمَّ أَرْسَلَ بِثَمَنِهِ إِلَيْهِ.
[خ٧١٨٦ (٢١٤١)/ م٩٩٧]

(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتەوە پیاوێك لە هاوەڵانی غولامێکی بۆ دوای مردنی[1] ئازاد کرد، جگە لەوە ماڵی تری نەبوو، پێغەمبەر بە هەشتسەد درهەم فرۆشتی و نرخەکەی بۆ رەوانە کرد.

- ولفظ مسلم ـ وبعضه عند البخاري ـ قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي عُذْرَةَ عَبْداً لَهُ عَنْ دُبُرٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(أَلَكَ مَالٌ غَيْرُهُ)** ؟ فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ: **(مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي)** ؟ فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الْعَدَوِيُّ بِثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ، فَجَاءَ بِهَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: **(ابْدَأْ بِنَفْسِكَ فَتَصَدَّقْ عَلَيْهَا، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ فَلأَهْلِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَهْلِكَ شَيْءٌ فَلِذِي قَرَابَتِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ ذِي قَرَابَتِكَ شَيْءٌ فَهكَذَا وَهَكَذَا)**. يَقُولُ: فَبَيْنَ يَدَيْكَ، وَعَنْ يَمِينِكَ، وَعَنْ شِمَالِكَ. [خ٢١٤١]

---

[1] بۆ دوای مردنی: واتە مەرجی ئازادبوونەکە دوای مردنی خاوەنەکەیەتی، هەرکات خاوەنەکەی مرد ئەو ئازاد بێت-و.

لەفزەکەی موسلیم-کە هەندێکی لای بوخاری هەیە- وتی: پیاوێك لە بەنی عوزرە بەندەیەکی بۆ دوای مردنی ئازاد کرد، ئەوە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتەوە و فەرمووی: (**ئایا جگە لەوە ماڵ و سامانێکی ترت هەیە؟**)، وتی: نەخێر، پێغەمبەر فەرمووی: (**کێ لە منی دەکرێت؟**)، نوعەیمی کوڕی عەبدوڵای عەدەوی بە هەشتسەد درهەم لێی کڕی، پارەکەی هێنا بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەویش پێیدا، پاشان فەرمووی: (**بە نەفسی خۆت دەست پێ بکە و صەدەقەی پێ بکە، گەر شتێك زیاد بوو بۆ خانەوادەکەت، گەر شتێك لە خانەوادەکەت زیاد بوو بۆ خزمە نزیکەکانت، گەر شتێك لە خزمە نزیکەکانت زیاد بوو، بەم جۆرە و بەم جۆرە**)، دەڵێت: لە بەردەم و لای راست و لای چەپت.

## ٣- دەروازەی: ژنەکە لە ماڵ و سامانی مێردەکەی بە بڕی پێویست وەردەگرێت

**٢٤٣٣**- (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: جاءَتْ هِنْدُ بِنْتُ عُتْبَةَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، ما كانَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ مِنْ أَهْلِ خِبَاءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ يَذِلُّوا مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ، ثُمَّ ما أَصْبَحَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَهْلُ خِبَاءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ يَعِزُّوا مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ. قَالَ: (**وَأَيْضاً، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ**). قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ مِسِّيكٌ، فَهَلْ عَلَيَّ حَرَجٌ أَنْ أُطْعِمَ مِنَ الَّذِي لَهُ عِيَالَنَا؟ قالَ: (**لاَ أُرَاهُ إِلاَّ بِالْمَعْرُوفِ**). [خ٣٨٢٥ (٢٢١١)/ م١٧١٤]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: هندی کچی عوتبە هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، پێمخۆش نەبوو هیچ کەس لە ئەهلی دەوارنشینان بە قەدەر ئەهلی دەوارنشینی تۆ زەلیل بێت، پاشان ئەمڕۆ پێمخۆش نییە هیچ کەس لە ئەهلی دەوارنشینان بە قەدەر ئەهلی تۆ بەعیززەت بێت، پێغەمبەر فەرمووی: (**سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، منیش هەر بەو جۆرە**)، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا،

ئەبو سوفیان پیاوێکی دەستپێوەگرە، ئایا تەنگەلانیم لەسەرە لەوەی هەیەتی خۆراکی منداڵەکانمان بدەم؟ فەرمووی: **(بە باشی نابینم مەگەر بە مەعرووف**[1]**)**.

- وفي رواية لهما: قالت: إنَّ أَبا سُفْيانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، وَلَيْسَ يُعْطِينِي ما يَكْفِينِي وَوَلَدِي؛ إلاَّ ما أَخَذْتُ مِنْهُ، وَهْوَ لاَ يَعْلَمُ، فَقَالَ: (**خُذِي ما يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالمَعْرُوفِ**). [خ٥٣٦٤]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان: هند وتی: ئەبو سوفیان پیاوێکی دەستنوقاوە و ئەوەندەم پێ نادات بەشی من و منداڵەکەم بکات، مەگەر ئەوەی لێی دەبەم و ئەو نازانێت، فەرمووی: **(ئەوەندە ببە بەشی خۆت و منداڵەکەت بکات بە مەعرووف)**.

## ٤- دەروازەی: پیاو لە ماڵ و سامانی کوڕەکەی ببات

**٢٤٣٤**- عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَمَّتِهِ: أَنَّهَا سَأَلَتْ عَائِشَةَ ﵂: فِي حِجْرِي يَتِيمٌ، أَفَآكُلُ مِنْ مَالِهِ؟ فَقَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ مِنْ أَطْيَبِ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ، وَوَلَدُهُ مِنْ كَسْبِهِ**). [د٣٥٢٨/ ت١٣٥٨/ ن٤٤٦١/ جه٢١٣٧/ مي٢٥٧٩]

* صحيح.

لە عومارەی کوڕی عومەیرەوە، لە خوشکی باوکییەوە: ئەو پرسیاری لە عائیشە(خوا لێی رازی بێت) کرد: منداڵێکی بێبابم لە لایە[2]، ئایا لە ماڵ و سامانەکەی بخۆم؟ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(حەلاڵترین و پاکترین شتێك پیاو بیخوات لە کەسابەتی خۆیەتی، کوڕەکەی لە کەسابەتی خۆیەتی)**.

**٢٤٣٥**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ لِي مَالاً وَوَلَداً، وَإِنَّ وَالِدِي يَجْتَاحُ مَالِي، قَالَ: (**أَنْتَ وَمَالُكَ لِوَالِدِكَ ، إِنَّ أَوْلاَدَكُمْ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِكُمْ، فَكُلُوا مِنْ كَسْبِ أَوْلاَدِكُمْ**). [د٣٥٣٠/ جه٢٢٩٢]

* صحيح.

---

[1] بە مەعرووف: واتە بە چاکە، بە رادە و سنووری خۆی، نە زیاد و نە کەم و بەئەندازەی پێویست-و.

[2] منداڵەکە منداڵی خۆی بووە، بەڵام باوکی مردووە-و.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ماڵ و سامانێك و منداڵێکم هەیە، باوکم دەدات بەسەر ماڵەکەمدا، فەرمووی: **(تۆ و ماڵ و سامانەکەت بۆ باوکتە، منداڵەکانتان لە حەڵاڵترین کەسبی ئێوەن، بۆیە لە کەسابەتی منداڵەکانتان بخۆن).**

**٢٤٣٦**– عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ أَوْلاَدَكُمْ هِبَةُ الله لَكُم: ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ﴾** [الشورى:٤٩] **فَهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ لَكُمْ إِذَا احْتَجْتُمْ إِلَيْهَا).** [ك٣١٢٣/هق٧/٤٨٠]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(منداڵەکانتان بەخششی خودان بۆ ئێوە: ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ﴾** [الشورى:٤٩]، **ئەوان و ماڵ و سامانیان بۆ ئێوەیە گەر پێیان ئاتاج بوون).**

## ١- دەروازەی: ئەوەی لە رەچەڵەکەوە حەرام دەبێت لە شیرخواردنەوە حەرام دەبێت

**٢٤٣٧-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي بِنْتِ حَمْزَةَ: **(لاَ تَحِلُّ لِي، يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ ما يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ، هِيَ بِنْتُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ)**.
[خ٢٦٤٥/ م١٤٤٧]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی کچەکەی حەمزە[1] فەرمووی: **(بە من حەڵاڵ نییە، ئەوەی لە رەچەڵەکەوە حەرام دەبێت لە شیرخواردنەوە حەرام دەبێت، ئەو کچی برامە لە شیرخواردنەوە)**.

**٢٤٣٨-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ اللهَ حَرَّمَ مِنَ الرَّضَاعِ مَا حَرَّمَ مِنَ النَّسَبِ)**. [ت١١٤٦]
* صحيح.

**لە عەلی کوڕی ئەبی تالبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی لە رەچەڵەکەوە خودا حەرامی کردووە لە شیرخواردنەوە حەرامی کردووە).**

## ٢- دەروازەی: شیری گەورە

**٢٤٣٩-** (ق) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ أَنَّ عائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ أَفْلَحُ ـ أَخُو أَبِي الْقُعَيْسِ، بَعْدَما أُنْزِلَ الْحِجَابُ ـ. فَقُلْتُ: لاَ آذَنُ لَهُ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ فِيهِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَإِنَّ أَخاهُ أَبَا الْقُعَيْسِ لَيْسَ هُوَ أَرْضَعَنِي، وَلكِنْ أَرْضَعَتْنِي امْرَأَةُ أَبِي الْقُعَيْسِ، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَفْلَحَ أَخا أَبِي الْقُعَيْسِ اسْتَأْذَنَ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ حَتَّى أَسْتَأْذِنكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(وَما مَنَعَكِ أَنْ تَأْذَنِي! عَمُّكِ)**. قُلْتُ: يَا

---

[1] "حەمزە" مامی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، لەگەڵ ئەوەش برای شیری پێغەمبەر(ﷺ) بوو-و.

رَسُولَ اللهِ، إنَّ الرَّجُلَ لَيْسَ هُوَ أَرْضَعَنِي، وَلكِنْ أَرْضَعَتْنِي امْرَأَةُ أَبِي الْقُعَيْسِ، فَقَالَ: (**ائْذَنِي لَهُ، فَإِنَّهُ عَمُّكِ، تَرِبَتْ يَمِينُكِ**).

قالَ: عُرْوَةُ: فَلِذلِكَ كانَتْ عائِشَةُ تَقُولُ: حَرِّمُوا مِنَ الرَّضَاعَةِ ما تُحَرِّمُونَ مِنَ النَّسَبِ.
[خ٤٧٩٦ (٢٦٤٤)/ م١٤٤٥]

(ق) لە عوروەی كوڕی زوبەیرەوە: عائیشە(خوا لێی رازی بێت) وتی: لەدوای دابەزینی حیجاب ئەفلەح-برای ئەبی قوعەیس- داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی كرد، وتم: مۆڵەتی نادەم تا تیایدا مۆڵەت لە پێغەمبەر(ﷺ) وەردەگرم، چونكە براكەی ئەبو قوعەیس شیری بە من نەداوە[1]، بەڵكو ژنەكەی ئەبی قوعەیس شیری بە من داوە، پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لام و پێم وت: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەفلەحی برای ئەبی قوعەیس داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی كرد نەمویست مۆڵەتی بدەم تا مۆڵەت لە تۆ وەردەگرم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**چی رێگری لێ كردنی مۆڵەتی مامت نەدەی؟**)، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوەكە شیری بە من نەداوە، بەڵكو ژنەكەی ئەبی قوعەیس شیری بە من داوە، فەرمووی: (**مۆڵەتی بدە، ئەو مامی تۆیە، دەستی راستت خۆڵاوی بێت**).

عوروە وتی: بۆ ئەو مەبەستە عائیشە دەیوت: ئەوەی لە رەچەڵەك حەرامی دەكەن لە شیرخواردن حەرامی بكەن.

## ٣- دەروازەی: شیرخواردن لە برسێتییەوەیە

**٢٤٤٠-** (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا رَجُلٌ، فَكَأَنَّهُ تَغَيَّرَ وَجْهُهُ، كَأَنَّهُ كَرِهَ ذلِكَ، فَقَالَتْ: إنَّه أَخِي، فَقَالَ: (**انْظُرْنَ مَنْ إخْوَانُكُنَّ، فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنَ الْمَجَاعَةِ**). [خ٥١٠٢ (٢٦٤٧)/ م١٤٥٥]

---

[1] واتە: لەگەڵ براكەی ئەبو قوعەیس-كە ناوی ئەفلەح بوو- پێكەوە شیریان نەخواردبوو، بەڵكو ژنەكەی ئەبی قوعەیس شیری بە عائیشە دابوو، واتە عائیشە وەك كچی ئەبی قوعەیسی لێ هاتبوو و وەك برازای ئەفلەح، چونكە ئەفلەح برای ئەبی قوعەیس بوو-و.

(ق) لە عائیشـەوە(خوا لێـی رازی بێـت): پێغەمبـەر(ﷺ) هاتـە ژوورەوە بـۆ لای، پیاوێکی لە لا بوو، وەك ئەوەی روخساری بگۆڕێت، وەك ئەوەی ئـەوەی پـێ نـاخۆش بێت، عائیشە وتی: ئەو برامە، پێغەمبەر فەرمووی: **(وردببنـەوە بـزانن کـێ براتانـە، شیرخواردن لە برسێتییەوەیە[1])**.

## ٤- دەروازەی: مژێك و دوو مژ

**٢٤٤١**- (م) عَنْ عائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لا تُحَرِّمُ المصَّةُ والمصَّتَانِ**). [م١٤٥٠]

(م) لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: **(مـژێك و دوو مـژ حەرام ناکات)**.

## ٥- دەروازەی: حەرام کردن بە پێنج شیرخواردنە

**٢٤٤٢**- (م) عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرْآنِ: عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ. ثُمَّ نُسِخْنَ: بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ. فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهُنَّ فِيمَا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ. [م١٤٥٢]

**(م) لە عائیشەوە، ئەو وتی: لەوەی کاتی خۆی لە قورئان دابەزی ئەمـە هـەبوو (عشـر رضـعات معلومـات یُحـرِّمن) پاشـان بـە (خمـس معلومـات) نەسـخبوونەوە، پێغەمبـەری خودا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد و ئەوانە لەوانە بوون لە قورئان دەخوێنران.**

---

[1] واتە: دەبێ منداڵەکە لەسەر برسێتییەوە شیرەکە بخوات و مژێك و دوو مـژ نـەبێت، بـەڵکو ژەمێکی خواردنی منداڵەکە بێت-و.

## ٦- دەروازەی: شیردان بە گەورە

**٢٤٤٣**- (م) عَن ابنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ القَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ سَالِماً . مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ . كَانَ مَعَ أَبِي حُذَيْفَةَ وَأَهْلِهِ فِي بَيْتِهِمْ، فَأَتَتْ . تَعْنِي: ابْنَةَ سُهَيْلٍ . النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: إِنَّ سَالِماً قَدْ بَلَغَ مَا يَبْلُغُ الرِّجَالُ، وَعَقَلَ مَا عَقَلُوا، وَإِنَّهُ يَدْخُلُ عَلَيْنَا، وَإِنِّي أَظُنُّ أَنَّ فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً. فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَرْضِعِيهِ تَحْرُمِي عَلَيْهِ، وَيَذْهَبِ الَّذِي فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ**) ، فَرَجَعَتْ فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُهُ، فَذَهَبَ الَّذِي فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ. [م١٤٥٣]

**(م) لە ئیبن ئەبی مولەیکەوە، لە قاسمەوە، لە عائیشەوە: سالم-مەولای ئەبی حوزەیفە- لەگەڵ ئەبی حوزەیفە و خانەوادەکەی بوو لە ماڵەکەیان، کچەکەی سوهەیل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: سالم گەیشتووە بەوەی پیاو پێی دەگات، ئەوەی پیاو دەیزانەوێ ئەویش دەیزانەوێ، ئەو دێتە ژوورەوە بۆ لامان، من وا گومان دەبەم لە نەفسی ئەبی حوزەیفەدا لەو بارەیەوە شتێك هەیە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (شیری پێ بدە لێی حەرام دەبیت و ئەوەی لە نەفسی ئەبی حوزەیفەدایە نامێنێت)، گەڕایەوە و وتی: من شیرم پێدا و ئەوەی لە نەفسی ئەبی حوزەیفەدا بوو نەما.**

- وفي رواية: قَالَتْ عَائِشَةُ: جَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلٍ إلى النبيّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَرَى فِي وَجْهِ أَبِي حُذَيفَةَ مِنْ دُخُولِ سالِمٍ . وهو حَلِيفهُ . فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَرْضِعِيهِ**) ، قَالَتْ: وَكَيْفَ أُرْضِعُهُ وَهُوَ رَجُلٌ كَبِيرٌ؟! فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَقَالَ: (**قَدْ عَلِمْتُ أَنَّهُ رَجُلٌ كَبِيرٌ**).

**لە ریوایەتێکدا: عائیشە وتی: سەهلەی کچی سوهەیل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من لە روخساری ئەبی حوزەیفە لە هاتنە ژوورەوەی سالم-کە هاوپەیمانی بوو- شتێك دەبینم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (شیری پێ بدە)، چۆن شیری پێ بدەم ئەو پیوێکی گەورەیە؟! پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەندەیەکی کرد و فەرمووی: (دەزانم ئەو پیاوێکی گەورەیە).**

**٢٤٤٤**- (م) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ . زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم . قَالَتْ: أَبَى سَائِرُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يُدْخِلْنَ عَلَيْهِنَّ أَحَداً بِتِلْكَ الرَّضَاعَةِ، وَقُلْنَ لِعَائِشَةَ: وَاللهِ مَا نَرَى هذَا إلاَّ رُخْصَةً أَرْخَصَهَا رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم لِسَالِمٍ خَاصَّةً، فَمَا هُوَ بِدَاخِلٍ عَلَيْنَا أَحَدٌ بِهَذِهِ الرَّضَاعَةِ، وَلاَ رَائِينَا. [م١٤٥٤]

**(م) لە ئوم سەلەمەوە -هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- وتی: هەموو هاوسەرانی پێغەمبەر(ﷺ) نەیانویست بەو جۆرە شیردانە كەسێك بێتە ژوورەوە بۆ لایان، ئەوان بە عائیشەیان وت:: سوێند بە خودا، ئەوە تەنها بە روخسەتێك دەبینین پێغەمبەری خودا تایبەت بە سالم روخسەتی دابێت، هیچ كەس بەو شیردانە نایەتە ژوورەوە بۆ لامان و نامان بینێت.**

## ٧- دەروازەی: شایەتی شیردەر

**٢٤٤٥**- (خ) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الحَارِثِ: أَنَّهُ تَزَوَّجَ ابْنَةً لأَبِي إهَابِ بْنِ عَزِيزٍ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: قَدْ أَرْضَعْتُ عُقْبَةَ وَالَّتِي تَزَوَّجَ، فَقَالَ لَهَا عُقْبَةُ: ما أَعْلَمُ أَنَّكِ أَرْضَعْتِنِي وَلاَ أَخْبَرْتِنِي، فَأَرْسَلَ إلَى آلِ أَبِي أَهَابٍ يَسْأَلُهُمْ، فَقَالُوا: ما عَلِمْنا أَرْضَعَتْ صَاحِبَتَنا. فَرَكِبَ إلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِالمَدِينَة فَسَأَلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**كَيْفَ وَقَدْ قِيلَ**) ! ففارَقَها وَنَكَحَتْ زَوْجاً غَيْرَهُ. [خ٢٦٤٠ (٨٨)]

**(خ) لە عوقبەی كوڕی حاریسەوە: ئەو كچێكی ئەبی ئیهابی كوڕی عەزیزی مارە كرد ئافرەتێك هات بۆ لای و وتی: من شیرم داوە بە عوقبە و ئەو ئافرەتەی مارەی كردووە، عوقبە پێی ت: وا نازانم تۆ شیرت بە من دابێت، لەو بارەیەوە هەواڵت پێنەداوم، بۆیە ناردی بۆ لای ئالی ئەبی ئەهاب و پرسیاری لێكردن، ئەوانیش وتیان: وا نازانین ئەو ئافرەتەمان شیری دابێت، سوار بوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە و پرسیاری لێكرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (چۆن دەبێت كە وتراوە ![1])، بۆیە لێی جیابوویەوە و ئافرەتەكە مێردی بە كەسێكی تر كرد.**

---

[1] واتە: چۆن بە تۆ شیاوە لە كاتێكدا ئەو ئافرەتە دەڵێت شیرم پێداون؟-و.

## ٨- دەروازەی: دوای لەشیربڕینەوە شیر خواردن نییە[1]

**٢٤٤٦-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ يُحَرِّمُ مِنَ الرِّضَاعَةِ؛ إِلاَّ مَا فَتَقَ الْأَمْعَاءَ فِي الثَّدْيِ، وَكَانَ قَبْلَ الْفِطَامِ**). [ت١١٥٢]

* صحيح.

لە ئوم سەلەمەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(تەنها ئەوەی ریخۆڵەكان پڕ دەكات لە شیر و بەر لە بڕینەوە لە شیرخواردن حەرام دەبێت).**

[1] واتە: گەر تەمەنی منداڵەكە دوو ساڵی تەواو كرد لەگەڵ هەر منداڵێكی تر شیر بخوات نابێتە خوشك و برای-و.

## بەشی یەکەم

## حوکمەکانی تەڵاق

### ١- دەروازەی: خراپترین حەڵاڵ

**٢٤٤٧**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَبْغَضُ الحَلاَلِ إِلَى اللهِ تَعَالَى الطَّلاَقُ**). [د٢١٧٨/ جه٢٠١٨]

* ضعيف.

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (خراپترین حەڵاڵ لای خودا(سبحانە وتعالى) بریتییە لە تەڵاق).**

### ٢- دەروازەی: تەڵاقی سوننەت

**٢٤٤٨**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿**يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ**﴾[الطلاق:١]. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: قُبُلِ عِدَّتِهِنَّ. [ن٣٣٩٣]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، دەربارەی فەرموودەی خودا(عز وجل): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[الطلاق:١]. ئیبن عەباس وتی: هاتن و سەرەتای عیددەکەی.**

**٢٤٤٩**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: طَلاَقُ السُّنَّةِ أَنْ يُطَلِّقَهَا طَاهِراً فِي غَيْرِ جِمَاعٍ.

* صحيح. [ن٣٣٩٥/ جه٢٠٢٠]

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: تەڵاقی سوننەت ئەوەیە لەسەر پاکی و بەبێ جووتبوون لەگەڵی تەڵاقی بدات.**

**٢٤٥٠**- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: الطَّلاَقُ عَلَى أَرْبَعَةِ وُجُوهٍ، وَجْهَانِ حَلاَلٌ، وَوَجْهَانِ حَرَامٌ، فَأَمَّا الْحَلاَلُ: فَأَنْ يُطَلِّقَهَا طَاهِراً مِنْ غَيْرِ جِمَاعٍ، أَو يُطَلِّقَهَا حَامِلاً مُسْتَبِيناً حَمْلَهَا، وَأَمَّا الْحَرَامُ: فَأَنْ يُطَلِّقَهَا حَائِضاً، أَوْ يُطَلِّقَهَا حِينَ يُجَامِعُهَا، لاَ يَدْرِي اشْتَمَلَ الرَّحِمُ عَلَى وَلَدٍ أَمْ لاَ. [هق٧/٣٢٥]

**لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: تەلاّق لەسەر چوار رووە: دوو روویان حەلاّڵن و دوو روویان حەرامن، حەلاڵەکە: لەسەر پاکی و بەبێ جووتبوون لەگەڵی تەلاّقی بدات، یان بە سکپڕی تەلاّقی بدات و سکەکەی ئاشکرا بووبێت، حەرامەکە: لە حەیزدا تەلاّقی بدات، یان کاتێ لەگەڵی جووت دەبێت تەلاّقی بدات، نازانێت ئایا رەحم منداڵێکی هەڵگرتووە یان نە.**

**٢٤٥١**- عَنْ عَلِي ﷺ قَالَ: مَا طَلَّقَ رَجُلٌ طَلاَقَ السُّنَّةِ فَيَنْدَمَ أَبَداً. [هق٧/٣٢٥]

**لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: هەر پیاوێك تەلاّقی سوننەت ئەنجام بدات هەرگیز پەشیمان نابێتەوە.**

## ٣- دەروازەی: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ﴾ [البقرة: ٢٢٩]

**٢٤٥٢**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ للنَّبِي صلّى الله عليه وسلّم: إِنِّي أَسْمَعُ الله يَقُولُ: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ﴾ فَأَيْنَ الثَّالِثَةُ؟ قَالَ: (﴿فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ﴾ [البقرة: ٢٢٩] هِيَ الثَّالِثَةُ). [هق٧/٣٤٠]

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پیاوێك بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: من لە خودا دەبیستم دەفەرموێت: (﴿فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ﴾ [البقرة: ٢٢٩] بریتییە لە سێیەم).**

**٢٤٥٣**- عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثاً، قَالَ: فَسَكَتَ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ رَادُّهَا إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: يَنْطَلِقُ أَحَدُكُمْ فَيَرْكَبُ الْحُمُوقَةَ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا

ابْنَ عَبَّاسٍ! يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! وَإِنَّ اللهَ قَالَ: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا﴾ [الطلاق:٢]، وَإِنَّكَ لَمْ تَتَّقِ اللهَ، فَلَمْ أَجِدْ لَكَ مَخْرَجاً، عَصَيْتَ رَبَّكَ، وَبَانَتْ مِنْكَ امْرَأَتُكَ، وَإِنَّ اللهَ قَالَ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ﴾ [الطلاق:١] فِي قُبُلِ عِدَّتِهِنَّ.

**لە موجاهیدەوە، وتی: لای ئیبن عەباس بووم، پیاوێك هات بۆ لای و وتی: ئەو ژنەکەی سێ بە سێ تەلاق داوە، وتی: ئەو بێدەنگ بوو، تا وا گومانم برد ژنەکەی دەگێڕێتەوە بۆ لای، پاشان وتی: یەکێك لە ئێوە دەڕوات و سواری گەمژەیی دەبێت و پاشان دەڵێت: ئەی ئیبن عەباس، ئەی ئیبن عەباس، خودا فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا﴾ [الطلاق:٢]، تۆ لە خودا نەترساوی، بۆیە دەروویەکم بۆ تۆ نەبینییەوە، لە پەروەردگارت یاخی بوویت و ژنەکەت لێ جیابوویەوە، خودا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ﴾ [الطلاق:١]، لە هاتن و سەرەتای عیددەکەیانەوە.**

- وفي رواية عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: إِذَا قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ ثَلاثاً، بِفَمٍ وَاحِدٍ؛ فَهِيَ وَاحِدَةٌ.
وفي رواية جَعَلَهُ مَنْ قَوْلَ عِكْرِمَةَ. [د٢١٩٧]

* صحيح.

**لە ریوایەتێکدا لە عیکریمەوە، لە ئیبن عەباسەوە: گەر وتی: تۆ سێ بە سێ تەلاق دراوی، بە یەك دەم و زمان، ئەوە بریتییە لە یەك[1]، لە ریوایەتێکی تردا کردوویەتی بە قسەی عیکریمە.**

## ٤- دەروازەی: تەلاقی حەیزدار

**٢٤٥٤-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حائِضٌ، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَسَأَلَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم

---

[1] **واتە: بریتییە لە یەك تەلاق-و.**

عَنْ ذلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْها حَتَّى تَطْهُر، ثُمَّ تَحِيضَ ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ، وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمرَ الله أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ). [خ٥٢٥١ (٤٩٠٨)/ م١٤٧١]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): ئەو لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ژنەکەی تەڵاق دا لە حەیزدا بوو، عومەری کوڕی خەتاب دەربارەی ئەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(فەرمانی پێ بکە با بیگێڕێتەوە، پاشان لای خۆی رایبگرێت تا پاك دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتە حەیزەوە و پاشان پاك دەبێتەوە، پاشان گەر لەدوای ئەوە ویستی لای خۆی دەیهێڵێتەوە، گەر بشخوازێ تەڵاقی دەدات بەرلەوەی لەگەڵی جووتبێت، ئەوە ئەو عیددەیە خودا فەرمانی کردووە ژنی بۆ تەڵاق بدرێت)**.

- وفي رواية لمسلم: (مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لْيُطَلِّقْهَا طَاهِراً أَوْ حَامِلاً).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: **(فەرمانی پێ بکە با بیگێڕێتەوە و پاشان لەسەر پاکی یان حەملداری تەڵاقی بدات)**.

- وفي رواية له: قُلْتُ: فَاعْتَدَدْتَ بِتِلْكَ التَّطْلِيقَةِ الَّتِي طَلَّقْتَ، وَهْيَ حَائِضٌ؟ قَالَ: مَا لِيَ لاَ أَعْتَدُّ بِهَا؟ وَإِنْ كُنْتُ عَجَزْتُ وَاسْتَحْمَقْتُ.

**لە ریوایەتێکی تری موسلیمدا: وتم: ئایا تۆ بەو تەڵاقدانەی تەڵاقتدا عیددەت لێ دەگرت و ئەو لە حەیزدا بوو؟ وتی: بۆچی بەوە عیددەی لێ نەگرم؟ گەر من دەستەوسان بم و گەمژە بم.**

## ٥- دەروازەی: حوکمەکانی تەڵاق و تەڵاقی سێ بە سێ

**٢٤٥٥**- (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ الطَّلاَقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبِي بَكْرٍ وَسَنَتَيْنِ مِنْ خِلاَفَةِ عُمَرَ، طَلاَقُ الثَّلاَثِ: وَاحِدَةٌ. فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: إِنَّ النَّاسَ قَدِ اسْتَعْجَلُوا فِي أَمْرٍ قَدْ كَانَتْ لَهُمْ فِيهِ أَنَاةٌ ، فَلَوْ أَمْضَيْنَاهُ عَلَيْهِمْ! فَأَمْضَاهُ عَلَيْهِمْ. [م١٤٧٢]

(م) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: لە سەردەمی ئەبوبەکر و دوو ساڵ خەلافەتی عومەر تەڵاقی سێ بە سێ یەك بوو، عومەری کوڕی خەتاب وتی: خەڵکی پەلە دەکەن لە کاروبارێك کاتی خۆی تیایدا ماوە و چاوەڕوانییان هەبوو، گەر بتوانین بەسەریاندا تێیپەڕێنین[1]، بۆیە بەسەریاندا تێیپەڕاند.

**٢٤٥٦**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: طَلَّقَ رُكَانَةُ امْرَأَتَهُ ثَلاثاً فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ، فَحَزِنَ عَلَيْهَا حُزْناً شَدِيداً، فَسأَلَهُ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**كَيْفَ طَلَّقْتَهَا؟**)، قَالَ: طَلَّقْتُهَا ثَلاَثاً، فَقَالَ: (**فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ؟**) ، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (**فَإِنَّمَا تِلْكَ وَاحِدَةٌ فَأَرْجِعْهَا إِنْ شِئْتَ**)، فَرَاجَعَهَا، فَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما يَرَى أَنَّمَا الطَّلاَقُ عِنْدَ كُلِّ طُهْرٍ، فَتِلْكَ السُّنَّةُ التي كَانَ عَلَيْهَا النَّاسُ، وَالَّتِي أَمَرَ الله لَهَا ﴿**فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ**﴾ [الطلاق:١]. [هق٧/٣٣٧]

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: روکانە ژنەکەی خۆی لە یەك دانیشتندا سێ بە سێ تەڵاق دا، دواتر بۆ ژنەکەی دڵتەنگییەکی رووی لێ کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری لێ کرد: (**چۆن تەڵاقت دا**)، وتی: سێ بە سێ تەڵاقم دا، فەرمووی: (**لە یەك دانیشتندا؟**)، وتی: بەڵێ، فەرمووی: (**ئەوە یەك تەڵاقە گەر دەخوازی بیگێڕەرەوە**)، ئەویش ژنەکەی گێڕایەوە، ئیبن عەباس(خوایان لێ رازی بێت) پێیوابوو تەڵاق لە هەموو پاکێتییەکدایە، ئەوە ئەو سوننەتە بوو خەڵکی لەسەر بوون و بۆ ئەوە خودا فەرمانی کردووە: ﴿**فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ**﴾ [الطلاق:١].

* وَهَـٰذَا الإِسْنَادُ لاَ تَقُومُ بِهِ الْحُجَّةُ، مَعَ ثَمَانِيَةٍ رَوَوْا عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فُتْيَاهُ بِخِلاَفِ ذَلِكَ.

ئەم ئیسنادە بەڵگەی پێ راست نابێتەوە لەگەڵ هەشت کەس لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) پێچەوانەی ئەوە ریوایەتیان لێوە کردووە.

---

[1] واتە: گەر بتوانین تەڵاقی سێ بە سێ بە سێ حساب بکەین، نەك بە یەك–و.

## ٦- دەروازەی: ئەو ئافرەتەی سێ بە سێ[١] تەڵاق دراوە بۆ مێردەکەی حەڵاڵ نییە تا مێرد بە کەسێکی تر دەکاتەوە

**٢٤٥٧-** (ق) عَنْ عائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رِفاعَةَ الْقُرَظِيَّ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فَبَتَّ طَلاَقَهَا، فَتَزَوَّجَهَا بَعْدَهُ عَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ الزُّبَيْرِ، فَجَاءَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّها كانَتْ عِنْدَ رِفاعَةَ فَطَلَّقَهَا آخِرَ ثَلاَثِ تَطْلِيقَاتٍ، فَتَزَوَّجَهَا بَعْدَهُ عَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ الزَّبِيرِ، وَإِنَّهُ وَاللهِ ما مَعَهُ يَا رَسُولَ الله إِلاَّ مِثْلُ هذِهِ الْهُدْبَةِ . لِهُدْبَةٍ أَخَذَتْهَا مِنْ جِلْبَابِهَا .! قالَ: وَأَبُو بَكْرٍ جالِسٌ عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَابْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ جالِسٌ بِبَابِ الحُجْرَةِ لِيُؤْذَنَ لَهُ، فَطَفِقَ خالِدٌ يُنَادِي أَبَا بَكْرٍ: يَا أَبَا بَكْرٍ، أَلاَ تَزْجُرُ هذِهِ عَمَّا تَجْهَرُ بِهِ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟! وَما يَزِيدُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى التَّبَسُّمِ، ثُمَّ قالَ: **(لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفاعَةَ؟! لاَ، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ ، وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ)**. [خ٦٠٨٤ (٢٦٣٩)/ م١٤٣٣]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): ریفاعەی قورزی ژنەکەی خۆی تەڵاق دا و تەڵاقەکەی یەکلابوویەوە، لەدوای ئەو عبدالرحمانی کوڕی زوبەیر هاوسەرگیری لەگەڵ کرد، ژنەکە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من لای ریفاعە بووم و بە دوایینی سێ تەڵاقەکە تەڵاقیداوم و لەدوای ئەو عبدالرحمانی کوڕی زوبەیر مارەی کردووم، سوێند بە خودا، ئەو تەنها وەك ئەم پۆشاکەی لە لایە-لایەکی سەرپۆشەکەی بە دەستەوە گرتبوو[٢]- وتی: ئەبوبەکر لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو و کوڕەکەی سەعیدی کوڕی عاصیش لە دەرگای ژوورەکە دانیشتبوو بۆئەوەی مۆڵەت بدرێت، خالید بەردەوام بانگی دەکرد: ئەی ئەبوبەکر، ئەرێ ئەم ژنە دەمکوت ناکەی لەوەی لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیڵێت؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەنها خەندەی زیاد دەکرد، پاشان فەرمووی: (لەوانەیە بتەوێ بگەڕێیەوە بۆ لای ریفاعە؟! نەخێر، تا تۆ لە شیرینییەکەی ئەو[٣] دەچێژی و ئەو لە شیرینییەکەی تۆ دەچێژێت).**

---

[١] سێ بە سێ لە سێ دانیشتنی جیاوازدا-و.

[٢] واتە: بە سەرپۆشەکە پێغەمبەری تێگەیاند هێنی پیاوەکەی وەك ئەو پەڕۆیە شلە-و.

[٣] واتە: عبدالرحمانی کوڕی زوبەیر-و.

**٢٤٥٨**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: فِي الرَّجُلِ تَكُونُ لَهُ الْمَرْأَةُ يُطَلِّقُهَا، ثُمَّ يَتَزَوَّجُهَا رَجُلٌ آخَرُ، فَيُطَلِّقُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَتَرْجِعَ إِلَى زَوْجِهَا الْأَوَّلِ؟ قَالَ: **(لاَ، حَتَّى تَذُوقَ الْعُسَيْلَةَ)**. [ن٣٤١٤/ جه١٩٣٣]

* صحيح.

**لە ئیبن عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): دەربارەی پیاوێك ژنی هەیە و تەڵاقی دەدات و پاشان پیاوێکی تر هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات، و تەڵاقی دەدات بەرلەوەی بچێتە لای، ئایا دەگەڕێتەوە بۆ لای پیاوەکەی یەکەمجاری؟ فەرمووی: (نەخێر، تا ژنەکە شیرینییەکە دەچێژێت[1])**.

## ٧- دەروازەی: تەڵاق لە (إغلاق- تووڕەیی یان ناچارکردن)دا

**٢٤٥٩**– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(لاَ طَلاَقَ، وَلاَ عَتَاقَ فِي غِلاَقٍ)**. [د٢١٩٣/ جه٢٠٤٦]

**لە عائیشەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (لە "غِلاق[2]"دا تەڵاق و ئازاد کردن نییە)**.

- ولفظ ابن ماجه: **(لاَ طَلاَقَ، وَلاَ عَتَاقَ فِي إِغْلاَقٍ)**.

* حسن.

**لەفزەکەی ئیبن ماجە: (لە "إغْلاق"دا تەڵاق و ئازاد کردن نییە)**.

## ٨- دەروازەی: تەڵاقی نەخۆش و ناچارکراو و سەرخۆش و گاڵتەکەر

**٢٤٦٠**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(ثَلاَثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ، وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: النِّكَاحُ، وَالطَّلاَقُ، وَالرَّجْعَةُ)**. [د٢١٩٤/ ت١١٨٤/ جه٢٠٣٩]

* صحيح.

---

[1] واتە: تا لەگەڵ مێردی دووەمی جووت دەبێت–و.

[2] واتە: تووڕەیی یان ناچارکردن–و.

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سیان بەڕاستبوونیان ڕاستییە و شۆخیبوونیان ڕاستییە: هاوسەرگیری، و تەڵاق، و گێڕانەوە[1]).**

**٢٤٦١**– عَنْ مَالِكٍ: أَنَّهُ سَمِعَ رَبِيعَةَ بْنَ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقُولُ: بَلَغَنِي أَنَّ امْرَأَةَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ سَأَلَتْهُ أَنْ يُطَلِّقَهَا، فَقَالَ: إِذَا حِضْتِ ثُمَّ طَهُرْتِ، فَآذِنِينِي. فَلَمْ تَحِضْ حَتَّى مَرِضَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، فَلَمَّا طَهُرَتْ آذَنَتْهُ، فَطَلَّقَهَا الْبَتَّةَ، أَوْ تَطْلِيقَةً لَمْ يَكُنْ بَقِيَ لَهُ عَلَيْهَا مِنَ الطَّلاَقِ غَيْرُهَا، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ يَوْمَئِذٍ مَرِيضٌ، فَوَرَّثَهَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ مِنْهُ بَعْدَ انْقِضَاءِ عِدَّتِهَا.

* حديث صحيح.		[ط١٢٠٩]

**لە مالیکەوە: ئەو گوێی لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبی عبدالرحمن بوو دەیوت: پێمگەیشتووە ژنەکەی عبدالرحمانی کوڕی عەوف داوای لە عبدالرحمان کرد تەڵاقی بدات، وتی: گەر کەوتییە حەیزەوە و پاشان پاکبوویەوە ئاگادارم بکە، ئەو نەکەوتە حەیزەوە تا عبدالرحمانی کوڕی عەوف نەخۆشکەوت، کاتێک پاکبوویەوە ئاگاداری کرد بە تەڵاقی سێ بە سێ تەڵاقی دا، یان تەڵاقدانێك تەڵاقی بەسەریەوە نەمێنێت، لەو ڕۆژەدا عبدالرحمانی کوڕی عەوف نەخۆش بوو، دوای تەواوبوونی عیددەکەی عوسمانی کوڕی عەفان لە عبدالرحمانەوە میراتی پێدا[2].**

**٤٦٢٢**– عَنْ ثَابِتِ بْنِ الْأَحْنَفِ: أَنَّهُ تَزَوَّجَ أُمَّ وَلَدٍ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: فَدَعَانِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ فَجِئْتُهُ، فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ، فَإِذَا سِيَاطٌ مَوْضُوعَةٌ، وَإِذَا قَيْدَانِ مِنْ حَدِيدٍ، وَعَبْدَانِ لَهُ قَدْ أَجْلَسَهُمَا، فَقَالَ: طَلِّقْهَا؛ وَإِلاَّ وَالَّذِي يُحْلَفُ بِهِ فَعَلْتُ بِكَ كَذَا وَكَذَا، قَالَ فَقُلْتُ: هِيَ الطَّلاَقُ أَلْفاً.

قَالَ: فَخَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهِ، فَأَدْرَكْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ بِطَرِيقِ مَكَّةَ، فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي كَانَ مِنْ شَأْنِي، فَتَغَيَّظَ عَبْدُ اللهِ وَقَالَ: لَيْسَ ذَلِكَ بِطَلاَقٍ، وَإِنَّهَا لَمْ تَحْرُمْ عَلَيْكَ، فَارْجِعْ إِلَى أَهْلِكَ. قَالَ:

---

[1] مەبەست بە "گێڕنەوە" بریتییە لە "الرجعة"–و.

[2] عوسمان(خوا لێی ڕازی بێت) میراتی پێدا لەبەر پەیوەستبوونی نەخۆشییەکەی عبدالرحمان–کە ژنەکەی تێدا تەڵاق دا– بە مردنەکەیەوە–و.

فَلَمْ تُقْرِرْنِي نَفْسِي حَتَّى أَتَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ . وَهُوَ يَوْمَئِذٍ بِمَكَّةَ أَمِيرٌ عَلَيْهَا . فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي كَانَ مِنْ شَأْنِي، وَبِالَّذِي قَالَ لِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: فَقَالَ لِي عَبْدُ اللهِ بْنُ الزُّبَيْرِ: لَمْ تَحْرُمْ عَلَيْكَ، فَارْجِعْ إِلَى أَهْلِكَ، وَكَتَبَ إِلَى جَابِرِ بْنِ الْأَسْوَدِ الزُّهْرِيِّ . وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ .، يَأْمُرُهُ أَنْ يُعَاقِبَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَأَنْ يُخَلِّيَ بَيْنِي وَبَيْنَ أَهْلِي. قَالَ: فَقَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، فَجَهَّزَتْ صَفِيَّةُ امْرَأَةُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ امْرَأَتِي حَتَّى أَدْخَلَتْهَا عَلَيَّ بِعِلْمِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، ثُمَّ دَعَوْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَوْمَ عُرْسِي لِوَلِيمَتِي، فَجَاءَنِي. [ط١٢٤٥]

لە سابیتی كوڕی ئەحنەفـەوە: ئـەو هاوسـەرگیری كـرد لەگـەڵ دایكـی منداڵـەكانی عبدالرحمانی كوڕی زەیدی كوڕی خەتاب، وتی: عەبدوڵای كوڕی عبـدالرحمانی كـوڕی زەیدی كوڕی خەتاب بانگی كـردم، منـیش هـاتم بـۆ لای، و چـوومە ژوورەوە بـۆ لای، بینیم قەمچی و كۆت و بەندی ئاسن دانراوە و دوو بەندەی خۆی دانیشـاندووە، وتــی: تەڵاقی بدە، ئەگینا سوێند بەو كەسەی سوێندی پێ دەدرێت ئاوا و ئاوات لێ دەكەم، وتی: وتم: ئەو هەزار جار تەڵاقی كەوتبێت.

لای ئەو چوومە دەرەوە، لە رێگەی مەككە بـە عەبـدوڵای كـوڕی عومـەر گەیشـتم، هەواڵی ئەوەم پێدا لە من روویدابوو، عەبدوڵا نارەحەت بوو و وتی: ئەوە تـەڵاق نییـە، و ئـەو لـە تـۆ حـەرام نـەبووە، و بگـەڕێوە بـۆ لای خانەوادەكـەت، وتــی: نەفسـم دڵنیانەبوویەوە تا هاتم بۆ لای عەبدوڵای كوڕی زوبەیر—ئەو لەو رۆژانەدا لە مەككە بوو و ئەمیر بوو لەسەر مەككە— هەواڵم ئەوەم پێدا لە مـن روویـدابوو و بـەوەی عەبـدوڵای كوڕی عومەر بە منی وت، وتی: عەبدوڵای كوڕی زوبەیر پێی وتم: لە تۆ حەرام نـەبووە و بگەڕێوە بۆ لای خانەوادەكەت، بۆ جـابری كـوڕی ئەسـوەدی زوهـری—ئـەو ئـەمیری مەدینە بوو— نووسی، فەرمانی پێ كرد سـزای عەبـدوڵای كـوڕی عبـدالرحمان بـدات و نەهێڵێ بكەوێتە نێوان من و خانەوادەكەم، وتی: هاتم بۆ مەدینـە، صـەفییە—ژنەكـەی عەبدوڵای كوڕی عومەر— ژنەكەمی ئامادە كرد تا هێنایە ژوورەوە بۆ لام بـە ئاگـاداری عەبدوڵای كـوڕی عومـەر، پاشـان لـە رۆژی زەماوەندەكـەم عەبـدوڵای كـوڕی عومـەرم بانگهێش كرد بۆ وەلیمەكەم، ئەویش هات بۆ لام.

**٢٤٦٣**– عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ سُئِلاَ عَنْ طَلاَقِ السَّكْرَانِ؟ فَقَالاَ: إِذَا طَلَّقَ السَّكْرَانُ جَازَ طَلاَقُهُ، وَإِنْ قَتَلَ قُتِلَ بِهِ. [ط١٢٤٩]

**لە مالیكەوە، ئەو پێیگەیشتووە: پرسیاركراوە لـە سـەعیدی كـوڕی موسـەییەب و سولەیمانی كوڕی یەسار دەربارەی تەڵاقی سەرخۆش؟ وتیان: گەر سەرخۆش تـەڵاق بدات تەڵاقەكەی دروستە، و گەر بكوژێت بە كەسەكە دەكوژرێتەوە.**

## ٩- دەروازەی: تەڵاقی نەفام(كەم ئەقڵ)

**٢٤٦٤**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**كُلُّ طَلاَقٍ جَائِزٌ؛ إِلاَّ طَلاَقَ الْمَعْتُوهِ الْمَغْلُوبِ عَلَى عَقْلِهِ**). [ت١١٩١]

* ضعيف جدا.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەموو تەلاقێك رێگە پێدراوە، جگە لە تەڵاقی نەفامی ئەقڵ بەزیو).**

## ١٠- دەروازەی: دەربارەی كینایەكانی تەڵاق

**٢٤٦٥**– عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَزْمٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ قَالَ لَهُ: الْبَتَّةُ مَا يَقُولُ النَّاسُ فِيهَا؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَقُلْتُ لَهُ: كَانَ أَبَانُ بْنُ عُثْمَانَ يَجْعَلُهَا وَاحِدَةً، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ: لَوْ كَانَ الطَّلاَقُ أَلْفاً مَا أَبْقَتِ الْبَتَّةُ مِنْهَا شَيْئاً، مَنْ قَالَ: الْبَتَّةَ؛ فَقَدْ رَمَى الْغَايَةَ الْقُصْوَى. [ط١١٧٠]

**لە ئەبی بەكری كوڕی حەزمەوە: عومەری كوڕی عبدالعزیز پێـی وت: خـەڵكی چـی دەڵێن دەربارەی تـەڵاقی سـێ بـە سـێ؟ وتـی: وتم: ئـەبانی كـوڕی عوسمـان بـە یـەك تەڵاقی دادەنا، عومەری كوڕی عبدالعزیز وتی: گەر تەڵاق هەزار بێـت تـەڵاقی سـێ بـە سێ هیچی ناهێڵێتەوە، هەر كەس بڵێ: سێ بە سێ، ئەوپەڕی ئامانجی هەڵداوە.**

**٢٤٦٦**– عَنِ ابْنِ شِهَابٍ: أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ كَانَ يَقْضِي فِي الَّذِي يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ: أَنَّهَا ثَلاَثُ تَطْلِيقَاتٍ. [ط١١٧١]

**لە ئیبن شیهابەوە: مەروانی کوڕی حەکەم بە سێ تەڵاق قەزاوەتی دەکرد بە تەڵاقی ئەو کەسەی سێ بە سێ ژنەکەی خۆی تەڵاق دەدات.**

**٢٤٦٧**– عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَقُولُ فِي الْخَلِيَّةِ وَالْبَرِيَّةِ: إِنَّهَا ثَلَاثُ تَطْلِيقَاتٍ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا. [ط١١٧٤]

* إسناده صحيح.

**لە نافیعەوە: عەبدوڵای کوڕی عومەر دەربارەی "الخلية والبرية"[1] دەیوت: هەریەك لەو دوانە سێ تەڵاقدانە.**

## ١١- دەروازەی: تەڵاقی هەڵواسراو بە مەرجێکەوە

**٢٤٦٨**– عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: فِي رَجُلٍ قَالَ لِامْرَأَتِهِ: إِنْ فَعَلْتِ كَذَا وَكَذَا، فَهِيَ طَالِقٌ فَتَفْعَلُهُ، قَالَ: هِيَ وَاحِدَةٌ، وَهُوَ أَحَقُّ بِهَا. [هق٧/٣٥٦]

**لە ئیبن مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: دەربارەی پیاوێك بە ژنەکەی خۆی وتووە: گەر ئەوە و ئەوە بکەی ئەو تەڵاق دراوە، ژنەکەش ئەوە دەکات[2]، وتی: ئەوە بریتییە لە یەك تەڵاق و ئەو لەپێشترە بە ژنەکەی.**

**٢٤٦٩**– عَنْ إِبْرَاهِيمَ: فِي رَجُلٍ قَالَ لِامْرَأَتِهِ: هِيَ طَالِقٌ إِلَى سَنَةٍ، قَالَ: هِيَ امْرَأَتُهُ يَسْتَمْتِعُ مِنْهَا إِلَى سَنَةٍ. [هق٧/٣٥٦]

**لە ئیبراهیمەوە: دەربارەی پیاوێك بە ژنەکەی دەڵێت: ئەو بۆ ماوەی ساڵێك تەڵاق دراوە، وتی: ئەو ژنەیەتی تا ساڵێك خۆشی لێ دەبینێت[3].**

---

[1] "الخلية أو البرية" لەو دەستەواژانەن تەڵاقی سێ بە سێیان پێ دەدرێت–و.

[2] واتە: ژنەکە ئەو کارە دەکات پیاوەکە تەڵاقی لێخواردووە نەیکات–و.

[3] واتە: دوای ساڵەکە تەڵاقی دەکەوێت–و.

**٢٤٧٠-** عَنِ الشَّعْبِي فِي رَجُلٍ قَالَ لِامْرَأَتِهِ: أَنْتِ طَالِقٌ إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ، قَالَ: هِيَ امْرَأَتُهُ يَوْمَ طَلَّقَهَا حَتَّى يَجِيءَ رَمَضَانُ. [هق٧/٣٥٦]

**لە شەعبییەوە، دەربارەی پیاوێك بە ژنەكەی دەڵێت: گەر رەمەزان هات تۆ تەڵاقت كەوتبێت، وتی: ئەو ژنیەتی لەو رۆژەوە تەڵاقیداوە تا رەمەزان دێت.**

## ١٢- دەروازەی: تەڵاق بەر لە هاوسەرگیری

**٢٤٧١-** عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ طَلاَقَ قَبْلَ نِكَاحٍ، وَلاَ عِتْقَ قَبْلَ مِلْكٍ**). [جه٢٠٤٨]

* حسن صحيح.

**لە میسوەری كوڕی مەخرەمەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (بەر لە هاوسەرگیری تەڵاق نییە و بەر لە موڵكداری رزگاركردنی كۆیلە نییە).**

**٢٤٧٢-** عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي عَيَّاشٍ الْأَنْصَارِيِّ: أَنَّهُ كَانَ جَالِساً مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ وَعَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: فَجَاءَهُمَا مُحَمَّدُ بْنُ إِيَاسِ بْنِ الْبُكَيْرِ فَقَالَ: إِنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثاً قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَمَاذَا تَرَيَانِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الزُّبَيْرِ: إِنَّ هَذَا الْأَمْرَ مَا لَنَا فِيهِ قَوْلٌ، فَاذْهَبْ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ فَإِنِّي تَرَكْتُهُمَا عِنْدَ عَائِشَةَ، فَسَلْهُمَا، ثُمَّ ائْتِنَا فَأَخْبِرْنَا. فَذَهَبَ فَسَأَلَهُمَا، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ لِأَبِي هُرَيْرَةَ: أَفْتِهِ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، فَقَدْ جَاءَتْكَ مُعْضِلَةٌ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: الْوَاحِدَةُ تُبِينُهَا، وَالثَّلاَثَةُ تُحَرِّمُهَا حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ.
وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ مِثْلَ ذَلِكَ. [ط١٢٠٦]

* حديث صحيح.

**لە موعاویەی كوڕی ئەبی عەییاشی ئەنصارییەوە: ئەو لەگەڵ عەبدوڵای كوڕی زوبەیر و عاصیمی كوڕی عومەری كوڕی خەتاب دانیشتبوو محەمەدی كوڕی ئیاسی كوڕی بوكەیر هات بۆ لایان و وتی: پیاوێك لە ئەهلی بادیە ژنەكەی سێ بە سێ تەڵاقداوە بەرلەوەی بچێتە لای، ئێوە چۆنی دەبینن؟ عەبدوڵای كوڕی زوبەیر وتی: ئێمە قسەمان لەو كارەدا نییە، برۆ بۆ لای عەبدوڵای كوڕی عەباس و ئەبو هورەیرە،**

من ئەوانم لای عائیشە بەجێهێڵا، پرسیاریان لێ بکە و پاشان وەرەوە بۆ لامان و هەواڵمان پێ بدە، ڕۆیشت و پرسیاری لێکردن، ئیبن عەباس بە ئەبو هورەیرەی وت: فتوای بۆ بدە، ئەی ئەبو هورەیرە، گرێکوێرەیەکت بۆ هاتووەتە پێش، ئەبو هورەیرە وتی: یەك[1] جیای دەکاتەوە و سێ حەرامی دەکات تا مێردێکی تر دەکاتەوە.

ئیبن عەباسیش هەر وەك ئەوەی وت.

## ١٣- دەروازەی: تەڵاق بۆ ئەو کەسەیە دەست بۆ لاق دەبات[2]

**٢٤٧٣**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ سَيِّدِي زَوَّجَنِي أَمَتَهُ، وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنِي وَبَيْنَهَا، قَالَ: فَصَعِدَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْمِنْبَرَ فَقَالَ: (**يَا أَيُّهَا النَّاسُ، مَا بَالُ أَحَدِكُمْ يُزَوِّجُ عَبْدَهُ أَمَتَهُ، ثُمَّ يُرِيدُ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَهُمَا؟! إِنَّمَا الطَّلَاقُ لِمَنْ أَخَذَ بِالسَّاقِ**). [جه٢٠٨١]

* حسن.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، سەردارەکەم کەنیزەکەکەی لێ مارە کردووم، ئەو دەیەوێت من لە ئەو جیابکاتەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرکەوتە سەر مینبەر و فەرمووی: **(ئەی خەڵکینە، یەکێك لە ئێوە چی بەسەرهاتووە کەنیزەکەکەی لە بەندەکەی مارە دەکات، پاشان دەیەوێ لە یەکتریان جیابکاتەوە؟ تەڵاق بۆ ئەو کەسەیە دەست بۆ لاق دەبات).**

## ١٤- دەروازەی: کەسێك کاروباری ژنەکەی دەداتە دەستی

**٢٤٧٤**– عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي جَعَلْتُ أَمْرَ امْرَأَتِي فِي يَدِهَا، فَطَلَّقَتْ نَفْسَهَا، فَمَاذَا تَرَى؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: أُرَاهُ كَمَا قَالَتْ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لاَ تَفْعَلْ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ! فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَنَا أَفْعَلُ؟ أَنْتَ فَعَلْتَهُ. [ط١١٧٧]

* اسناده منقطع.

---

(1) واتە: یەك تەڵاق–و.

(2) دەست بۆ لاق دەبات: واتە: دەست بۆ لاقی ژنەکە دەبات، واتە: مێردی ژنەکە–و.

له مالیکەوە: ئەو پێیگەیشتووە: پیاوێك هات بۆ لای عەبدوڵای کوڕی عومەر و وتی: ئەی باوکی عبدالرحمن، من کاروباری ژنەکەم داوەتە دەست خۆی، ئەو نەفسی خۆی تەلاقداوە، تۆ چۆنی دەبینی؟ عەبدوڵای کوڕی عومەر وتی: بەو جۆرەی دەبینم وتویەتی، پیاوەکە وتی: ئەوە مەکە، باوکی عبدالرحمن، ئیبن عومەر وتی: من ئەنجامی دەدەم؟ تۆ ئەنجامتداوە[1].

**٢٤٧٥**- عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ: أَنَّهُ كَانَ جَالِساً عِنْدَ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، فَأَتَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي عَتِيقٍ وَعَيْنَاهُ تَدْمَعَانِ، فَقَالَ لَهُ زَيْدٌ: مَا شَأْنُكَ؟ فَقَالَ: مَلَّكْتُ امْرَأَتِي أَمْرَهَا، فَفَارَقَتْنِي، فَقَالَ لَهُ زَيْدٌ: مَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: الْقَدَرُ، فَقَالَ زَيْدٌ: ارْتَجِعْهَا إِنْ شِئْتَ، فَإِنَّمَا هِيَ وَاحِدَةٌ، وَأَنْتَ أَمْلَكُ بِهَا. [ط١١٧٩]

* إسناده صحيح.

لە خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیتەوە: ئەو لای زەیدی کوڕی سابیت دانیشتبوو محەمەدی کوڕی ئەبی عەتیق هات بۆ لای و چاوەکانی فرمێسکی هەڵدەوەراند، زەید پێی وت: چیتە؟ وتی: کاروباری ژنەکەم دایە دەست خۆی ئێستا لێم جیابووەتەوە، زەید پێی وت: چی هەڵینای بۆ ئەو کارە؟[2] وتی: قەدەر، زەید وتی: گەر دەخوازی بیگێڕەوە، ئەوە بریتییە لە یەك تەلاق و تۆ خاوەندارتری پێی.

## ١٥- دەروازەی: سەرپشك کردن تەلاق نییە

**٢٤٧٦**- (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: خَيَّرَنَا رسول الله صلّى الله عليه وسلّم، فَاخْتَرْنَا اللهَ وَرَسُولَهُ، فَلَمْ يَعُدَّ ذلِكَ عَلَيْنَا شَيْئاً. [خ٥٢٦٢/ م١٤٧٧]

---

[1] واتە: ئەوە من نیم لە یەکترتان جیادەکەمەوە، تۆ بۆ خۆت تەلاقەکەت داوەتە دەست ژنەکە و لە تۆ جیابووەتەوە-و.

[2] واتە: چی وای لێکردی تەلاقەکە بدەیە دەست ژنەکەت؟-و.

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرپشکی کردین، ئێمەش خودا و پێغەمبەرمان هەڵبژارد، ئەوە لەسەر ئێمە شتێك لە عیددەی دیاری نەکرد.

■ وفي رواية لهما: عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عائِشَةَ عَنِ الْخِيَرَةِ؟ فَقَالَتْ: خَيَّرَنَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، أَفَكَانَ طَلاَقاً؟ [خ٥٢٦٣]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان: لە مەسرووقەوە، وتی: پرسیارم لە عائیشە کرد دەربارەی سەرپشککردن؟ وتی: پێغەمبەر(ﷺ) سەرپشکی کردین، ئایا ئەوە تەڵاق بوو؟[١]

٢٤٧٧- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ: أَنَّهَا خَطَبَتْ عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ قُرَيْبَةَ بِنْتَ أَبِي أُمَيَّةَ، فَزَوَّجُوهُ، ثُمَّ إِنَّهُمْ عَتَبُوا عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَقَالُوا: مَا زَوَّجْنَا إِلاَّ عَائِشَةَ، فَأَرْسَلَتْ عَائِشَةُ إِلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَجَعَلَ أَمْرَ قُرَيْبَةَ بِيَدِهَا، فَاخْتَارَتْ زَوْجَهَا، فَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ طَلاَقاً.

* إسناده صحيح. [ط١١٨١]

[وانظر: **٣٦٩٧**].

لە عائیشەوە، دایکی باوەڕداران: ئەو قورەیبەی کچی ئەبی ئومەیەی بۆ عبدالرحمانی کوڕی ئەبوبەکر خواست، پاشان ئەوان سەرزەنشتی عبدالرحمانیان کرد و وتیان: ئێمە تەنها بە عائیشەمان داوە، عائیشە ناردی بەدوای عبدالرحماندا و ئەوەی بۆ باس کرد، عبدالرحمان کاروباری قورەیبەی دایە دەست قورەیبە، ئەویش مێردەکەی خۆی هەڵبژارد، ئەوەش نەبووە تەڵاق.

## ١٦- دەروازەی: کەسێك فێڵ لە ژنێك بکات

٢٤٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ خَبَّبَ زَوْجَةَ امْرِئٍ، أَوْ مَمْلُوكَهُ؛ فَلَيْسَ مِنَّا). [د٢١٧٥/ ٥١٧٠]

* صحيح.

---

[١] پرسیارەکە ئینکارییە، واتە: ئەوە تەڵاق نەبوو-و.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس ژنی پیاوێك یان کەنیزەکێکی بە موڵککراو بخەڵەتێنێ لە ئێمە نییە).**

■ وفي رواية: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ خَبَّبَ امْرَأَةً عَلَى زَوْجِهَا، أَوْ عَبْداً عَلَى سَيِّدِهِ).

لە ریوایەتێکدا: (**لە ئێمە نییە کەسێك ژنێ لە مێردەکەی فریو بدات، یان بەندەیەك لە سەردارەکەی**[1]).

## ١٧- دەروازەی: گێڕانەوە و شایەتیدان لەسەری

**٢٤٧٩**- عَنْ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم طَلَّقَ حَفْصَةَ، ثُمَّ رَاجَعَهَا.

* صحيح. [د٢٢٨٣/ ن٣٥٦٢/ جه٢٠١٦/ مي٢٣١٠]

**لە عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) حەفصەی تەڵاقدا و پاشان گێڕایەوە.**

**٢٤٨٠**- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّه سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ، ثُمَّ يَقَعُ بِهَا، وَلَمْ يُشْهِدْ عَلَى طَلاَقِهَا، وَلاَ عَلَى رَجْعَتِهَا؟ فَقَالَ: طَلَّقْتَ لِغَيْرِ سُنَّةٍ، وَرَاجَعْتَ لِغَيْرِ سُنَّةٍ، أَشْهِدْ عَلَى طَلاَقِهَا وَعَلَى رَجْعَتِهَا وَلاَ تَعُدْ. [د٢١٨٦/ جه٢٠٢٥]

* صحيح.

**لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە: ئەو پرسیاری لێکرا دەربارەی ئافرەتێك ژنەکەی خۆی تەڵاق دەدا و پاشان لەگەڵی جووت دەبێت و شایەت لەسەر تەڵاقەکەی و لەسەر گێڕانەوەکەی ناگرێت؟ وتی: بەبێ سوننەت تەڵاقیداوە و بەبێ سوننەت گێڕاویەتەوە، شایەت بگرە لەسەر تەڵاقدانی و لەسەر گێڕانەوەی و عیددە سەرژمێر مەکە.**

---

[1] واتە: یان بەندەیەك فریو بدات لە سەردارەکەی-و.

## ١٨- دەروازەی: خەرجی و شوێنی نیشتەجێبوون بۆ ئافرەتێك سێ بە سێ تەڵاق درابێت

**٢٤٨١-** (م) عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ: أَنَّ أَبَا عَمْرِو بْنَ حَفْصٍ طَلَّقَهَا الْبَتَّةَ، وَهُوَ غَائِبٌ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا وَكِيلُهُ بِشَعِيرٍ، فَسَخِطَتْهُ. فَقَالَ: واللهِ! مَا لَكِ عَلَيْنا مِنْ شَيْءٍ. فَجَاءَتْ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: (**لَيْسَ لَكِ عَلَيْهِ نَفَقَةٌ**) ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَعْتَدَّ فِي بَيْتِ أُمِّ شَرِيكٍ، ثُمَّ قَالَ: (**تِلْكِ امْرَأَةٌ يَغْشَاهَا أَصْحَابِي، اعْتَدِّي عِنْدَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَإِنَّهُ رَجُلٌ أَعْمَى، تَضَعِينَ ثِيَابَكِ، فَإِذَا حَلَلْتِ فَآذِنِينِي**) ، قَالَتْ: فَلَمَّا حَلَلْتُ ذَكَرْتُ لَهُ: أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ وَأَبَا جَهْمٍ خَطَبَانِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَلاَ يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ، وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ فَصُعْلُوكٌ لاَ مَالَ لَهُ. انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ**) ، فَكَرِهْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: (**انْكِحِي أُسَامَةَ**) ، فَنَكَحْتُهُ، فَجَعَلَ اللهُ فِيهِ خَيْراً، وَاغْتَبَطْتُ. [م١٤٨٠]

(م) لە فاتیمەی كچی قەیسەوە: عەمری كوڕی حەفص سێ بە سێ تەڵاقیدا، عەمر نادیار بوو، بە وەكیلەكەیدا جۆی بۆ ژنەكەی رەوانە كرد، ژنەكەی تووڕە كرد، عەمر وتی: سوێند بە خودا لەسەر ئێمە شتێك بۆ تۆ بوونی نییە، ئافرەتەكە هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەوەی بۆ باس كرد، پێغەمبەر فەرمووی: (**بۆ تۆ خەرجی لەسەر ئەو نییە**)، فەرمانی پێكرد لە ماڵی ئوم شەریك عیددەی خۆی بگرێت، پاشان فەرمووی: (**ئەو ئافرەتە هاوەڵانم دەچن بۆ لای، لای ئیبن ئوم مەكتووم عیددەكەت بگرە، ئەو پیاوێكی كوێرە، پۆشاكەكەت لە خۆت دەكەیەوە**[1]**، گەر عیددەكەت تەواو بوو ئاگادارم بكەرەوە**)، ئافرەتەكە وتی: كاتێك عیددەكەم تەواو بوو بۆ پێغەمبەرم باس كرد: موعاویەی كوڕی ئەبی سوفیان و ئەبا جەهم داوایان كردووم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئەبا جەهم عەساكەی لەسەر شانی داناگرێت**[2]**، موعاویەش صەعلووكە و ماڵ و سامانی نییە، شوو بە ئوسامەی كوڕی زەید بكە**)، پێمناخۆش

---

[1] واتە: دەتوانی لە ماڵەكەیدا پۆشاكەكەت لە خۆت بكەیەوە، چونكە ئیبن ئوم مەكتووم كەسێكی نابینا بوو و ئامۆزای ئافرەتەكە بوو-و.

[2] واتە: لە ژن دەدات-و.

بوو، پاشان فەرمووی: **(مێرد بە ئوسامە بکە)**، منیش مێردم پێکرد، خودا خێری تێکرد و دڵخۆش بووم.

- وفي رواية: قَالَتْ: طَلَّقَنِي زَوْجِي ثَلاثاً، فَأَرَدْتُ النُّقْلَةَ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم. فَقَالَ: **(انْتَقِلِي إِلَى بَيْتِ ابْنِ عَمِّكِ عَمْرِو بْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ؛ فَاعْتَدِّي عِنْدَهُ)**.

لە ریوایەتێکدا: وتی: مێردەکەم سێ بە سێ تەڵاقیدام، ویستم بگوێزمەوە، هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی: **(بگوێزەرەوە بۆ ماڵی ئامۆزاکەت عەمری کوڕی ئوم مەکتووم، لای ئەو عیددەی خۆت بگرە)**.

- وفي رواية: فقال صلّى الله عليه وسلّم: **(لا نَفَقَةَ لَكِ، ولا سُكْنَى)**.

لە ریوایەتێکدا: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(خەرجی و شوێنی نیشتەجێبوونت بۆ نییە)**.

- وفي رواية: قَالَتْ: طَلَّقَنِي بَعْلِي ثَلاَثاً، فَأَذِنَ لِي النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ أَعْتَدَّ فِي أَهْلِي.

لە ریوایەتێکی تردا: وتی: پیاوەکەم سێ بە سێ تەڵاقیدام، پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دام لای خانەوادەکەم عیددە بگرم.

## ١٩- دەروازەی: موتعەی تەلاقدراو

**٢٤٨٢**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فِي هَذِهِ الآيَةِ: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ [البقرة: ٢٣٦]، قَالَ: هُوَ الرَّجُلُ يَتَزَوَّجُ الْمَرْأَةَ وَلَمْ يُسَمِّ لَهَا صَدَاقاً، ثُمَّ طَلَّقَهَا مِنْ قَبْلِ أَنْ يَنْكِحَهَا، فَأَمَرَ الله تَعَالَى أَنْ يُمَتِّعَهَا عَلَى قَدْرِ يُسْرِهِ وَعُسْرِهِ، فَإِنْ كَانَ مُوسِراً، مَتَّعَهَا بِخَادِمٍ أَوْ نَحْوِ ذَلِكَ، وَإِنْ كَانَ مُعْسِراً، فَبِثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ أَوْ نَحْوِ ذَلِكَ. [هق٧/٢٤٤]

لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ [البقرة: ٢٣٦]، وتی: ئەوە پیاوێکە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەت دەکات و مارەیی بۆ دیاری ناکات، پاشان تەڵاقی دەدات بەرلەوەی بچێتە

**لای، خودا(سبحانە وتعالی) فەرمانی كرد بەپێی هەبوونی و نەبوونی[1] بەشی ژنەكە بدات، گەر هەبوو بوو بە خزمەتكارێك یان هاوشێوەی ئەوە كۆمەكی بكات، گەر نەبوو بوو بە سێ دەست پۆشاك و یان هاوشێوەی ئەوە.**

**٢٤٨٣**- عَنِ ابْنِ سِيرِينَ: أَنَّ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ رضي الله عنهما: طَلَّقَ امْرَأَةً لَهُ، فَمَتَّعَهَا بِعَشَرَةِ آلاَفِ دِرْهَمٍ، قَالَ فَقَالَتْ: مَتَاعٌ قَلِيلٌ لِحَبِيبٍ أُفَارِقُ، قَالَ: فَبَلَغَهُ ذَلِكَ فَرَاجَعَهَا.

[هق٧/٢٤٤]

**لە ئیبن سیرینەوە: حەسەنی كوڕی عەلی(خوایان لێ ڕازی بێت) ژنێكی خۆی تەڵاقدا و دە هەزار درهەمی پێدا، وتی: ژنەكە وتی: خۆشییەكی كەم بەرانبەر خۆشەویستێك لێی جیادەبمەوە، وتی: ئەوە بە حەسەن گەیشتەوە گێڕایەوە.**

**٢٤٨٤**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لِكُلِّ مُطَلَّقَةٍ مُتْعَةٌ، إِلاَّ التِي تُطَلَّقُ وَقَدْ فُرِضَ لَهَا الصَّدَاقُ، وَلَمْ تُمَسَّ، فَحَسْبُهَا نِصْفُ مَا فُرِضَ لَهَا.　　[هق٧/٢٥٧]

**لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، ئەو دەیوت: بۆ هەموو تەڵاقدراوێك موتعەیەك هەیە، مەگەر ئەو ئافرەتەی تەڵاق دەدرێ و مارەیی بۆ بڕاوەتەوە و دەستی بۆ نەبراوە، ئەوە نیوەی مارەییەكە بۆ ئەو بەسە.**

## ٢٠- دەروازەی: عیددەی مردن

**٢٤٨٥**- (ق) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ جَالِسٌ عِنْدَهُ، فَقَالَ: أَفْتِنِي فِي امْرَأَةٍ وَلَدَتْ بَعْدَ زَوْجِهَا بِأَرْبَعِينَ لَيْلَةً؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: آخِرُ الأَجَلَيْنِ، قُلْتَ أَنَا: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾[الطلاق:٤].

---

[1] واتە: بەپێی دەوڵەمەندی و هەژاری كەسەكە ـ و.

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَا مَعَ ابْنِ أَخِي ـ يَعْنِي: أَبَا سَلَمَةَ ـ، فَأَرْسَلَ ابْنُ عَبَّاسٍ غُلاَمَهُ كُرَيْباً إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ يَسْأَلُهَا، فَقَالَتْ: قُتِلَ زَوْجُ سُبَيْعَةَ الأَسْلَمِيَّةِ وَهِيَ حُبْلَى، فَوَضَعَتْ بَعْدَ مَوْتِهِ بِأَرْبَعِينَ لَيْلَةً، فَخُطِبَتْ، فَأَنْكَحَهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وكانَ أَبُو السَّنَابِلِ فِيمَنْ خَطَبَهَا.

[خ٤٩٠٩/ م١٤٨٥]

**(ق) لە ئەبی سەلەمەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای ئیبن عەباس، ئەبو هورەیرە لای دانیشتبوو، وتی: فتوام بۆ بدە دەربارەی ژنێك پاش چل شەو لە مردنی مێردەکەی مندالّی بووە؟ ئیبن عەباس وتی: دوایین وادەکە[1]، من[2] وتم: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾[الطلاق:٤].**

**ئەبو هورەیرە وتی: من لەگەڵ برازاکەی خۆمم-واتە ئەبا سەلەمە- بۆیە ئیبن عەباس غولامەکەی-کورەیب- نارد بۆ لای ئوم سەلەمە[3] پرسیاری لێ بکات، ئوم سەلەمە وتی: مێردەکەی سوبەیعەی ئەسلەمی کوژرا، سوبەیعە سکی پڕ بوو، لەدوای مردنی بە چل شەو سکەکەی دانا، داخوازی کرا و پێغەمبەری خودا بە مێردی دا، ئەبو سەنابیل لەوانە بوو داخوازی کرد.**

**٢٤٨٦**– عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ عَجْرَةَ: أَنَّ الْفُرَيْعَةَ بِنْتَ مَالِكِ بْنِ سِنَانٍ ـ وَهِيَ أُخْتُ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ـ أَخْبَرَتْهَا: أَنَّهَا جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تَسْأَلُهُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهَا فِي بَنِي خُدْرَةَ، فَإِنَّ زَوْجَهَا خَرَجَ فِي طَلَبِ أَعْبُدٍ لَهُ أَبَقُوا، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِطَرَفِ الْقَدُومِ لَحِقَهُمْ؛ فَقَتَلُوهُ. فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ أَرْجِعَ إِلَى أَهْلِي، فَإِنِّي لَمْ يَتْرُكْنِي فِي مَسْكَنٍ يَمْلِكُهُ وَلاَ نَفَقَةٍ.

قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (نَعَمْ).

---

[1] واتە: چوار مانگ و دە رۆژ عیددە دەگرێت-و.

[2] "من" واتە: ئەبی سەلەمە-و.

[3] ئەم (ئەبو سەلەمە)ی لە فەرموودەکەدا هاتووە جیایە لە (ئەبو سەلەمە) هاوسەری یەکەمی ئوم سەلەمە، چونکە مێردەکەی ئوم سەلەمە پێشتر کۆچی دوایی کرد و پاشان ئوم سەلەمە لەگەڵ پێغەمبەر هاوسەرگیری کرد-و.

قَالَتْ: فَخَرَجْتُ، حَتَّى إِذَا كُنْتُ فِي الْحُجْرَةِ ـ أَوْ فِي الْمَسْجِدِ ـ دَعَانِي ـ أَوْ أَمَرَ بِي، فَدُعِيتُ لَهُ ـ فَقَالَ: (**كَيْفَ قُلْتِ**)؟ فَرَدَدْتُ عَلَيْهِ الْقِصَّةَ الَّتِي ذَكَرْتُ مِنْ شَأْنِ زَوْجِي، قَالَتْ: فَقَالَ: (**امْكُثِي فِي بَيْتِكِ، حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ**). قَالَتْ: فَاعْتَدَدْتُ فِيهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً.

قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، أَرْسَلَ إِلَيَّ فَسَأَلَنِي عَنْ ذَلِكَ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَاتَّبَعَهُ وَقَضَى بِهِ.

* صحيح. [د٢٣٠٠/ ت١٢٠٤/ ن٣٥٢٨/ جه٢٠٣١/ مي٢٣٣٣]

**لە زەینەبی کچی کەعبی کوڕی عەجرەوە: فورەیعەی کچی مالیکی کوڕی سینان– ئەو خوشکی ئەبو سەعیدی خودری بوو– هەواڵی پێدا: ئەو هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری لێکرد بگەڕێتەوە بۆ لای خانەوادەکەی لە بەنی خودرە، چونکە مێردەکەی ڕۆیشتووە بە دوای چەند بەندەیەکیدا کە هەڵهاتوون، تا لە دەوروبەری "القَدوم" بەوان گەیشت و کوشتیان، پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد بگەڕێمەوە بۆ لای خانەوادەکەم، چونکە ئەو منی لەماڵێك بەجێنەهێڵاوە خۆی خاوەنی بێت و خەرجیشی بەجێنەهێڵاوە.**

**وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ).**

**وتی: چوومە دەرەوە تا گەیشتمە حوجرەکە–یان ناو مزگەوتەکە– بانگی کردم– یان فەرمانی کرد منی بۆ بانگ بکرێمەوە– فەرمووی: (چۆنت وت؟)، چیرۆکەکەم دەربارەی مێردەکەم بەسەریدا دووبارە کردەوە، وتی: فەرمووی: (لە ماڵەکەت بمێنەرەوە، تا نووسراوەکە دەگاتە وادەی خۆی)، وتی: لە ماڵەکەدا چوار مانگ و دە ڕۆژ عیددەم گرت.**

**وتی: کاتێ عوسمانی کوڕی عەفان ناردی بە دوامدا و پرسیاری ئەوەی لێکردم هەواڵم پێدا و ئەویش شوێنیکەوت و قەزاوەتی پێکرد.**

## ٢١- دەروازەی: عیددەی تەڵاقدراو

**٢٤٨٧**– عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ بْنِ السَّكَنِ الْأَنْصَارِيَّةِ: أَنَّهَا طُلِّقَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَلَمْ يَكُنْ لِلْمُطَلَّقَةِ عِدَّةٌ، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل حِينَ طُلِّقَتْ أَسْمَاءُ بِالْعِدَّةِ لِلطَّلَاقِ، فَكَانَتْ أَوَّلَ مَنْ أُنْزِلَتْ فِيهَا الْعِدَّةُ لِلْمُطَلَّقَاتِ. [د٢٢٨١]

* حسن.

**لە ئەسمای کچی یەزیدی کوڕی سەکەنی ئەنصارییەوە: ئەو لەسەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەلاقدرا، بۆ تەلاّقدراو عیددە نەبوو، کاتێك ئەسما تەلاّقدرا خودا(عز وجل) عیددەی بۆ تەلاّق دابەزاند، ئەو یەکەمین کەس بوو عیددەی تەلاّقدراوانی دەربارە دابەزی.**

**٢٤٨٨**– عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ: أَنَّهُ كَانَتْ عِنْدَهُ أُمُّ كُلْثُومٍ بِنْتُ عُقْبَةَ، فَقَالَتْ لَهُ، وَهِيَ حَامِلٌ: طَيِّبْ نَفْسِي بِتَطْلِيقَةٍ، فَطَلَّقَهَا تَطْلِيقَةً، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ فَرَجَعَ وَقَدْ وَضَعَتْ، فَقَالَ: مَا لَهَا؟ خَدَعَتْنِي خَدَعَهَا اللهُ، ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**سَبَقَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ، اخْطُبْهَا إِلَى نَفْسِهَا**). [جه٢٠٢٦]

* صحيح.

**لە زوبەیری کوڕی عەوامەوە: ئەو ئوم کلسوومی کچی عوقبەی لە لا بوو، ئوم کلسووم –سکی پڕ بوو– بە زوبەیری وت: دڵخۆشم بکە بە تەلاّقێك، ئەویش بە تەلاّقێك تەلاّقیدا، پاشان زوبەیر ڕۆیشت بۆ نوێژ و گەڕایەوە منداڵەکەی بوویوو، زوبەیر وتی: ئەمە چییەتی؟ فریویدام خودا فریوی بدات، پاشان زوبەیر هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر فەرمووی: (نووسراوەکە پێش وادەکەی کەوت، ببە بە یەکێك لە داخوازیکەران)[1].**

**٢٤٨٩**– عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ وَسَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ وَأَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ وَابْنِ شِهَابٍ، أَنَّهُمْ كَانُوا يَقُولُونَ: إِذَا دَخَلَتِ الْمُطَلَّقَةُ فِي الدَّمِ مِنَ الْحَيْضَةِ الثَّالِثَةِ، فَقَدْ بَانَتْ مِنْ زَوْجِهَا، وَلاَ مِيرَاثَ بَيْنَهُمَا، وَلاَ رَجْعَةَ لَهُ عَلَيْهَا. [ط١٢٢٤]

**لە مالیکەوە، ئەو پێیگەیشتووە: لە قاسمی کوڕی محەمەد و سالمی کوڕی عەبدوڵا و ئەبی بەکری کوڕی عبدالرحمن و سولەیمانی کوڕی یەسار و ئیبن شیهابەوە، ئەوان دەیانوت: گەر ئافرەتی تەلاّقدراو ڕۆیشتە ناو خوێنەوە لە حەیزی سێیەم لە مێردەکەی جیابووەتەوە و میرات لە نێوانیان نییە و پیاوەکە گێڕانەوەی لەسەر ژنەکە نییە.**

---

[1] واتە: تەلاّقت کەوتووە و مافێکت بەسەریەوە نەماوە، دەتوانی یەکێك بیت لە داخوازیکەرانی ژنەکە–و.

## ٢٢- دەروازەی: عیددەی بزربوو و نادیار

**٢٤٩٠-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ فَقَدَتْ زَوْجَهَا، فَلَمْ تَدْرِ أَيْنَ هُوَ؟ فَإِنَّهَا تَنْتَظِرُ أَرْبَعَ سِنِينَ، ثُمَّ تَعْتَدُّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً، ثُمَّ تَحِلُّ. [ط١٢١٩]

* رجاله ثقات.

**لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە: عومەری کوڕی خەتاب وتی: هەر ئافرەتێك مێردەکەی لەدەستدا و بزر بوو و نەیزانی ئەو لە کوێیە، ئەو چوار ساڵ چاوەڕوانی مێردەکەی دەکات، پاشان چوار مانگ و دە ڕۆژ عیددە دەگرێت و پاشان حەڵاڵ دەبێت[1].**

## ٢٣- دەروازەی: چوونە دەرەوەی ئافرەتی عیددەگر بۆ پێویستی خۆی لە ڕۆژدا

**٢٤٩١-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: طُلِّقَتْ خَالَتِي، فَأَرَادَتْ أَنْ تَجُدَّ نَخْلَهَا، فَزَجَرَهَا رَجُلٌ أَنْ تَخْرُجَ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(بَلى، فَجُدِّي نَخْلَكِ، فَإِنَّكِ عَسَى أَنْ تَصَدَّقِي، أَو تَفْعَلِي مَعْرُوفاً).** [م١٤٨٣]

**(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پوورم تەڵاق درا، ویستی بەری دارخورماکەی بکاتەوە، پیاوێك دەمکوتی کرد لەوەی بچێتە دەرەوە، ئەو هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموو: (با[2]، بەری دلرخورماکەت بکەرەوە، چونکە لەوانەیە صەدەقە بکەی، یان چاکەیەك ئەنجام بدەی).**

**٢٤٩٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لاَ تَبِيتُ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا، وَلاَ الْمَبْتُوتَةُ؛ إِلاَّ فِي بَيْتِهَا. [ط١٢٥٧]

* إسناده صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، ئەو دەیوت: مێردمردوو و تەڵاقدراو تەنها لە ماڵەکەی خۆی شەو دەمێنێتەوە.**

---

[1] واتە: پاشان مێرد کردنی حەڵاڵ دەبێت-و.

[2] واتە: بەڵێ بۆت هەیە ئەو کارە بکەی-و.

## ٢٤- دەروازەی: ماتەمینی لە عیددەی مردوودا

**٢٤٩٣-** (ق) عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ قَالَتْ: لَمَّا جاءَ نَعْيُ أَبِي سُفْيَانَ مِنَ الشَّامِ، دَعَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ ﷺ بِصُفْرَةٍ فِي الْيَوْمِ الثَّالِثِ، فَمَسَحَتْ عارِضَيْهَا وَذِرَاعَيْهَا، وَقَالَتْ: إِنِّي كُنْتُ عَنْ هذَا لَغَنِيَّةً، لَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بالله وَالْيَوْمِ الآخِرِ، أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ، فَإِنَّهَا تُحِدُّ عَلَيْهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً**). [خ١٢٨٠/ م١٤٨٦]

**(ق) لە زەینەبی کچی ئەبی سەلەمەوە، وتی: کاتێ هەواڵی مردنی ئەبی سوفیان لە شامەوە هات، ئوم حەبیبە لە ڕۆژی سێیەم داوای بۆنی کرد و هێنای بە دوو لای روخساریدا و وتی: من لەمە بێنیازم، گەر لە پێغەمبەرم(ﷺ) نەبیستبا دەیفەرموو: (حەڵاڵ نییە بۆ ئافرەتێك ئیمانی بە خودا و ڕۆژی دوایی هێناوە لەسەرو سێ ڕۆژەوە ماتەمینی بۆ مردوو بگێڕێت، مەگەر بۆ مێرد بێت، چوار و مانگ و دە ڕۆژ ماتەمینی بۆ دەگێڕێت).**

**٢٤٩٤-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا لاَ تَلْبَسُ الْمُعَصْفَرَ مِنَ الثِّيَابِ، وَلاَ الْمُمَشَّقَةَ ، وَلاَ الْحُلِيَّ، وَلاَ تَخْتَضِبُ، وَلاَ تَكْتَحِلُ**).

**لە ئوم سەلەمەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: (ئەو ژنەی مێردەکەی مردووە پۆشاکی ڕەنگکراو بە درەختی "العُصْفُر" و پۆشاکی ڕەنگکراو بە قوڕی سوور ناپۆشێ و خشڵ لە خۆی نادات و خەنە ناگرێتە سەر و چاو ناڕێژێ).**

■ ولم يذكر النسائي: الْحُلِيَّ. [د٢٣٠٤/ ٣٥٣٧ن]

* صحيح.

**نەسائی "خشڵ"ی باس نەکردووە.**

## ٢٥- دەروازەی: دایەنی

**٢٤٩٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ ابْنِي هَذَا كَانَ بَطْنِي لَهُ وِعَاءً، وَثَدْيِي لَهُ سِقَاءً، وَحِجْرِي لَهُ حِوَاءً، وَإِنَّ أَبَاهُ طَلَّقَنِي، وَأَرَادَ أَنْ يَنْتَزِعَهُ مِنِّي، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَنْتِ أَحَقُّ بِهِ مَا لَمْ تَنْكِحِي**). [د٢٢٧٦]

* حسن.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: ژنێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەم کوڕەم سکم بۆی بوو بە دەفر و دوو مەمکم بۆی بوو بە ئاودان، و باوەشم بۆی بوو بە ئامێز، باوکی تەڵاقیداوم و دەیەوێت کوڕەکەم لێ وەربگرێتەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(تۆ لەپێشتری بە کوڕەکە گەر هاوسەرگیری نەکەیەوە)**.

**٢٤٩٦**- عَنْ رَافِعِ بْنِ سِنَانٍ: أَنَّهُ أَسْلَمَ، وَأَبَتِ امْرَأَتُهُ أَنْ تُسْلِمَ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: ابْنَتِي وَهِيَ فَطِيمٌ أَوْ شَبَهُهُ، وَقَالَ رَافِعٌ: ابْنَتِي، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(اقْعُدْ نَاحِيَةً)** ، وَقَالَ لَهَا: **(اقْعُدِي نَاحِيَةً)** قَالَ: وَأَقْعَدَ الصَّبِيَّةَ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ قَالَ: **(ادْعُوَاهَا)** ، فَمَالَتِ الصَّبِيَّةُ إِلَى أُمِّهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(اللَّهُمَّ اهْدِهَا)** فَمَالَتِ الصَّبِيَّةُ إِلَى أَبِيهَا، فَأَخَذَهَا. [د٢٢٤٤/ ن٣٤٩٥/ جه٢٣٥٢]

* صحيح.

لە رافیعی کوڕی سینانەوە: ئەو موسڵمان بوو و ژنەکەی نەیویست موسڵمان بێت، ژنەکە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: کچەکەم، لەشیر براوەتەوە، یان هاوشێوەی ئەوە، رافیع وتی: کچەکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(تۆ لە لایەکەوە دابنیشە)**، **(تۆش لە لایەکەوە دابنیشە)**، وتی: منداڵەکەی لە نێوانیان دانا، پاشان فەرمووی: **(بانگی بکەن)**، منداڵەکە مەیلی بە لای دایکیدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(خودایە هیدایەتی بدە**[1]**)**، منداڵەکە رۆیشت بۆ لای باوکی و وەریگرت.

## ٢٦- دەروازەی: وادەی "العنين[2]"

**٢٤٩٧**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ تَزَوَّجَ امْرَأَةً فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَمَسَّهَا، فَإِنَّهُ يُضْرَبُ لَهُ أَجَلٌ سَنَةً، فَإِنْ مَسَّهَا؛ وَإِلاَّ فُرِّقَ بَيْنَهُمَا. [ط١٢٤١]

---

[1] چونکە دایکەکەی بێباوەڕ بوو گەر بچوویا بۆ لای دایکی وەك ئەو بێباوەڕ دەردەچوو، وەك لە فەرموودەدا هاتووە: (**هەموو منداڵێك لەسەر فیترەت لەدایك دەبێت، دایك و باوکی...فەرموودەکە**)، بۆیە پێغەمبەر دوعای بۆ کرد تا رۆیشت بۆ لای باوکی-و.

[2] "العَنين" کەسێکە توانای جووتبوونی نییە-و.

لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە، ئەو دەیوت: هەر کەس هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێك کرد و نەیتوانی بچێتە لای، ئەو کەسە ماوەی ساڵێکی بۆ دیاری دەکرێت، گەر چووە لای باشە، ئەگەر نە لەیەکتر جیادەکرێنەوە.

**٢٤٩٨**- عَنْ مَالِك: أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ: مَتَى يُضْرَبُ لَهُ الْأَجَلُ، أَمِنْ يَوْمِ يَبْنِي بِهَا، أَمْ مِنْ يَوْمِ تُرَافِعُهُ إِلَى السُّلْطَانِ؟ فَقَالَ: بَلْ مِنْ يَوْمِ تُرَافِعُهُ إِلَى السُّلْطَانِ. [ط١٢٤٢]

لە مالیکەوە: ئەو پرسیاری لە ئیبن شیهاب کرد: کەی وادەکەی بۆ دادەنرێت، ئایا لەو ڕۆژەوە دەیگوێزێتەوە، یان لەو ڕۆژەوە بەرزی دەکاتەوە بۆ لای سولّتان؟ وتی: بەڵکو لەو ڕۆژەوە بەرزی دەکاتەوە بۆ لای سولّتان[1].

**٢٤٩٩**- عَنْ عُمَر بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ فِي الْعِنِّين: يُؤَجَّل سَنَةً، فَإِنْ قَدِرَ عَلَيْهَا وإِلاَّ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا، وَلَهَا المهْر، وَعَلَيْهَا العِدَّة. [هق٧/٢٢٦]

لە عومەری کوڕی خەتابەوە(خوا لێی رازی بێت)، ئەو دەربارەی "العنين" دەیوت: ساڵێك دوادەخرێت، گەر توانای بەسەر ژنەکەدا هەبوو باشە، ئەگەر نە لەیەکتریان جیا دەکاتەوە و ژنەکە مارەییەکەی بۆ هەیە و عیددەی لەسەرە.

## ٢٧- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی دوو حەکەمەکە هاتووە

**٢٥٠٠**- عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ قَالَ فِي الْحَكَمَيْنِ اللَّذَيْنِ قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا﴾ [النساء: ٣٥] إِنَّ إِلَيْهِمَا الْفُرْقَةَ بَيْنَهُمَا وَالْاجْتِمَاعَ. [ط١٢٣٩]

لە مالیکەوە، ئەو پێی گەیشتووە: عەلی کوڕی ئەبی تالب دەربارەی دوو حەکەمەکە کە خودا(تعالی) دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا

---

[1] واتە: لەو ڕۆژەوە ژنەکە بۆ لای قازی سکالاّ بەرز دەکاتەوە-و.

﴿فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا ٣٥﴾ [النساء: ٣٥]، وتی: بۆ ئەو دوو حەكەمە هەیە لە یەكتریان جیابكەنەوە یان رێكیان بخەنەوە.

**٢٥٠١-** عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: إِنِ اجْتَمَعَ رَأْيُهُمَا عَلَى أَنْ يُفَرِّقَا أَوْ يَجْمَعَا، فَأَمْرُهُمَا جَائِزٌ. [هق٧/٣٠٦]

**لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: گەر بۆچوونی دوو حەكەمەكە لەسەر ئەوە كۆبوویەوە لەیەكتریان جیابكەنەوە یان رێكیان بخەنەوە، فەرمانەكەیان جائیزە.**

**٢٥٠٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما ﴿إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآ﴾ [النساء: ٣٥]، قَالَ: يَعْنِي الحَكَمَيْنِ. [هق٧/٣٠٦]

**لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): ﴿إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآ﴾ [النساء: ٣٥]، وتی: واتە دوو حەكەمەكە.**

## ٢٨- دەروازەی: كەسێك ژنەكەی لە خۆی حەرام دەكات یان پشتی تێ دەكات[1]

**٢٥٠٣-** (ق) عن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قالَ في الْحَرَامِ: يُكَفِّرُ. وَقالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ﴾[الأحزاب:٢١]. [خ٤٩١١/ م١٤٧٣]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، دەربارەی لەخۆ حەرامكردن وتی: كەفارەت دەدات، هەروەها ئیبن عەباس وتی: ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ﴾[الأحزاب:٢١][2].**

---

(١) "پشتی تێ دەكات" واتە "ظهار"ی لێ دەكات-و.

(٢) مەبەستی ئەو رووداوەیە بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ)هات لەگەڵ ژنەكانی و ئایەت دابەزی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ﴾[ التحريم: ١].

▪ وفي رواية للبخاري: قال: إِذَا حَرَّمَ امْرَأَتَهُ لَيْسَ بِشَيْءٍ. [خ٥٢٦٦]

**لە ریوایەتێکی بوخاریدا: وتی: گەر ژنەکەی لە خۆی حەرام کرد شتێ نییە.**

▪ وفي رواية لمسلم: قَالَ: إِذَا حَرَّمَ الرَّجُلُ عَلَيْهِ امْرَأَتَهُ، فَهْيَ يَمِينٌ يُكَفِّرُهَا.

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا: وتی: گەر پیاو ژنەکەی لەسەر خۆی حەرام کرد، ئەوە سوێندێکە و دەبێ کەفارەتی بدات.**

**٢٥٠٤-** عَنْ خَوْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ قَالَتْ: وَاللهِ فِيَّ وَفِي أَوْسِ بْنِ صَامِتٍ أَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل صَدْرَ سُورَةِ الْمُجَادَلَةِ، قَالَتْ: كُنْتُ عِنْدَهُ وَكَانَ شَيْخاً كَبِيراً قَدْ سَاءَ خُلُقُهُ وَضَجِرَ، قَالَتْ: فَدَخَلَ عَلَيَّ يَوْماً، فَرَاجَعْتُهُ بِشَيْءٍ، فَغَضِبَ فَقَالَ: أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي. قَالَتْ: ثُمَّ خَرَجَ فَجَلَسَ فِي نَادِي قَوْمِهِ سَاعَةً، ثُمَّ دَخَلَ عَلَيَّ، فَإِذَا هُوَ يُرِيدُنِي عَلَى نَفْسِي، قالتْ: فَقُلْتُ: كَلاَّ، وَالَّذِي نَفْسُ خُوَيْلَةَ بِيَدِهِ! لاَ تَخْلُصُ إِلَيَّ وَقَدْ قُلْتَ مَا قُلْتَ، حَتَّى يَحْكُمَ اللهُ وَرَسُولُهُ فِينَا بِحُكْمِهِ، قَالَتْ: فَوَاثَبَنِي، وَامْتَنَعْتُ مِنْهُ فَغَلَبْتُهُ بِمَا تَغْلِبُ بِهِ الْمَرْأَةُ الشَّيْخَ الضَّعِيفَ، فَأَلْقَيْتُهُ عَنِّي. قَالَتْ: ثُمَّ خَرَجْتُ إِلَى بَعْضِ جَارَاتِي، فَاسْتَعَرْتُ مِنْهَا ثِيَابَهَا، ثُمَّ خَرَجْتُ حَتَّى جِئْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَجَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَذَكَرْتُ لَهُ مَا لَقِيتُ مِنْهُ، فَجَعَلْتُ أَشْكُو إِلَيْهِ صلّى الله عليه وسلّم مَا أَلْقَى مِنْ سُوءِ خُلُقِهِ.

قَالَتْ: فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**يَا خُوَيْلَةُ، ابْنُ عَمِّكِ شَيْخٌ كَبِيرٌ، فَاتَّقِي اللهَ فِيهِ**) قَالَتْ: فَوَاللهِ مَا بَرِحْتُ حَتَّى نَزَلَ فِيَّ الْقُرْآنُ، فَتَغَشَّى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَا كَانَ يَتَغَشَّاهُ، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ، فَقَالَ لِي: (**يَا خُوَيْلَةُ، قَدْ أَنْزَلَ اللهُ فِيكِ وَفِي صَاحِبِكِ**) ثُمَّ قَرَأَ عَلَيَّ: **﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ①﴾**، إِلَى قَوْلِهِ: **﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ④﴾** [المجادلة: ١ . ٤].

فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مُرِيهِ فَلْيُعْتِقْ رَقَبَةً**) ، قالتْ: فَقُلْتُ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ مَا عِنْدَهُ مَا يُعْتِقُ! قَالَ: (**فَلْيَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ**) ، قالتْ: فَقُلْتُ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّهُ شَيْخٌ كَبِيرٌ مَا بِهِ مِنْ صِيَامٍ، قَالَ: (**فَلْيُطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِيناً وَسْقاً مِنْ تَمْرٍ**) ، قالتْ: قُلْتُ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ مَا ذَاكَ عِنْدَهُ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**فَإِنَّا سَنُعِينُهُ بِعَرَقٍ مِنْ تَمْرٍ**) ، قالتْ: فَقُلْتُ: وَأَنَا يَا رَسُولَ اللهِ سَأُعِينُهُ بِعَرَقٍ آخَرَ. قَالَ: (**قَدْ أَصَبْتِ وَأَحْسَنْتِ، فَاذْهَبِي فَتَصَدَّقِي عَنْهُ، ثُمَّ اسْتَوْصِي بِابْنِ عَمِّكِ خَيْراً**) قَالَتْ: فَفَعَلْتُ. [د٢٢١٤/ حم٢٧٣١٩]

لە خەولەی کچی سەعلەبەوە، وتی: سوێند بە خودا، دەربارەی من و ئەوسی کوڕی صامیت خودا(عز وجل) سەرەتای سورەتی "المجادلة"ی دابەزاند، خەولە وتی: من لای ئەوس بووم، ئەو پیرێکی بە تەمەن بوو، رەوشتی خراپ بووبوو و وەڕس بووبوو، وتی: رۆژێك هاتە ژوورەوە بۆ لام، بە شتێك وەڵامم دایەوە، تووڕە بوو و وتی: تۆ لەسەر من وەك پشتی دایکمی، خەولە وتی: پاشان رۆیشتە دەرەوە و لە کۆڕی هۆزەکەی بۆ ماوەیەك دانیشت و پاشان هاتە ژوورەوە بۆ لام، بینیم منی بۆ نەفسی خۆی دەوێت[1]، خەولە وتی: منیش وتم: نەخێر، بەو کەسەی نەفسی خەولەی بەدەستە، بۆم رەوا نیت دوای ئەوەی کە وتت[2]، تا خودا و پێغەمبەرەکەی دەربارەی ئێمە حوکم دەردەکەن، خەولە وتی: ئەو لە باوەشی گرتم، منیش رێگریم لێکرد و بەسەریدا زاڵ بووم بەوەی ئافرەت زاڵ دەبێت بە سەر پیرێکی لاوازدا، لە خۆمم دوورخستەوە، خەولە وتی: پاشان چوومە دەرەوە بۆ لای یەکێك لە جیرانەکانم، پۆشاکەکەیم لێ خواست، پاشان رۆیشتم تا هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، لەبەردەمی دانیشتم، باسی ئەوەم بۆ کرد تووشم هاتبوو، سکاڵای خۆم بردە لای ئەو(ﷺ) لەسەر ئەوەی تووشم دێت لە خراپی هەڵسوکەوتی[3].

خەولە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەردەوام دەیفەرموو: **(ئەی خوەیلە[4]، ئامۆزاکەت[5] پیرێکی بەساڵاچووە، لە خودا بترسە دەربارەی)**، خەولە وتی: سوێند بە خودا، لەو جێگە هەڵنەستام قورئان دەربارەم دابەزی، ئەوەی داگیری دەکرد پێغەمبەری خودای داگیر کرد[6]، پاشان لەسەری رەوییەوە و پێی فەرمووم: **(ئەی خوەیلە، خودا دەربارەی تۆ و هاوەڵەکەت[7] قورئانی دابەزاندووە)**، پاشان

---

[1] واتە: دەیەوێ لەگەڵی جووت ببێت-و.

[2] دوای وتنی: (تۆ لەسەر من وەك پشتی دایکمی)-و.

[3] لە خراپی هەڵسوکەوتی مێردەکەی-و.

[4] خوەیلە: ناوی بچووکراوەی خەولەیە-و.

[5] خەولە و هاوسەرەکەی ئامۆزای یەکتربوون-و.

[6] واتە: ئەو وەحییەی پێغەمبەری داگیر دەکرد بۆی دابەزی-و.

[7] واتە: مێردەکەت-و.

خوێندییەوە بەسەرمدا: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ①﴾، تا ئایەتی: ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ④﴾ [المجادلة: ١ - ٤].

پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: **(فەرمانی پێ بکە با کۆیلەیەك ئازاد بکات)**، خەولە وتی: وتم: سوێند بە خودا، ئەی پێغەمبەری خودا، شتێکی لا نییە کۆیلەی پێ ئازاد بکات، فەرمووی: **(کەوابوو با دوو مانگ بەدوای یەکدا بەڕۆژوو بێت)**، خەولە وتی: وتم: سوێند بە خودا، ئەی پێغەمبەری خودا، ئەو پیرێکی ئەفتادەیە و توانای ڕۆژووی نییە، فەرمووی: **(با شەست هەژار خواردن بدات بە "وَسْق"ێك[(١)] لە خورما)**، خەولە وتی: وتم: سوێند بە خودا، ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوەی لە لا نییە، خەولە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کەوابوو ئێمە بە "عَرَق"ێك[(٢)] لە خورما کۆمەکی دەکەین)**، خەولە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، منیش بە "عَرَق"ێکی تر کۆمەکی دەکەم، پێغەمبەر فەرمووی: **(پێکات و چاکت کرد، بڕۆ و لەوەوە صەدەقەکە بکە، پاشان چاك بە لەگەڵ ئامۆزاکەت)**، خەولە وتی: منیش بەو جۆرەم ئەنجامدا.

- هذا لفظ المسند ، وزاد أبو داود: وَالْعَرَقُ سِتُّونَ صَاعاً.

* حسن.

ئەمە لەفزی (المسند)ە، ئەبو داود ئەمەی زیاد کردووە: "العَرَق" شەست "صاع[(٣)]"ە.

---

(١) لای جمهوور یەك "وسق" ١٢٢.٤ کیلۆیە-و.

(٢) "عَرَق" لای جمهوور نزیك بە سی کیلۆ و نیوە-و.

(٣) یەك "صاع" نزیك بە دوو کیلۆ و نیوە، ئەم قسەی ئەبی داود کە دەڵێت (عرق) شەست (صاع)ە لەگەڵ قسەی جمهوور پێکنایەتەوە، ئەگەر یەك (صاع) نزیك بە دوو کیلۆ و نیو بێت، چونکە ئەو کات یەك (عرق) سەد و پەنجا کیلۆگرامە نەك سی کیلۆگرام و نیو، ئەمەش لە بڕی (وسق)ەوە نزیکترە تا (عرق)، مەگەر لە بارێکدا بڕی (صاع) لای ئەبی داود شتێکی تر بووبێت، لە ڕیوایەتێکی تردا ئەبو داود دەڵێت: (عرق) سی "صاع" و ئەوەش ڕاسترین دوو قسەکەیە، زۆربەی ڕیوایەتەکان دەڵێن: پازدە (صاع)ە، ئەم جیاوازییەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە یەك جۆر (عرق) بوونی نەبووە بەڵکو بەپێی ناوچەکان بەرینی و بڕ و ڕادەی (عرق) گۆڕانی بەسەردا هاتووە-و.

٢٥٠٥- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ الْبَيَاضِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي الْمُظَاهِرِ يُوَاقِعُ قَبْلَ أَنْ يُكَفِّرَ، قَالَ: (كَفَّارَةٌ وَاحِدَةٌ).　　[ت١١٩٨/ جه٢٠٦٤]

* صحيح.

**لە سەلەمەی کوڕی سەخری بەیازییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەربارەی ئەو کەسەی زیهار دەکات و دەچێتە لای ژنەکەی بەرلەوەی کەفارەتەکەی بدا، فەرمووی: (یەك کەفارەتە).**

٢٥٠٦- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: تَبَارَكَ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ كُلَّ شَيْءٍ، إِنِّي لَأَسْمَعُ كَلَامَ خَوْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ، وَيَخْفَى عَلَيَّ بَعْضُهُ، وَهِيَ تَشْتَكِي زَوْجَهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَهِيَ تَقُولُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَكَلَ شَبَابِي، وَنَثَرْتُ لَهُ بَطْنِي، حَتَّى إِذَا كَبِرَتْ سِنِّي، وَانْقَطَعَ وَلَدِي، ظَاهَرَ مِنِّي، اللَّهُمَّ إِنِّي أَشْكُو إِلَيْكَ! فَمَا بَرِحَتْ حَتَّى نَزَلَ جِبْرَائِيلُ بِهَؤُلَاءِ الْآيَاتِ ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَـٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ [المجادلة:١].

* صحيح.　　[ن٣٤٦٠/ جه١٨٨، ٢٠٦٣]

**لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە، وتی: عائیشە وتی: مەزنی و شکۆمەندی بۆ ئەو خودایەی بیستنی هەموو شتێکی گرتووەتەوە، من گوێم لە لە قسەکانی خەولەی کچی سەعلەبە گرتبوو و هەندێ لە قسەکانم لێ شاراوە بوو، ئەو لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) سکاڵای لە مێردەکەی دەکرد و دەیوت: ئەی پێغەمبەری خودا، گەنجێتی خواردم و سکم بۆ پەرش و بڵاو کرد، تا تەمەنم گەورە بوو و لە سك و سزا چوومەوە زیهاری لێکردم، خودایە من سکاڵای خۆم لای تۆ دەکەم، لەو جێگە هەڵنەستا تا جیبریل ئەم ئایەتانەی دابەزاند:** ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَـٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ [المجادلة:١].

- ورواية النسائي مختصرة.

**ریوایەتەکەی نەسائیش بە پوختی.**

## ٢٩- دەروازەی: خولع

**٢٥٠٧-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: جاءَتِ امْرَأَةُ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ الله، ما أَنْقِمُ عَلَى ثَابِتٍ فِي دِينٍ وَلاَ خُلُقٍ؛ إِلاَّ أَنِّي أَخافُ الْكُفْرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (فَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ)؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ، فَرَدَّتْ عَلَيْهِ، وَأَمَرَهُ فَفَارَقَهَا. [خ٥٢٧٦ (٥٢٧٣)]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: ژنەکەی سابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من تانە نادەم لە دین و ئەخلاقی سابیت، بەڵام لە بێباوەڕی دەترسم[1]، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کەوابوو باخچەکەی بۆ دەگێڕییەوە؟)، وتی: بەڵێ، بۆیە باخچەکەی بۆ گێڕایەوە و پێغەمبەر فەرمانی بە سابیت کرد و لێی جیابوویەوە.**

**٢٥٠٨-** عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلاَقاً فِي غَيْرِ مَا بَأْسٍ، فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ**).

* صحيح. [د٢٢٢٦/ ت١١٨٧/ جه٢٠٥٥/ مي٢٣١٦]

**لە سەوبانەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر ئافرەتێك داوای تەڵاقی لە مێردەکەی کرد بەبێ بوونی خراپییەك بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرامە).**

**٢٥٠٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ اخْتَلَعَتْ مِنْهُ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عِدَّتَهَا حَيْضَةً. [د٢٢٢٩/ ت١١٨٥م]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە: ژنەکەی سابیتی کوڕی قەیس بە خولع لێی جیابوویەوە، پێغەمبەر(ﷺ) عیددەکەی کرد بە یەك حەیز.**

---

[1] **واتە: سابیت توانای هاوسەرگیری کردنی نییە و دەترسم تووشی زینا ببم و بێباوەڕ ببمەوە—و.**

## بەشی دووەم

## "اللعان"

٢٥١٠- (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ: أَنَّ عُوَيْمِراً الْعَجْلاَنِيَّ جاءَ إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ الأَنْصَارِيِّ، فَقَالَ لَهُ: يَا عَاصِمُ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ سَلْ لِي يَا عاصِمُ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. فَسَأَلَ عَاصِمٌ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَكَرِهَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم المَسَائِلَ وَعَابَهَا، حَتَّى كَبُرَ عَلَى عَاصِمٍ مَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. فَلَمَّا رَجَعَ عاصِمٌ إِلَى أَهْلِهِ، جَاءَ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: يَا عَاصِمُ، ماذَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَقَالَ عاصِمٌ: لَمْ تَأْتِنِي بِخَيْرٍ، قَدْ كَرِهَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم المَسْأَلَةَ الَّتِي سَأَلْتُهُ عَنْهَا. قَالَ عُوَيْمِرٌ: واللهِ لاَ أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَهُ عَنْهَا.

فَأَقْبَلَ عُوَيْمِرٌ حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَسْطَ النَّاسِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**قَدْ أَنْزَلَ الله فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ، فَاذْهَبْ فَأْتِ بِهَا**). قالَ سَهْلٌ: فَتَلاَعَنَا، وَأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَّا فَرَغا، قالَ عُوَيْمِرٌ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ الله إِنْ أَمْسَكْتُهَا، فَطَلَّقَهَا ثَلاَثاً، قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم.

قالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَتْ تِلْكَ سُنَّةَ المَتَلاَعِنَيْنِ. [خ٥٢٥٩ (٤٢٣)/ م١٤٩٢]

**(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە: عوەیمیری عەجلانی هات بۆ لای عاصیمی کوڕی عەدیی ئەنصاری و پێی وت: ئەی عاصم، گەر پیاوێك لەگەڵ ژنەکەی پیاوێك ببینێت، ئایا دەیکوژێت و بیکوژنەوە، یان دەبێ چی بکات؟ ئەی عاصم دەربارەی ئەوە پرسیارم بۆ بکە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، عاصم دەربارەی ئەوە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسەکەی لا ناپەسەند بوو و تانەی لێدا، تا ئەوەی لە پێغەمبەری خودای(ﷺ) بیست بوو لەسەر عاصم گران بوو، کاتێ عاصم گەڕایەوە بۆ ناو خانەوادەکەی عوەیمیر هات و وتی: ئەی عاصم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) چی پێ فەرمووی؟ عاصم وتی: خێرت بۆ نەهێنام، پێغەمبەری**

خودا(ﷺ) ئەو پرسەی لێم پرسی لا ناپەسەند بوو، عوەیمیر وتی: سوێند بە خودا، کۆڵ نادەم تا دەربارەی پرسیاری لێ دەکەم.

عوەیمیر کەوتەڕێ تا هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە لەناو خەڵکدا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر پیاوێك لەگەڵ ژنەکەی پیاوێك ببینێ، ئایا دەیکوژێت و بیکوژنەوە، یان دەبێ چی بکات؟ **پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا ئایەتی دابەزاند دەربارەی تۆ و ژنەکەت، بڕۆ و بیهێنە)**، سەهل وتی: هەردووکیان نەفرەتیان ئاڵوگۆڕ کرد، من لەگەڵ خەڵکەکە بووم لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، کاتێ لێبوونەوە، عوەیمیر وتی: گەر لای خۆم بیهێڵمەوە درۆم بۆ هەڵبەستووە، بۆیە سێ بە سێ تەڵاقیدا بەرلەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێ بکات.

ئیبن شیهاب دەڵێت: ئەوەش سوننەتی دوو نەفرەتکارەکەیە.

**٢٥١١**– (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً رَمَى امْرَأَتَهُ، فَانْتَفَى مِنْ وَلَدِهَا، فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَتَلاَعَنَا كَمَا قَالَ اللهُ، ثُمَّ قَضَى بِالْوَلَدِ لِلْمَرْأَةِ، وَفَرَّقَ بَيْنَ المُتَلاَعِنَيْنِ.　[خ٤٧٤٨/ م١٤٩٤]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێك ژنەکەی خۆی تۆمەتبار کرد و خۆی لە منداڵەکەی بەری کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردن و نەفرەتکارییان کرد وەك چۆن خودا فەرموویەتی، پاشان قەزاوەتی کرد منداڵەکە بۆ ژنەکە بێت و دوو نەفرەتکارەکەی لەیەکتر جیاکردەوە.**

- وفي رواية للبخاري: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ... [خ٥٣٠٦]

**لە ریوایەتێکی بوخاریدا: پیاوێك لە ئەنصار...**

**٢٥١٢**– (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ عَنِ المُتَلاعِنَيْنِ، فَقَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لِلْمُتَلاعِنَيْنِ: (**حِسَابُكُمَا عَلَى اللهِ، أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ، لاَ سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا**). قَالَ: مَالِي؟ قَالَ: (**لاَ مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا، فَهُوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا، فَذَاكَ أَبْعَدُ لَكَ**).　[خ٥٣١٢ (٥٣١١)/ م١٤٩٣]

(ق) لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: پرسیارم کرد لە ئیبن عومەر دەربارەی دوو نەفرەتکارەکە: وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە دوو نەفرەتکارەکەی فەرموو: **(حسابتان لەسەر خودایە، یەکێکتان درۆزنن، تۆ ڕێگەیەکت لەبەردەم نییە بۆ سەر ژنەکە)**، پیاوەکە وتی: ماڵ و سامانەکەم؟[1] فەرمووی: **(ماڵ و سامانت بۆ نییە گەر تۆمەتەکەت بۆ ئەو ڕاست بێت، چونکە ئەوە بەوەیە داوێنی ئەوت بۆ خۆت حەڵاڵ کردووە، گەر تۆمەتەکەت بۆ ئەو درۆ بێت ئەوە بۆ تۆ دوورترە)**.

**٢٥١٣**- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ أَمْرَأَتَهُ عَنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِشَرِيكِ بْنِ سَحْمَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**الْبَيِّنَةَ، أَوْ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ**). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِذَا رَأَى أَحَدُنَا عَلَى امْرَأَتِهِ رَجُلاً، يَنْطَلِقُ يَلْتَمِسُ الْبَيِّنَةَ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**الْبَيِّنَةَ، وَإِلاَّ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ**). فَقَالَ هِلاَلٌ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ! إِنِّي لَصَادِقٌ، فَلَيُنْزِلَنَّ اللهُ ما يُبَرِّئُ ظَهْرِي مِنَ الحَدِّ، فَنَزَلَ جِبْرِيلُ وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ: ﴿**وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ**﴾ [النور:٦]، فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ: ﴿**إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴿٩﴾**﴾ [النور:٩]. فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَجَاءَ هِلاَلٌ فَشَهِدَ، وَالنَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ**)؟ ثُمَّ قَامَتْ فَشَهِدَتْ، فَلَمَّا كَانَتْ عِنْدَ الخَامِسَةِ وَقَّفُوهَا، وَقَالُوا: إِنَّهَا مُوجِبَةٌ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَتَلَكَّأَتْ وَنَكَصَتْ، حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهَا تَرْجِعُ، ثُمَّ قَالَتْ: لاَ أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ، فَمَضَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَبْصِرُوهَا، فَإِنْ جاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ، سَابِغَ الأَلْيَتَيْنِ، خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ، فَهُوَ لِشَرِيكِ بْنِ سَحْمَاءَ**). فَجَاءَتْ بِهِ كَذلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَوْلاَ ما مَضى مِنْ كِتَابِ اللهِ، لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ**). [خ٤٧٤٧ (٢٦٧١)]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە: هیلالی کوڕی ئومەیە لای پێغەمبەر(ﷺ) ژنەکەی خۆی بە شەریکی کوڕی سەحما تۆمەتبار کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(بەڵگە، یان داری حەد لە پشتت)**، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر یەکێك لە ئێمە پیاوێك لەسەر ژنەکەی ببینێت دەڕوات بەڵگەی بۆ دەهێنێت، پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام دەیفەرموو: **(بەڵگە، یان داری حەد لە پشتت)**، هیلال وتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە، من

---

[1] واتە: ئەو مارەییەی بە ئافرەتەکەم داوە چی بەسەر دێت؟-و.

ڕاستگۆم، خودا ئایەت دادەبەزێنێت پشتم لە داری حەد بەری بکات، جیبریل دابەزی و ئەمەی بۆ سەر دابەزاند: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ﴾ [النور:٦]، تا ﴿إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ [النور:٩]، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت و ناردی لە دووی، هیلال هات و شایەتیدا، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: **(خودا دەزانێت یەکێك لە ئێوە درۆزنە، ئایا لەو دوانەتان کەسێکتان تەوبەکارە؟)** پاشان ژنەکە هەستا و شایەتی دا، کاتێك گەیشتە پێنجەم پێغەمبەر وەستانی، خەڵکەکە وتیان: پێویستکەرە[1]، ئیبن عەباس وتی: زمانی هات بە یەکدا و گەڕایەوە تا گومانمان برد پاشگەز دەبێتەوە، پاشان وتی: هۆزەکەم شەرمەزار ناکەم بە درێژایی ڕۆژگار، بۆیە بەردەوام بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(چاودێری بکەن، گەر چاو ڕەش و سمت پان و لاق خڕ بوو ئەوە منداڵی شەریکی کوڕی سەحمایە)**، ژنەکە منداڵەکەی بوو بەو جۆرە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر لە کتێبەکەی خودادا گوزەری نەکردبایە من و ئەو[2] کاروبارێکمان دەبوو)**.

**٢٥١٤**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَمَرَ رَجُلاً حِينَ أَمَرَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ أَنْ يَتَلاَعَنَا، أَنْ يَضَعَ يَدَهُ عَلَى فِيهِ عِنْدَ الْخَامِسَةِ، وَيَقُولُ: إِنَّهَا مُوجِبَةٌ. [د٢٢٥٥/ ن٣٤٧٢]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە پیاوێك -کاتێ فەرمانی کرد بە دوو نەفرەتکارەکە نەفرەت بکەن- لە پێنجەمدا دەست لەسەر دەمی خۆی دابنێت و بڵێت: ئەوە پێویستکەرە.

---

[1] پێویستکەرە: واتە "موجِبة" واتە تووڕەیی خودای بۆ پێویست دەبێت گەر ژنەکە درۆ بکات-و.

[2] واتە: ژنەکە-و.

## بەشی سێیەم

## "الإيلاء[1]"

**٢٥١٥-** (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم حَلَفَ لاَ يَدْخُلُ عَلَى بَعْضِ أَهْلِهِ شَهْراً، فَلَمَّا مَضَى تِسْعَةٌ وَعِشْرُونَ يَوْماً غَدَا عَلَيْهِنَّ أَوْ رَاحَ، فَقِيلَ لَهُ: يَا نَبِيَّ الله! حَلَفْتَ أَنْ لاَ تَدْخُلَ عَلَيْهِنَّ شَهْراً؟ قَالَ: **(إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ يَوْماً)**.

[خ٥٢٠٢ (١٩١٠)/ م١٠٨٥]

**(ق) لە ئوم سەلەمەوە: پێغەمبەر(ﷺ) سوێندی خوارد مانگێك نەچێتە لای هەندێ لە خانەوادەكانی، كە بیست و نۆ ڕۆژ تێپەڕی بەیانی یان ئێوارە سەردانی كردن، پێیوترا: ئەی پێغەمبەری خودا، تۆ سوێندت خوارد مانگێ نەچییە ژوورەوە بۆ لایان؟ فەرمووی: (دەكرێت مانگ بیست و نۆ ڕۆژیش بێت).**

- وفي رواية للبخاري: آلَى مِنْ نِسَائِهِ شَهْراً.		[خ١٩١٠]

**لە ریوایەتێكی بوخاریدا: مانگێ سوێندی خوارد لە ژنەكانی.**

**٢٥١٦-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَصْبَحْنَا يَوْماً وَنِسَاءُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَبْكِينَ، عِنْدَ كُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ أَهْلُهَا، فَخَرَجْتُ إِلَى المسْجِدِ، فَإِذَا هُوَ مَلآنُ مِنَ النَّاسِ، فَجَاءَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، فَصَعِدَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ فِي غُرْفَةٍ لَهُ، فَسَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ سَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ سَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، فَنَادَاهُ، فَدَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَال: أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ فَقَالَ: **(لاَ، وَلكِنْ آلَيْتُ مِنْهُنَّ شَهْراً)**. فَمَكَثَ تِسْعاً وَعِشْرِينَ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَى نِسَائِهِ.		[خ٥٢٠٣]

---

[1] **"الإيلاء" بریتییە لە سوێندخواردنی پیاو لەسەر ئەوەی نەچێتە لای ژنەكەی یان ژنەكانی-و.**

(خ) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ڕۆژێك بەیانیمان لێبوویەوە و ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەگریان، هەریەك لەو ژنانە خانەوادەکەی لای بوو، من ڕۆشتمە دەرەوە بۆ مزگەوت، بینیم پڕە لە خەڵك، عومەری کوڕی خەتاب هات سەرکەوت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەو لە ژوورێکی خۆیدا بوو، سەلامی کرد کەس وەڵامی نەدایەوە، پاشان سەلامی کرد و کەس وەڵامی نەدایەوە، پاشان سەلامی کرد و کەس وەڵامی نەدایەوە، بانگی پێغەمبەری کرد و ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئایا ژنەکانت تەلاق داوە؟ فەرمووی: **(نەخێر، بەڵام مانگی سوێندم لێ خواردوون)**، بیست و نۆ ڕۆژ مایەوە و پاشان ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای ژنەکانی.

**٢٥١٧**– (خ) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما كَانَ يَقُولُ فِي الإِيلاَءِ الَّذِي سَمَّى اللهُ: لاَ يَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدَ الأَجَلِ؛ إِلاَّ أَنْ يُمْسِكَ بِالْمَعْرُوفِ، أَوْ يَعْزِمَ الطَّلاَقَ كَمَا أَمَرَ اللهُ عزّ وجل. [خ٥٢٩٠]

(خ) لە نافیعەوە: ئیبن عومەر(خوایان لێ ڕازی بێت) دەربارەی **"الإیلاء"** کە خودا ناوی لێناوە دەیوت: لەدوای وادەکە بۆ کەس حەڵاڵ نییە[١]، دەبێ بە چاکە دەستی پێوە بگرێ، یان پێداگر بێت لەسەر تەلاق وەك چۆن خودا(عز وجل) فەرمانی کردووە[٢].

[١] واتە: دوای تەواوبوونی وادەی سوێندەکەی حەڵاڵ نییە لە ژنەکەی دابېڕێت–و.

[٢] مەبەست ئەم دوو ئایەتەیە: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾﴾ [البقرة:٢٢٦– ٢٢٧]–و.

## بەشی یەکەم

## رەچەڵەك

### ١- دەروازەی: گەر پیاوەکە بە نەریّ کردنی منداڵەکە پشتی هەڵکرد

**٢٥١٨-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ أَعْرَابِيّاً أَتَى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاَماً أَسْوَدَ، وَإِنِّي أَنْكَرْتُهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ**)؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (**فَمَا أَلْوَانُهَا**)، قالَ: حُمْرٌ، قَالَ: (**هَلْ فِيهَا مِنْ أَورَقَ**)؟ قَالَ: إِنَّ فِيهَا لَوُرْقاً، قالَ: (**فَأَنَّى تُرَى ذلِكَ جَاءَهَا**)؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، عِرْقٌ نَزَعَهَا، قَالَ: (**وَلَعلَّ هَذَا عِرْقٌ نَزَعَهُ**). وَلَمْ يُرَخِّصْ لَهُ فِي الاِنْتِفَاءِ مِنْهُ. [خ٧٣١٤ (٥٣٠٥)/ م١٥٠٠]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: ئەعرابییەك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: ژنەکەم منداڵێکی رەشی بووە، من بە ناپەسەندی دەبینم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئایا حوشترت هەیە؟)، وتی: بەڵێ، فەرمووی: (رەنگیان چۆنە؟)، وتی: سوور، فەرمووی: (ئایا بەڵەکیان تێدایە؟)، وتی: بەڵەکیان تێدایە، فەرمووی: (پێتوایە ئەوەی لە کوێوە هێنابێت؟)، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، رەچەڵەکێکە وەریگرتووە، فەرمووی: (لەوانەیە ئەوەش رەچەڵەکێك بێت وەریگرتبێت[1])، پێغەمبەر رێگەی نەدا نەرێی منداڵەکە لە خۆی بکات.**

### ٢- دەروازەی: منداڵ بۆ خاوەن جێگەی نووستنە

**٢٥١٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ**). [خ٦٨١٨ (٦٧٥٠)/ م١٤٥٨]

---

[1] واتە: لەوانەیە بە بۆماوە بۆی بەجێمابێت-و.

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(منداڵ بۆ خاوەن جێگەی نووستنە، و پیاوی زیناكەریش زیانۆمەندی بۆ دەمێنێتەوە)**.

▪ وفي رواية للبخاري: (الْوَلَدُ لِصَاحِبِ الْفِرَاشِ). [خ٦٧٥٠]

لە ریوایەتێكی بوخاریدا: **(منداڵ بۆ خاوەن جێی نووستنە)**.

**٢٥٢٠-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فِي غُلامٍ، فَقَالَ سَعْدٌ: هذَا يَا رَسُولَ اللهِ ابْنُ أَخِي عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّهُ ابْنُهُ، انْظُرْ إِلَى شَبَهِهِ. وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: هَذَا أَخِي يَا رَسُولَ اللهِ، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي مِنْ وَلِيدَتِهِ، فَنَظَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلى شَبَهِهِ فَرَأَى شَبَهاً بَيِّناً بِعُتْبَةَ، فَقَالَ: **(هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ، وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ بِنْتَ زَمْعَةَ)**. فَلَمْ تَرَهُ سَوْدَةُ قَطُّ.

[خ٢٢١٨ (٢٠٥٣)/ م١٤٥٧]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، ئەو وتی: سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص و عەبدی كوڕی زەمعە دەربارەی منداڵێك نەیارییان بۆ دروست بوو، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەمە منداڵی براكەمە، عوتبەی كوڕی ئەبی وەقاص، وەسێتی بۆ كردووم ئەوە كوڕیەتی، تەماشای شێوەكەی بكە، عەبدی كوڕی زەمعەش وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەمە برامە، لەسەر جێگەی نووستنی باوكم و لە كەنیزەكەكەی لەدایك بووە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەماشای شێوەكەی كرد، بینی شێوەیەكی ئاشكرای هەیە بە عوتبە، بۆیە فەرمووی: **(ئەوە بۆ تۆیە ئەی عەبد، منداڵ بۆ جێگەی نووستنەكەیە و پیاوی زیناكەر زیانۆمەندی بۆ دەمێنێتەوە، ئەی سەودەی كچی زەمعە حیجابی لێ بكە[1])**، بۆیە هەرگیز سەودە نەیبینی.

---

[1] سەودەی كچی زەمعە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، خوشكی عەبدی كوڕی زەمعە بوو، وایاندەزانی غوڵامەكە برای ئەوانە، بەڵام دەرچوو برازای سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصە، چونكە شێوەی غوڵامەكە بە براكەی سەعد دەچوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) غوڵامەكەی نەدا بە سەعد، چونكە براكەی زیناكار بووە، پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە سەودەی هاوسەری كرد حیجابی لێ بكات، چونكە لە راستەقینەدا برای نییە-و.

**٢٥٢١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَمْرٍو قَالَ: قَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ فُلاَناً ابْنِي، عَاهَرْتُ بِأُمِّهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ دِعْوَةَ فِي الإِسْلاَمِ، ذَهَبَ أَمْرُ الْجَاهِلِيَّةِ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ).** [د٢٢٧٤]

* حسن صحيح.

**له عەبدوڵای كوڕی عەمرەوە، وتی: پیاوێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، فڵان كوڕی منە، لە سەردەمی نەفامی زینام لەگەڵ دایكی كرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە ئیسلامدا بانگەشەیەك نییە، كاروباری نەفامی تێپەڕی، منداڵ بۆ جێگەی نووستنەكەیە، و پیاوی زیناكەر زیانۆمەندی بۆ دەمێنێتەوە).**

## ٣- دەروازەی: رەچەڵەكناس

**٢٥٢٢-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ عَلَيَّ مَسْرُوراً، تَبْرُقُ أَسَارِيرُ وَجْهِهِ فَقَالَ: **(أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزاً نَظَرَ آنِفاً إِلَى زَيْدِ بْنِ حارِثَةَ وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، فَقَالَ: إِنَّ هذِهِ الأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ).** [خ٦٧٧٠ (٣٥٥٥)/ م١٤٥٩]

**(ق) له عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە دڵخۆشی هاتە ژوورەوە بۆ لام، روخساری دەبرسكایەوە، فەرمووی: (ئایا نابینی ئێستا رەچەڵەكناسێك(مُجَزِّز) تەماشای زەیدی كوڕی حاریسە و ئوسامەی كوڕی زەیدی كرد و وتی: ئەم پێیانە هەندێكیان لە هەندێكیانن).**

- وفي رواية لهما: دَخَلَ فَرَأَى أُسَامَةَ وَزَيْداً، وَعَلَيْهِمَا قَطِيفَةٌ، قَدْ غَطَّيَا رُؤُوسَهُمَا وَبَدَتْ أَقْدَامُهُمَا، فَقَالَ: **(إِنَّ هذِهِ الأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ).** [خ٦٧٧١]

**لە ریوایەتێكی هەردووكیان: هاتە ژوورەوە و ئوسامە و زەیدی بینی و قەتیفەیەكیان لەسەر بوو و سەری خۆیان داپۆشی بوو و پێیەكانیان دەركەوتبوو، فەرمووی: (ئەم پێیانە هەندێكیان لە هەندێكیانن).**

- وفي رواية لهما: فَسُرَّ بِذَلِكَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَعْجَبَهُ، فَأَخْبَرَ بِهِ عَائِشَةَ.[خ٣٧٣١]

لە ریوایەتێکی تری هەردووکیان: پێغەمبەر(ﷺ) بەوە دڵخۆش بوو و پێی سەرسام بوو و بەوە هەواڵی دا بە عائیشە.

- وفي رواية لمسلم: وَكَانَ مُجَزِّزٌ قَائِفاً.

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: "مُجَزِّز" رەچەڵەکناس بوو.

## ٤- دەروازەی: کەسێك بە ناوی باوکییەوە ناوی نەهێنرێت

**٢٥٢٣**- (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ ادَّعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ ـ وَهُوَ يَعْلَمُهُ ـ؛ إِلاَّ كَفَرَ بِاللهِ. وَمَنِ ادَّعَى قَوْماً لَيْسَ لَهُ فِيهِمْ نَسَبٌ؛ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ). [خ٣٥٠٨/ م٦١]

(ق) لە ئەبی زەڕەوە(خوا لێی رازی بێت): ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر پیاوێك خۆی بداتە پاڵ کەسێکی تر جگە لە باوکی-ئەو کارەکە بزانێت[1]- بێباوەڕی بە خودا نواندووە، هەر کەس خۆی بداتە پاڵ هۆزێك لەناو ئەواندا رەچەڵەکی نەبێت با شوێنی خۆی لە ئاگر خۆشبکات).**

**٢٥٢٤**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ تَرْغَبُوا عَنْ آبَائِكُمْ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ أَبِيهِ، فَهُوَ كُفْرٌ). [خ٦٧٦٨/ م٦٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(پشتهەڵمەکەن لە باب و باپیرانتان، هەر کەس پشتهەڵبکات لە باوکی ئەوە بێباوەڕییەکە).**

## ٥- دەروازەی: حەرام کردنی تانەدان لە رەچەڵەك

**٢٥٢٥**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ، وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ). [م٦٧]

---

[1] واتە: ئەو بزانێت ئەو پیاوە باوکی نییە-و.

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دوو شت لەناو خەڵکی بێباوەڕییەکیان پێوەیە: تانەدان لە رەچەڵەك، و لاواندنەوەی مردوو)**.

## ٦- دەروازەی: منداڵی دۆزراوە

**٢٥٢٦**- (خـ) عَنْ سُنَيْنٍ أَبِي جَمِيلَةَ . رَجُلٌ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ .: أَنَّهُ وَجَدَ مَنْبُوذاً فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، قَالَ: فَجِئْتُ بِهِ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى أَخْذِ هَذِهِ النَّسَمَةِ؟ فَقَالَ: وَجَدْتُهَا ضَائِعَةً، فَأَخَذْتُهَا، فَقَالَ لَهُ عَرِيفُهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّهُ رَجُلٌ صَالِحٌ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَكَذَلِكَ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: اذْهَبْ فَهُوَ حُرٌّ، وَلَكَ وَلَاؤُهُ، وَعَلَيْنَا نَفَقَتُهُ.

* إسناده صحيح.		[خـ: الشهادات . باب ١٦/ ط١٤٤٨]

(خـ) لە سونەینەوە، ئەبی جەمیلە-پیاوێك لە بەنی سولەیم-: ئەو لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب منداڵێکی فڕێدراوی بینییەوە، وتی: هێنام بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب، وتی: چی هانیدای بۆ سەر وەرگرتنی ئەم گیاندارە؟ وتی: بینیم فڕێ درابوو و منیش هەڵمگرتەوە، ناسێنەرەکەی وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەو پیاوێکی صاڵحە، عومەر پێی وت: ئایا ئەو بەو جۆرەیە؟ وتی: بەڵێ، عومەری کوڕی خەتاب وتی: بڕۆ ئەو[1] ئازادە و وەلائی بۆ تۆیە و خەرجی لەسەر ئێمەیە.

## ٧- دەروازەی: رەچەڵەك و کار و کردەوە

[وانظر: **٣٣٣٤** (من بطأ به عمله) -**هەر کەس کارەکەی پاشی بخات)**].

---

(١) واتە: منداڵەکە-و.

## بەشی دووەم

## ناونان و عەقیقە

### ١- دەروازەی: (بە ناوی من ناوبنێن، بە کونیەی من کونیە مەخوازن)

**٢٥٢٧-** (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلاَمٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمَ، فَقَالَتِ الأَنْصَارُ: لاَ نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ، وَلاَ نُنْعِمُكَ عَيْناً، فَأَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وُلِدَ لِي غُلاَمٌ، فَسَمَّيْتُهُ الْقَاسِمَ، فَقَالَتِ الأَنْصَارُ: لاَ نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ، وَلاَ نُنْعِمُكَ عَيْناً، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَحْسَنَتِ الأَنْصَارُ، سَمُّوا بِاسْمِي، وَلاَ تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي، فَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ**). [خ٣١١٥/ م٢١٣٣]

**(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵای ئەنصارییەوە، وتی: پیاوێك لە ئێمە منداڵێکی بوو ناوی نا "القاسم"، ئەنصار وتیان: ئێمە بە "أبا القاسم" ناوی تۆ ناهێنین، چاوت بەوە رۆشن ناکەینەوە، پیاوەکە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، غوڵامێکم لەدایکبووە ناوملێناوە (القاسم)، کەچی ئەنصار دەڵێت: بە "أبا القاسم" ناوت ناهێنین و بەوە چاوت رۆشن ناکەینەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەنصار چاکیان کردووە، بە ناوی من ناوبنێن، بە کونیەی من کونیە مەنێن، چونکە منم "قاسم"[١]").**

**٢٥٢٨-** (ق) عَنْ أَنس ﷺ قال: دَعَا رَجُلٌ بِالبَقِيعِ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: لَمْ أَعْنِكَ، قَالَ: (**سَمُّوا بِاسْمِي، وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي**).
[خ٢١٢١ (٢١٢٠)/ م٢١٣١]

**(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پیاوێك لە بەقیع بانگی کرد: (یا أبا القاسم-ئەی باوکی قاسم)، پێغەمبەر(ﷺ) لای بە لادا کردەوە، پیاوەکە وتی: مەبەستم تۆ نەبوو، پێغەمبەر فەرمووی: (بە ناوی من ناوبنێن، بە کونیەی من کونیە مەنێن).**

---
[١] واتە: دابەشکار-و.

## ٢- دەروازەی: ناونان بە ناوی پێغەمبەران

**٢٥٢٩-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسى ﷺ قَالَ: وُلِدَ لِي غُلاَمٌ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَسَمَّاهُ إِبْرَاهِيمَ، فَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ، ودَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ، وَدَفَعَهُ إِلَيَّ، وَكَانَ أَكْبَرَ وَلَدِ أَبِي مُوسى.
[خ٥٤٦٧/ م٢١٤٥]

**(ق) لە ئەبی موساوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: منداڵێکم لەدایك بوو، هێنام بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا ئیبراهیم، بە دەنکە خورمایەك دەمی منداڵەکەی شیرین کرد و دوعای بەرەکەتی بۆ کرد و دایەوە دەستم، ئەو کوڕە گەورەی ئەبو موسا بوو.**

## ٣- دەروازەی: گۆڕینی ناو بۆ باشتر

**٢٥٣٠-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ زَيْنَبَ كَانَ اسْمُهَا بَرَّةَ، فَقِيلَ: تُزَكِّي نَفْسَهَا، فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: زَيْنَبَ.
[خ٦١٩٢/ م٢١٤١]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: زەینەب ناوی "بَرَّة"[١] بوو، وترا: تەزکییەی نەفسی خۆی دەکات، بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناوینا زەینەب.**

**٢٥٣١-** (خ) عَنِ ابْنِ المسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ أَبَاهُ جاءَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(ما اسْمُكَ)**؟ قالَ: حَزْنٌ، قالَ: **(أَنْتَ سَهْلٌ)**، قالَ: لاَ أُغَيِّرُ اسْماً سَمَّانِيْهِ أَبِي! قَالَ ابْنُ المسَيَّبِ: فَمَا زَالَتِ الحُزُونَةُ فِينَا بَعْدُ.
[خ٦١٩٠]

**(خ) لە ئیبن موسەییبەوە، لە باوکییەوە: باوکی هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر فەرمووی: (ناوت چییە؟)، وتی: "حَزْن"[٢]، فەرمووی: (تۆ سەهلی)، وتی: ناوێك ناگۆڕم باوکم ناوی لێنابم، ئیبن موسەییەب وتی: لەدوای ئەوە بەردەوام دڵتەنگی لەناوماندا بوو.**

---

[١] "برَّة" واتە چاکەکار-و.

[٢] (حزن) مانای دڵتەنگی و مانای چیا دەگەیەنێت، بۆیە پێغەمبەر گۆڕی بۆ (سهل) کە مانای ئاسانی و مانای دەشت دەگەیەنێت-و.

**٢٥٣٢**– (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ ابْنَةً لِعُمَرَ كَانَتْ يُقَالُ لَهَا: عَاصِيَةُ، فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: جَمِيلَةَ. [م٢١٣٩]

**(م) لە ئیبن عومەرەوە: كچێكی عومەر پێی دەوترا "عاصیة[١]"، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناوی نا "جمیلة".**

**٢٥٣٣**– عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُغَيِّرُ الِاسْمَ الْقَبِيحَ. [ت٢٨٣٩]

* صحيح.

**لە عائیشەوە: پێغەمبەر(ﷺ) ناوی ناشیرینی دەگۆڕی.**

## ٤- دەروازەی: ئەو ناوانەی ناپەسەندن

**٢٥٣٤**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عن النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَخْنَعُ الأَسْمَاءِ عَنْدَ اللهِ رَجُلٌ تَسَمَّى بِمَلِكِ الأَمْلاكِ**). [خ٦٢٠٦ (٦٢٠٥)/ م٢١٤٣]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (پەستترین و رسواترین ناو لای خودا(عز وجل) ناوی پیاوێكە بە "مَلِك الأملاك[٢]" ناوی خۆی دەنێت).**

**٢٥٣٥**– (م) عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تُسَمِّ غُلاَمَكَ: رَبَاحاً، وَلاَ يَسَاراً، وَلاَ أَفْلَحَ، وَلاَ نَافِعاً**). [م٢١٣٦]

**(م) لە سەمورەی كوڕی جوندەبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ناوی منداڵەكەت مەنێ "رباح، یسار، أفلح، نافع".**

---

[١] واتە: یاخی–و.

[٢] ملك الأملاك: "أملاك" كۆی وشەی "مُلْك" یان "مِلْك"، مانای "مەلیكی مەملەكەتان"ی هەیە، "ملِك الملوك"یش مانای "شاهەنشا(شای شاهان)"ی هەیە–و.

**٢٥٣٦–** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أَرَادَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَنْهى عَنْ أَنْ يُسَمَّى بِيَعْلَى، وَبِبَرَكَةَ، وَبِأَفْلَحَ، وَبِيَسَارٍ، وَبِنَافِعٍ، وَبِنَحْوِ ذلِكَ. ثُمَّ رَأَيْتُهُ سَكَتَ بَعْدُ عَنْهَا، فَلَمْ يَقُلْ شَيْئاً. ثُمَّ قُبِضَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَلَمْ يَنْهَ عَنْ ذلِكَ. ثُمَّ أَرَادَ عُمَرُ أَنْ يَنْهَى عَنْ ذلِكَ، ثُمَّ تَرَكَهُ. [م٢١٣٨]

**(م) له جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ویستی نەهی بکات لە ناونان بە "یعلی و برکة و أفلح و یسار و نافع" و هاوشێوەی ئەوانە، لەدوای ئەوە بینیم لەوانە بێدەنگ بوو و هیچی نەوت، پاشانیش پێغەمبەری خودا کۆچی دوایی کرد و نەهی لەوانە نەکردبوو، پاشان عومەر ویستی نەهی لەوانە بکات، دواتر وازیلێهێنا.**

## ٥- دەروازەی: خۆشەویستترین ناو

**٢٥٣٧–** (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ إِلَى اللهِ: عَبْدُ اللهِ، وَعَبْدُ الرَّحْمنِ)**. [م٢١٣٢]

**(م) له ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خۆشەویستترین ناوتان لای خودا: "عبدالله و عبدالرحمن"ە).**

## ٦- دەروازەی: "العقيقة والتحنيك[1]"

**٢٥٣٨–** (خ) عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: مَعَ الْغُلاَمِ عَقِيقَةٌ. [خ٥٤٧١]

**(خ) له سەلمانی کوڕی عامیرەوە، وتی: لەگەڵ غوڵام عەقیقە هەیە.**

**٢٥٣٩–** عَنْ أُمِّ كُرْزٍ الْكَعْبِيَّةِ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(عَنِ الْغُلاَمِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ)**. [د٢٨٣٤/ ن٤٢٢٦/ جه٣١٦٢/ مي٢٠٠٩]
* صحيح.

---

[1] **"العقيقة" بریتییە لەو حەیوانەی لە ڕۆژی حەوتەم بۆ منداڵ سەردەبڕێت، "التحنيك" سەقفی ناو دەمی منداڵ بە خورمای کوتراو و جواو دەهەنوێنرێ، ئەوەش بریتییە لە "التحنيك"ـو.**

له "أم كُرْز الكعبية"ەوە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(بۆ کوڕ دوو "شاة" هاوتا، و بۆ کچ یەك "شاة"[1])**.

**٢٥٤٠**– عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (كُلُّ غُلاَمٍ رَهِينَةٌ بِعَقِيقَتِهِ، تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ، وَيُحْلَقُ، وَيُسَمَّى). [د٢٨٣٨/ ت١٥٢٢/ ن٤٢٣١/ جه٣١٦٥]

* صحيح.

**لە سەموورەی کوڕی جوندەبەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەموو منداڵێك بارمتەی عەقیقەکەیەتی[2]، لە ڕۆژی حەوتەم بۆی سەردەبڕێت و سەری دەتاشرێت و ناودەنرێت).**

**٢٥٤١**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَقَّ عَنِ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ كَبْشاً كَبْشاً. [د٢٨٤١/ ن٤٢٣٠]

**لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ هەریەك لە حەسەن و حوسەین بەرانێکی کرد بە عەقیقە.**

- ولفظ النسائي: بِكَبْشَيْنِ كَبْشَيْنِ.

* صحيح.

**لەفزەکەی نەسائی بۆ هەریەکەیان بە دوو بەران.**

[وانظر في التحنيك: ١٧١٤، ٢٥٢٩، ٣٦٠٤، ٣٧٦٧].

## ٧- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی خەتەنە هاتووە

**٢٥٤٢**– (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سُئِلَ ابنُ عَبَّاسٍ: مِثْلُ مَنْ أَنْتَ حينَ قُبِضَ النبيُّ صلّى الله عليه وسلّم؟ قال: أنا يَومَئِذٍ مَخْتُونٌ. قالَ: وَكَانُوا لاَ يَخْتِنُونَ الرَّجلَ حَتَّى يُدْرِكَ. [خ٦٢٩٩]

---

[1] واتە: بۆ کوڕ دوو حەیوانی سپی یان دوو حەیوانی رەش و بۆ کچ یەك دانە–و.

[2] واتە: حەیوانە سەربڕاوەکە دەبێتە رزگار کردنی لە بارمتەیی–و.

**(خ) لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: پرسیار لە ئیبن عەباس کرا: تۆ وەك کێ بووی کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد؟ وتی: من لەو ڕۆژەدا خەتەنەکراو بووم، وتی: ئەوان پیاویان[1] خەتەنە نەدەکرد تا پێدەگەیی.**

**٢٥٤٣**– عن أم عطية الأنصارية: أن امرأةً كانت تَخْتِنُ بالمدينةِ، فقال لها النبيُّ صلى الله عليه وسلم: (**لا تَنْهِكي؛ فإن ذلك أحظى للمرأةِ وأحبُّ للبَعْلِ**). [د٥٢٧١]

* صحيح، وقال أبوداود: ضعيف.

**لە ئوم عەتییەی ئەنصارییەوە: ئافرەتێك لە مەدینە خەتەنەی دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (زیادەڕەوی مەکە لە بڕین، چونکە ئەوە[2] خۆشی زۆرترە بۆ ئافرەت و لای پیاو خۆشترە).**

## ٨- دەروازەی: بانگدان بە گوێی منداڵی لەدایك بوودا

**٢٥٤٤**– عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَذَّنَ فِي أُذُنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ حِينَ وَلَدَتْهُ فَاطِمَةُ بِالصَّلَاةِ. [د٥١٠٥/ ت١٥١٤]

* حسن. وقال شعيب: ضعيف.

**لە ئەبی ڕافیعەوە، وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی بانگی نوێژی دا بە گوێی حەسەنی کوڕی عەلیدا کاتێ فاتیمە حەسەنی بوو.**

---

[1] "پیاویان" واتە: نێریان–و.

[2] واتە: ئەوەی لە خەتەنەکردنی ئافرەتان دەیبڕێت جێگەی خۆشی پیاوە، پێغەمبەر نەهی نەکرد لە ئافرەتە خەتەنەکەرەکە، بەڵام پێی فەرموو: ئەو شتەی تۆ دەیبڕی جێگەی خۆشی ژن و پیاوە، بۆیە بنەبڕی مەکە، لە دووتوێی فەرموودەکەدا ئاماژە هەیە بۆ خەتەنە نەکردنی ئافرەتان و هێڵانەوەی ئەو بەشەی جەستەی، هەرچەند لای ئەبی داود فەرموودەکە بە لاواز دانراوە–و.

## ٩- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی ئەدەبدادانی منداڵ هاتووە و فەرمان پێکردنی بە نوێژ

**٢٥٤٥**- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَأَنْ يُؤَدِّبَ الرَّجُلُ وَلَدَهُ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِصَاعٍ**). [ت١٩٥١]

* ضعيف.

**لە جابری کوڕی سەمورەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر پیاوێك ئەدەبی منداڵەکەی دابدات باشترە لەوەی "صاع"ێك بکات بە صەدەقە[١]).**

**٢٥٤٦**- عَنْ عَمْرِو بْنِ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِي: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَا نَحَلَ وَالِدٌ وَلَداً مِنْ نَحْلٍ، أَفْضَلَ مِنْ أَدَبٍ حَسَنٍ**). [ت١٩٥٢]

* ضعيف.

[وانظر: **١١٧١**] وفي أمره بالصلاة والتفريق في المضاجع.

**لە عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاصییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (باوکێك شتێکی بە منداڵەکەی نەبەخشیوە باشتر و چاکتر لە ئەدەبی باش و جوان).**

## ١٠- دەروازەی: دەربارەی کونیە

**٢٥٤٧**- عَنْ حَمْزَةَ بْنِ صُهَيْبٍ: أَنَّ عُمَرَ قَالَ لِصُهَيْبٍ: مَا لَكَ تَكْتَنِي بِأَبِي يَحْيَى، وَلَيْسَ لَكَ وَلَدٌ؟ قَالَ: كَنَّانِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِأَبِي يَحْيَى. [جه٣٧٣٨]

* حسن. وقال شعيب: ضعيف.

**لە حەمزەی کوڕی سوهەیبەوە: عومەر بە سوهەیبی وت: بۆچی (أبي يحيى)ت کردووە بە کونیە و کوڕیشت نییە؟ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) (أبي يحيى)ی کرد بە کونیەم.**

---

[١] واتە: "صاع"ێك -کە نزیك بە دوو کیلۆ و نیوە- لە گەنم یان جۆ یان خورما یان مێوژ-و.

**٢٥٤٨**– عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، كُلُّ صَوَاحِبِي لَهُنَّ كُنًى، قَالَ: (**فَاكْتَنِي بِابْنِكِ عَبْدِ اللهِ**). يَعْنِي: ابْنِ اخْتُهَا، فَكَانَتْ تُكَنَّى بِأُمِّ عَبْدِ اللهِ. [د٤٩٧٠/ جه٣٧٣٩]

* صحيح.

لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، ئەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، هەموو هاورێكانم كونیەیان هەیە، فەرمووی: (**تۆش بە كورەكەت "عبدالله" كونییە وەربگرە**)، واتە: كوری خوشكەكەی[1]، بۆیە ئەو بە "أم عبدالله" كونییەی گرتبوو.

## ١١- دەروازەی: یاری لەگەڵ منداڵان

**٢٥٤٩**– عن عبدالله بن الحارث قال: كان رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم يصفُّ عبدَ اللهِ وعبيدَ اللهِ وكثيرًا بنِي العباسِ ثم يقولُ (**من سبَق إليَّ فله كذا وكذا**) قال فيستبقونَ إليه فيقعون على ظهرِه وصدرِه فيُقبِّلُهم ويلتزِمُهم. [حم١٨٣٦]

* إسناده ضعيف.

لە عەبدوڵای كوری حاریسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەبدوڵا و عوبەیدوڵا و زۆرێك لە كورەكانی عەباسی ریز دەكرد و پاشان دەیفەرموو: (**هەر كەس پێش بكەوێت بۆ لای من ئەوە و ئەوەی بۆ هەیە**)، وتی: ئەوانیش پێشبركێیان دەكرد بۆ لای و دەكەوتن بەسەر پشت و سینەیدا و ماچی دەكردن و لەئامێزی دەگرتن.

---

[1] واتە: عەبدوڵای كوری زوبەیر–و.

# بەشی یەكەم

## فەرزەكان[1]

### ١- دەروازەی: گەیاندنی فەرزەكان بە خاوەنەكانیان لەدوای جێبەجێ كردنی مافەكان

**٢٥٥٠**- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ**). [خ٦٧٣٢/ م١٦١٥]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (فەرزەكان بە خاوەنەكانیان بگەیەنن، ئەوەی مایەوە بۆ پیاوی نێرە).**

### ٢- دەروازەی: میراتی دایك و باوك و ژن و مێرد

**٢٥٥١**- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ الْمالُ لِلْوَلَدِ، وَكَانَتِ الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ، فَنَسَخَ الله مِنْ ذلِكَ ما أَحَبَّ، فَجَعَلَ لِلذَّكَرِ: مِثْلَ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، وَجَعَلَ لِلأَبَوَيْنِ: لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسَ، وَجَعَلَ لِلْمَرْأَةِ: الثُّمُنَ والرُّبُعَ، وَلِلْزَّوْجِ: الشَّطْرَ وَالرُّبُعَ. [خ٢٧٤٧]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: ماڵ و سامان بۆ كوڕ بوو و وەسێتیش بۆ دایك و باوك، خودا ئەوەی پێیخۆش بوو لەوە سڕییەوە، بۆ نێر وەك بەشی دوو مێی دانا، بۆ دایك و باوكیش بۆ هەریەكەیان شەشیەكی بڕییەوە، بۆ ژنیش هەشتیەك و چارەك، بۆ مێردیش نیوە و چارەك[2].**

---

[1] مەبەست بە فەرزەكان(الفرائض) ئەو بڕ و هەندانەی لە كتێبەكەی خودادا بۆ میرات دیاریكراوە كە بریتین لە نیوە و چارەك و هەشتیەك و دوو سێیەك و شەشەیەك-و.

[2] واتە: بەپێی ژمارە و جۆری میراتگران بەشەكان گۆڕانیان بەسەردا دێت-و.

- وفي رواية: وَجَعَلَ لِلأَبَوَيْنِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسَ وَالثُّلُثَ. [خ٤٥٧٨]

**له ریوایەتێكدا: بۆ دایك و باوك، بۆ هەریەكەیان شەشیەك و سێیەك.**

## ٣- دەروازەی: میراتی باپیر

**٢٥٥٢**- (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: كَتَبَ أَهْلُ الْكُوفَةِ إِلَى ابْنِ الزُّبَيْرِ فِي الجَدِّ، فَقَالَ: أَمَّا الَّذِي قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذاً مِنْ هذِهِ الأُمَّةِ خَلِيلاً؛ لاَتَّخَذْتُهُ**). أَنْزَلَهُ أَباً. يَعْنِي: أَبَا بَكْرٍ. [خ٣٦٥٨]

**(خ) له عەبدوڵای كوڕی ئەبی مولەیكەوە، وتی: ئەهلی كوفە دەربارەی باپیر نووسراوێكیان بۆ ئیبن زوبەیر نووسی، ئەویش وتی: ئەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی فەرموویەتی: (گەر لەم ئومەتە خەلیلێكم بگرتبایە ئەوم دەكردە خەلیل)، له جێگەی باوكی داناوە، واتە: ئەبوبەكر.**

**٢٥٥٣**- عَنِ الْحَسَنِ: أَنَّ عَلِيّاً كَانَ يُشَرِّكُ الْجَدَّ مَعَ الْإِخْوَةِ إِلَى السُّدُسِ. [مي٢٩٦٣]

* إسناده صحيح.

**له حەسەنەوە: عەلی باپیری لەگەڵ براكان بۆ شەشەیەك بەشدار پێ دەكرد.**

**٢٥٥٤**- عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ يُشَرِّكُ الْجَدَّ إِلَى سِتَّةٍ مَعَ الْإِخْوَةِ، يُعْطِي كُلَّ صَاحِبِ فَرِيضَةٍ فَرِيضَتَهُ، وَلاَ يُوَرِّثُ أَخاً لِأُمٍّ مَعَ جَدٍّ، وَلاَ أُخْتاً لِأُمٍّ، وَلاَ يَزِيدُ الْجَدَّ مَعَ الْوَلَدِ عَلَى السُّدُسِ؛ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ غَيْرُهُ، وَلاَ يُقَاسِمُ بِأَخٍ لِأَبٍ مَعَ أَخٍ لِأَبٍ وَأُمٍّ. وَإِذَا كَانَتْ أُخْتٌ لِأَبٍ وَأُمٍّ، وَأَخٌ لِأَبٍ، أَعْطَى الْأُخْتَ النِّصْفَ، وَالنِّصْفَ الْآخَرَ بَيْنَ الْجَدِّ وَالْأَخِ نِصْفَيْنِ. وَإِذَا كَانُوا إِخْوَةً وَأَخَوَاتٍ شَرَّكَهُمْ مَعَ الْجَدِّ إِلَى السُّدُسِ. [مي٢٩٦٥]

* فيه انقطاع.

لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە، وتی: عەلی باپیری لەگەڵ شەش برا بەشدار پێ دەکرد، فەرزی دەدا بە خاوەن هەر فەرزێك[1]، برا لە دایکەوە لەگەڵ باپیر میراتی پێ نەدەگرت، هەر بەو جۆرە خوشك لە دایکەوە، باپیر لەگەڵ کوڕ زیاتر لە شەشیەك میرات ناگرێ، مەگەر غەیری ئەو بێت، هەر بەو جۆرە بەشدار نابێت بە برایەك لە باوکەوە لەگەڵ بوونی برایەك لە باوك و دایکەوە، گەر خوشك بوو لە باوك و دایکەوە و برابوو لە باوکەوە نیوە بە خوشکەکە دەدات و نیوەکەی تر بە دوو نیوە لە نێوان باپیر و براکە، گەر برا و خوشك بوون لەگەڵ باپیر بۆ شەشیەك بەشدارییان پێ دەکات.

**٢٥٥٥**– عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ: أَنَّهُ كَانَ يُقَاسِمُ بِالْجَدِّ مَعَ الْإِخْوَةِ إِلَى الثُّلُثِ، ثُمَّ لاَ يُنْقِصُهُ.
* إسناده منقطع. [مي ٢٩٧١]

لە زەیدی کوڕی سابیتەوە: ئەو بۆ سێیەك بەشداری بە باپیر دەکرد لەگەڵ براکان، پاشان لەوە کەمتری نەدەکرد.

## ٤- دەروازەی: میراتی منداڵ

**٢٥٥٦**– (خ) عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَتَانَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ بِالْيَمَنِ مُعَلِّماً وَأَمِيراً، فَسَأَلْنَاهُ: عَنْ رَجُلٍ تُوُفِّيَ: وَتَرَكَ ابْنَتَهُ وَأُخْتَهُ؟ فَأَعْطَى الاِبْنَةَ النِّصْفَ، وَالأُخْتَ النِّصْفَ. [خ٦٧٣٤]

(خ) لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە، وتی: مەعازی کوڕی جەبەل وەك مامۆستا و ئەمیر هات بۆ لامان لە یەمەن، پرسیارمان لێکرد دەربارەی پیاوێك دەمرێت و کچێك و خوشکێك بەجێدەهێڵێت؟ مەعاز نیوەی دا بە کچەکە و نیوەکەی تر بۆ خوشکەکە.

**٢٥٥٧**– (خ) عَنْ هُزَيْلِ بْنِ شُرَحْبِيلَ قَالَ: سُئِلَ أَبُو مُوسى: عَنِ ابْنَةٍ، وَابْنَةِ ابْنٍ، وَأُخْتٍ؟ فَقَالَ: لِلاِبْنَةِ النِّصْفُ، وَلِلأُخْتِ النِّصْفُ، وَأْتِ ابْنَ مَسْعُودٍ فَسَيُتَابِعُنِي. فَسُئِلَ ابْنُ مَسْعُودٍ، وَأُخْبِرَ

---

[1] واتە: بڕی دیاریکراوی دەدا بە هەر خاوەن بەشێك لە میراتگران–و.

بِقَوْلِ أَبِي مُوسى، فَقَالَ: لَقَدْ ضَلَلْتُ إِذاً وَما أَنَا مِنَ المُهْتَدِينَ! أَقْضِي فِيهَا بِمَا قَضى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: لِلاِبْنَةِ النِّصْفُ، وَلاِبْنَةِ الابْنِ السُّدُسُ تكْمِلَةَ الثُّلُثَيْنِ، وَما بَقِيَ فَلِلأُخْتِ. فَأَتيْنَا أَبَا مُوسى فَأَخْبَرْنَاهُ بِقَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ، فَقَالَ: لاَ تَسْأَلُونِي، ما دَامَ هذَا الْحَبْرُ فِيكُمْ. [خ٦٧٣٦]

(خ) لە هوزەیلی کوڕی شورەحبیلەوە، وتی: پرسیار لە ئەبو موسا کرا دەربارەی: کچێك و کچی کوڕێك و خوشکێك؟ وتی: بۆ کچەکە نیوە و بۆ خوشکەکە نیوە، بچۆ بۆ لای ئیبن مەسعوود، ئەو بەدواداچوونم بۆ دەکات، پرسیار لە ئیبن مەسعوود کرا و هەواڵی قسەکەی ئەبی موسای پێ ڕاگەیەنرا، وتی: کەوابوو من گومڕابووم و لە هیدایەتدراوان نیم[1]، قەزاوەتی تێدا دەکەم بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) قەزاوەتی تێدا کرد: بۆ کچەکە نیوە، و بۆ کچی کوڕەکە شەشیەك تەواوکاری دوو سێیەیەکە و ئەوەی مایەوە بۆ خوشکەکە، هاتین بۆ لای ئەبو موسا و هەواڵی قسەکەی ئیبن مەسعوودمان پێ ڕاگەیاند، ئەویش وتی: مادام ئەو زانا لەناو ئێوەیە پرسیار لە من مەکەن.

**٢٥٥٨**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: جَاءَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَعُودُنِي وَأَنَا مَرِيضٌ فِي بَنِي سَلِمَةَ، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، كَيْفَ أَقْسِمُ مَالِي بَيْنَ وَلَدِي؟ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ شَيْئاً، فَنَزَلَتْ: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوۡلَـٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ﴾ الآيَةَ [النساء:١١]. [ت٢٠٩٦، ٣٠١٥]

* هو في الصحيحين بلفظ قريب (خ٥٦٥١/ م١٦١٦).

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لام و سەردانی کردم، من لە بەنی سەلەمە نەخۆش بووم، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن ماڵەکەم لە نێوان منداڵەکانم دابەش بکەم؟ بە شتێك وەڵامی نەدامەوە، ئایەت دابەزی: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوۡلَـٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ﴾ [النساء:١١].

---

[1] واتە: گەر بەیانی حەق نەکەم من گومڕابووم و لە هیدایەتدراوان نیم–و.

## ٥- دەروازەی: میراتی نێوان موسڵمان و بێباوەڕ

**٢٥٥٩–** (ق) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ، وَلاَ الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ)**. [خ٦٧٦٤ (١٥٨٨)/ م١٦١٤]

**(ق) لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (موسڵمان میرات لە بێباوەڕ نابات و بێباوەڕ میرات لە موسڵمان نابات).**

**٢٥٦٠–** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَتَوَارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ شَتَّى)**. [د٢٩١١/ جه٢٧٣١]

* حسن صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەرگیز ئەهلی دوو ئایین میرات لەیەکتر ناگرن).**

## ٦- دەروازەی: میراتی "الكلالة[(١)]"

**٢٥٦١–** (م) عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ خطَبَ يَوْمَ جُمُعَةٍ، فَذَكَرَ نَبِيَّ الله صلّى الله عليه وسلّم، وَذَكَرَ أَبَا بَكْرٍ، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي لاَ أَدَعُ بَعْدِي شَيْئاً أَهَمَّ عِنْدِي مِنَ الْكَلاَلَةِ، مَا رَاجَعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي شَيْءٍ مَا رَاجَعْتُهُ فِي الْكَلاَلَةِ، وَمَا أَغْلَظَ لِي فِي شَيْءٍ مَا أَغْلَظَ لِي فِيهِ، حَتَّى طَعَنَ بِإِصْبَعِهِ فِي صَدْرِي، وَقَالَ: **(يَا عُمَرُ، أَلاَ تَكْفِيكَ آيَةُ الصيْفِ الَّتِي فِي آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ)**؟ وَإِنِّي إِنْ أَعِشْ أَقْضِ فِيهَا بِقَضِيَّةٍ، يَقْضِي بِهَا مَنْ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَمَنْ لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ. [م١٦١٧]

**(م) لە مەعدانی کوڕی ئەبی تەلحەوە: لە رۆژی هەینی عومەری کوڕی خەتاب وتاری دا، باسی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و باسی ئەبوبەکری کرد، پاشان وتی: من لەدوای خۆم شتێك وازلێناهێنم لام گرنگتر بێت لە "الكلالة"، لە هیچ شتێکدا بە قەدەر**

---

(١) "الكلالة" ئەو میراتەیە لە کەسێك بەجێدەمێنێ و کوڕ و باوکی نییە–و.

"الکلالـة" نەگەڕاومەتـەوە بـۆ لای پێغەمبـەری خـودا، لـە هـیچ شـتێکدا بـە قـەدەر "الکلالة" لێم توند نەبووە تا بە دوو پەنجەی کێشای بە سینەمدا و فەرمووی: **(ئـەی عومەر، ئایا ئایەتی "الصيف-هاوین"[1] کە لە کۆتایی سورەتی "النساء"ە بۆ تۆ بەس نییـە؟)**، من گەر بژیم تیایدا بە پرسێك قەزاوەت دەکەم ئەوانەی قورئان دەخوێنن و ئەوانەی قورئان ناخوێنن قەزاوەتی تێدا بکەن.

**٢٥٦٢-** عَنْ جَابِرٍ قَالَ: اشْتَكَيْتُ وَعِنْدِي سَبْعُ أَخَوَاتٍ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَنَفَخَ فِي وَجْهِي، فَأَفَقْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلاَ أُوصِي لِأَخَوَاتِي بِالثُّلُثَيْنِ؟ قَالَ: **(أَحْسِنْ)**. قُلْتُ: الشَّطْرُ؟ قَالَ: **(أَحْسِنْ)**. ثُمَّ خَرَجَ وَتَرَكَنِي، فَقَالَ: **(يَا جَابِرُ، لاَ أُرَاكَ مَيِّتاً مِنْ وَجَعِكَ هَذَا، وَإِنَّ اللهَ قَدْ أَنْزَلَ فَبَيَّنَ الَّذِي لِأَخَوَاتِكَ فَجَعَلَ لَهُنَّ الثُّلُثَيْنِ)**. قَالَ: فَكَانَ جَابِرٌ يَقُولُ: أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِيَّ: ﴿**يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ**﴾[النساء:١٧٦].

* صحيح.　　　　　　　　　　　　　　[د٢٨٨٧]

لە جابرەوە، وتی: نەخۆشکەوتم و حەوت خوشکم هەبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لام و فووی کرد بە روخسارمدا، هاتمەوە بەر هۆش و وتم: ئەی

[1] ئەو دوو ئایەتە یەکێکیان لە زستاندا دابەزیوە و یەکێکیان لە هاوین، ئایەتی هاوینەکە ئەم ئایەتەیە: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾﴾[النساء:١٧٦]، ئایەتەکەی زستانیش ئەم ئایەتەیە: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم ۚ مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ ۚ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾﴾[النساء: ١٢] -و.

پێغەمبەری خودا ئایا وەسێت بکەم بە سێیەکی ماڵ و سامانەکەم بۆ خوشکەکانم؟ فەرمووی: **(چاکە بکە)**، وتم: نیوەی؟ فەرمووی: **(چاکە بکە)**، پاشان ڕۆیشتە دەرەوە و بەجێیهێڵام و فەرمووی: **(ئەی جابر، نابینم لەم ئازارەی ئێستات بمری، خودا دابەزاندووە و ئەوەی بۆ خوشکەکانی تۆیە ڕۆشنی کردووەتەوە و دوو سێ یەکی بۆ داناون)**، وتی جابر دەیوت: ئەم ئایەتە دابەزی دەربارەم: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ﴾ [النساء:١٧٦].

**٢٥٦٣**- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ يَسْتَفْتُونَكَ فِي الْكَلاَلَةِ، فَمَا الْكَلاَلَةُ؟ قَالَ: (**تُجْزِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ**).

فَقُلْتُ لِأَبِي إِسْحَاقَ: هُوَ مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَدَعْ وَلَداً وَلاَ وَالِداً؟ قَالَ: كَذَلِكَ ظَنُّوا أَنَّهُ كَذَلِكَ.

* صحيح. [د٢٨٨٩/ ت٣٠٤٢]

لە ئەبی بەکری کوڕی عەییاشەوە، لە ئەبی ئیسحاقەوە، لە بەرائی کوڕی عازیبەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا داوای فتوات لێ دەکەن دەربارەی "الکلالة"، "الکلالة" **چییە؟ فەرمووی: (ئایەتی "الصیف-هاوین" بەسە بۆ تۆ)**[1].

وتم بە ئەبی ئیسحاق: ئەوە ئەو کەسەیە دەمرێت و کوڕ و باوکی لەدوا بەجێنامێنێ؟ وتی: هەر بەو جۆرە گومانیان برد ئەوە بەو جۆرە بێت.

## ٧- دەروازەی: میراتی منداڵی نەرێکراو لە تەڵاقی لەعان(اللعان)ەوە

**٢٥٦٤**- عَنْ مَكْحُولٍ قَالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِيرَاثَ ابْنِ الْمُلاَعَنَةِ لِأُمِّهِ، وَلِوَرَثَتِهَا مِنْ بَعْدِهَا. [د٢٩٠٧]

* صحيح مرسل.

---

[1] بۆ "ئایەتی هاوین" تەماشای پەراوێزی پێشتر بکە-و.

لە مەكحوولەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) میراتی كوڕی مولاعەنەی بۆ دایكی دانا، هەروەها بۆ میراتگرانی دایكی لەدوای دایكی[1].

## ٨- دەروازەی: میراتی كۆمەڵێك برا

**٢٥٦٥-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّ أَعْيَانَ بَنِي الْأُمِّ يَتَوَارَثُونَ دُونَ بَنِي الْعَلاَّتِ. [ت٢٠٩٥/ جه٢٧٣٩/ مي٣٠٢٧]

**لە عەلییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) قەزاوەتی كرد برای دایك و باوكی، نەك برای باوكی میرات دەگرن.**

- زاد ابن ماجه والدارمي: يَرِثُ الرَّجُلُ أَخَاهُ لِأَبِيهِ وَأُمِّهِ، دُونَ إِخْوَتِهِ لِأَبِيهِ.

* حسن.

**ئیبن ماجە و داریمی ئەمەیان زیاد كردووە: پیاو لە برای باوك و دایكی، نەك برای باوكی میرات دەگرێت.**

## ٩- دەروازەی: میراتی داپیر

**٢٥٦٦-** عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ أَنَّهُ قَالَ: جَاءَتِ الْجَدَّةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا، فَقَالَ: مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى شَيْءٌ، وَمَا عَلِمْتُ لَكِ فِي سُنَّةِ نَبِيِّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم شَيْئاً، فَارْجِعِي حَتَّى أَسْأَلَ النَّاسَ. فَسَأَلَ النَّاسَ، فَقَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَعْطَاهَا السُّدُسَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَلْ مَعَكَ غَيْرُكَ؟ فَقَامَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ، فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، فَأَنْفَذَهُ لَهَا أَبُو بَكْرٍ.

[1] واتە: منداڵی مولاعەنە بمرێت میراتەكەی دایكییەتی، گەر دایكی مرد بۆ میراتگرانی دایكییەتی-و.

ثُمَّ جَاءَتِ الْجَدَّةُ الْأُخْرَى إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا، فَقَالَ: مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى شَيْءٌ، وَمَا كَانَ الْقَضَاءُ الَّذِي قُضِيَ بِهِ إِلاَّ لِغَيْرِكِ، وَمَا أَنَا بِزَائِدٍ فِي الْفَرَائِضِ، وَلَكِنْ هُوَ ذَلِكَ السُّدُسُ، فَإِنِ اجْتَمَعْتُمَا فِيهِ فَهُوَ بَيْنَكُمَا، وَأَيَّتُكُمَا خَلَتْ بِهِ فَهُوَ لَهَا.

[د٢٨٩٤/ ت٢١٠٠/ جه٢٧٢٤/ مي٢٩٨١]

* قال شعيب: صحيح لغيره.

**لە قەبیصەی کوڕی زوئەیبەوە، ئەو وتی: داپیرێك هات بۆ لای ئەبوبەکری صدیق پرسیاری میراتی خۆی لێکرد، ئەبوبەکر وتی: لە کتێبەکەی خودادا شتێکت بۆ نییە، لە سوننەتی پێغەمبەری خوداش(ﷺ) شتێك بۆ تۆ نازانم، بگەڕێوە تا پرسیار لە خەڵکی دەکەم، موغیرەی کوڕی شوعبە وتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئامادە بووم شەشیەکی پێدا، ئەبوبەکر وتی: کەسی ترت لەگەڵ بوو؟ محەمەدی کوڕی مەسلەمە هەستا و هەمان ئەو قسەی کرد موغیرەی کوڕی شوعبە کردی، ئەبوبەکر ئەوەی بۆ داپیرەکە جێبەجێ کرد.**

**پاشان داپیرێکی تر هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) پرسیاری میراتی خۆی لێکرد، عومەر وتی: لە کتێبەکەی خودادا شتێکت بۆ نییە، ئەو قەزاوەتەش بڕیاری لێدرا تەنها بۆ تۆ کراوە، من لە فەرزەکان[١] زیاد ناکەم، بەڵام ئەوە بریتییە لە شەشیەك، گەر هەردووکتان[٢] تیایدا کۆبوونەوە ئەوە لە نێوانتانە، هەر کامێکتان پێی تەنهاکەوتن ئەوە بۆ ئەوە.**

---

[١] مەبەست بە فەرزەکان(الفرائض) ئەو بڕ و ئەندازانەن بۆ میرات دیاری کراون، لە نیوە و سێیەك و چارەك و شەشیەك و هەشتیەك-و.

[٢] واتە: باپیر و داپیر-و.

## ١٠- دەروازەی: دەربارەی "العصبة"[١]

**٢٥٦٧-** عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ قَيْسٍ: أَنَّ عُمَرَ قَضَى فِي أَهْلِ طَاعُونِ عَمَوَاسَ. أَول طَاعُونٍ فِي الإِسْلامِ. أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا كَانُوا مِنْ قِبَلِ الْأَبِ سَوَاءً، فَبَنُو الْأُمِّ أَحَقُّ، وَإِذَا كَانَ بَعْضُهُمْ أَقْرَبَ مِنْ بَعْضٍ بِأَبٍ، فَهُمْ أَحَقُّ بِالْمَالِ. [مي٣٠٢٥]

* إسناده صحيح.

**لە زەححاکی کوڕی قەیسەوە: عومەر دەربارەی ئەهلی تاعوونی "عَمَواس"- یەکەمین تاعوون لە ئیسلامدا- قەزاوەتی کرد بەوەی ئەوان گەر لای باوکەوە یەکسان بوون، ئەوا منداڵی دایك لەپێشترن، گەر هەندێکیان لە هەندێکی تریان نزیکتر بوون ئەوان لەپێشترن بە ماڵ و سامانەکە.**

**٢٥٦٨-** عَن إِبْرَاهِيمَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ: الْأُمُّ عَصَبَةُ مَنْ لاَ عَصَبَةَ لَهُ، وَالْأُخْتُ عَصَبَةُ مَنْ لاَ عَصَبَةَ لَهُ. [مي٣٠٢٩]

* منقطع، رجاله ثقات.

**لە ئیبراهیمەوە، وتی: عەبدوڵای کوڕی مەسعوود وتی: دایك دەبێتە "عَصَبَة" بۆ کەسێك "عَصَبَة"ی نییە، خوشك دەبێتە "عَصَبَة" بۆ کەسێك "عَصَبَة"ی نییە.**

## ١١- دەروازەی: خوشك لەگەڵ کچ دەبنە "عَصَبَة"[٢]

**٢٥٦٩-** عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: قَضَى مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ بِالْيَمَنِ، فِي بِنْتٍ وَأُخْتٍ، فَأَعْطَى الْبِنْتَ النِّصْفَ، وَالْأُخْتَ النِّصْفَ. [مي٢٩٢١]

* إسناده صحيح على شرط البخاري.

---

[١] (العصبة): "العاصِب" ئەو میراتگرەیە میرات دەبات نەك بە بڕی دیاریکراو، هەمووی یان ئەوەی دەمێنێتەوە لەدوای جیاکردنەوەی بڕەکان-و.

[٢] (العصبة): تەماشای پەراوێزی پێش خۆی بکە-و.

لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە، وتی: مەعازی کوڕی جەبەل لە یەمەن بۆ کچێك و خوشکێك قەزاوەتی کرد، نیوەی دا بە کچەکە و نیوەی دا بە خوشکەکە.

## ١٢- دەروازەی: یەکێك لە ژن و مێردەکە لەگەڵ باوك و دایك(الغراوَیْن)

**٢٥٧٠-** عن ابراهيم قال: قال عبدالله بن مسعود: كان عمرُ إذا سلك بنا طريقًا، وجدناه سهلًا، وإنه قال في زوجٍ وأبوَين: للزوجِ النصفُ وللأمِّ ثلثُ ما بقِيَ. [مي٢٩٠٧]

* اسناده ضعيف.

لە ئیبراهیمەوە، وتی: عەبدوڵای کوڕی مەسعوود وتی: گەر عومەر ڕێگەیەکی بە ئێمە بگرتبایەتەبەر بە ئاسانمان دەبینی، ئەو دەربارەی مێرد و باوك و دایك وتی: بۆ مێردەکە نیوە و ئەوەی دەمێنێتەوە سێیەکی بۆ دایکە.

**٢٥٧١-** عَنْ أَبِي الْمُهَلَّبِ الجَرْمِيِّ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، قَالَ فِي امْرَأَةٍ وَأَبَوَيْنِ: لِلْمَرْأَةِ الرُّبُعُ، وَلِلْأُمِّ ثُلُثُ مَا بَقِيَ. [مي٢٩٠٩]

* إسناده صحيح.

لە ئەبی موهەلەبی جەرمییەوە: عوسمانی کوڕی عەفان دەربارەی ژنێك و باوك و دایك وتی: بۆ ژنەکە چارەك و ئەوەی دەمێنێتەوە سێیەکی بۆ دایکە.

## ١٣- دەروازەی: دەربارەی هاوبەشان

**٢٥٧٢-** عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ: فِي زَوْجٍ، وَأُمٍّ، وَإِخْوَةٍ لِأَبٍ وَأُمٍّ، وَإِخْوَةٍ لِأُمٍّ؟ قَالَ: كَانَ عُمَرُ وَعَبْدُ اللهِ وَزَيْدٌ يُشَرِّكُونَ، وَقَالَ عُمَرُ: لَمْ يَزِدْهُمُ الأَبُ إِلاَّ قُرْباً. [مي٢٩٢٤]

* إسناده صحيح.

لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە دەربارەی مێرد، و دایك، و برای دایك و باوکی، و برای دایکی، وتی: عومەر و عەبدوڵا و زەید هاوبەشییان پێ دەکردن، عومەر وتی: باوك تەنها نزیکی زیادکردوون.

## ١٤- دەروازەی: "الأَكْدَرِيّة[(١)]"

**٢٥٧٣**- عَنْ قَتَادَةَ: أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ قَالَ فِي أُخْتٍ، وَأُمٍّ، وَزَوْجٍ، وَجَدٍّ، قَالَ: جَعَلَهَا مِنْ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ: لِلْأُمِّ سِتَّةٌ، وَلِلزَّوْجِ تِسْعَةٌ، وَلِلْجَدِّ ثَمَانِيَةٌ، وَلِلْأُخْتِ أَرْبَعَةٌ. [مي٢٩٧٣]

* إسناده صحيح.

**لە قەتادەوە: زەیدی کوڕی سابیت دەربارەی خوشکێك و دایك و مێردێك و باپیرێك وتی: کردی بە بیست و حەوت بەشەوە: بۆ دایکەکە شەش، و بۆ مێردەکە نۆ، و بۆ باپیر هەشت، و بۆ خوشکەکە چوار.**

## ١٥- دەروازەی: دەربارەی "العول[(٢)]"

**٢٥٧٤**- عَنْ شُرَيْحٍ: فِي امْرَأَةٍ تَرَكَتْ: زَوْجَهَا، وَأُمَّهَا، وَأُخْتَهَا لِأَبِيهَا وَأُمِّهَا، وَأُخْتَهَا لِأَبِيهَا، وَإِخْوَتَهَا لِأُمِّهَا:

جَعَلَهَا مِنْ سِتَّةٍ، ثُمَّ رَفَعَهَا فَبَلَغَتْ عَشْرَةً: لِلزَّوْجِ النِّصْفُ: ثَلَاثَةُ أَسْهُمٍ، وَلِلْأُخْتِ مِنَ الْأَبِ وَالْأُمِّ النِّصْفُ: ثَلَاثَةُ أَسْهُمٍ، وَلِلْأُمِّ السُّدُسُ: سَهْمٌ، وَلِلْإِخْوَةِ مِنَ الْأُمِّ الثُّلُثُ: سَهْمَانِ، وَلِلْأُخْتِ مِنَ الْأَبِ: سَهْمٌ تَكْمِلَةُ الثُّلُثَيْنِ. [مي٢٩٣٨]

* إسناده صحيح.

---

(١) **(الأكدرية): بابەتێکی میراتە تیایدا لە میراتی ئافرەتێکی مردوودا مێرد و دایك و باپیر و خوشك کۆدەبنەوە-و.**

(٢) **(العول): لە بابەتەکانی میراتە، بریتییە لە زیاد کردنی پشکەکان لە ئەسڵی بابەتەکە بە زیادکردنی کەسرەکانی لە یەکێکی تەواو، بۆ نموونە گەر پیاوێك بمرێت: باوك و دایك و چوار خوشك و یەك ژنی لەدوا بەجێمابێت: گەر ئەسڵی بابەتەکە (٢٤) پشك بێت و پشکەکانی میراتگران (٢٧) بن، ڕێگەکە ئەوەیە ئەسڵی بابەتەکە بۆ (٢٧) بەرزبکەیەوە و میراتەکە بۆ (٢٧) پشك دابەش بکەین، بۆ باوك(٤) پشك و بۆ دایك (٤) پشك، و بۆ هەر کچێك (٤) پشك، و بۆ ژنەکەی (٣) پشك-و.**

لە شورەیحەوە: دەربارەی ئافرەتێك مێرد، و دایك، و خوشك لە باوك و دایكەوە و خوشك لە باوكەوە و برا لە دایكەوە لەدوای بەجێماوە: كردی بە شەش بەشەوە، پاشان بەرزی كردەوە تا گەیشتە دە بەش: بۆ مێردەكە نیوە، سێ بەش[1]، بۆ خوشك لە باوك و دایكەوە: نیوە: سێ بەش[2]، بۆ دایكەكە شەشیەك: یەك بەش[3]، بۆ برا لە دایكەوە سێیەك: دوو بەش[4]، بۆ خوشك لە باوكەوە: یەك بەشی تەواوكەری دوو سێیەكەكە.[5]

## ١٦- دەروازەی: دەربارەی "الرد[6]"

**٢٥٧٥**- عن عبدالله بن مسعود: في ابنة، وابنة ابنٍ، قال: النصف والسُّدس، وما بقي فرد على البنت. [مي٢٩٨٨]

* اسناده ضعيف.

لە عەبدوڵای كوڕی مەسعوودەوە: دەربارەی كچێك و كچی كوڕێك، وتی: نیوە و شەشیەك، ئەوەی دەمێنێتەوە دەگێڕرێتەوە بۆ كچەكە.

---

(١) واتە: لە ئەسڵدا لە شەش بەشەكە نیوە دەبات، واتە: سێ پشك، بەڵام پشكەكانی بەرزكراونەتەوە بۆ دە بەش، لەم دەبەشە سێ پشك دەبات-و.

(٢) واتە: خوشك لە دایك و باوكەوە لە شەش بەشەكە نیوە دەبات كە سێ پشكە، بەڵام لە دە بەشەكە سێ پشك دەبات-و.

(٣) واتە: بۆ دایكەكە لە شەش بەشەكە یەك پشك، بەڵام لە دە بەشەكە یەك پشك دەبات-و.

(٤) واتە: برا لە دایكەوە سێیەكی لە شەش بەشەكە دەبرد واتە دوو پشك و لە دە بەشەكەش دوو پشك-و.

(٥) سەرنج بدە: وەك ژمارە لە شەش پشكەكە و دە پشكەكە هەریەكەیان هەمان ژمارەی پشكیان بەردەكەوێ، بەڵام بڕ و هەندی پشكەكە لە شەش بەشدا زۆرترە لە بڕ و هەندی پشكەكە لە دە بەشدا-و.

(٦) بریتییە لە زیادە لە بەشی میراتگران و كەمبوون لە پشكەكان-و.

**٢٥٧٦**- عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ: أَنَّهُ أُتِيَ فِي إِخْوَةٍ لِأُمٍّ، وَأُمٍّ؟ فَأَعْطَى الْإِخْوَةَ مِنَ الْأُمِّ الثُّلُثَ، وَالْأُمَّ سَائِرَ الْمَالِ، وَقَالَ: الْأُمُّ عَصَبَةُ مَنْ لاَ عَصَبَةَ لَهُ. [مي٢٩٨٩]

* موقوف، إسناده صحيح.

**لە عەلقەمەوە، لە عەبدولاوە: دەربارەی برا لە دایکەوە و دایك هێنرا بۆ لای، سێیەکی دا بە براکان لە دایکەوە، ئەوەی مایەوە لە ماڵەکە بۆ دایکەکە، وتی: دایك "عصبة[1]"یە بۆ کەسێك "عصبة"ی نەبێت.**

**٢٥٧٧**- عَنِ عامِرٍ الشَّعْبِيِّ: سئل عَنْ رَجُلٍ مَاتَ وَتَرَكَ ابْنَتَهُ، لاَ يُعْلَمُ لَهُ وَارِثٌ غَيْرَهُمَا؟ قَالَ: لَهَا الْمَالُ كُلُّهُ. [مي٢٩٩٠]

* إسناده صحيح.

**لە عامیر شەعبییەوە: پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك مردووە و کچێکی بەجێهێڵاوە و میراتگری تر جگە لە ئەو نازانرێت[2]، وتی: هەموو ماڵەکە بۆ کچەکەیە.**

## ١٧- دەروازەی: میراتی لەدایك بوو

**٢٥٧٨**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا اسْتَهَلَّ الْمَوْلُودُ وُرِّثَ**).

* صحيح. [د٢٩٢٠]

**لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (گەر منداڵ لەدایك بوو میرات دەگرێت).**

**٢٥٧٩**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ وَالْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ يَرِثُ الصَّبِيُّ حَتَّى يَسْتَهِلَّ صَارِخاً**).

---

[1] (العصبة): "العاصِب" ئەو میراتگرەیە میرات دەبات نەك بە بڕی دیاریکراو، هەمووی دەبات یان ئەوەی دەمێنێتەوە لەدوای جیاکردنەوەی بڕەکان و هەندەکان-و.

[2] "نازانرێت": واتە: ناناسرێت و بوونی نییە-و.

قَالَ: وَاسْتِهْلاَلُهُ: أَنْ يَبْكِيَ، أَوْ يَصِيحَ، أَوْ يَعْطِسَ. [جه١ ٢٧٥]

* صحيح.

لە جابری كوڕی عەبدوڵڵا و میسوەری كوڕی مەخرەمەوە، وتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لەدایكبوو میرات ناگرێ تا دەست بە هاوار دەكات)**.

وتی: دەستپێكردنی ئەوەیە بگری، یان هاوار بكات، یان بپژمێت.

## ١٨- دەروازەی: میراتی نوقمبوو و كوژراو

**٢٥٨٠-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: كُلُّ قَوْمٍ مُتَوَارِثِينَ، عَمِيَ مَوْتُهُمْ فِي هَدْمٍ، أَوْ غَرَقٍ، فَإِنَّهُمْ لاَ يَتَوَارَثُونَ، يَرِثُهُمُ الأَحْيَاءُ. [مي٣٠٨٧]

* إسناده حسن.

لە زەیدی كوڕی سابیتەوە، وتی: هەموو خەڵك لەیەكتر میراتگرن، گەر مردنیان بەهۆی رمان یان نوقمبوونەوە دیار نەبوو، ئەوان میرات ناگرن و زیندووان میراتیان لێ دەگرن.

**٢٥٨١-** عَنْ يَحْيَى بْنِ عَتِيقٍ قَالَ: قَرَأْتُ فِي بَعْضِ كُتُبِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ: فِي الْقَوْمِ يَقَعُ عَلَيْهِمُ البَيْتُ، لاَ يُدْرَى أَيُّهُمَا مَاتَ قَبْلُ؟ قَالَ: لاَ يُوَرَّثُ الْأَمْوَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ، وَيُوَرَّثُ الْأَحْيَاءُ مِنَ الْأَمْوَاتِ. [مي٣٠٨٨]

* إسناده صحيح.

لە یەحیای كوڕی عەتیقەوە، وتی: لە یەكێ لە نوسراوەكانی عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ئەمەم خوێندەوە: دەربارەی خەڵكانێك ماڵەكە بەسەریاندا دەڕمێت و نازانرێت كامیان پێش كامیان مردووە؟ وتی: مردوو هەندێكیان لە هەندێكی تریان میرات ناگرن و زیندووان میرات لە مردووان دەگرن.

## ١٩- دەروازەی: میراتی نێرەمووك

**٢٥٨٢-** عَنْ عَلِيٍّ: فِي الرَّجُلِ يَكُونُ لَهُ مَا لِلرَّجُلِ وَمَا لِلْمَرْأَةِ، مِنْ أَيِّهِمَا يُوَرَّثُ؟ فَقَالَ: مِنْ أَيِّهِمَا بَالَ؟ [مي٣٠١٢]

* مرسل رجاله ثقات.

**لە عەلییەوە: دەربارەی پیاوێك ئەوەی پیاو هەیەتی و ئەوەی ژن هەیەتی ئەویش هەیەتی، وتی: لە کامیانەوە میز دەکات[1].**

## ٢٠- دەروازەی: میراتی خزمان

**٢٥٨٣-** عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(ابْنُ أُخْتِ الْقَوْمِ مِنْهُمْ)**.

* صحيح. [د٥١٢٢]

**لە ئەبی موساوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کوڕی خوشکی هۆزێك لەوانە[2]).**

**٢٥٨٤-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الْخَالُ وَارِثُ مَنْ لاَ وَارِثَ لَهُ)**. [ت٢١٠٤/ مي٣٠٢٠]

* صحيح.

**لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خاڵ میراتگری کەسێکە میراتگری نەبێت).**

**٢٥٨٥-** عَنْ زِيَادٍ قَالَ: أُتِيَ عُمَرُ فِي عَمٍّ لِأُمٍّ، وَخَالَةٍ، فَأَعْطَى الْعَمَّ لِلأُمِّ الثُّلُثَيْنِ، وَأَعْطَى الْخَالَةَ الثُّلُثَ. [مي٣٠٢١]

---

[1] واتە: شوێنی میزەکەی بڕیاری نێری و مێی ئەو دەدات-و.

[2] واتە: لە میرات و کۆمەکی و سەرخستن و چاکە و بەزەیی لەوانە-و.

لە زیادەوە، وتی: دەربارەی مامی دایك و پوور لە دایكەوە هێنرا بۆ لای عومەر، دوو سێیەكی دا بە مامی دایكەكە و بە پوورەكەش سێیەك[1].

**٢٥٨٦**– عَنِ الْحَسَنِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ أَعْطَى الْخَالَةَ الثُّلُثَ، وَالْعَمَّةَ الثُّلُثَيْنِ.

* إسناده منقطع. [مي٣٠٢٢]

لە حەسەنەوە: عومەری كوڕی خەتاب سێیەكی دا بە خوشكی دایك(پوور) و دوو سێیەك بۆ خوشكی باوك(پوور).

**٢٥٨٧**– عَنْ مَسْرُوقٍ: فِي رَجُلٍ تُوُفِّيَ وَلَيْسَ لَهُ وَارِثٌ؛ إِلاَّ ابْنَةُ أَخِيهِ وَخَالُهُ، قَالَ: لِلْخَالِ نَصِيبُ أُخْتِهِ، وَلاِبْنَةِ الْأَخِ نَصِيبُ أَبِيهَا. [مي٣١٠٠]

* إسناده صحيح.

لە مەسرووقەوە: دەربارەی پیاوێك دەمرێت و میراتگری نییە جگە لە كچی براكەی و خوشكی دایكی، وتی: بۆ پوورەكە وەك بەشی خوشكی پیاوەكە، بۆ برازاكەش وەك بەشی باوكی كچەكە.

## ٢١- دەروازەی: دەربارەی میراتی پاشگەزبوو لە ئیسلام

**٢٥٨٨**– عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ: أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ جَعَلَ مِيرَاثَ الْمُرْتَدِّ لِوَرَثَتِهِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ. [مي٣١١٧]

* إسناده صحيح.

لە ئەبی عەمری شەیبانییەوە: عەلی كوڕی ئەبی تالب میراتی پاشگەزبووی دا بە میراتگرانی لە موسڵمانان.

[1] واتە: كردی بە سێ بەشەوە: دوو بەش بۆ مامەكە و یەك بەش بۆ پوورەكە لە دایكەوە–و.

## ٢٢- دەروازەی: پووچ كردنەوەی میراتی بكوژ[1]

**٢٥٨٩**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْقَاتِلُ لاَ يَرِثُ**).

* صحيح. [ت٢١٠٩/ جه٢٦٤٥]

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(بكوژ میرات ناگری)**.

## ٢٣- دەروازەی: میراتی ژن و مێرد لە خوێن

**٢٥٩٠**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ امْرَأَتَيْنِ مِنْ هُذَيْلٍ، قَتَلَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى، وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا زَوْجٌ وَوَلَدٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم دِيَةَ الْمَقْتُولَةِ عَلَى عَاقِلَةِ الْقَاتِلَةِ، وَبَرَّأَ زَوْجَهَا وَوَلَدَهَا، قَالَ: فَقَالَ عَاقِلَةُ الْمَقْتُولَةِ: مِيرَاثُهَا لَنَا؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ، مِيرَاثُهَا لِزَوْجِهَا وَوَلَدِهَا**). [د٤٥٧٥/ جه٢٦٤٨]

* صحيح.

لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە: دوو ئافرەت لە هوزەیل یەكێكیان یەكێكی تریانی كوشت، هەریەكەیان مێرد و كوڕیان هەبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوێنی ئافرەتە كوژراوەكەی دا بەسەر كەسوكاری ئافرەتە بكوژەكەدا و مێردەكەی و كوڕەكەی بەری كرد، وتی: كەسوكاری كوژراوەكە وتیان: میراتەكەی بۆ ئێمەیە؟ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(نەخێر، میراتەكەی بۆ مێردەكەی و كوڕەكەیەتی)**.

## ٢٤- دەروازەی: میراتی منداڵی زینا

**٢٥٩١**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَيُّمَا رَجُلٍ عَاهَرَ بِحُرَّةٍ أَوْ أَمَةٍ، فَالْوَلَدُ وَلَدُ زِنًى، لاَ يَرِثُ وَلاَ يُورَثُ**). [ت٢١١٣/ جه٢٧٤٥]

* حسن.

---

[1] مەبەست بە "بكوژ" ئەو كەسەیە كەسێك دەكوژێت بۆئەوەی میراتەكەی ببات–و.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر پیاوێك زینای کرد لەگەڵ ئافرەتێکی ئازاد یان لەگەڵ کەنیزەکێك، منداڵەکە منداڵی زینایە و نە میرات دەگرێ و نە میراتی لێ دەگیرێت).**

**٢٥٩٢**– عن الحسن قال: ابن الملاعنة مثل ولد الزنى: ترثه أمه وورثته أمه. [مي٣١٤٩]

* إسناده ضعيف.

**لە حەسەنەوە، وتی: منداڵی مولاعەنە وەك منداڵی زینایە، دایکی میراتی لێ دەگرێت، میراتگرانی بریتین لە میراتگرانی دایکی.**

## ٢٥- دەروازەی: قەرزدانەوە بەر لە وەسێت

**٢٥٩٣**– عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالدَّيْنِ قَبْلَ الْوَصِيَّةِ، وَأَنْتُمْ تَقْرَؤُونَهَا: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ﴾[النساء:١٢]، وَإِنَّ أَعْيَانَ بَنِي الْأُمِّ لَيَتَوَارَثُونَ دُونَ بَنِي الْعَلاَّتِ. [ت٢٠٩٤/ جه٢٧١٥]

* حسن. وقال شعيب: ضعيف.

**لە عەلییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەر لە وەسێت فەرمانی بە قەرز دەکرد، ئێوەش دەیخوێننەوە: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ﴾[النساء:١٢]، برا و خوشك لە یەك دایکەوە لە یەکتر میرات دەگرن، نەك برا و خوشك لە دایکی جیاوازەوە.**

## ٢٦- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی فێرکردنی فەرزەکان(بڕ و ئەندازەکانی میرات)ەوە هاتووە

**٢٥٩٤**– عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: لَوْ هَلَكَ عُثْمَانُ وَزَيْدٌ فِي بَعْضِ الزَّمَانِ، لَهَلَكَ عِلْمُ الْفَرَائِضِ، لَقَدْ أَتَى عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ وَمَا يَعْلَمُهَا غَيْرُهُمَا. [مي٢٨٩٤]

* إسناده صحيح.

لە ئیبن شیهابەوە، وتی: گەر عوسمان و زەید سەردەمانێ تیاچوونایە زانستی فەرزەکان[1] تیادەچوو، ڕۆژگارێك بەسەر خەڵکیدا هاتووە جگە لەوان کەسێکی تر نایانزانێت.

**٢٥٩٥-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**تَعَلَّمُوا الْعِلْمَ وَعَلِّمُوهُ النَّاسَ، تَعَلَّمُوا الْفَرَائِضَ وَعَلِّمُوهَا النَّاسَ، تَعَلَّمُوا الْقُرْآنَ وَعَلِّمُوهُ النَّاسَ، فَإِنِّي امْرُؤٌ مَقْبُوضٌ، وَالْعِلْمُ سَيُقْبَضُ، وَتَظْهَرُ الْفِتَنُ، حَتَّى يَخْتَلِفَ اثْنَانِ فِي فَرِيضَةٍ، لاَ يَجِدَانِ أَحَداً يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا**).

* إسناده صحيح. [مي٢٢٧/ ك٧٩٥٠]

لە ئیبن مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**فێری زانست ببن و خەڵکی پێ فێر بکەن، فەرزەکان[2] فێر ببن و خەڵکی پێ فێر بکەن، فێری قورئان ببن و خەڵکی فێر بکەن، من کەسێکم دەمرم، و زانستیش دەمرێت و فیتنە سەرهەڵدەدات تا دوان لە فەرزێکدا ناکۆك دەبن و کەسێك نابیننەوە لە یەکتریان جیابکاتەوە**).

---

[1] واتە: فەرزەکان: واتە ئەو بڕ و هەند و پشکانەی لە کتێبەکەی خودادا بۆ میراتگران دانراون-و.

[2] واتە: فەرزەکان: واتە ئەو بڕ و هەند و پشکانەی لە کتێبەکەی خودادا بۆ میراتگران دانراون-و.

## بەشی دووەم

## وەسێت و وەقف

### ١- دەروازەی: هاندان دەربارەی وەسێت

**٢٥٩٦-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**ما حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ، يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مُكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ**).

[خ٢٧٣٨/ م١٦٢٧]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لیّ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر مرۆی موسڵمان شتێکی هەبێت وەسێتی تێدا بکات حەقە دوو شەو نەمێنێتەوە و وەسێتە نوسراوەکەی لای بێت).**

### ٢- دەروازەی: وەسێتی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٥٩٧-** (ق) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى رضي الله عنهما: هَلْ كانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَوْصى؟ فَقَالَ: لاَ، فَقُلْتُ: كَيْفَ كُتِبَ عَلَى النَّاسِ الْوَصِيَّةُ، أَوْ أُمِروا بِالْوَصِيَّةِ؟ قَالَ: أَوْصى بِكِتَابِ الله. [خ٢٧٤٠/ م١٦٣٤]

[وانظر: ٣٧٠٩- ٣٧١٢]

**(ق) لە تەلحەی کوڕی موصەرِیفەوە، وتی: پرسیارم لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفا(خوا لێی رازی بێت) کرد: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) وەسێتی کرد؟ وتی: نەخێر، وتم: ئەی چۆن وەسێت لەسەر خەڵك فەرزکراوە، یان فەرمانیان پێکراوە بە وەسێت؟ وتی: وەسێتی کرد بە کتێبەکەی خودا.**

## ٣- دەروازەی: وەسێت بە سێیەك

٢٥٩٨- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قالَ: لَوْ غَضَّ النَّاسُ إِلَى الرُّبُعِ، لأنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، أَوْ كَبِيرٌ). [خ٢٧٤٣/ م١٦٢٩]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: گەر خەڵكی دابەزن بۆ چارەك[1]، چونكە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سێیەك، سێیەكیش زۆرە، یان گەورەیە).**

٢٥٩٩- (م) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ سِتَّةَ مَمْلُوكِينَ لَهُ عِنْدَ مَوْتِهِ، لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُمْ، فَدَعَا بِهِمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَجَزَّأَهُمْ أَثْلاَثاً، ثُمَّ أَقْرَعَ بَيْنَهُمْ، فَأَعْتَقَ اثْنَيْنِ، وَأَرَقَّ أَرْبَعَةً، وَقَالَ لَهُ قَوْلاً شَدِيداً. [م١٦٦٨]

**(م) لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە: پیاوێك شەش بەندەی كۆیلەی خۆی لە سەرەمەرگ رزگار كرد، جگە لەوان ماڵ و سامانی نەبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی كردن و كردنی بە سێ بەشەوە، پاشان قورعەی لە نێوانیان كرد و دوانی رزگار كرد و چواری بە كۆیلە كردەوە و قسەی توندی بە پیاوەكە وت.**

- وفي رواية: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ أَوْصَى عِنْدَ مَوْتِهِ، فَأَعْتَقَ سِتَّةَ مَمْلُوكِينَ.

**لە ریوایەتێكدا: پیاوێك لە ئەنصار لە سەرەمەرگ وەسێتی كرد و شەش بەندەی بە موڵككراوی رزگار كرد.**

## ٤- دەروازەی: دەستوەردان و هەڵسوكەوتی نەخۆش

٢٦٠٠- (خ) وَيُذْكَرُ أَنَّ شُرَيْحاً، وَعُمَرَ بْنَ عَبْدِ العَزِيزِ، وَطَاوُساً، وَعَطَاءً، وَابْنَ أُذَيْنَةَ أَجَازُوا إِقْرَارَ الْمَرِيضِ بِدَيْنٍ.

---

[1] **واتە: كارێكی باشە گەر خەڵكی لە وەسێت بە سێیەكی ماڵەكەیان دابەزن بۆ وەسێت بە چاركی ماڵەكەیان-و.**

وَقَالَ الْحَسَنُ: أَحَقُّ مَا تَصَدَّقَ بِهِ الرَّجُلُ آخِرَ يَوْمٍ مِنَ الدُّنْيَا، وَأَوَّلَ يَوْمٍ مِنَ الْآخِرَةِ.

وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ وَالْحَكَمُ: إِذَا أَبْرَأَ الْوَارِثَ مِنَ الدَّيْنِ بَرِئَ.

وَأَوْصَى رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ أَنْ لاَ تُكْشَفَ امْرَأَتُهُ الْفَزَارِيَّةُ عَمَّا أُغْلِقَ عَلَيْهِ بَابُهَا.

[خ. الوصايا، باب ٨]

**(خـ) وا باس دەكرێت شورەیح، و عومەری كوڕی عبدالعزیز، و تاووس و عەتا و ئیبن ئوزەینە ڕێگەیان دابێت نەخۆش زمانگۆیی(إقرار) بكات بە قەرزێك.**

**حەسەن دەڵێت: باشترین ڕۆژێك پیاو صەدەقەی پێ بكات دوایین ڕۆژییەتی لە دنیا و یەكەم ڕۆژییەتی لە دواڕۆژ.**

**ئیبراهیم و حەكەم دەڵێن: گەر میراتگری لە قەرز بەری كرد بەری دەبێت.**

**رافیعی كوڕی خەدیج وەسێتی كرد ژنە فەزارییەكەی ئەوە دەرنەخات دەرگای بەسەردا داخراوە.**

**٢٦٠١**– عَنْ عَامِرٍ قَالَ: يَجُوزُ بَيْعُ الْمَرِيضِ وَشِرَاؤُهُ وَنِكَاحُهُ، وَلاَ يَكُونُ مِنَ الثُّلُثِ.

* إسناده حسن. [مي ٣٢٦٠]

**لە عامیرەوە، وتی: كڕین و فرۆشتن و هاوسەرگیری نەخۆش دروستە و لە سێیەكەكە نییە.**

**٢٦٠٢**– عَنِ الْحَارِثِ الْعُكْلِيِّ قَالَ: مَا حَابَى بِهِ الْمَرِيضُ فِي مَرَضِهِ مِنْ بَيْعٍ أَوْ شِرَاءٍ، فَهُوَ فِي ثُلُثِهِ قِيمَةُ عَدْلٍ. [مي ٣٢٦١]

* إسناده صحيح.

**لە حاریسی عوكلییەوە، وتی: ئەوەی نەخۆش پێیخۆشە لە فرۆشتن یان كڕین ئەوە لە سێیەكەكەی نرخی بەرانبەرە.**

**٢٦٠٣**– عَنْ حُمَيْدٍ الطَّوِيلِ: أَنَّ رَجُلاً يُكْنَى أَبَا ثَابِتٍ، أَقَرَّ لاِمْرَأَتِهِ عِنْدَ مَوْتِهِ: أَنَّ لَهَا عَلَيْهِ أَرْبَعَمِائَةِ دِرْهَمٍ مِنْ صَدَاقِهَا، فَأَجَازَهُ الْحَسَنُ. [مي ٣٣٠٢]

* إسناده صحيح.

لە حومەیدی تەویلەوە: پیاوێك كونییەكەی ئەبو سابیت بوو لە سەرەمەرگ زمانگۆیی[1] كرد بۆ ژنەكەی: ئەو چوارسەد درهەم لە مارەیی بەسەر مێردەكەیەوە ماوە، حەسەن رێگەی پێدا.

## ٥- دەروازەی: وەسێت بە بێباب

٢٦٠٤- (خ) عَنْ نَافِعٍ قَالَ: مَا رَدَّ ابْنُ عُمَرَ عَلَى أَحَدٍ وَصِيَّةً. [خ٢٧٦٧]

(خ) لە نافیعەوە، وتی: ئیبن عومەر وەسێتی كەسی رەد نەدەكردەوە.

٢٦٠٥- عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، فَقَالَ لَهُ: إِنَّ لِي يَتِيماً وَلَهُ إِبِلٌ، أَفَأَشْرَبُ مِنْ لَبَنِ إِبِلِهِ؟ فَقَالَ لَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنْ كُنْتَ تَبْغِي ضَالَّةَ إِبِلِهِ، وَتَهْنَأُ جَرْبَاهَا، وَتَلُطُّ حَوْضَهَا، وَتَسْقِيهَا يَوْمَ وِرْدِهَا، فَاشْرَبْ غَيْرَ مُضِرٍّ بِنَسْلٍ، وَلاَ نَاهِكٍ فِي الْحَلْبِ.
* إسناده صحيح. [ط١٧٣٩]

لە قاسمی كوڕی محەمەدەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای عەبدوڵای كوڕی عەباس و پێی وت: من منداڵی بێبابم لە لایە و حوشتری هەیە، ئایا لە شیری حوشترەكەی بخۆمەوە؟ ئیبن عەباس پێی وت: گەر حوشتری بزربووی بۆ دەدۆزییەوە و گەڕییان لێ دەكەیەوە و حەوزەكەیان بۆ رێكدەخەیەوە و رۆژی ئاودانیان ئاویان دەدەی ئەوا بخۆرەوە و زیان بە بەچكەكەی مەگەیەنە و شەكەتی مەكە بە دۆشین.

٢٦٠٦- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: ابْتَغُوا بِأَمْوَالِ الْيَتَامَى، لاَ تَأْكُلُهَا الصَّدَقَةُ. [هق٦/٢]

لە عومەری كوڕی خەتابەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ماڵ و سامانی بێبابان بەرهەم بهێنن با صەدەقە نەیخوات.

---

[1] واتە: زمانگۆیی: واتە (إقرار)—و.

**٢٦٠٧**– عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: كَانَتْ عَائِشَةُ ﵂ تُزَكِّي أَمْوَالَنَا، وَإِنَّهَا لَيُتْجَرُ بِهَا فِي الْبَحْرَيْنِ. [هق٦/٣]

[وانظر: **٣٣٤٠** في الأكل من مال اليتيم، وانظر: **٣٤٥٧** في كفالة اليتيم].

**لە قاسمی کوڕی محەمەدەوە، وتی: عائیشە(خوا لێی رازی بێت) زەکاتی ماڵ و سامانی ئێمەی دەردەکرد، ئەو لە بەحرەین بازرگانی پێ دەکرد.**

## ٦- دەروازەی: وەسێت بۆ میراتگر ناکرێت

**٢٦٠٨**– عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ**). [د٢٨٧٠/ ت٢١٢٠/ جه٢٧١٣]

* صحيح.

**لە ئەبی ئومامەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (خودا مافی هەموو خاوەن مافێکی داوە، وەسییەت بۆ میراتگر ناکرێت[1]).**

## ٧- دەروازەی: صەدەقە لە ژیاندا باشترە لە وەسێت[2]

**٢٦٠٩**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، نَبِّئْنِي بِأَحَقِّ النَّاسِ مِنِّي بِحُسْنِ الصُّحْبَةِ؟ فَقَالَ: (**نَعَمْ، وَأَبِيكَ! لَتُنَبَّأَنَّ: أُمُّكَ**) قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (**ثُمَّ أُمُّكَ**) قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (**ثُمَّ أُمُّكَ**) قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (**ثُمَّ أَبُوكَ**).

قَالَ: نَبِّئْنِي يَا رَسُولَ اللهِ عَنْ مَالِي، كَيْفَ أَتَصَدَّقُ فِيهِ؟ قَالَ: (**نَعَمْ، وَاللهِ لَتُنَبَّأَنَّ: أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ، تَأْمُلُ الْعَيْشَ، وَتَخَافُ الْفَقْرَ، وَلاَ تُمْهِلْ، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ نَفْسُكَ هَاهُنَا، قُلْتَ: مَالِي لِفُلاَنٍ، وَمَالِي لِفُلاَنٍ، وَهُوَ لَهُمْ، وَإِنْ كَرِهْتَ**). [جه٢٧٠٦]

* صحيح.

---

[1] واتە: لە بەشە میراتی خۆی زیاتر پێ نادرێت لە رێگەی وەسێتەوە–و.

[2] واتە: صەدەقەکردن لە ژیاندا و لەسەر ساغ و سەلامەتی باشترە لە وەسێتکردن لە کاتی سەرەمەرگ بە سێیەکی ماڵ و سامانەکەی بۆ صەدەقە–و.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، هەواڵم پێ بدە دەربارەی لەپێشترین کەس لە خەڵکی لە منەوە هاوەڵی باشی بکەم، فەرمووی: **(بەڵێ، بە گیانی باوکت، هەواڵت پێ دەدرێت: دایکت[1])**، وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: **(پاشان دایکت)**، وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: **(پاشان دایکت)**، وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: **(پاشان باوکت)**.

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، هەواڵم پێ بدە دەربارەی ماڵ و سامانەکەم، چۆن صەدەقەی تێدا بکەم؟ فەرمووی: **(بەڵێ، سوێند بە خودا، هەواڵت پێ دەدرێت، صەدەقە بکەی و لەشساغ[2] و کەم دەرامەت بیت، هیوات بە ژیان و گوزەران بێت و لە هەژاری بترسی، پشتگوێی نەخەی تا نەفست دەگاتە ئەوێندەر[3]، بڵێی: ماڵەکەم بۆ فلان، و ماڵەکەم بۆ فلان، ئەوە بۆ ئەوانە[4]، با پێشتناخۆش بێت)**.

## ٨- دەروازەی: پاشگەزبوونەوە لە وەسێت

**٢٦١٠**– عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: يُغَيِّرُ صَاحِبُ الْوَصِيَّةِ مِنْهَا مَا شَاءَ غَيْرَ الْعَتَاقَةِ. [مي٣٢٥٣]

* إسناده صحيح.

لە شەعبییەوە، وتی: خاوەن وەسێت چۆنی بوێت گۆڕانی تێدا دەکات، جگە لە ئازادکردنی کۆیلە[5].

**٢٦١١**– عَنِ الزُّهْرِيِّ: فِي الرَّجُلِ يُوصِي بِوَصِيَّةٍ، ثُمَّ يُوصِي بِأُخْرَى؟ قَالَ: هُمَا جَائِزَتَانِ فِي مَالِهِ. [مي٣٢٥٧]

* إسناده صحيح.

---

(١) واتە: باشترین کەس بۆ چاکە لەگەڵ کردن بریتییە لە دایکت–و.

(٢) واتە: نەکەوتبیتە ناو نەخۆشی مەرگەوە–و.

(٣) واتە: تا لە سەرەمەرگ گیانت دەگاتە سینە و قورگ–و.

(٤) واتە: پێتخۆش بێت و پێتناخۆش بێت ئەوە میراتە و لەدوای مردنت بۆ ئەوانە–و.

(٥) واتە: نابێت لە ئازاد کردنی کۆیلە لە وەسێتەکەی پەشیمان ببێتەوە–و.

لە زوهرییەوە: دەربارەی پیاو وەسێتێك دەكات و پاشان وەسێتێكی تر دەكات؟ وتی: ئەو دوانە لە ماڵ و سامانەكەیدا رێگە پێدراون.

## ٩- دەروازەی: كەسێك بە زیاتر لە سێیەك وەسێت بكات

**٢٦١٢**- عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ: فِي رَجُلٍ أَوْصَى وَالْوَرَثَةُ شُهُودٌ مُقِرُّونَ؟ فَقَالَ: لاَ يَجُوزُ. قَالَ الدارمي: يَعْنِي: إِذَا أَنْكَرُوا بَعْدُ. [مي٣٢٣٣]

* إسناده صحيح.

لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە: دەربارەی پیاوێك وەسێتی كرد[1] و میراتگرانی ئامادەبوون و دانیان پیادا نا؟ وتی: رێگە پێ نەدراوە، داریمی وتی: واتە: گەر دواتر نەرێیان كرد[2].

**٢٦١٣**- عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: سَأَلْتُ الْحَكَمَ وَحَمَّاداً عَنِ الْأَوْلِيَاءِ يُجِيزُونَ الْوَصِيَّةَ، فَإِذَا مَاتَ لَمْ يُجِيزُوا؟ قَالَ: لاَ يَجُوزُ. [مي٣٢٣٤]

* إسناده صحيح.

لە شوعبەوە، وتی: پرسیارم كرد لە حەكەم و حەماد دەربارەی كەسوكار دان دەنێن بە وەسێتدا، كاتێ كەسەكە مرد دانی پیادا نانێن؟ وتی: رێگە پێدراو نییە.

## ١٠- دەروازەی: الوقف

**٢٦١٤**- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ أَصَابَ أَرْضاً بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَسْتَأْمِرُهُ فِيهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضاً بِخَيْبَرَ، لَمْ أُصِبْ مالاً قَطُّ أَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُ بِهِ؟ قَالَ: (**إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا**).

---

[1] واتە: بە زیاتر لە سێیەك وەسێتی كرد–و.

[2] واتە: گەر دوای مردنی كەسەكە میراتگرانی نەرێی وەسێتەكەیان كرد بە زیاتر لە سێیەك–و.

قَالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ: أَنَّهُ لاَ يُبَاعُ وَلاَ يُوهَبُ وَلاَ يُورَثُ، وَتَصَدَّقَ بِهَا فِي الْفُقَرَاءِ، وَفِي الْقُرْبَى، وَفِي الرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لاَ جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، وَيُطْعِمَ غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ. قَالَ: فَحَدَّثْتُ بِهِ ابْنَ سِيرِينَ، فَقَالَ: غَيْرَ مُتَأَثِّلٍ مالاً.
[خ٢٧٣٧ (٢٣١٣)/ م١٦٣٢]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): عومەری کوڕی خەتاب لـە خەیبـەر زەوییەکی بەدەستهێنا، هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا داوای فەرمانی کرد، و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من لە خەیبەر زەوییەکم بەدەستهێناوە، هیچ ماڵ و سامانێکم بەدەست نەهێناوە بەنرختر لەوە، چ فەرمانێکم پێ دەکەی؟ فـەرمووی: (گەر بتـەوێ ئەسڵەکەی بەند بکە و بیکەی بە صەدەقە[1]).**

**وتی: عومەر کردی بە صەدەقە: نەفرۆشرێت و نە بەخشرێت و بە میرات نەگیرێت، کردی بە صەدەقە بۆ هەژاران و خزمان و بەندەکان، و لە ڕێگەی خودا، و ڕێبواران، و میوان، و گوناهێکی تێدا نـەبێت گـەر سەرپەرشـتکارەکەی بـە چاکە لێـی بخـوات و دەرخوارد بدات، (غیر متمَوِّل–مـاڵ و سـامانی لێـوە خـڕ نەکاتـەوە)، وتـی: بـۆ ئـیبن سیرینم باس کرد، وتی: "غیر متأثِّل مالا–وەك ماڵ و سامان کۆینەکاتەوە".**

- وفي رواية للبخاري: فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (تَصَدَّقْ بِأَصْلِهِ، لاَ يُبَاعُ وَلاَ يُوهَبُ وَلاَ يُورَثُ، وَلكِنْ يُنْفَقُ ثَمَرُهُ). [خ٢٧٦٤]

**لـە ڕیوایـەتێکی بوخـاری: پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: (ئەسـڵەکەی بکـە بـە صەدەقە، نەفرۆشرێت و نەبەخشرێت و بەمیرات نەگیرێت، بەڵام بەروبوومەکەی خەرج بکرێت[2]).**

---

[1] واتە: ئەسڵی زەوییەکە وەقف بێت و نـە فرۆشـترێت و نەبەخشـرێت و بـە مـیرات نـەگیرێ، بەڵام بەروبوومی صەدەقە بێت–و.

[2] واتە: لە صەدەقەدا خەرج بکرێت–و.

**٢٦١٥**– عَنِ الزُّبَيْرِ: أنه جَعَلَ دُورَهُ صَدَقَةً عَلَى بَنِيهِ، لاَ تُبَاعُ وَلاَ تُوَرَّثُ، وَأَنَّ لِلْمَرْدُودَةِ مِنْ بَنَاتِهِ أَنْ تَسْكُنَ غَيْرَ مُضِرَّةٍ وَلاَ مُضَارٍّ بِهَا، فَإِنْ هِيَ اسْتَغْنَتْ بِزَوْجٍ، فَلاَ حَقَّ لَهَا. [مي٣٣٤٣]

* إسناده صحيح.

[وانظر في الصدقة الجارية: **١٦٣٨**].

**لە زوبەیرەوە: خانووەکانی کردە صەدەقە بۆ کوڕەکانی، نەفرۆشرێ و بە میرات نەگیرێ، گەڕاوە[1] لە کچەکانی تیایدا نیشتەجێ ببن بەبێ زیان گەیاندن و زیان پێ گەیاندنیان، گەر کچەکە بە هاوسەرێك بێنیاز بوو مافێکی بۆ نییە.**

---

[1] واتە: گەڕاوە: ئەو ئافرەتەی بە تەڵاقدان یان بە مردنی مێردەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی–و.

## ١- دەروازەی: چاکە لەگەڵ دایك و باوك

**٢٦١٦-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَالَ: **(أُمُّكَ)**. قالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: **(ثُمَّ أُمُّكَ)**. قالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: **(ثُمَّ أُمُّكَ)**. قالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: **(ثُمَّ أَبُوكَ)**. [خ٥٩٧١/ م٢٥٤٨]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، کێ پێشترین کەسە بە هاوەڵێکردنی باش لە لایەن منەوە؟ فەرمووی: (دایکت)، وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: (پاشان دایکت)، وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: (پاشان دایکت)، وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: (پاشان باوکت).**

**٢٦١٧-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَاسْتَأْذَنَهُ فِي الْجِهَادِ، فَقَالَ: **(أَحَيٌّ وَالِدَاكَ)**؟ قالَ: نَعَمْ، قالَ: **(فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ)**.

[خ٣٠٠٤/ م٢٥٤٩]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای مۆڵەتی جیهادی لێکرد، فەرمووی: (ئایا دایك و باوکت زیندوون؟)، وتی: بەڵێ، فەرمووی: (کەوابوو لەو دوانەدا جیهاد بکە).**

**٢٦١٨-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(رَغِمَ أَنْفُهُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ)** قِيلَ: مَنْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(مَنْ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ عِنْدَ الْكِبَرِ، أَحَدَهُمَا أَوْ كِلَيْهِمَا، ثُمَّ لَمْ يَدْخُلِ الْجَنَّةَ)**. [م٢٥٥١]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لووتی خۆڵاویی بێت، پاشان لووتی خۆڵاویی بێت، پاشان لووتی خۆڵاویی بێت)، وترا: کێ، ئەی**

پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **(کەسێك لە پیریدا دەگات بە باوك و دایکی، هەردووکیان یان بە یەکێکیان، پاشان ناچێتە بەهەشتەوە)**.

## ٢- دەروازەی: سیلەی ڕەحمی دایك و باوکی هاوەڵدانەر

**٢٦١٩-** (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قَالَتْ: قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي وَهْيَ مُشْرِكَةٌ، فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَاسْتَفْتَيْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم، قُلْتُ: إِنَّ أُمِّي قَدِمَتْ وَهْيَ رَاغِبَةٌ، أَفَأَصِلُ أُمِّي؟ قَالَ: **(نَعَمْ، صِلِي أُمَّكِ)**. [خ٢٦٢٠/ م١٠٠٣]

(ق) لە ئەسمای کچی ئەبی بەکرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دایکم هات بۆ لام ئەو هاوەڵدانەر بوو، داوای فتوام لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد و وتم: دایکم هاتووە و ئەو حەز دەکات[1]، ئایا سیلەی ڕەحمی لەگەڵ بەکاربهێنم؟ فەرمووی: **(بەڵێ، سیلەی ڕەحم لەگەڵ دایکت بەکاربهێنە)**.

- وفي رواية للبخاري: فِي عَهْدِ قُرَيْشٍ إِذْ عَاهَدُوا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَمُدَّتِهِمْ. [خ٣١٨٣]

لە ڕیوایەتێکی بوخاری: لە پەیمانەکەی قورەیش[2]، چونکە ئەوان بۆ ماوەیەك پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەستبوو[3].

---

[1] واتە: حەزی بە چاکەکردنە لەگەڵ ئەسمای کچی، هەدیەی بۆ هێناوە و حەز دەکات کچەکەی چاکەی لەگەڵ بکات-و.

[2] واتە: لە سەردەمی ئەو پەیمانەی کەوتبووە نێوان موسڵمانان و قورەیش ئەو هاتبوو بۆ مەدینە، ئەگینا بێباوەڕانی قورەیش نەیاندەتوانی بێن بۆ مەدینە-و.

[3] واتە: دوای سوڵحی حودەیبییە-و.

## ٣- دەروازەی: حەرامبوونی خراپی لەگەڵ دایك و باوك

**٢٦٢٠-** (ق) عَنِ المغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ: عُقُوقَ الأُمَّهَاتِ، وَوَأْدَ البَنَاتِ، وَمَنَعَ وَهَات. وَكَرِهِ لَكُمْ: قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ المَالِ**). [خ٢٤٠٨ (٨٤٤)/ م: الأقضية. ٥٩٣ (١٢)]

(ق) لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**خودا خراپی مامەڵەی لەگەڵ دایك و باوك و زیندەبەچاڵ کردنی کچ حەرام کردووە و ماف پێشێل کردنی قەدەغە کردووە، و "وتی وتی"[1] و زۆری پرسیار و بەفیڕۆدانی ماڵ و سامانی[2] لە ئێوە بە ناپەسەند داناوە**).

**٢٦٢١-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ: أَنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ**)، قِيلَ: **يَا رَسُولَ الله، وَكَيْفَ يَلْعَنُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ؟** قَالَ: (**يَسُبُّ الرَّجُلُ أَبَا الرَّجُلِ؛ فَيَسُبُّ أَبَاهُ، وَيَسُبُّ أُمَّهُ؛ فَيَسُبُّ أُمَّهُ**). [خ٥٩٧٣/ م٩٠]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**لە گەورەترینی گوناهە گەورەکان ئەوەیە پیاو نەفرەت لە دایك و باوکی بکات**)، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن پیاو نەفرەت لە دایك و باوکی دەکات؟ فەرمووی: (**پیاو جنێو بە باوکی پیاوێك دەدات ئەویش جنێو بە باوکی دەدات، جنێو بە دایکی دەدات، ئەویش جنێو بە دایکی دەدات**).

## ٤- دەروازەی: پلە و پایەی بەجێهێنانی سەردان و پەیوەندی دۆستانی باوك و دایك

**٢٦٢٢-** (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ كَانَ إِذَا خَرَجَ إِلَى مَكَّةَ كَانَ لَهُ حِمَارٌ يَتَرَوَّحُ عَلَيْهِ، إِذَا مَلَّ رُكُوبَ الرَّاحِلَةِ، وَعِمَامَةٌ يَشُدُّ بِهَا رَأْسَهُ. فَبَيْنَا هُوَ يَوْماً عَلَى ذلِكَ الْحِمَارِ، إِذْ مَرَّ بِهِ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ:

---

[1] واتە: قسە گواستنەوە و دەنگۆ بڵاوکردنەوە-و.

[2] واتە: وەك قومار و دەستبڵاویی-و.

أَلَسْتَ ابْنَ فُلاَنِ بْنِ فُلاَنٍ؟ قَالَ: بَلَى، فَأَعْطَاهُ الْحِمَارَ وَقَالَ: ارْكَبْ هذَا، وَالْعَمَامَةَ، قَالَ: اشْدُدْ بِهَا رَأْسَكَ. فَقَالَ لَهُ بَعْضُ أَصْحَابِهِ: غَفَرَ اللهُ لَكَ! أَعْطَيْتَ هذَا الأَعْرَابِيَّ حِمَاراً كُنْتَ تَرَوَّحُ عَلَيْهِ، وَعِمَامَةً كُنْتَ تَشُدُّ بِهَا رَأْسَكَ! فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ مِنْ أَبَرِّ الْبِرِّ صِلَةَ الرَّجُلِ أَهْلَ وِدِّ أَبِيهِ، بَعْدَ أَنْ يُوَلِّيَ**)، وَإِنَّ أَبَاهُ كَانَ صَدِيقاً لِعُمَرَ. [م٢٥٥٢]

**(م) لە ئیبن عومەرەوە: ئەو کاتێك برۆیشتبا بۆ مەککە گوێدرێژێکی هەبوو ئیسراحەتی دەکرد لەسەری گەر لە سواربوونی حوشتر وەڕس بوایە، مێزەرەیەکی هەبوو سەری خۆی پێ دەپێچا، رۆژێك لەسەر ئەو گوێدرێژە بوو ئەعرابییەك بە پاڵیدا گوزەری کرد، وتی: تۆ کوڕی فلانی کوڕی فلان نیت؟ وتی: با، گوێدرێژەکەی پێدا و وتی: سواری ئەمە ببە، هەروەها مێزەرەکەی پێدا و وتی: سەری خۆتی پێ ببێچە، یەکێك لە هاوەڵانی پێی وت[1]: خودا لێت خۆش بێت، گوێدرێژەکەت بەخشی بەو ئەعرابییە لەسەری ئیسراحەتت دەکرد و مێزەرەکەت پێدا سەری خۆتت پێ دەپێچا! عەبدوڵا وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (لە باشترین چاکە ئەوەیە پیاو پەیوەندی خۆشەویستانی باوکی جێبەجێ بکات لەدوای ئەوەی دەبێتە جێگرەوە)، باوکی ئەو ئەعرابییە هاوڕێی عومەر بوو.**

## ٥- دەروازەی: بەزەیی بۆ رۆڵەکان

**٢٦٢٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَبَّلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الحَسَنَ بْنَ عَلِيّ وَعِنْدَهُ الأَقْرَعُ بْنُ حابِسٍ التَّمِيمِيُّ جالِساً، فَقَالَ الأَقْرَعُ: إِنَّ لِي عَشَرَةً مِنَ الْوَلَدِ ما قَبَّلْتُ مِنْهُمْ أَحَداً، فَنظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ثُمَّ قالَ: (**مَنْ لاَ يَرْحَمُ لاَ يُرْحَمُ**).

[خ٥٩٩٧/ م٢٣١٨]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کرد و ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی لا دانیشتبوو، ئەقرەع وتی: دە منداڵم هەیە**

**[1] واتە: یەکێك لە هاوەڵانی عەبدوڵا بە عەبدوڵای وت–و.**

**هیچ کامیانم ماچ نەکردووە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەماشای کرد و پاشان فەرمووی: (هەر کەس بەزەیی نەکات[1] بەزەیی پێ ناکرێت).**

**٢٦٢٤-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: جاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: تُقَبِّلُونَ الصِّبْيَانَ؟ فَمَا نُقَبِّلُهُمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَوَ أَمْلِكُ لَكَ أَنْ نَزَعَ الله مِنْ قَلْبِكَ الرَّحْمَةَ)**. [خ٥٩٩٨/ م٢٣١٧]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: ئەعرابییەك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: منداڵ ماچ دەکەن؟ ئێمە ماچیان ناکەین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من چیم لە دەستدایە بۆ تۆ خودا بەزەیی لە دڵت دەرکردبێت).**

**٢٦٢٥-** عَنْ يَعْلَى الْعَامِرِيِّ أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ يَسْعَيَانِ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَضَمَّهُمَا إِلَيْهِ وَقَالَ: **(إِنَّ الْوَلَدَ مَبْخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ)**. [جه٣٦٦٦]

* صحيح.

**لە یەعلای عامیرییەوە، ئەو وتی: حەسەن و حوسەین هاتن هەوڵی لای پێغەمبەریان(ﷺ) دەدا، پێغەمبەر هەردووکیانی لەئامێز گرت و فەرمووی: (منداڵ جێی دەستنوقاوی و ترسنۆکین[2]).**

## ٦- دەروازەی: پلە و پایەی چاکە لەگەڵ کچ

**٢٦٢٦-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَتِ امْرَأَةٌ مَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا تَسْأَلُ، فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئاً غَيْرَ تَمْرَةٍ، فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا، فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا، وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ، فَدَخَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَيْنَا فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَال: **(مَنِ ابْتُلِيَ مِنْ هذِهِ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ، كُنَّ لَهُ سِتْراً مِنَ النَّارِ)**. [خ١٤١٨/ م٢٦٢٩]

---

[1] واتە: بەزەیی بە کەسانی تر نەبەخشێت-و.

[2] واتە: ترس لە ژیان و گوزەرانی منداڵ مرۆڤ تووشی دەستنوقاوی و ترسنۆکی دەکات-و.

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ئافرەتێك لەگەڵ دوو کچی هاتە ژوورەوە داوای دەکرد[1]، جگە لە دەنکە خورمایەك هیچ شتێکم لا نەبوو بۆی، دەنکە خورماکەم پێدا و لە نێوان دوو کچەکەی دابەشم کرد و ئەو لێی نەخوارد، پاشان هەستا و رۆیشتە دەرەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لامان و هەواڵم پێدا، فەرمووی: **(هەر کەس بە کچان تاقیبکرێتەوە دەبنە پۆشەری لە ئاگر)**.

**٢٦٢٧**– (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ) وَضَمَّ أَصَابِعَهُ. [م٢٦٣١]

(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس دوو کەنیشك[2] بەخێو بکات تا باڵغ دەبن رۆژی قیامەت دێت و من و ئەو)**، پەنجەکانی لەیەکتر دا[3].

**٢٦٢٨**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ وُلِدَتْ لَهُ أُنْثَى فَلَمْ يَئِدْهَا وَلَمْ يُهِنْهَا، وَلَمْ يُؤْثِرْ وَلَدَهُ . يعني الذكر . عَلَيْهَا، أَدْخَلَهُ اللهُ بِهَا الجَنَّةَ).

* قال الذهبي: صحيح. [ك٧٣٤٨]

لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس مێینەیەکی بوو و زیندەبەچاڵی نەکرد و سوکایەتی پێ نەکرد و کوڕەکەی–واتە نێرینەکەی– بەسەردا پێش نەخست، خودا بەو مێیینە دەیخاتە بەهەشتەوە)**.

---

[1] واتە: سواڵی دەکرد–و.

[2] واتە: کچ–و.

[3] واتە: من و ئەو وەك ئەم پەنجانە واین–و.

## ٧- دەروازەی: سیلەی رەحم

**٢٦٢٩**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ اللهَ خَلَقَ الخَلْقَ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْ خَلْقِهِ، قَالَتِ الرَّحِمُ: هذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ الْقَطِيعَةِ، قَالَ: نَعَمْ، أَمَا تَرْضِينَ بأَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى، يَا رَبِّ! قَالَ: فَهُوَ لَكِ**). قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (فَاقْرَؤُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ۝٢٢﴾ [محمد: ٢٢]). [خ٥٩٨٧ (٤٨٣٠)/ م٢٥٥٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**خودا دروستکراوانی دروست کرد، کە لە دروستکراوانی بوویەوە رەحم وتی: ئەمە مەقامی پەنابەرە[1] بە تۆ لە دابڕان[2]؟ فەرمووی: بەڵێ، ئایا رازی نابیت هەر کەس دەتگەیەنێ بیگەیەنم و هەر کەس دەتبچڕێنێ بیبچڕێنم؟ وتی: با، ئەی پەروەردگار، فەرمووی: ئەوە بۆ تۆ**)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**گەر دەخوازن بخوێننەوە: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ۝٢٢﴾ [محمد: ٢٢]**).

**٢٦٣٠**- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، أَوْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ ؛ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ). [خ٢٠٦٧، ٢٥٥٧]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**هەر کەس پێیخۆشە رۆزییەکەی بەرین بێت و ئەجەلەکەی دوابخرێت با سیلەی رەحم جێبەجێ بکات**).

**٢٦٣١**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**تَعَلَّمُوا مِنْ أَنْسَابِكُمْ مَا تَصِلُونَ بِهِ أَرْحَامَكُمْ، فَإِنَّ صِلَةَ الرَّحِمِ مَحَبَّةٌ فِي الأَهْلِ، مَثْرَاةٌ فِي الْمَالِ، مَنْسَأَةٌ فِي الأَثَرِ**). [ت١٩٧٩]

* صحيح.

---

[1] واتە: هانابەر بۆ لای خودا-و.

[2] واتە: لە بڕینی سیلەی رەحم-و.

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(لە رەچەڵەکتانەوە شتێك فێر ببن سیلەی رەحمی خۆتانی پێ جێبەجێ بکەن، چونکە سیلەی رەحم خۆشەویستییە لە خانەوادە و فرەکردنی ماڵ و سامانە و دواخستنی ئەجەلە).**

## ٨- دەروازەی: تاوانی پچڕانی سیلەی رەحم

**٢٦٣٢-** (ق) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعٌ).** [خ٥٩٨٤/ م٢٥٥٦]

(ق) لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە، ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(پچڕێنەر[1] ناچێتە بەهەشتەوە).**

- وفي رواية لمسلم: **(لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ).**

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: **(پچڕێنەری سیلەی رەحم ناچێتە بەهەشتەوە).**

**٢٦٣٣-** عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَا مِنْ ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجِّلَ اللهُ لِصَاحِبِهِ العُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا، مَعْ مَا يَدَّخِرُ لَهُ فِي الآخِرَةِ، مِنَ البَغْيِ، وَقَطِيْعَةِ الرَّحِمِ).**

* صحيح. [د٤٩٠٢/ ت٢٥١١/جه٤٢١١]

لە ئەبی بەکرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هیچ گوناهێك شایستەتر نییە بە پێشخستنی سزا لە دنیا-لەگەڵ ئەوەی لە دواڕۆژ بۆی هەڵگیراوە- لە دەستدرێژی و پچڕانی سیلەی رەحم).**

## ٩- دەروازەی: گەیەنەری سیلەی رەحم بە هاوشێوە و هاوتایی نییە

**٢٦٣٤-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: **(لَيْسَ الْوَاصِلُ بِالمُكَافِئِ، وَلكِنِ الْوَاصِلُ الَّذِي إِذَا قُطِعَتْ رَحِمُهُ وَصَلَهَا).** [خ٥٩٩١]

---

[1] واتە: ئەو کەسەی سیلەی رەحم دەپچڕێنێ-و.

(خ) لە عەبدوڵای كوڕی عەمرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەیەنەری سیلەی رەحم بە هاوتاكار نییە، بەڵكو گەیەنەری سیلەی رەحم ئەو كەسەیە گەر سیلەی رەحمی پچڕێنرا گرێی بداتەوە)**[1].

## ١٠- دەروازەی: چاكە لەگەڵ خوشكی دایك(پوور)

**٢٦٣٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَصَبْتُ ذَنْباً عَظِيماً، فَهَلْ لِي تَوْبَةٌ؟ قَالَ: **(هَلْ لَكَ مِنْ أُمٍّ)**؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: **(هَلْ لَكَ مِنْ خَالَةٍ)**؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: **(فَبِرَّهَا)**. [حب ٤٣٥/ ت ملحق ١٩٦٨]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين (شعيب).

لە ئیبن عومەرەوە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من گوناهێكی گەورەم ئەنجامداوە، ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ فەرمووی: **(ئایا دایكت هەیە؟)**، وتی: نەخێر، فەرمووی: **(ئایا خوشكی دایكت هەیە؟)**، وتی: بەڵێ، فەرمووی: **(چاكەی لەگەڵ بكە)**.

## ١١- دەروازەی: ئایا لەبەر چاكە لەگەڵ دایك و باوك ژنەكەی تەڵاق دەدا؟

**٢٦٣٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَتْ تَحْتِي امْرَأَةٌ، وَكُنْتُ أُحِبُّهَا، وَكَانَ عُمَرُ يَكْرَهُهَا، فَقَالَ لِي: طَلِّقْهَا، فَأَبَيْتُ، فَأَتَى عُمَرُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(طَلِّقْهَا)**. [د٥١٣٨/ ت١١٨٩/ جه٢٠٨٨]

* صحيح.

---

[1] واتە: گەیەنەری سیلەی رەحم ئەو كەسە نییە سیلەی رەحمی لەگەڵ بەجێدەهێنرێ و ئەویش لە بەرانبەردا سیلەی رەحم بەجێدەهێنێ، بەڵكو بەجێهێنەری سیلەی رەحم ئەو كەسەیە سیلەی رەحمی لەگەڵ دەپچڕێنن و ئەو گرێی دەداتەوە—و.

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: ژنێکم هەبوو خۆشمدەویست، عومەر لای ناپەسەند بوو، بۆیە پێی وتم: تەڵاقی بدە، منیش نەمویست تەڵاقی بدەم، عومەر هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوەی بۆ باس کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(تەڵاقی بدە)**.

**٢٦٣٧**– عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ: أَنَّ رَجُلاً أَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّ لِيَ امْرَأَةً، وَإِنَّ أُمِّي تَأْمُرُنِي بِطَلاَقِهَا. قَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ**)، فَإِنْ شِئْتَ فَأَضِعْ ذَلِكَ الْبَابَ، أَوْ احْفَظْهُ.

ورُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: إِنَّ أُمِّي، وَرُبَّمَا قَالَ: إن أَبِي.		[ت١٩٠٠/ جه٢٠٨٩، ٣٦٦٣]

* صحيح.

لە ئەبی دەرداوە: پیاوێك هات بۆ لای و وتی: ژنێکم هەیە، دایکم فەرمانم پێ دەکات بە تەڵاقدانی، ئەبو دەردا وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(دایك و باوك ناوەندترین دەرگاکانی بەهەشتن، گەر دەتەوێ ئەو دەرگا لەدەست بدە، یان بەدەستی بهێنە)**.

پێموایە سوفیان وتی: دایکم، یان وتی: باوکم.

## بەشی یەکەم

## خۆراك و ئادابی خواردن

### ١- دەروازەی: خواردنی حەڵاڵ و "بسم الله" کردن و خواردن بە دەستی ڕاست

**٢٦٣٨-** (ق) عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: كُنْتُ غُلاَماً فِي حَجْرِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(يَا غُلامُ، سَمِّ الله، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ)**، فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ. [خ٥٣٧٦/ م٢٠٢٢]

(ق) لە عومەری کوڕی ئەبی سەلەمەوە، وتی: مێردمنداڵێك بووم لەژێر چاودێری پێغەمبەری خودا(ﷺ)، دەستم بەناو دەفری خواردنەکەدا دەگێڕا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: **(ئەی غولام، ناوی خودا بهێنە، و بە دەستی ڕاست بخۆ، و لەبەردەم خۆتەوە بخۆ)**، پاش ئەوە بەردەوام خواردنم بەو جۆرە بوو.

**٢٦٣٩-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ الله عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: لاَ مَبِيتَ لَكُمْ وَلاَ عَشَاءَ. وَإِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ الله عِنْدَ دُخُولِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ. وَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ الله عِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ)**. [م٢٠١٨]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(گەر پیاو ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و کاتی چوونە ژوورەوە و کاتی خواردنی یادی خودای کرد، شەیتان دەڵێت: نە جێگەی مانەوەی شەوتان هەیە، نە ژەمی شێوان، گەر چووە ژوورەوە و یادی خودای نەکرد لە چوونەژوورەوە، شەیتان دەڵێت: جێگەی مانەوەی شەوتان مسۆگەر کرد، گەر لە کاتی خواردنەکەی یادی خودای نەکرد، دەڵێت: جێگەی مانەوەی شەو و ژەمی شێوانتان مسۆگەر کرد)**.

**٢٦٣٩ م**– (م) وَعَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تَأْكُلُوا بِالشِّمَالِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِالشِّمالِ)**. [م٢٠١٩]

**(م) هەر لە جابرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، فەرمووی: (بە چەپ خواردن مەخۆن، چونکە شەیتان بە چەپ خواردن دەخوات).**

**٢٦٤٠**– (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَن رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيمِينِه، وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ)**. [م٢٠٢٠]

**(م) لە عەبدولڵای کوڕی عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە خواردنی خوارد با بەدەستی ڕاست بخوات، گەر خواردنەوەی خواردەوە با بە دەستی ڕاست بخواتەوە، چونکە شەیتان بە چەپی دەخوات و بە چەپی دەخواتەوە).**

- وَكَانَ نَافِعٌ يَزِيدُ فِيهَا: **(وَلاَ يَأْخُذُ بِهَا، وَلاَ يُعْطِي بِهَا)**.

**نافیع ئەمەی تێدا زیاد دەکرد: (بە دەستی چەپ وەرنەگرێت و بە دەستی چەپ نەبەخشێت).**

**٢٦٤١**– عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ؛ فَلْيَذْكُرِ اسْمَ اللهِ تَعَالَى، فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَذْكُرَ اسْمَ اللهِ تَعَالَى فِي أَوَّلِهِ؛ فَلْيَقُلْ: بِاسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ)**.

* صحيح. [د٣٧٦٧/ ت١٨٥٨/ جه٣٢٦٤/ مي٢٠٦٣]

[وانظر في طلب الحلال: **٢٢٢٧، ٣١٩٦**]

**لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە خواردنی خوارد با ناوی خودا(تعالی) بهێنێت، گەر لە بیری چوو ناوی خودا(تعالی) لە سەرەتاوە بهێنێت با بڵێت: "بسم اللهِ أوَّلَهُ وآخِرَهُ–بە ناوی خودا لە سەرەتا و کۆتاییەوە").**

## ٢- دەروازەی: باوەڕدار بە یەك ریخۆڵە دەخوات

**٢٦٤٢-** (ق) عَنْ نَافِعٍ قالَ: كانَ ابْنُ عُمَرَ لاَ يَأْكُلُ حَتَّى يُؤْتَى بِمِسْكِينٍ يَأْكُلُ مَعَهُ، فَأَدْخَلْتُ رَجُلاً يَأْكُلُ مَعَهُ، فَأَكَلَ كَثِيراً، فَقَالَ: يَا نَافِعٌ، لاَ تُدْخِلْ هذَا عَلَيَّ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، والْكافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ**).

[خ٥٣٩٣/ م٢٠٦٠]

**(ق) لە نافیعەوە، وتی: ئیبن عومەر نەیدەخوارد تا هەژارێك دەهێنرا لەگەڵی بخوات، پیاوێکم بردە ژوورەوە لەگەڵی بخوات، زۆری خوارد، ئیبن عومەر وتی: ئەی نافیع، ئەمە مەهێنە ژوورەوە بۆ لام، گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (باوەڕدار بە یەك ریخۆڵە دەخوات، بێباوەڕ بە حەوت ریخۆڵە دەخوات).**

## ٣- دەروازەی: خواردن بە شاندادانەوە

**٢٦٤٣-** (خ) عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنِّي لاَ آكُلُ مُتَّكِئاً**).

[خ٥٣٩٨]

**(خ) لە ئەبی جوحەیفەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (من بە شاندادانەوە ناخۆم).**

**٢٦٤٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَأْكُلَ الرَّجُلُ وَهُوَ مُنْبَطِحٌ عَلَى وَجْهِهِ. [جه٣٣٧٠]

* حسن. وقال شعيب: ضعيف

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد پیاو بە روودا کەوتبێت و خواردن بخوات.**

## ٤- دەروازەی: لێسانەوەی پەنجەکان و خواردن بە سێ پەنجە

**٢٦٤٥-** (م) عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَأْكُلُ بِثَلاَثِ أَصَابِعَ، وَيَلْعَقُ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يَمْسَحَهَا. [م٢٠٣٢]

**(م) لە کەعبی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا بە سێ پەنجە دەیخوارد و دەستی خۆی دەلێسایەوە بەرلەوەی بیسڕێت.**

## ٥- دەروازەی: گەر پاروویەکی لێکەوت با هەڵیبگرێتەوە

**٢٦٤٦-** (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ الشَّيْطَانَ يَحْضُرُ أَحَدَكُمْ عِنْدَ كُلِّ شَيْءٍ مِنْ شَأْنِهِ، حَتَّى يَحْضُرَهُ عِنْدَ طَعَامِهِ، فَإِذَا سَقَطَتْ مِنْ أَحَدِكُمُ اللُّقْمَةُ، فَلْيُمِطْ مَا كَانَ بِهَا مِنْ أَذى، ثُمَّ لْيَأْكُلْهَا، وَلاَ يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ، فَإِذَا فَرَغَ، فَلْيَلْعَقْ أَصَابِعَهُ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي فِي أَيِّ طَعَامِهِ تَكُونُ الْبَرَكَةُ**). [م٢٠٣٣]

**(م) لە جابرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (شەیتان لە هەرچی شت و کاروباری یەکێك لە ئێوە ئامادە دەبێت، تا لە خواردنەکەی ئامادە دەبێت، گەر لە یەکێکی ئێوە پاروویەك بەربوویەوە با ئەوەی پێوەیەتی لە پیسی بیسڕێتەوە و پاشان بیخوات و لێینەگەڕێ بۆ شەیتان، کاتێك تەواو بوو با پەنجەکانی بلێسێتەوە، چونکە ئەو نازانێت لە کام خواردنی بەرەکەت هەیە).**

- وفي رواية: (**وَلاَ يَمْسَحْ يَدَهُ بِالْمِنْدِيلِ، حَتَّى يَلْعَقَ أَصَابِعَهُ**).

**لە ریوایەتێکدا: (بە دەستماڵ دەستی خۆی نەسڕێت، تا دەستەکانی دەلێسێتەوە).**

## ٦- دەروازەی: ئەوەی دەیڵێ کاتێ لە خواردنەکەی تەواو دەبێت

**٢٦٤٧-** (خ) عَنْ أَبِي أُمامَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كانَ إِذَا فَرَغَ مِنْ طَعَامِهِ ـ وَقالَ مَرَّةً: إِذَا رَفَعَ مائِدَتَهُ ـ، قالَ: (**الْحَمْدُ للهِ الَّذِي كَفَانَا وَأَرْوَانَا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلاَ مَكْفُورٍ**). وَقالَ مَرَّةً: (**الْحَمْدُ للهِ رَبِّنَا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلاَ مُوَدَّعٍ، وَلاَ مُسْتَغْنًى، رَبُّنَا**). [خ٥٤٥٩]

(خ) لە ئەبی ئومامەوە: كە پێغەمبەر(ﷺ) لە خواردنەكەی تەواو دەبوو-جارێك وتی: كە سفرەكەیان هەڵدەگرت- دەیفەرموو: (**"الحمد لله الذي كفانا وأروانا غير مكفيّ**[1] **ولا مكفور**[2]**"**)، جارێك فەرمووی: (**"الحمد لله ربّنا غير مكفيّ ولا مودّع**[3] **ولا مستغنى**[4]**، ربّنا"**).

**٢٦٤٨**- (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ اللهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ، فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا، أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ، فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا). [م٢٧٣٤]

(م) لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خودا لە بەندە رازی دەبێت خواردنێك بخوات و لەسەری حەمدی ئەو بكات، یان خواردنەوەیەك بخواتەوە و لەسەری حەمدی ئەو بكات**).

**٢٦٤٩**- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَكَلَ أَوْ شَرِبَ قَالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَ وَسَقَى، وَسَوَّغَهُ، وَجَعَلَ لَهُ مَخْرَجاً). [د٣٨٥١]

* صحيح.

لە ئەبی ئەیوبی ئەنصارییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) كە خواردنی دەخوارد یان خواردنەوەی دەخواردەوە دەیفەرموو: (**"الحمد لله الذي أطعم وسقى، وسوّغه، وجعل له مخرجا"**[5]).

---

[1] واتە: نیعمەتی خودا رەدكراوە نین-و.

[2] واتە: نیعمەتی جێگەی سپڵەیی و ناشوكری نین-و.

[3] واتە: نیعمەتی وازلێناهێنرێت -و.

[4] واتە: نیعمەتەكانی جێگەی بێنیازی نین و مرۆڤ لێیان بێنیاز نابێت-و.

[5] واتە: حەمدی خودای دەكرد بۆ شەش نیعمەت نیعمەت: خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشیوە و خواردن و خواردنەوەكەی ساز و ئاسان كردووە بۆ قوتدان و دوو دەرچەی بۆ پاشەڕۆكەیان كردووەتەوە-و.

## ٧- دەروازەی: گەر میوان کەسی تری لەگەڵ بێت

**٢٦٥٠-** (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يُكْنَى أَبَا شُعَيْبٍ، فَقَالَ لِغُلاَمٍ لَهُ قَصَّابٍ: اجْعَلْ لِي طَعَاماً يَكْفِي خَمْسَةً، فَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَدْعُوَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم خَامِسَ خَمْسَةٍ، فَإِنِّي قَدْ عَرَفْتُ فِي وَجْهِهِ الجُوعَ، فَدَعَاهُمْ. فَجَاءَ مَعَهُمْ رَجُلٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ هذَا قَدْ تَبِعَنَا، فَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَأْذَنَ لَهُ فَأْذَنْ لَهُ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ يَرْجِعَ رَجَعَ**). فَقَالَ: لاَ، بَلْ قَدْ أَذِنْتُ لَهُ. [خ٢٠٨١/ م٢٠٣٦]

**(ق) لە ئەبی مەسعوودەوە، وتی: پیاوێك لە ئەنصار پێی دەوترا "أبا شعیب" هات و بە غولامێکی خۆی -کە گۆشتفرۆش بوو- وت: خواردنم بۆ ئامادە بکە بەشی پێنج کەس بکات، من دەمەوێ پێغەمبەر(ﷺ) بانگهێش بکەم وەك پێنجەمی پێنج کەسەکە، چونکە من لە روخساریدا برسێتیم بینی، کەسەکانی بانگهێش کرد، پیاوێك لەگەڵیان هات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەم کەسە شوێنمانکەوتووە گەر دەتەوێ مۆڵەتی بدەی مۆڵەتی بدە، گەر دەتەوێ بگەڕێتەوە دەگەڕێتەوە)، ئەبو شوعەیب وتی: نەخێر، بەڵکو ئەویشم مۆڵەت دا.**

## ٨- دەروازەی: گەر میوان داوای بانگهێشی کەسێکی تر بکات

**٢٦٥١-** (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ جَاراً لِرَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم فَارِسِيّاً، كَانَ طَيِّبَ الْمَرَقِ، فَصَنَعَ لِرَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ جَاءَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ: (**وَهذِهِ**)؟ لِعَائِشَةَ. فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ**). فَعَادَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**وَهذِهِ**)؟ قَالَ: لاَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ**). ثُمَّ عَادَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَهذِهِ**)؟ قَالَ: نَعَمْ، فِي الثَّالِثَةِ، فَقَامَا يَتَدَافَعَانِ حَتَّى أَتَيَا مَنْزِلَهُ. [م٢٠٣٧]

**(م) لە ئەنەسەوە: جیرانێکی پێغەمبەر(ﷺ) فارسی بوو، شلەی خۆشی لێدەنا، بۆ پێغەمبەری خودای(ﷺ) لێنا و پاشان هات و بانگهێشی کرد، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەی ئەمە؟)-بۆ عائیشە-[1] وتی: نەخێر، پێغەمبەری خوداش(ﷺ) فەرمووی:**

---

[1] واتە: ئایا عائیشەش لەگەڵ خۆم بهێنم؟-و.

**(نەخێر**[1]**)، کەسەکە هاتەوە و بانگهێشتی کردەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی ئەمە؟)، وتی: نەخێر، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نەخێر)، پاشان گەڕایەوە بانگهێشتی کردەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی ئەمە؟)، لە سێیەمجاردا وتی: بەڵێ، هەردووکیان هەستان و هەریەکەیان ئەویتری پێش دەخست تا هاتن بۆماڵی پیاوەکە.**

## ٩- دەروازەی: رەخنە لە خواردن ناگرێت

**٢٦٥٢-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: ما عابَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم طَعَاماً قَطُّ، إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ، وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ. [خ٥٤٠٩ (٣٥٦٣)/ م٢٠٦٤]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) رەخنەی لە خواردنێك نەگرتووە، گەر حەزی لێبوایە دەیخوارد، گەر لای ناپەسەند بوایە وازیلێدەهێنا.**

- وفي رواية لمسلم: وَإِنْ لَمْ يَشْتَهِهِ، سَكَتَ.

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا: گەر حەزی لێ نەبوایە بێدەنگ دەبوو.**

## ١٠- دەروازەی: داوای دوعا لە میوانی صالح

**٢٦٥٣-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ قَالَ: نَزَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى أَبِي، قَالَ: فَقَرَّبْنَا إِلَيْهِ طَعَاماً وَوَطْبَةً، فَأَكَلَ مِنْهَا، ثُمَّ أُتِيَ بِتَمْرٍ فَكَانَ يَأْكُلُهُ، وَيُلْقِي النَّوَى بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ، وَيَجْمَعُ السَّبَّابَةَ وَالْوُسْطَى. قَالَ شُعْبَةُ: هُوَ ظَنِّي. وَهُوَ فِيهِ، إِنْ شَاءَ الله، إِلْقَاءُ النَّوَى بَيْنَ الإِصْبَعَيْنِ. ثُمَّ أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ الَّذِي عَنْ يَمِينِهِ. قَالَ: فَقَالَ أَبِي، وَأَخَذَ بِلِجَامِ دَابَّتِهِ: ادْعُ الله لَنَا، فَقَالَ: (اللَّهُمَّ! بَارِكْ لَهُمْ فِي مَا رَزَقْتَهُمْ، وَاغْفِرْ لَهُمْ وَارْحَمْهُمْ). [م٢٠٤٢]

---

[1] واتە: گەر عائیشەم لەگەڵ نەبێت وەڵامی بانگهێشتەکەت نادەمەوە -و.

(م) لە عەبدوڵای کوڕی بوسرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو بە میوانی باوکم، وتی: خواردنەکە و تێکەڵەی خورما و کەشك و ڕۆنمان لێ نزیك کردەوە و لێی خوارد، پاشان خورمای بۆ هێنرا دەیخوارد و ناوکەکانی هەڵدەدا بۆ نێوان دوو پەنجەی، پەنجەی شایەتمان و ناوەندی پێکەوە کۆدەکردەوە-پاشان خواردنەوەی بۆ هێنرا خواردییەوە، پاشان دایە دەست ئەو کەسەی لای ڕاستییەوە بوو، وتی: باوکم دەستی بە لغاوی وڵاخی سوارییەکەیەوە گرتبوو و وتی: دوعامان بۆ بکە، فەرمووی: **(خودایە، بەرەکەت بخە ناو ڕۆزییەکەیان و لێیان خۆش ببە و ڕەحمیان پێ بکە).**

## ١١- دەروازەی: خواردنی یەکێك بەشی دووان دەکات[1]

**٢٦٥٤-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(طَعَامُ الاِثْنَيْنِ كَافِي الثَّلاَثَةِ، وَطَعَامُ الثَّلاَثَةِ كَافِي الأَرْبَعَةِ).** [خ٥٣٩٢/ م٢٠٥٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، ئەو وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خواردنی دووان بەشی سیان دەکات، خواردنی سیان بەشی چوار دەکات).**

## ١٢- دەروازەی: باشترین پێخۆر سرکەیە

**٢٦٥٥-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم سَأَلَ أَهْلَهُ الأُدُمَ، فَقَالُوا: مَا عِنْدَنَا إِلاَّ خَلٌّ، فَدَعَا بِهِ، فَجَعَلَ يَأْكُلُ بِهِ وَيَقُولُ: **(نِعْمَ الأُدُمُ الْخَلُّ، نِعْمَ الأُدُمُ الْخَلُّ).** [م٢٠٥٢]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەر(ﷺ) داوای پێخۆری لە خانەوادەکەی کرد، وتیان: تەنها سرکەمان لە لایە، پێغەمبەر داوای کرد، ئەو دەیخوارد و دەیفەرموو: **(باشترین پێخۆر سرکەیە، باشترین پێخۆر سرکەیە).**

---

[1] واتە: ناونیشانەکە لە ژمارەکاندا لەگەڵ فەرموودەکە تەبا نییە، مەگەر لە فەرموودەیەکی تری وەرگرتبێت-و.

**٢٦٥٦**– عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ**)؟ فَقُلْتُ: لاَ، إِلاَّ كِسَرٌ يَابِسَةٌ وَخَلٌّ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**قَرِّبِيهِ، فَمَا أَقْفَرَ بَيْتٌ مِنْ أُدْمٍ فِيهِ خَلٌّ**). [ت١٨٤١]

* حسن.

**لە ئوم هانی کچی ئەبی تالبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لام و فەرمووی: (شتێکتان لە لایە؟)، وتم: نەخێر، جگە لە پارچە نانی رەق و سرکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نزیکی بکەرەوە،ماڵێك هەژار نەکەوتووە لە پێخۆر سرکەی تێدا بێت).**

## ١٣- دەروازەی: شۆربای "التلبينة[1]"

**٢٦٥٧**– (ق) عَنْ عائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ: أَنَّهَا كانَتْ إِذَا ماتَ المَيِّتُ مِنْ أَهْلِهَا، فَاجْتَمَعَ لِذلِكَ النِّسَاءُ، ثُمَّ تَفَرَّقْنَ إِلاَّ أَهْلَهَا وَخاصَّتَهَا، أَمَرَتْ بِبُرْمَةٍ مِنْ تَلْبِينَةٍ، فَطُبِخَتْ، ثُمَّ صُنِعَ ثَرِيدٌ، فَصُبَّتِ التَّلْبِينَةُ عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: كُلْنَ مِنْهَا، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**التَّلْبِينَةُ مُجَمَّةٌ لِفُؤَادِ المَرِيضِ، تَذْهَبُ بِبَعْضِ الحُزْنِ**). [خ٥٤١٧، ٢٢١٦]

**(ق) لە عائیشەوە–هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)–: گەر کەسێك بمردبایە ئافرەتان بۆ ئەوە کۆدەبوونەوە، پاشان جگە لە خانەوادە و کەسە تایبەتەکان بڵاوەیان دەکرد، فەرمانیان دەکرد بە مەنجەڵێك لە "تلبینة"، لێدەنرا، پاشان ترێت ئامادە دەکرا و "تلبینة"ەکەی بەسەردا دەکرا، پاشان دەیوت: لێی بخۆن، گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: ("تلبینة" دڵی نەخۆش ئاسوودە دەکات و هەندێ دڵتەنگی لادەبات).**

[1] "التلبينة": بریتییە لە شۆربای جۆی نەهاڕاو(زاد المعاد٤/١٢٠)–و.

## ١٤- دەروازەی: خورمای تازە پێگەیو بە ترۆزییەوە

**٢٦٥٨-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَأْكُلُ الرُّطَبَ بِالْقِثَّاءِ. [خ٥٤٤٠/ م٢٠٤٣]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبی تالیبەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی خورمای تازە پێگەیوی بە ترۆزییەوە دەخوارد.**

## ١٥- دەروازەی: عەجوە و خورما

**٢٦٥٩-** (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ تَصَبَّحَ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعَ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً، لَمْ يَضُرَّهُ فِي ذٰلِكَ الْيَوْمِ: سُمٌّ وَلاَ سِحْرٌ).
[خ٥٤٤٥/ م٢٠٤٧]

**(ق) لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس هەموو رۆژ بەیانی بە حەوت دەنك عەجوە بکاتەوە لەو رۆژەدا نە ژەهر و نە سیحر زیانی پێ ناگەیەنن).**

**٢٦٦٠-** (م) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ يَجُوعُ أَهْلُ بَيْتٍ عِنْدَهُمُ التَّمْرُ). [م٢٠٤٦]

**(م) لە عائیشەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خانەوادەیەك برسی نابن خورمایان لە لا بێت).**

**٢٦٦١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِتَمْرٍ عَتِيقٍ، فَجَعَلَ يُفَتِّشُهُ يُخْرِجُ السُّوسَ مِنْهُ. [د٣٨٣٢/ جه٣٣٣٣]
* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: خورمای کۆن هێنرا بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، خورماکەی دەپشکنی و "سوس"[1]ی لێ دەردەکرد.**

[1] واتە: جۆرە مێروویەکە -و.

## ١٦- دەروازەی: کولەکەی شیرین

**٢٦٦٢-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: إِنَّ خَيَّاطاً دَعا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِطَعَامٍ صَنَعَهُ. قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: فَذَهَبْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى ذلِكَ الطَّعَامِ، فَقَرَّبَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خُبْزاً وَمَرَقاً، فِيهِ دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَتَتَبَّعُ الدُّبَاءَ مِنْ حَوَالَيِ الْقَصْعَةِ، قَالَ: فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ مِنْ يَوْمِئِذٍ.
[خ٢٠٩٢/ م٢٠٤١]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: بەرگدرووییەك پێغەمبەری خودای(ﷺ) بانگهێش کرد بۆ خواردنێك کە دروستی کرد بوو، ئەنەسی کوڕی مالیك وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشتم بۆ ئەو خواردنە، شلە و نانی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نزیك کردەوە، کولەکەی شیرین و گۆشتی وشککراوی تێدا بوو، پێغەمبەرم(ﷺ) بینی بەدوای کولەکەکاندا دەگەڕا لە دەوروبەری قاپەکە، وتی: لەو ڕۆژەوە حەزم لە کولەکەی شیرینە.**

## ١٧- دەروازەی: سیر و پیاز

[أنظر: ١١١٤- ١١١٦، ٣٦٠٢]

## ١٨- دەروازەی: گەر مێش کەوتە ناو دەفرەوە

**٢٦٦٣-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ؛ فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ، ثُمَّ لِيَطْرَحْهُ، فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ شِفَاءً، وَفِي الآخَرِ دَاءً).
[خ٥٧٨٢ (٣٣٢٠)]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر مێش کەوتە ناو دەفری یەکێکتان با هەمووی نوقم بکات پاشان فڕێی بدات، چونکە لە یەکێك لە باڵەکانی شیفایەك هەیە و لەوەکەی تری نەخۆشییەك).**

▪ وفي رواية: (فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ). [خ۳۳۲۰]

لە ریوایەتێکی تری بوخاری: **(کەوتە ناو خواردنەوەی یەکێکتان)**.

## ۱۹- دەروازەی: شۆرینی دەست پێش خواردن و دوای خواردن

**۲۶٦٤**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ نَامَ وَفِي يَدِهِ غَمَرٌ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ، فَأَصَابَهُ شَيْءٌ، فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ). [د۳۸۵۲/ ت۱۸٦۰/ جه۳۲۹۷/ مي۲۱۰۷]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس خەوت و چەوری بە دەستییەوە بوو و نەیشۆری و شتێکی تووشهات با تەنها سەرزەنشتی خۆی بکات)**.

▪ ولفظ غير أبي داود: (وَفِي يَدِهِ رِيحُ غَمَرٍ...).

لەفزی ئەوانی تر جگە لە ئەبو داود: **(بەدەستییەوە بۆنی چەوری هەبوو)**.

## ۲۰- دەروازەی: هەندێ لە گوزەرانی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" و هاوەڵانی

[انظر: ۳٦٦۹، ۳٦۷۱، ۳٦۷٥، ۳۷٤۷]

## ۲۱- دەروازەی: خواردنی ئەهلی کیتاب و هاوەڵدانەران و دەفرەکانیان

**۲٦٦٥**- عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَنُصِيبُ مِنْ آنِيَةِ الْمُشْرِكِينَ وَأَسْقِيَتِهِمْ، فَنَسْتَمْتِعُ بِهَا، فَلاَ يَعِيبُ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ. [د۳۸۳۸]

* صحيح.

**لە جابرەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەزامان دەکرد و ڕێمان لە دەفر و کوندە و جەوەندەی هاوەڵدانەران دەکەوت و سوودمان لێ دەبینین، پێغەمبەر ئەوەی لەوان بە خراپ نەدەبینی**.

**٢٦٦٦-** عن عَدِيِّ بْنَ حَاتِمٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَبِي كَانَ يَصِلُ الرَّحِمَ، وَيَفْعَلُ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: **(إِنَّ أَبَاكَ أَرَادَ أَمْراً فَأَدْرَكَهُ)** . يَعْنِي: الذِّكْرَ . قالَ: قُلْتُ: إِنِّي أَسْأَلُكَ عَنْ طَعَامٍ لاَ أَدَعُهُ إِلاَّ تَحَرُّجاً، قَالَ: **(لاَ تَدَعْ شَيْئاً ضَارَعْتَ فِيهِ نَصْرَانِيَّةً)**. [حم١٨٢٦٢]

* حسن.

لە عەدی کوڕی حاتەمەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، باوکم سیلەی ڕەحمی بەجێدەهێنا و ئەوە و ئەوەی دەکرد، فەرمووی: **(باوکت شتێکی دەویست پێی گەیشت)**-واتە: ناوی باش- وتی: وتم: من پرسیاری خواردنێکت لێ دەکەم، تەنها لە شك و دڵکرمێنییەوە وازیلێدەهێنم، فەرمووی: **(شتێك وازلێمەهێنە تیایدا هاوشێوەی نەصرانی بوویت[1])**.

## ٢٢- دەروازەی: خواردنی گۆشت

**٢٦٦٧-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُعْجِبُهُ الذِّرَاعُ. قَالَ: وَسُمَّ فِي الذِّرَاعِ، وَكَانَ يَرَى أَنَّ الْيَهُودَ هُمْ سَمُّوهُ. [د٣٧٨١]

* صحيح.

لە ئیبن مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) حەزی لە دەست بوو[2]، وتی: بە دەست ژەهرخوارد کرا، پێیوابوو یەهوود ژەهرخواردیان کرد[3].

---

[1] ئیسلام بریتییە لە حەنەفییەتی پڕ لە چاوپۆشی و نەصرانییەت بریتییە لە ڕەهبانییەت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکرد لە ڕەهبانییەتی نەصرانییەوە هیچ شت وازلێنەهێنێ، چونکە عەدی کوڕی حاتەم پێش موسڵمان بوونی نەصرانی بوو-و.

[2] واتە: لە گۆشتی حەیوان حەزی لە دەستەکەی بوو-و.

[3] لە فەتحی خەیبەر ژنێکی یەهوودی دەستی حەیوانی بۆ هێنا و ژەهرخواردی کرد-و.

## ٢٣- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی گۆشت و شیری "الجلالة"[(١)] هاتووە

**٢٦٦٨**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ أَكْلِ الْجَلاَّلَةِ وَأَلْبَانِهَا. [د٣٧٨٥/ ت١٨٢٤/ جه٣١٨٩]

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە خواردنی "الجلالة" و شیرەکەی[(٢)].**

- ولأبي داود: نُهِيَ عَنْ رُكُوبِ الْجَلاَّلَةِ. [د٢٥٥٧]

* حسن صحيح.

**ریوایەتەکەی ئەبی داود: نەهی کرا لە سواربوونی "الجلالة".**

## ٢٤- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی ئاردی سپی و نان هاتووە

**٢٦٦٩**- عَنْ أُمِّ أَيْمَنَ: أَنَّهَا غَرْبَلَتْ دَقِيقاً، فَصَنَعَتْهُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم رَغِيفاً، فَقَالَ: **(مَا هَذَا)**؟ قَالَتْ: طَعَامٌ نَصْنَعُهُ بِأَرْضِنَا، فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَصْنَعَ مِنْهُ لَكَ رَغِيفاً، فَقَالَ: **(رُدِّيهِ فِيهِ، ثُمَّ اعْجِنِيهِ)**. [جه٣٣٣٦]

* حسن الإسناد.

**لە ئوم ئەیمەنەوە[(٣)]: ئەو ئاردی لە هێڵەك دا و کولێرەیەکی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لێ دروست کرد، فەرمووی: (ئەمە چییە؟)، وتی: خواردنێکە لە**

---

(١) واتە: ئەو گیاندارانەی بە زۆری پیسی و پاشەڕۆی ئاژەڵان دەخۆن-و.

(٢) هەندێ ئاژەڵ با حەڵاڵیش بن سروشتێك بەسەریاندا زاڵ دەبێت پیسی دەخۆن و لە خواردنە سەرەکییەکەی خۆیان دوور دەکەونەوە، گەر جارێك و دوو جار بێت لای فەقیهان نەهی ناکرێت لە گۆشت و شیرەکەی، بەڵام گەر بە زۆری پیسی دەخوارد ئەوە لە خواردنی گۆشتەکەی و شیرەکەی دوورەپەرێزی دەکرێت، فەقیهان دەڵێن: گەر ئاژەڵەکە بەند بکرێ لە خواردنی شتی پیس و بچێتەوە سەر خواردنەکەی خۆی ئەو نەهییەی لەسەر هەڵدەگیرێت-و.

(٣) واتە: جاریەی پێغەمبەری خودا بوو، خەڵکی حەبەشە بوو، دایکی ئوسامەی کوڕی زەید-و.

زەوی خۆمان[1] دروستمان دەکرد، پێمخۆش بوو کولێرەیەکت لەوە بۆ دروست بکەم، فەرمووی: **(تێیبکەرەوە[2] و پاشان بیشێلە).**

## ٢٥- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی خواردنی پەنیر و رۆن هاتووە

**٢٦٧٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِجُبْنَةٍ فِي تَبُوكَ، فَدَعَا بِسِكِّينٍ، فَسَمَّى وَقَطَعَ. [د٣٨١٩]

* حسن الإسناد.

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: لە تەبووکەوە پەنیرێك بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هێنرا، داوای چەقۆیەکی کرد ناوی خودای هێنا و بڕی.**

**٢٦٧١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ أَطْعَمَهُ اللهُ طَعَاماً، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ! بَارِكْ لَنَا فِيهِ، وَارْزُقْنَا خَيْراً مِنْهُ، وَمَنْ سَقَاهُ اللهُ لَبَناً، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ! بَارِكْ لَنَا فِيهِ، وَزِدْنَا مِنْهُ، فَإِنِّي لاَ أَعْلَمُ مَا يُجْزِئُ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ؛ إِلاَّ اللَّبَنُ**). [جه٣٣٢٢]

* حسن.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس خودا خواردنێکی دەرخوارد دا با بڵێت: "اللهم بارك لنا فيه وارزقنا خيرا منه"، هەر کەس خودا شیری دەرخوارد دا با بڵێت: "اللهم بارك لنا فيه، وزدنا منه" چونکە من شتێك شك نابەم جێگەی خواردن و خواردنەوە بگرێتەوە جگە لە شیر[3]).**

---

[1] واتە: حەبەشە-و.

[2] واتە: ئەو سۆس و کۆتەڵەی بە هێڵەکەکە لە ئاردەکەت جیاکردووەتەوە تێیبکەرەوە و پاشان لەگەڵ ئاردەکە بیشێلە-و.

[3] واتە: مەڵێ: خودایە باشتر لە شیرم پێ بدە، بەڵکو بڵێ: خودایە لە شیرم بۆ زیاد بکە، چونکە شیر باشترین خواردن و خواردنەوەیە-و.

## ٢٦- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی خواردنی زەیت هاتووە

**٢٦٧٢**- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**كُلُوا الزَّيْتَ، وَادَّهِنُوا بِهِ، فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ**).

لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(زەیت بخۆن، و خۆتانی پێ بهەنوون، چونکە ئەوە لە درەختێکی بەفەڕەوەیە[1])**.

- ولفظ ابن ماجه: (**ائْتَدِمُوا بِالزَّيْتِ...**). [ت١٨٥١/ جه٣٣١٩]

* صحيح.

لەفزەکەی ئیبن ماجە: **(زەیت بکەنە پێهخۆر...)**.

## ٢٧- دەروازەی: پەناگرتن لە برسێتی

**٢٦٧٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ! إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ، فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ، فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ**).

* حسن. [د١٥٤٧/ ن٥٤٨٣/ جه٣٣٥٤]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: **("اللهم إني أعوذ بك من الجوع، فإنه بأس الضجيع، وأعوذ بك من الخيانة فإنها بئست البطانة-خودایە من پەنات پێ دەگرم لە برسێتی[2] چونکە خراپترین یاوەری جێگەی نووستن و پاڵدانەوەیە، پەنات پێ دەگرم لە ناپاکی چونکە خراپترین حەشاردراو و شاراوەی مرۆڤە[3]")**.

---

[1] مەبەست زەیتی زەیتوونە-و.

[2] واتە: برسێتی-کە ئازارێکە لە گەدەدا- خراپترین شتێکە لەگەڵ مرۆڤ دێتە ناو جێگەی نووستن و پاڵدانەوە، چونکە خەوی لێ هەراسان دەکات و رێگری لێ دەکات لە عیبادەت و یادی خودا-و.

[3] واتە: ناپاکی خراپترین شتێکە مرۆڤ حەشاری دابێت و شاردبێتییەوە-و.

## ٢٨- دەروازەی: میانەگیری لە خواردن و تێر نەخواردن

**٢٦٧٤**- عَنِ المِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَا مَلَأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرّاً مِنْ بَطْنٍ. بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ لاَ مَحَالَةَ، فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ، وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ**). [ت٢٣٨٠/ جه٣٣٤٩]

* صحيح.

لە میقدامی کوڕی مەعدیکەریبەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**ئادەمیزاد دەفرێکی پڕ نەکردووە خراپتر لە سکی، چەند پارووەیەك بەسە بۆ ئادەمیزاد پەیکەری رابگرن، گەر هەردەبوو بخوات سێیەکی بۆ خواردن و سێیەکی بۆ خواردنەوە و سێیەکی بۆ هەناسەی**).

**٢٦٧٥**- عن عطية بن عامر الجهني قال: سمعت سلمان، وأُكرهَ على طعام يأكله، فقال: حسبي، إني سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلّم يقول: (**إنَّ أكثَرَ الناسِ شِبَعًا في الدُّنْيا أطوَلُهم جوعًا في الآخرةِ**). [جه٣٣٥١]

* حسن. ضعفه شعيب.

لە عەتییەی کوڕی عامیری جوهەنییەوە، وتی: گوێم لە سەلمان بوو، ئەو زۆری لێکرا لەسەر خواردنی خۆراکێك، وتی: بەسمە، من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**تێرترین خەڵك لە دنیا درێژترین برسێتی هەیە لە رۆژی قیامەت**).

**٢٦٧٦**- عن ابن عمر قال: تجشأ رجلٌ عند النبي صلّى الله عليه وسلم، فقال: (**كُفَّ عنا جُشاءك، فإن أكثرهم شبعاً في الدنيا أطولهم جوعاً يوم القيامة**). [ت٢٤٧٨/ جه٣٣٥٠]

* حسن. وضعفه شعيب جدًا.

[وانظر: **٢٦٤٢**]

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پیاوێك لای پێغەمبەر(ﷺ) قوڕقێنەی لێدا، فەرمووی: (**قوڕقێنەکەتمان لێبگرەوە، چونکە تێرترینیان لە دنیا درێژترین برسێتی هەیە لە رۆژی قیامەت**).

## ٢٩- دەروازەی: ناچار بە مردارەوە بوو

**٢٦٧٧**- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَنَّ رَجُلاً نَزَلَ الْحَرَّةَ، وَمَعَهُ أَهْلُهُ وَوَلَدُهُ، فَقَالَ رَجُلٌ: إِنَّ نَاقَةً لِي ضَلَّتْ، فَإِنْ وَجَدْتَهَا فَأَمْسِكْهَا، فَوَجَدَهَا، فَلَمْ يَجِدْ صَاحِبَهَا، فَمَرِضَتْ، فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ: انْحَرْهَا، فَأَبَى، فَنَفَقَتْ، فَقَالَتْ: اسْلَخْهَا حَتَّى نُقَدِّدَ شَحْمَهَا وَلَحْمَهَا وَنَأْكُلَهُ، فَقَالَ: حَتَّى أَسْأَلَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَتَاهُ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: **(هَلْ عِنْدَكَ غِنًى يُغْنِيكَ)**؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: **(فَكُلُوهَا)**. قَالَ: فَجَاءَ صَاحِبُهَا فَأَخْبَرَهُ الْخَبَرَ، فَقَالَ: هَلاَّ كُنْتَ نَحَرْتَهَا؟ قَالَ: اسْتَحْيَيْتُ مِنْكَ. [د٣٨١٦]

* حسن الإسناد.

**لە جابری کوڕی سەموورەوە: پیاوێك لە "الحـرَّة" نیشـتەجێ بـوو و خانـەوادە و منداڵەکەی پێ بوو، پیاوێکی تر پێی وت: حوشـترێکم بـزر بـووە، گـەر بینیتـەوە لای خـۆت رایبگـرە، پیاوەکـە دۆزییـەوە و خاوەنەکـەی نەبینییـەوە، حوشـترەکە نەخۆشـکەوت، ژنەکـەی پێـی وت: سـەریبڕە، پیاوەکـە نەیویسـت، حوشـترەکە مرداربووەوە، ژنەکە وتی: پێستەکەی لێ بکەرەوە تا بەزەکـەی و گۆشـتەکەی وشـك بکەینەوە و بیخۆین، پیاوەکە وتی: دەبێ پرسـیار لـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) بکـەم، هات بۆ لای و پرسیاری لێکرد، فەرمووی: (ئایا شتێکت لە لایە بێنیازت بکات لەوە؟)، وتی: نەخێر، فەرمووی: (بیخۆن)، وتی: هاوەڵەکەی هات بۆ لای و هەواڵەکـەی پێـدا، وتی: ئەی بۆچی سەرتنەبڕی، وتی: شەرمم لێکردی.**

## ٣٠- دەروازەی: کۆبوونەوە لەسەر خواردن

**٢٦٧٨**- عَنْ وَحْشِيٍّ: أَنَّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّا نَأْكُلُ وَلاَ نَشْبَعُ، قَالَ: **(فَلَعَلَّكُمْ تَفْتَرِقُونَ)**؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: **(فَاجْتَمِعُوا عَلَى طَعَامِكُمْ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ، يُبَارَكْ لَكُمْ فِيهِ)**. [د٣٧٦٤/ جه٣٢٨٦]

* حسن.

لە وەحشییەوە: هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە دەخۆین و تێر نابین، فەرمووی: (لەوانەیە بڵاوە بکەن[1]؟)، وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (لەسەر خواردنەکەتان کۆببنەوە و ناوی خودای لەسەر بهێنن، بۆ ئێوە بەرەکەتی تێدەکەوێت).

## ٣١- دەروازەی: فەرمووکردن بۆ خواردن

**٢٦٧٩-** عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ قَالَتْ: أُتِيَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِطَعَامٍ، فَعَرَضَ عَلَيْنَا، فَقُلْنَا: لاَ نَشْتَهِيهِ، فَقَالَ: (**لاَ تَجْمَعْنَ جُوعاً وَكَذِباً**). [جه٣٢٩٨]

* حسن.

لە ئەسمای کچی یەزیدەوە، وتی: خواردن بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هێنرا، فەرمووی لێکردین، وتمان: حەزمان پێی نییە، فەرمووی: (**برسێتی و درۆ کۆمەکەنەوە[2]**).

## ٣٢- دەروازەی: دوعا بۆ خاوەن خواردنەکە

**٢٦٨٠-** عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم جَاءَ إِلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَجَاءَ بِخُبْزٍ وَزَيْتٍ، فَأَكَلَ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ، وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ المَلاَئِكَةُ**). [د٣٨٥٤]

* صحيح.

لە ئەنەسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای سەعدی کوڕی عوبادە، نان و زەیتی هێنا، پێغەمبەر خواردی، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**"أفْطَرَ عِنْدَكُم الصائمون، وأكَلَ طعامَكُم الأبرارُ، وصَلَّتْ عَلَيْكُم الملائكةُ- ڕۆژووان لاتان بەربانگ بکەنەوە، و چاکان لە خواردنتان بخۆن، و فریشتەکان صەڵەواتتان لەسەر بدەن[3]"**).

---

[1] واتە: لەوانەیە لەسەر خواردنەکە کۆنەبنەوە و هەر کەس بە جیا و دوور لەویتر خواردنەکە بخوات-و.

[2] واتە: برسیتانە و دەڵێن برسیمان نییە-و.

[3] واتە: داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکەن-و.

## بەشی دووەم

# سەربڕاو و ڕاو و نێچیر

## ١- دەروازەی: فەرمان کردن بە باش سەربڕین و کوشتنەوە

**٢٦٨١**– (م) عَنْ شَدَّاد بْنِ أَوْسٍ قَالَ: ثِنْتَانِ حَفِظْتُهُمَا عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ اللهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ؛ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ؛ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ)**. [م١٩٥٥]

(م) لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە، وتی: دوو شتم لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لەبەرکرد، فەرمووی: **(خودا چاکەی لەسەر هەموو شت نووسیوە، گەر کوشتتانەوە بە باشی بیکوژنەوە، گەر سەرتانبڕی بە باشی سەریبڕن، با یەکێك لە ئێوە چەقۆکەی تیژ بکات و سەربڕاوەکەی ئاسوودە بکات)**.

## ٢- دەروازەی: "الفرع والعتيره"

**٢٦٨٢**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ فَرَعَ وَلاَ عَتِيرَةَ)**. وَالْفَرَعُ: أَوَّلُ النِّتَاجِ، كَانُوا يَذْبَحُونَهُ لِطَوَاغِيتِهِمْ، وَالْعَتِيرَةُ فِي رَجَبٍ. [خ٥٤٧٣/ م١٩٧٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(نە "فرع" و نە "عتيرة")**.

"القَرَع" بریتییە لە یەکەمین سکی ئاژەڵەکان لە سەردەمی نەفامی بۆ تاغووتەکان سەردەبڕان، "العتيرة"[1]"ش لە ڕەجەبدا بوو.

---

[1] "العتيرة": سەربڕینێك بوو لە دە ڕۆژی یەکەمی مانگی ڕەجەب، پێشی دەوترا "الرجبية"–و.

## ٣- دەروازەی: ئەوەی سەربڕ ئەنجامی دەدات

**٢٦٨٣-** (ق) عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِذِي الْحُلَيْفَةِ، فَأَصَابَ النَّاسَ جُوعٌ، فَأَصَابُوا إِبِلاً وَغَنَماً، قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي أُخْرَيَاتِ الْقَوْمِ، فَعَجِلُوا وَذَبَحُوا وَنَصَبُوا الْقُدُورَ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِالْقُدُورِ فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ قَسَمَ، فَعَدَلَ عَشَرَةً مِنَ الْغَنَمِ بِبَعِيرٍ، فَنَدَّ منها بعيرٌ، فَطَلَبُوهُ فَأَعْيَاهُمْ، وَكَانَ فِي الْقَوْمِ خَيْلٌ يَسِيرَةٌ، فَأَهْوَى رَجُلٌ مِنْهُمْ بِسَهْمٍ، فَحَبَسَهُ اللهُ، ثُمَّ قَالَ: (**إِنَّ لِهَذِهِ الْبَهَائِمِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَمَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا، فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا**). قَالَ: فَقُلْتُ: إِنَّا نَرْجُو ـ أَوْ نَخَافُ ـ الْعَدُوَّ غَداً، وَلَيْسَتْ مَعَنَا مُدًى، أَفَنَذْبَحُ بِالْقَصَبِ؟ قَالَ: (**مَا أَنْهَرَ الدَّمَ، وَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ؛ فَكُلُوهُ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذلِكَ: أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الحَبَشَةِ**). [خ٢٤٨٨/ م١٩٦٨]

(ق) لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە، وتی: لە "ذي الحُليفة"[1] لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، برسێتی تووشی خەڵکەکە هات، تووشی حوشتر و مەڕ هاتن، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆتایی خەڵکەکەوە بوو، پەلەیان کرد و سەریانبڕی و مەنجەڵیان سوار کرد، پێغەمبەر فەرمانی کرد مەنجەڵەکان قلْپ بکەنەوە، پاشان دابەشی کرد، دە مەڕی بە حوشترێ هاوتا کرد[2]، حوشترێك لێیان هەڵهات بەدوایدا رۆیشتن ماندووی کردن و نەیانگرت، لەناو خەڵکەکە ئەسپی کەم هەبوو، پیاوێك لەوان تیرێکی هەڵدا خودا بەندی کرد[3]، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**ئەم گیاندارانە هەروەك گیانداری کێوی یاخیبوونیان تێدایە، ئەوەی خودا زاڵتان دەکات بەسەریدا بەم جۆرەی لێ بکەن**)، وتی: وتم: ئێمە دەمانەوێ-یان دەترسین- سبەینێ رووبەڕووی دوژمن ببینەوە و چەقۆیەکمان پێ نییە، ئایا بە قامیش سەربڕین؟ فەرمووی: (**ئەوەی خوێن دەڕژێنێ و**

---

[1] شوێنێکە نزیك بە مەدینە، میقاتی ئەهلی مەدینەیە-و.

[2] واتە: پاشان ئەوەی بەدەستیان هێنا بوو لە مەڕ و حوشتر پێغەمبەر لە نێوانیان دابەشی کرد، حوشترێك لە بری دە مەڕ دانرا-و.

[3] واتە: تیرەکەی بەرکەوت-و.

ناوی خودای لەسەر هێنراوە بیخۆن، ددان و نینۆك نە، لەو بارەیەوە قسەتان بۆ دەکەم: ددان بریتییە لە ئێسقان، نینۆك بریتییە لە تیغی حەبەشی[1]).

**٢٦٨٤-** (خ) عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّهُ كَانَتْ لَهُمْ غَنَمٌ تَرْعَى بِسَلْعٍ، فَأَبْصَرَتْ جَارِيَةٌ لَنَا بِشَاةٍ مِنْ غَنَمِنَا مَوْتاً، فَكَسَرَتْ حَجَراً فَذَبَحَتْهَا بِهِ، فَقَالَ لَهُمْ: لاَ تَأْكُلُوا حَتَّى أَسْأَلَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، أَوْ أُرْسِلَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مَنْ يَسْأَلُهُ، وَأَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ ذَاكَ، أَوْ أَرْسَلَ، فَأَمَرَهُ بِأَكْلِهَا. [خ٢٣٠٤]

(خ) لە کەعبی کوڕی مالیکەوە: ئەوان مەڕگەلیان هەبوو لە "سَلْع"[2] دەلەوەڕان، کەنیزەکێکمان کاوڕێك لە رانەمەڕەکەی لە گیانداندا بینی بوو، بەردێکی شکاند بوو و بەوە سەربڕی بوو، کەعب پێی وتن: لێی مەخۆن تا پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکەم یان کەسێك رەوانە دەکرێ بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێ بکات، ئەو پرسیاری دەربارەی ئەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد بوو، یان کەسێکی بۆ لا رەوانە کرد بوو، پێغەمبەر فەرمانی کرد بوو بە خواردنی.

**٢٦٨٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: إِذَا نُحِرَتِ النَّاقَةُ فَذَكَاةُ مَا فِي بَطْنِهَا فِي ذَكَاتِهَا، إِذَا كَانَ قَدْ تَمَّ خَلْقُهُ وَنَبَتَ شَعْرُهُ، فَإِذَا خَرَجَ مِنْ بَطْنِ أُمِّهِ ذُبِحَ، حَتَّى يَخْرُجَ الدَّمُ مِنْ جَوْفِهِ.

* إسناده صحيح. [ط١٠٦١]

لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: گەر حوشتری مێیە سەربڕا سەربڕینی ئەوەی لە سکیدایە بریتییە لە سەربڕینی حوشترەکە، گەر بەچکەکە بەتەواوی دروست بووبوو و تووکی لێهاتبوو، گەر لە سکی دایکی دەرهێنرا سەردەبڕێت تا خوێنەکە لە ناو سکی بێتە دەرەوە.

---

[1] واتە: بە ئێسقان و تیغی حەبەشی سەرمەبڕن-و.

[2] "سلع" چیایەکە لە مەدینە-و.

## ٤- دەروازەی: سەربڕاوی ئەعراب

**٢٦٨٦-** (خ) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ قَوْماً قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ قَوْماً يَأْتُونَنَا بِاللَّحْمِ، لاَ نَدْرِي: أَذُكِرُوا اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ أَمْ لاَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(سَمُّوا اللهَ عَلَيْهِ، وَكُلُوهُ)**. [٢٠٥٧]

**(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): خەڵکانێك وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، خەڵکانێ گۆشتمان بۆ دەهێنن، نازانین ئایا ناوی خودایان لەسەر هێناوە یان نە؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئێوە لەسەری ناوی خودا بهێنن و بیخۆن).**

## ٥- دەروازەی: راو بە سەگ و کەوان

**٢٦٨٧-** (ق) عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قُلْتُ: إِنَّا قَوْمٌ نَصِيدُ بِهذِهِ الْكِلاَبِ؟ فَقَالَ: **(إِذَا أَرْسَلْتَ كِلاَبَكَ الْمُعَلَّمَةَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ، فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَإِنْ قَتَلْنَ؛ إِلاَّ أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا أَمْسَكَهُ عَلَى نَفْسِهِ، وَإِنْ خَالَطَهَا كِلاَبٌ مِنْ غَيْرِهَا، فَلاَ تَأْكُلْ)**. [خ٥٤٨٣ (١٧٥)/ م١٩٢٩]

**(ق) لە عەدی کوڕی حاتەمەوە، وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد و وتم: ئێمە خەڵکانێکین بەم سەگانە راو دەکەین؟ فەرمووی: (گەر سەگە فێرکراوەکەت کردە نێچیر و ناوی خودات لەسەر هێنا ئەوەی بۆ ئێوەیان گرتووە لێی بخۆن با کوژراویش بن، مەگەر سەگەکە لێی خواردبێت، من دەترسم سەگەکە بۆ خۆی گرتبێت، گەر سەگی نافێرکراو پێیان تێکەڵ بوون[١] مەیخۆن).**

**٢٦٨٨-** (ق) عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ! إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ أَهْلِ الْكِتَابِ، أَفَنَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ؟ وَبِأَرْضِ صَيْدٍ، أَصِيدُ بِقَوْسِي وَبِكَلْبِي الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ، وَبِكَلْبِي المعَلَّمِ، فَمَا يَصْلُحُ لِي؟ قَالَ: **(أَمَّا مَا ذَكَرْتَ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ: فَإِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَهَا فَلاَ تَأْكُلُوا فِيهَا، وَإِنْ لَمْ**

---

[١] واتە: گەر سەگەکان هەندێکیان فێرکراو و هەندێکیان فێرنەکراو بوون نێچیرەکە مەخۆن–و.

تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا، وَكُلُوا فِيهَا. وَمَا صِدْتَ بِقَوْسِكَ، فَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ، فَكُلْ. وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ، فَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ، فَكُلْ. وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ غَيْرَ مُعَلَّمٍ، فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ، فَكُلْ).

[خ٥٤٧٨/ م١٩٣٠]

(ق) لە ئەبی سەعلەبەی خوشەنییەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە لە زەوی خەڵکانێکی ئەهلی کیتابین، ئایا لە دەفرەکانیاندا بخۆین؟ هەروەها لە زەوی راوین، بە کەوانەکەم راو دەکەم، هەروەها بە سەگەکەم کە فێرکراو نییە و بە سەگەکەم کە فێرکراوە، کامە بۆ من باش و شیاوە؟ فەرمووی: **(ئەوەی باست کرد لە ئەهلی کیتاب: گەر دەفری ترتان بینیوە لەوانەی ئەواندا مەخۆن، گەر نەتانبینییەوە بیانشۆرن و تیایاندا بخۆن، ئەوەی بە کەوانەکەت راوت کرد و ناوی خودات لەسەر هێنا بیخۆ، ئەوەی بە سەگە فێرکراوەکەت راوت کرد و ناوی خودات لەسەر هێنا بیخۆ، ئەوەی بە سەگە فێرنەکراوەکەت راوت کرد و بە سەربڕینی گەیشتی بیخۆ).**

## ٦- دەروازەی: گەر نێچیرەکە رۆژێك و دوو رۆژ بزر بوو

**٢٦٨٩-** (م) عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ، فَغَابَ عَنْكَ، فَأَدْرَكْتَهُ، فَكُلْهُ، مَا لَمْ يُنْتِنْ). [م١٩٣١]

(م) لە ئەبی سەعلەبەی خوشەینییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر تیرەکەت تەقاند و لێت بزر بوو[1] و ئەوجا بینیتەوە بیخۆ، گەر بۆگەنی نەکردبوو).**

---

[1] واتە: نێچیرەکەت لێ بزر بوو-و.

## ٧- دەروازەی: نەهی لە راو بە "الخَذْف[1]" و البُنْدُقَة[2]"

**٢٦٩٠-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ: أَنَّهُ رَأَى رَجُلاً يَخْذِفُ، فَقَالَ لَهُ: لاَ تَخْذِفْ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنِ الخَذْفِ . أَوْ كَانَ يَكْرَهُ الخَذْفَ . وَقَالَ: (**إِنَّهُ لاَ يُصَادُ بِهِ صَيْدٌ، وَلاَ يُنْكَأُ بِهِ عَدُوٌّ، وَلكِنَّهَا قَدْ تَكْسِرُ السِّنَّ، وَتَفْقَأُ الْعَيْنَ**). ثُمَّ رَآهُ بَعْدَ ذلِكَ يَخْذِفُ، فَقَالَ لَهُ: أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ نَهَى عَنِ الخَذْفِ . أَوْ كَرِهَ الخَذْفَ . وَأَنْتَ تَخْذِفُ؟! لاَ أُكَلِّمُكَ كَذَا وَكَذَا. [خ٥٤٧٩ (٤٨٤١)/ م١٩٥٤]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی موغفەلەوە: ئەو پیاوێکی بینی "یخذف-بە پلی دەست چەوی هەڵدەدا"، پێی وت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهیکردووە لە "الخذف-چەو هەڵدان"-یان ئەو "الخذف"ی لا ناپەسەند بوو- و فەرمووی: (ئەوە نێچیری پێ راو ناکرێت و دوژمنی پێ شکست ناهێنرێ، و چاو کوێر دەکات)، پاش ئەوە پیاوەکەی بینییەوە بە پلی دەست چەوی هەڵدەدا، پێی وت: من لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) باست بۆ دەکەم نەهی لە "حذف-چەوڵدان" کردووە-یان "حذف"ی لا ناپەسەند بوو- کەچی تۆ "حذف" دەکەی؟! ئەوەندە و ئەوەندە قسەت لەگەڵ ناکەم.**

## ٨- دەروازەی: حەرام کردنی هەموو کەڵبەدارێك لە دڕندە

**٢٦٩١-** (ق) عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ. [خ٥٥٣٠ (٥٥٢٧)/ م١٩٣٢]

**(ق) لە ئەبی سەعلەبەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە خواردنی هەموو کەڵبەدارێك لە دڕندە.**

---

[1] "خذف" بریتییە لە هەڵدانی چەو و زیخ بە پلی دەست، بە پەنجەی شایەتمان و پەنجە گەورە هەڵدەدرێت-و.

[2] "البندقة" ئامرازێکی راوکردن بووە-و.

**٢٦٩٢**- (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ. [م١٩٣٤]

**(م) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە هەموو کەڵبەدارێك لە دڕندە، هەروەها هەموو چڕنووکدارێك لە باڵندە.**

## ٩- دەروازەی: حەرامکردنی گوێدرێژی ماڵی

**٢٦٩٣**- (ق) عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ قَالَ: حَرَّمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لُحُومَ الحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ. [خ٥٥٢٧/ م١٩٣٦]

**(ق) لە ئەبی سەعلەبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەرام کرد.**

## ١٠- دەروازەی: موباح کردنی بزنمژە و کەروێشك

**٢٦٩٤**- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَهْدَتْ أُمُّ حُفَيْدٍ . خَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ . إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَقِطاً وَسَمْناً وَأَضُبّاً، فَأَكَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مِنَ الأَقِطِ وَالسَّمْنِ، وَتَرَكَ الضَّبَّ تَقَذُّراً. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَلَوْ كَانَ حَرَاماً مَا أُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٢٥٧٥/ م١٩٤٧]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ئوم حوفەید-پووری ئیبن عەباس لە دایکییەوە- کەشك و ڕۆن و بزنمژەی هەدیەی پێغەمبەر(ﷺ) کرد، پێغەمبەر(ﷺ) لە کەشك و ڕۆنەکەی خوارد، بزنمژەکەی وەك بێزلێکردنەوە[1] وازلێهێنا.**

**ئیبن عەباس وتی: لەسەر خوانەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بزنمژەکە خورا، گەر حەرام بوایە لەسەر خوانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەدەخورا.**

---

[1] واتە: بە سروشت حەزی لێی نەبوو، نەك بە هۆی حەرامییەوە-و.

**٢٦٩٥**– (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**الضَّبُّ لَسْتُ آكُلُهُ، وَلاَ أُحَرِّمُهُ**). [خ٥٥٣٦/ م١٩٤٣]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**بزنمژە، نە دەیخۆم و نە حەرامی دەکەم**).

**٢٦٩٦**– (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فِيهِمْ سَعْدٌ، فَذَهَبُوا يَأْكُلُونَ مِنْ لَحْمٍ، فَنَادَتْهُمُ امْرَأَةٌ مِنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: إِنَّهُ لَحْمُ ضَبٍّ، فَأَمْسَكُوا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**كُلُوا، أَوِ اطْعَمُوا، فَإِنَّهُ حَلاَلٌ. أَوْ قَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ، شَكَّ فِيهِ. وَلكِنَّهُ لَيْسَ مِنْ طَعَامِي**). [خ٧٢٦٧/ م١٩٤٤]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: خەڵكانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، لەناویاندا سەعد رۆیشتن لە گۆشتێ بخۆن، ئافرەتێك لە ژنەكانی پێغەمبەر(ﷺ) بانگی لێكردن ئەوە گۆشتی بزنمژەیە، ئەوانیش خۆیان لێگرتەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**بخۆن، یان بیكەنە خۆراك، چونكە ئەوە حەڵاڵە– یان فەرمووی: "خراپییەكی تێدا نییە"**، تیایدا شكی هەبوو[1]– **بەڵام ئەوە لە خۆراكی من نییە**).

**٢٦٩٧**– عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَفْوَانَ، أَوْ صَفْوَانَ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: اصَّدْتُ أَرْنَبَيْنِ فَذَبَحْتُهُمَا بِمَرْوَةٍ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْهُمَا، فَأَمَرَنِي بِأَكْلِهِمَا.

* صحيح. [د٢٨٢٢/ ن٤٣٢٤/ ٤٤١١/ جه٣١٧٥/ مي٢٠٥٧]

لە محەمەدی كوڕی صەفەوانەوە، یان صەفوانی كوڕی محەمەدەوە، وتی: دوو كەروێشكم راوكرد بە بەردی سپی سەرمبڕین، دەربارەیان پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) كرد فەرمانی پێكردم بە خواردنیان.

---

[1] واتە: راوی فەرموودەكە تیایدا شكی هەبوو–و.

## ١١- دەروازەی: موباح کردنی خواردنی کوللە و مریشك

**٢٦٩٨-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى رضي الله عنهما قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم سَبْعَ غَزَوَاتٍ أَوْ سِتًّا، كُنَّا نَأْكُلُ مَعَهُ الجَرَادَ. [خ٥٤٩٥/ م١٩٥٢]

**(ق) لە عەبدولڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) حەوت یان شەش غەزامان کرد، لەگەڵ ئەو کوللەمان دەخوارد.**

**٢٦٩٩-** (خ) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النبيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَأْكُلُ دَجَاجاً. [خ٥٥١٧]

**(خ) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی مریشکی دەخوارد.**

## ١٢- دەروازەی: موباح کردنی گۆشتی ئەسپ

**٢٧٠٠-** (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قَالَتْ: نَحَرْنَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَرَساً، فَأَكَلْنَاهُ. [خ٥٥١٠/ م١٩٤٢]

**(ق) لە ئەسمای کچی ئەبی بەکرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپێکمان سەربڕی و خواردمان.**

- وفي رواية للبخاري: وَنَحْنُ بِالْمَدِينَةِ. [خ٥٥١١]

**لە ریوایەتێکی بوخاریدا: ئێمە لە مەدینە بووین.**

**٢٧٠١-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا نَأْكُلُ لُحُومَ الْخَيْلِ، قُلْتُ: فَالْبِغَالُ؟ قَالَ: لاَ. [جه٣١٩٧]

* صحيح الإسناد.

**لە عەتای کوڕی ئەبی رەباحەوە، لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: کاتی خۆی گۆشتی ئەسپمان دەخوارد، وتم: ئەی ئێستر؟ وتی: نەخێر.**

## ١٣- دەروازەی: نەهی کردن لە بەند کردنی گیانداران تا مردن

٢٧٠٢- (ق) عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَنَسٍ عَلَى الحَكَمِ بْنِ أَيُّوبَ، فَرَأَى غِلْمَاناً، أَوْ فِتْيَاناً، نَصَبُوا دَجَاجَةً يَرْمُونَهَا، فَقَالَ أَنَسٌ: نَهَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ تُصْبَرَ الْبَهَائِمُ. [خ٥٥١٣/ م١٩٥٦]

**(ق) لە هیشامی کوڕی زەیدەوە، وتی: لەگەڵ ئەنەس چووینە ژوورەوە بۆ لای حەکەمی کوڕی ئەیوب، چەند غوڵامێك یان گەنجێکی بینی مریشکێکیان کردبووە نیشانە و تیریان تێ دەتەقاند، ئەنەس وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد گیانداران بەند بکرێن تا مردن.**

٢٧٠٣- (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ، فَمَرُّوا بِفِتْيَةٍ، أَوْ بِنَفَرٍ، نَصَبُوا دَجَاجَةً يَرْمُونَهَا، فَلَمَّا رَأَوْا ابْنَ عُمَرَ تَفَرَّقُوا عَنْهَا، وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ إِنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَعَنَ مَنْ فَعَلَ هَذَا. [خ٥٥١٥/ م١٩٥٨]

**(ق) لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: لای ئیبن عومەر بووم، بە پاڵ چەند گەنجێك یان چەند کەسێکدا گوزەریان کرد مریشکێکیان کردبووە نیشانە و تیریان تێ دەگرت، کاتێ ئیبن عومەریان بینی بڵاوەیان لێکرد، ئیبن عومەر وتی: کێ ئەمەی کردووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) نەفرەتی کردووە لەو کەسەی ئەمەی کردووە.**

٢٧٠٤- (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تَتَّخِذُوا شَيْئاً فِيهِ الرُّوحُ غَرَضاً)**. [م١٩٥٧]

**(م) لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (شتێك رۆحی تێدا بێت مەکەنە نیشانە[1]).**

---

[1] بۆئەوەی تیری تێتەقێنن-و.

## ١٤- دەروازەی: نێچیری دەریا

**٢٧٠٥**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَتَوضَّأُ بِمَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقالَ رسولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**هُوَ الْبَحْرُ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ**).

* صحيح. [د٨٣/ ت٦٩/ جه٣٨٦، ٣٢٤٦]

**لە ئەبی هورەیرەوە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) كرد: ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بگرین؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە دەریایە، ئاوەكەی پاكە[1] و مردارەوەبووی حەڵاڵە).**

**٢٧٠٦**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أُحِلَّتْ لَكُمْ مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ، فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ: فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ، وَأَمَّا الدَّمَانِ: فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ**).

* صحيح. [جه٣٢١٨، ٣٣١٤]

**لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دوو مردارەوەبوو و دوو خوێنتان بۆ حەڵاڵە، دوو مردارەوەبووەكە: ماسی و كولە، دوو خوێنەكەش: جگەر و سپڵ).**

## ١٥- دەروازەی: كەوڵكردن[2]

**٢٧٠٧**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَرَّ بِغُلاَمٍ يَسْلُخُ شَاةً، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**تَنَحَّ حَتَّى أُرِيَكَ**)، فَأَدْخَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه

---

[1] ئاوی دەریا پاكە بەركەوتنی مرۆڤ و جلوبەرگ پیس ناكات و پاككەرەوەشە لە لەشپیسی و بێدەستنوێژی-و.

[2] كەوڵ: ئەوەیە پێستی حەیوانەكە هەڵنەدڕی، هەوڵبدەی بە دەست پێستەكە لە گۆشتەكە جیابكەیەوە و لە ملەوە حەیوانەكە دەربهێنی و پێستەكە بە ساغی بمێنێتەوە بۆ مەشكە و كوندە لەدوای پاككردن و خۆشكردن-و.

وسلّم يَدَهُ بَيْنَ الْجِلْدِ وَاللَّحْمِ، فَدَحَسَ بِهَا حَتَّى تَوَارَتْ إِلَى الْإِبِطِ، وَقَالَ: (**يَا غُلَامُ، هَكَذَا فَاسْلُخْ**)، ثُمَّ مَضَى، وَصَلَّى لِلنَّاسِ، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. [د١٨٥/ جه٣١٧٩]

قَالَ أَبُو دَاوُد: زَادَ عَمْرٌو فِي حَدِيثِهِ: «يَعْنِي: لَمْ يَمَسَّ مَاءً».

* صحيح.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پاڵ غوڵامێکدا تێپەڕی کاوڕێکی کەوڵ دەکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: (کەناریگرە تا پێت نیشان بدەم)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی بردە ناو پێست و گۆشتەکە، رایماڵی تا لە بندەستیدا بزر بوو و فەرمووی: (ئەی غوڵام بەم جۆرە کەوڵی بکە)، پاشان رۆیشت و نوێژی بۆ خەڵك کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە.**

**ئەبو داود وتی: عەمر لە فەرموودەکەی ئەمەی زیاد کردووە: ((واتە: دەستی نەشۆری)).**

## ١٦- دەروازەی: نەهی کردن لە سەربڕینی شیردەر

**٢٧٠٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَتَى رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ، فَأَخَذَ الشَّفْرَةَ لِيَذْبَحَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِيَّاكَ وَالْحَلُوبَ**). [جه٣١٨٠]

* صحيح. وأخرجه مسلم في حديث طويل (٢٠٣٨).

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لای پیاوێك لە ئەنصار، چەقۆی هەڵگرت تا بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) حەیوانێ سەربڕێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: (ئاگادارت دەکەمەوە لە شیردەر).**

## ١٧- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی بۆق هاتووە

**٢٧٠٩**- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ: أَنَّ طَبِيباً سَأَلَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ ضِفْدَعٍ يَجْعَلُهَا فِي دَوَاءٍ، فَنَهَاهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ قَتْلِهَا. [د٣٨٧١/ ن٤٣٦٦/ مي٢٠٤١]

* صحيح.

**لە عبدالرحمانی کوڕی عوسمانەوە: پزیشکێك پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد دەربارەی بۆق دەیکاتە ناو دەواوە، پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لێکرد لە کوشتنی.**

## ١٨- دەروازەی: سەربڕینی کۆرپەلە

**٢٧١٠**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**ذَكَاةُ الْجَنِينِ ذَكَاةُ أُمِّهِ**). [د٢٨٢٨/ مي٢٠٢٢]

* صحيح.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: (سەربڕینی کۆرپەلە سەربڕینی دایکەکەیەتی).**

## ١٩- دەروازەی: ئەوەی لە زیندوو دەبڕێت مردووە

**٢٧١١**- عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم الْمَدِينَةَ وَهُمْ يَجُبُّونَ أَسْنِمَةَ الْإِبِلِ، وَيَقْطَعُونَ أَلْيَاتِ الْغَنَمِ، قَالَ: (**مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ، فَهِيَ مَيْتَةٌ**).

* صحيح. [د٢٨٥٨/ ت١٤٨٠/ مي٢٠٦١]

**لە ئەبی واقیدی لەیسییەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ مەدینە، ئەوان سینامی حوشتر و گونی بەرانیان حەز لێ دەکرد، فەرمووی: (ئەوەی لە گیاندار دەبڕێت و گیاندارەکە زیندوو بێت، بڕاوەکە مردارەوەبووە).**

**٢٧١٢**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ، فَمَا قُطِعَ مِنْهَا فَهُوَ مَيْتَةٌ**). [جه٣٢١٦]

* صحيح.

**له ئیبن عومەرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی لە گیانداران دەبڕرێت و گیاندارەکە زیندوو بێت، ئەوەی لێیبڕراوە مردارەوەبووە).**

# بەشی سێیەم

## قوربانی

### ١- دەروازەی: سوننەتی قوربانی و کاتەکەی

**٢٧١٣-** (ق) عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّي، ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، مَنْ فَعَلَهُ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلُ، فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لِأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ)**. فَقَامَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ، وَقَدْ ذَبَحَ، فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي جَذَعَةً، فَقَالَ: (اذْبَحْهَا، وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ). [خ٥٥٤٥ (٩٥١)/ م١٩٦١]

(ق) لە بەرائەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(یەکەمین شتێك لەم رۆژەماندا دەستی پێ دەکەین ئەوەیە نوێژ بکەین، پاشان بگەڕێینەوە و قوربانییەکان سەربڕین، هەر کەس ئەوەی کرد سوننەتی ئێمەی پێکاوە، هەر کەس پێشتر سەربڕێت[1] گۆشتێکە پێشکەشی خانەوادەکەی کردووە و لە شتێکدا لە نوسك نییە[2])**، ئەبو بوردەی کوڕی نیار هەستا، ئەو سەریبڕی بوو، و وتی: گیسکێکم[3] هەیە، فەرمووی: **(سەریببڕە، لەدوای تۆ بۆ کەسی تر شیاو نییە)**.

### ٢- دەروازەی: سوننەتی قوربانی

**٢٧١٤-** (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَذْبَحُوا إِلاَّ مُسِنَّةً ؛ إِلاَّ أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ، فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ)**. [م١٩٦٣]

---

(١) واتە: پێش نوێژی جەژن-و.

(٢) واتە: لە قوربانی نییە و بۆی نابێتە قوربانی-و.

(٣) واتە: گیسك بۆ حەیوانی رەش وەك کاوڕ وایە بۆ حەیوانی سپی، ساڵێك تەمەنی تەواو کردووە و پێیناوە لە دوو ساڵ-و.

(م) لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(تەنها دووساڵ[1] سەربیبڕن، مەگەر لەسەرتان گران بێت[2]، ئەوکات کاوڕێك[3] لە حەیوانی سپی سەربیبڕن).**

**٢٧١٥–** عَنْ عَاصِمِ بْنِ كُلَيْبِ بنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يُقَالُ لَهُ: مُجَاشِعٌ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ، فَعَزَّتِ الْغَنَمُ، فَأَمَرَ مُنَادِياً فَنَادَى: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَقُولُ: **(إِنَّ الْجَذَعَ يُوَفِّي مِمَّا يُوَفِّي مِنْهُ الثَّنِيُّ).**

[د٢٧٩٩/ ن٤٣٩٥/ جه٣١٤٠]

**لە عاصیمی کوڕی کولەیبی کوڕی شیهابەوە، لە باوکییەوە، وتی: لەگەڵ پیاوێك بووین لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەوترا: موجاشیع لە بەنی سولەیم، مەڕ دەگمەن بوو، فەرمانی کرد بانگکەرێك بانگ رابدێرێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: (کاوڕ(گیسك) جێگەی ئەوە دەگرێتەوە دووساڵ[4] جێگەی دەگرێتەوە).**

## ٣- دەروازەی: قوربانی پێغەمبەر" صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٧١٦–** (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: ضَحَّى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ، وَسَمَّى وَكَبَّرَ، وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا. [خ٥٥٦٥ (٥٥٥٣)/ م١٩٦٦]

---

[1] واتە: حەیوانەکە–مەڕ بێت یان بزن یان حوشتر– دوو ساڵ تەمەنی تەواو کردبێت–و.

[2] واتە: هەژار و کەمدەست بێت–و.

[3] واتە: کاوڕ: یەك ساڵی تەواو کردووە و پێیناوە لە دوو ساڵ–و.

[4] قۆناغەکانی گەورەبوونی حەیوانی سپی بەم جۆرەیە: بەرخ، کاوڕ، شەك، مەڕ یان بەران، قۆناغەکانی گەورەبوونی حەیوانی رەش بەم جۆرەیە، کار، گیسك، شتیر، بزن یان خرت(سابرێنگ)، کاوڕ و گیسك تەمەنیان یەك ساڵە، ئەوانی تر پێیان ناوە لە دوو ساڵ و زیاتر لە دوو ساڵ، واتە: کاوڕ یان گیسك کە تەمەنیان یەك ساڵی تەواو کردووە جێگەی شەك و مەڕ و بەران، و شتیر و خرت " سابرێنگ" و بزن دەگرێتەوە، –و.

(ق) لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە دوو بەرانی سپی شاخدار قوربانی کرد، بە دەستی خۆی سەریبڕین، ناوی خودای هێنا و "الله أكبر"ی کرد، لەسەر لا ملیان پێی دانابوو.

**٢٧١٧**- (م) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَمَرَ بِكَبْشٍ أَقْرَنَ، يَطَأُ فِي سَوَادٍ، وَيَبْرُكُ فِي سَوَادٍ، وَيَنْظُرُ فِي سَوَادٍ، فَأُتِيَ بِهِ لِيُضَحِّيَ بِهِ. فَقَالَ لَهَا: (**يَا عَائِشَةُ هَلُمِّي الْمُدْيَةَ**). ثُمَّ قَالَ: (**اشْحَذِيهَا بِحَجَرٍ**)، فَفَعَلَتْ، ثُمَّ أَخَذَهَا، وَأَخَذَ الْكَبْشَ فَأَضْجَعَهُ، ثُمَّ ذَبَحَهُ، ثُمَّ قَالَ: (**بِاسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنْ مُحَمَّدٍ وآلِ مُحَمَّدٍ، وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ**)، ثُمَّ ضَحَّى بِهِ. [م١٩٦٧]

(م) لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی کرد بەرانێکی شاخدار لاقەکان و سك و چاوی رەش بن، دەستەکانی رەش بن و بۆ رەش بڕوانن، بۆی هێنرا تا بیکات بە قوربانی، بە عائیشەی فەرموو: (**ئەی عائیشە خێرا چەقۆ بێنە**)، پاشان فەرمووی: (**بە بەردێك تیژی بکە**)، منیش ئەوەم کرد و چەقۆکەی گرت و بەرانەکەی گرت و رایکێشا و پاشان سەریبڕی، پاشان فەرمووی: (**بسم الله، خودایە، لە محەمەد و لە ئالی محەمەد و لە ئومەتی محەمەدی قبووڵ بکە**)، پاشان کردییە قوربانی[1].

**٢٧١٨**- عَنْ جَابِرٍ قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْأَضْحَى بِالْمُصَلَّى، فَلَمَّا قَضَى خُطْبَتَهُ نَزَلَ مِنْ مِنْبَرِهِ، وَأُتِيَ بِكَبْشٍ فَذَبَحَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِيَدِهِ، وَقَالَ: (**بِاسْمِ اللهِ، وَاللهُ أَكْبَرُ، هَذَا عَنِّي وَعَمَّنْ لَمْ يُضَحِّ مِنْ أُمَّتِي**). [د٢٨١٠/ ت١٥٢١]

* صحيح.

لە جابرەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژگە[2] ئامادەی نوێژی قوربان بووم، کاتێ وتارەکەی تەواو کرد لە مینبەرەکەی دابەزی و بەرانێکی بۆ هێنرا

---

[1] واتە: گۆشتەکەی دابەش کرد-و.

[2] نوێژگە(مصلی) شوێن و جێگەیەك بووە لە دەرەوەی مەدینە خەڵکی هاتوونەتە دەرەوە و نوێژی جەژنەکانیان تێدا ئەنجامداوە و پاشان هەر لەوێ قوربانییەکانیان سەربڕیوە-و.

و پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە دەستی خۆی سەربڕی و فەرمووی: **(بسم الله والله أكبر، ئەمە لە منەوە و لە هەر کەسەوە لە ئومەتەکەم قوربانی نەکردووە).**

## ٤- دەروازەی: سەربڕینی قوربانی لە نوێژگە[1]

**٢٧١٩-** (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَذْبَحُ وَيَنْحَرُ بِالمصَلَّى. [خ٥٥٥٢ (٩٨٢)]

(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژگە سەریدەبڕی و قوربانی دەکرد.

## ٥- دەروازەی: مۆڵەتدان بە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی

**٢٧٢٠-** (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ ضَحَّى مِنْكُمْ، فَلاَ يُصْبِحَنَّ بَعْدَ ثَالِثَةٍ وَبَقِيَ فِي بَيْتِهِ مِنْهُ شَيْءٌ)**، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ المقْبِلُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، نَفْعَلُ كَمَا فَعَلْنَا عَامَ الماضِي؟ قَالَ: **(كُلُوا، وَأَطْعِمُوا، وَادَّخِرُوا؛ فَإِنَّ ذلِكَ الْعَامَ كَانَ بِالنَّاسِ جَهْدٌ، فَأَرَدْتُ أَنْ تُعِينُوا فِيهَا)**. [خ٥٥٦٩/ م١٩٧٤]

(ق) لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە ئێوە قوربانی کرد لەدوای سێ رۆژ نابێ لە ماڵەکەی هیچی لێ مابێتەوە)**، کە ساڵی داهاتوو هاتە بەرەوە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا ئەوە بکەین ساڵی رابردوو کردمان؟ فەرمووی: **(بخۆن و بیکەنە خۆراك و لێی هەڵبگرن، ئەو ساڵە گرانی تووشی خەڵك هاتبوو، ویستم تیایدا کۆمەککار بن[2])**.

---

[1] نوێژگە(مصلی) شوێن و جێگەیەك بووە لە دەرەوەی مەدینە خەڵکی هاتوونەتە دەرەوە و نوێژی جەژنەکانیان تێدا ئەنجامداوە و پاشان هەر لەوێ قوربانییەکانیان سەربڕیوە–و.

[2] واتە: ویستم بە هەژاران ببەخشن و لای خۆتان هەڵینەگرن–و.

**٢٧٢١**- (م) عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: ذَبَحَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ضَحِيَّتَهُ، ثُمَّ قَالَ: (**يَا ثَوْبَانُ، أَصْلِحْ لَحْمَ هَذِهِ**)، فَلَمْ أَزَلْ أُطْعِمُهُ مِنْهَا حَتَّى قَدِمَ الْمَدِينَةَ. [م١٩٧٥]

**(م) لە سەوبانەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) قوربانییەکەی خۆی سەربڕی و پاشان فەرمووی: (ئەی سەوبان، ئەم گۆشتە چاك بکە[1])، بەردەوام لەو گۆشتەم دەرخوارد دەدا تا هاتەوە بۆ مەدینە.**

- وفي رواية: فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ.

**لە ریوایەتێکدا: لە حەجیماڵئاوایی.**

## ٦- دەروازەی: کەسی قوربانیکەر موو و نینۆکی نابات

**٢٧٢٢**- (م) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا رَأَيْتُمْ هِلاَلَ ذِي الْحِجَّةِ، وَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يُضَحِّيَ؛ فَلْيُمْسِكْ عَنْ شَعْرِهِ وَأَظْفَارِهِ**). [م١٩٧٧]

**(م) لە ئوم سەلەمەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (گەر مانگی یەکشەوەی زیلحەجەتان بینی و یەکێك لە ئێوە ویستی قوربانی بکات با خۆی بگرێتەوە لە موو و نینۆکی[2]).**

## ٧- دەروازەی: فەزڵی قوربانی

**٢٧٢٣**- عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَا عَمِلَ آدَمِيٌّ مِنْ عَمَلٍ يَوْمَ النَّحْرِ أَحَبَّ إِلَى اللهِ مِنْ إِهْرَاقِ الدَّمِ، إِنَّهَا لَتَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِقُرُونِهَا وَأَشْعَارِهَا وَأَظْلاَفِهَا، وَإِنَّ الدَّمَ لَيَقَعُ مِنَ اللهِ بِمَكَانٍ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ مِنَ الأَرْضِ، فَطِيبُوا بِهَا نَفْساً**). [ت١٤٩٣/ جه٣١٢٦]

* ضعيف

---

[1] واتە: ئامادەی بکە بۆ خواردن بە لێنان و برژان و ڕێگەکانی تر-و.

[2] واتە: موو و نینۆکی ئەو حەیوانەی بڕیاری قوربانی کردنی لێدراوە-و.

**لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئادەمیزاد ڕۆژی جەژنی قوربان کارێکی ئەنجام نەداوە چاکتر و باشتر لە ڕشتنی خوێن[1]، لە ڕۆژی قیامەت بە شاخ و موو و سمییەوە دێت، خوێن لای خودا شوێنێك دەگرێت بەرلەوەی بەربێتەوە بۆ زەوی[2]، بۆیە نەفستان پێی خۆش بێت).**

## ٨- دەروازەی: مەڕێك(بزنێك) بەسە بۆ خانەوادەیەك

**٢٧٢٤-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيَّ: كَيْفَ كَانَتِ الضَّحَايَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَقَالَ: كَانَ الرَّجُلُ يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْهُ وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ، حَتَّى تَبَاهَى النَّاسُ فَصَارَتْ كَمَا تَرَى. [ت١٥٠٥/ جه٣١٤٧]

* صحيح.

**لە عەتای کوڕی یەسارەوە، وتی: پرسیارم لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری کرد: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) قوربانی چۆن بوو؟ وتی: پیاوێك لە خۆی و لە خانەوادەکەیەوە مەڕێکی سەردەبڕی و لێیان دەخوارد و دەرخواردیان دەدا، تا خەڵکی کەوتنە شانازی کردن و بەم جۆرەی لێهات دەبینی[3].**

## ٩- دەروازەی: قوربانی لە مردووەوە

**٢٧٢٥-** عَنْ عَاصِمِ بْنِ شُرَيْبٍ قَالَ: أُتِيَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ بِكَبْشٍ فَذَبَحَهُ، وَقَالَ: بِسْمِ الله، اللَّهُمَّ مِنْكَ وَلَكَ، وَمِنْ مُحَمَّدٍ لَكَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَتُصُدِّقَ بِهِ. ثُمَّ أُتِيَ بِكَبْشٍ آخَرَ

---

(١) واتە: سەربڕینی حەیوان-و.

(٢) واتە: تەقوا و نیێتی کەسەکە بە خودا دەگات بەرلەوەی خوێنی حەیوانەکە بڕژێتە سەر زەوی-و.

(٣) واتە: خەڵکی بە هۆی هەرزانی و گوزەرانی باشەوە-لەو ڕۆژگارەی دوای پێغەمبەر- بۆ خۆی و خانەوادەکەی زیاتر لە قوربانییەك دەکات-و.

فَذَبَحَهُ، فَقَالَ: بِسْمِ اللهِ اللَّهُمَّ مِنْكَ، وَلَكَ، وَمِنْ عَلِيٍّ لَكَ. قَالَ ثُمَّ قَالَ: ائْتِنِي بِطَابِقٍ مِنْهُ، وَتَصَدَّقْ بِسَائِرِهِ. [هق٩/٢٨٧]

**لە عاصیمی کوڕی شورەیبەوە، وتی: لە ڕۆژی قوربان بەرانێك هێنرا بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالب(خوا لێی ڕازی بێت) و سەربڕی و وتی: "بسم الله"، خودایە لە تۆوە و بۆ تۆ، و لە محەمەدەوە بۆ تۆ، پاشان فەرمانکرا کرا بە صەدەقە، پاشان بەرانێکی تری بۆ هێنرا و سەربڕی و وتی: "بسم الله"، خودایە لە تۆوە و بۆ تۆ، و لە عەلییەوە بۆ تۆ، وتی: پاشان وتی: پەلێکیم بۆ بهێنن و ئەویتری بکەن بە صەدەقە.**

## ١٠- دەروازەی: هاوبەشبوون لە قوربانی

**٢٧٢٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَ الْأَضْحَى، فَاشْتَرَكْنَا فِي الْبَقَرَةِ سَبْعَةً، وَفِي الْبَعِيرِ عَشَرَةً.

* صحيح. [ت٩٠٥، ١٥٠١/ ن٤٤٠٤/ جه٣١٣١]

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: لە سەفەرێك لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، قوربان هاتە بەرەوە، حەوت کەس لە مانگایەکدا بەشداریمان کرد و لە حوشترێکدا دە کەس.**

## ١١- دەروازەی: ئەوەی لە قوربانی ناپەسەندە و شیاو نییە

**٢٧٢٧-** عَنْ عُبَيْدِ بْنِ فَيْرُوزَ قَالَ: سَأَلْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ: مَا لاَ يَجُوزُ فِي الْأَضَاحِيِّ؟ فَقَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ـ وَأَصَابِعِي أَقْصَرُ مِنْ أَصَابِعِهِ، وَأَنَامِلِي أَقْصَرُ مِنْ أَنَامِلِهِ ـ فَقَالَ: **(أَرْبَعٌ لاَ تَجُوزُ فِي الْأَضَاحِيِّ: الْعَوْرَاءُ بَيِّنٌ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيضَةُ بَيِّنٌ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ بَيِّنٌ ظَلَعُهَا، وَالْكَسِيرُ الَّتِي لاَ تُنْقِي)**. قال قُلْتُ: فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَكُونَ فِي السِّنِّ نَقْصٌ، قَالَ: مَا كَرِهْتَ فَدَعْهُ، وَلاَ تُحَرِّمْهُ عَلَى أَحَدٍ.

* صحيح. [د٢٨٠٢/ ت١٤٩٧/ ن٤٣٨١/ جه٣١٤٤/ مي١٩٩٢]

لە عوبەیدی کوڕی فەیروزەوە، وتی: پرسیارم کرد لە بەرائی کوڕی عازیب: ئەوەی شیاو نییە لە قوربانی؟ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ناوماندا هەستایە سەرپێ- پەنجەکانم لە پەنجەکانی کورتتر بوون و سەرە پەنجەکانم لە سەرە پەنجەکانی کورتتر بوون[1]- فەرمووی: **(چوارشت لە قوربانی دروست نین: کوێر کوێرییەکەی ئاشکرا بێت، نەخۆش و نەخۆشییەکەی ئاشکرا بێت، شەل و شەلییەکەی ڕۆشن بێت، شکستەدارێك لەبەر لاوازییەکەی مۆخی نەبێت)**، وتی: وتم: من لام ناپەسەندە لە ددانیدا ناتەواوی هەبێت، وتی: ئەوەی لات ناپەسەندە وازیلێبهێنە و لە کەسێکی حەرام مەکە.

**٢٧٢٨**- عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ نَسْتَشْرِفَ الْعَيْنَ وَالْأُذُنَ.

* حسن صحيح. [ت١٥٠٣/ ن٤٣٨٨/ جه٣١٤٣/ مي١٩٩٤]

لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردین چاو و گوێ بپشکنین.

## ١٢- دەروازەی: کەسێك قوربانییەکەی بکرێت و دواتر قوربانییەکە تووشبێت

**٢٧٢٩**- عَنْ أَبِي حَصِينٍ: أَنَّ ابْنَ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما رَأَى هَدَايَا لَهُ فِيهَا نَاقَةٌ عَوْرَاءُ فَقَالَ: إِنْ كَانَ أَصَابَهَا بَعْدَما اشْتَرَيْتُمُوهَا فَأَمْضُوهَا، وَإِنْ كَانَ أَصَابَهَا قَبْلَ أَنْ تَشْتَرُوهَا فَأَبْدِلُوهَا.

[هق٥/٢٤٢، ٩/٢٨٩]

لە ئەبی حەصینەوە: ئیبن زوبەیر لەناو کۆمەڵێك هەدی خۆی حوشترێکی مێیەی کوێری بینی، وتی: گەر لەدوای ئەوەی کڕیتان تووشی هاتووە تێیپەڕێنن، گەر بەر لەوەی بیکڕن تووشی هاتووە ئاڵوگۆڕی بکەن[2].

---

[1] دەگونجێ بۆ دەربڕینی ئەدەب ئەمەی وتبێت-و.

[2] واتە: بە حوشترێکی تر ئاڵوگۆڕی بکەن-و.

## ١٣- دەروازەی: وەکیلگرتن لە سەربڕینی قوربانی

**٢٧٣٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَحَرَ بَعْضَ بُدْنِهِ بِيَدِهِ، وَنَحَرَ بَعْضَهَا غَيْرُهُ. [ن٤٤٣١]

* صحيح.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەندێ حوشتری دابەستەی بە دەستی خۆی سەربڕی، هەندێکی تریان کەسانی تر سەریانبڕین.**

## بەشی چوارەم

## خواردنەوە و ئادابی خواردنەوە

### ١- دەروازەی: گوناهی ئەو کەسانەی ئاوی زیادە نابەخشن

**٢٧٣١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ ماءٍ بِالطَّرِيقِ يَمْنَعُ مِنْهُ ابْنَ السَّبِيلِ. وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَاماً لاَ يُبَايِعُهُ إِلاَّ لِدُنْيَاهُ، إِنْ أَعْطَاهُ مَا يُرِيدُ وَفَى لَهُ؛ وَإِلاَّ لَمْ يَفِ لَهُ. وَرَجُلٌ بَايَعَ رَجُلاً بِسِلْعَةٍ بَعْدَ العَصْرِ، فَحَلَفَ بِاللهِ لَقَدْ أُعْطِيَ بِهَا كَذَا وَكَذَا فَصَدَّقَهُ، فَأَخَذَهَا، وَلَمْ يُعْطَ بِهَا**).

[خ٢٣٥٨ (٢٣٥٨)/ م١٠٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سیان لە رۆژی قیامەت خودا قسەیان لەگەڵ ناکات و پاکیان ناکاتەوە و سزای بەئێشیان بۆ هەیە: پیاوێك لە رێگە ئاوی زیادەی لایە و لە موسافیری دەگرێتەوە، پیاوێك بەیعەت بە ئیمامێك دەکات و تەنها بۆ دنیا بەیعەتی پێ دەکات، گەر ئەوەی ویستی پێیبدات وەفادار دەبێت بۆی، ئەگینا وەفادار نابێت بۆی، پیاوێك شمەکێك لەدوای عەصر بە پیاوێکی تر دەفرۆشێت و سوێند دەخوات بە خودا ئەوەندە و ئەوەندەی پێدراوە، ئەویش باوەڕی پێ دەکات و دەیکرێت، ئەوەندەشی پێ نەدراوە)**.

### ٢- دەروازەی: نەهی کردن لە خواردنەوە بە پێوە

**٢٧٣٢-** (م) عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ نَهَى أَنْ يَشْرَبَ الرَّجُلُ قَائِماً. قَالَ قَتَادَةُ: فَقُلْنَا: فَالأَكْلُ؟ فَقَالَ: ذَاكَ أَشَرُّ أَوْ أَخْبَثُ. [م٢٠٢٤]

(م) لە قەتادەوە، لە ئەنەسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): ئەو نەهی کرد لەوەی پیاو بە پێوە بخواتەوە، قەتادە وتی: وتمان: ئەی خواردن؟ وتی: ئەوە خراپترە یان پیسترە.

**٢٧٣٣-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ يَشْرَبَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَائِماً، فَمَنْ نَسِيَ؛ فَلْيَسْتَقِئْ**). [م٢٠٢٦]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (یەکێك لە ئێوە بە پێوە نەخواتەوە، هەر کەس لەبیری چوو با برشێتەوە).**

## ٣- دەروازەی: خواردنەوەی زەمزەم و غەیری زەمزەم بە پێوە

**٢٧٣٤-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: سَقَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ زَمْزَمَ، فَشَرِبَ وَهُوَ قَائِمٌ. [خ١٦٣٧/ م٢٠٢٧]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: لە زەمزەم ئاوم دا بە پێغەمبەری خودا ئەویش بە پێوە خواردییەوە.**

- زاد مسلم في رواية: وَاسْتَسْقَى وَهُوَ عِنْدَ الْبَيْتِ.

**موسلیم ئەمەی زیاد کردووە: داوای ئاوی کرد ئەو لای بەیت بوو.**

**٢٧٣٥-** (خ) عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّهُ صَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ قَعَدَ فِي حَوَائِجِ النَّاسِ فِي رَحَبَةِ الْكُوفَةِ، حَتَّى حَضَرَتْ صَلاَةُ الْعَصْرِ، ثُمَّ أُتِيَ بِمَاءٍ، فَشَرِبَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَذَكَرَ رَأْسَهُ وَرِجْلَيْهِ، ثُمَّ قامَ، فَشَرِبَ فَضْلَهُ وَهْوَ قائِمٌ، ثُمَّ قالَ: إِنَّ نَاساً يَكْرَهُونَ الشُّرْبَ قِيَاماً، وَإِنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم صَنَعَ مِثْلَ ما صَنَعْتُ. [خ٥٦١٦ (٥٦١٥)]

**(خ) لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت): ئەو نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان بۆ پێویستی خەڵك لە بەرینی کوفە[1] دانیشت تا نوێژی عەصر هاتە بەرەوە، پاشان ئاوی بۆ هێنرا، خواردییەوە و روخسار و دوو دەستی شۆری، سەر و دوو قاچی پێ مەسح کرد، پاشان هەستایە سەر پێ و زیادە ئاوەکەی خواردەوە و ئەو بە پێوە بوو، پاشان وتی: خەڵکانێك خواردنەوە بە پێوە بە ناپەسەند دەبینن، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی ئەنجام دا کە من ئەنجامم دا.**

---

[1] مەبەست شوێنێکی بەرین بووە لە مزگەوتەکەی کوفە-و.

**٢٧٣٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَشْرَبُ قَائِماً وَقَاعِداً. [ت١٨٨٣]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی بە پێوە و بە دانیشتنەوە دەیخواردەوە.**

**٢٧٣٧-** عَنْ كَبْشَةَ الْأَنْصَارِيَّةِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ عَلَيْهَا، وَعِنْدَهَا قِرْبَةٌ مُعَلَّقَةٌ، فَشَرِبَ مِنْهَا وَهُوَ قَائِمٌ، فَقَطَعَتْ فَمَ الْقِرْبَةِ تَبْتَغِي بَرَكَةَ مَوْضِعِ فِي رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [ت١٨٩٢/ جه٣٤٢٣]

* صحيح.

**لە کەبشەی ئەنصارییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) رۆیشتە ژوورەوە بۆ لای و جەوەندەیەکی هەڵواسراوی لا بوو، لێی خواردەوە و ئەو بە پێوە بوو، ئەو دەمی جەوەندەکەی بڕی بە مەبەستی بەرەکەتی جێگە دەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ)[1].**

## ٤- دەروازەی: نەهی کردن لە خواردنەوە لە دەمی کوندە و جەوەندە

**٢٧٣٨-** (خ) عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: نَهَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يُشْرَبَ مِنْ فِي السِّقَاءِ. [خ٥٦٢٨ (٢٤٦٣)]

**(خ) لە ئەیوبەوە، لە عیکریمەوە، لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لە دەمی کوندە و جەوەندە بخورێتەوە[2].**

- زاد في رواية لأحمد: قَالَ أَيُّوبُ: فَأُنْبِئْتُ أَنَّ رَجُلاً شَرِبَ مِنْ فِي السِّقَاءِ، فَخَرَجَتْ حَيَّةٌ. [حم٧١٥٣]

---

(١) ویستویەتی جێ دەمەکە وەك فەڕ و بەرەکەتی پێغەمبەری خودا لای خۆی بپارێزێت—و.

(٢) واتە: بۆ ئاو خواردنەوە دەم بنرێت بە دەمی کوندە و جەوەندەوە وەك بینگرتن لێیان—و.

لە ریوایەتێکی ئەحمەدا ئەمە زیاد بووە: ئەیوب وتی: هەواڵم پێدراوە پیاوێك لە دەمی کوندەیەکەوە ئاوی خواردووەتەوە مارێك هاتووەتە دەرەوە.

## ٥- دەروازەی: ناپەسەندی هەناسەدان لە دەفردا

**٢٧٣٩-** (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إذا شربَ أَحَدُكُمْ؛ فلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ**). [خ١٥٣/ م٢٦٧ (٦٥)، الأشربة (١٢١)]

(ق) لە ئەبی قەتادەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە خواردییەوە با لە دەفرەکەدا هەناسە نەدات).**

**٢٧٤٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَعُودَ؛ فَلْيُنَحِّ الْإِنَاءَ ثُمَّ لِيَعُدْ، إِنْ كَانَ يُرِيدُ**). [جه٣٤٢٧]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە خواردییەوە با لە دەفرەکەدا هەناسە نەدات، گەر ویستی نەفەس وەربگرێت با دەفرەکە کەناربدات و نەفەس وەربگرێ پاشان بگەڕێتەوە گەر دەیەوێت).**

## ٦- دەروازەی: لە راستەوە بۆ راست لە خواردنەوەدا

**٢٧٤١-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي دَارِنَا هذِهِ، فَاسْتَسْقَى، فَحَلَبْنَا لَهُ شَاةً لَنَا، ثُمَّ شِبْتُهُ مِنْ مَاءِ بِئْرِنَا هذِهِ، فَأَعْطَيْتُهُ، وَأَبُو بَكْرٍ عَنْ يَسَارِهِ، وَعُمَرُ تُجَاهَهُ، وَأَعْرَابِيٌّ عَنْ يَمِينِهِ، فَلَمَّا فَرَغَ، قَالَ عُمَرُ: هذَا أَبُو بَكْرٍ، فَأَعْطَى الْأَعْرَابِيَّ فَضْلَهُ، ثُمَّ قَالَ: (**الأَيْمَنُونَ، الأَيْمَنُونَ، أَلاَ فَيَمِّنُوا**).

قَالَ أَنَسٌ: فَهْيَ سُنَّةٌ، فَهْيَ سُنَّةٌ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. [خ٢٥٧١ (٢٣٥٢)/ م٢٠٢٩]

(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەم ماڵەماندا هات بۆ لامان، داوای خواردنەوەی کرد، مەڕێکی خۆمان بۆ دۆشی، پاشان ئاوی ئەم بیرەی خۆمان پیێ تێکەڵ کرد و پێمدا، و ئەبوبەکر لای چەپییەوە بوو و عومەر بەرانبەری بوو و ئەعرابییەك لای ڕاستییەوە بوو، کاتیێ پێغەمبەر تەواو بوو عومەر وتی: ئەوە ئەبوبەکرە، ئەوەی مابوو دایە دەست ئەعرابییەکە، پاشان فەرمووی: **(ڕاستەوانەکان، ڕاستەوانەکان[1]، ئاگادار بن ڕاست پێشبخەن).**

ئەنەس وتی: ئەوە سوننەتە، ئەوە سوننەتە، سیێ جار.

**٢٧٤٢-** (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَ مِنْهُ، وَعَنْ يَمِينِهِ غُلاَمٌ، وَعَنْ يَسَارِهِ الأَشْيَاخُ، فَقَالَ لِلْغُلاَمِ: **(أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ هؤُلاَءِ)**، فَقَالَ الْغُلاَمُ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ، لاَ أُوثِرُ بِنَصِيبِي مِنْكَ أَحَداً، قَالَ: فَتَلَّهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي يَدِهِ. [خ٥٦٢٠ (٢٣٥١)/ م٢٠٣٠]

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە(خوا لێی ڕازی بێت): خواردنەوەیەك هێنرا بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) و لێی خواردەوە، لای ڕاستییەوە غوڵامێك بوو و لای چەپییەوە گەورەکان، بە غوڵامەکەی فەرموو: **(ئایا مۆڵەتم دەدەی بیدەم بەوانە؟)**، غوڵامەکە وتی: سوێند بە خودا، ئەی پێغەمبەری خودا، بە بەشی خۆم لە تۆوە کەس بەسەر خۆمدا پێش ناخەم، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دایە دەستی.

## ٧- دەروازەی: داپۆشینی دەفر

**٢٧٤٣-** (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ قَالَ: جاءَ أَبُو حُمَيْدٍ - رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ - مِنَ النَّقِيعِ بِإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَلاَّ خَمَّرْتَهُ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضَ عَلَيْهِ عُوداً)**. [خ٥٦٠٦ (٥٦٠٥)/ م٢٠١١]

---

[1] واتە: لە ڕاستەوە بۆ ڕاست و بە دەستی ڕاست بیدەنە دەست یەکتر، ئەعرابییەکە لای ڕاستی پێغەمبەرەوە دانیشتووە بۆیە شیرەکەی پێداوە-و.

(ق) لە جابری کوری عەبدوڵاوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: ئەبو حومەید- پیاوێك لە ئەنصار-بە دەفرێ شیرەوە لە "النقیع[1]"ەوە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(داتپۆشیبا، با پوشیش لەسەری دابنێی).**

**٢٧٤٤-** (م) وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(غَطُّوا الإِنَاءَ، وَأَوْكُوا السِّقَاءَ، فَإِنَّ فِي السَّنَةِ لَيْلَةً يَنْزِلُ فِيهَا وَبَاءٌ، لاَ يَمُرُّ بِإِنَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ غِطَاءٌ، أَوْ سِقَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ وِكَاءٌ؛ إِلاَّ نَزَلَ فِيهِ مِنْ ذلِكَ الْوَبَاءِ).** [م٢٠١٤]

(م) هەر لە جابرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(دەفر داپۆشن و دەمی کوندە و جەوەندە ببەستن، چونکە لە ساڵدا شەوێك هەیە نەخۆشی تێدا دادەبەزێت، بە هەر دەفرەێکدا گوزەر بکات پۆشەری نەبێت یان بە هەر کوندە و جەوەندەیەکدا گوزەر بکات پەتی بە دەمەوە نەبێت ئەو نەخۆشییە تیایدا دادەبەزێ).**

**٢٧٤٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِتَغْطِيَةِ الْإِنَاءِ، وَإِيكَاءِ السِّقَاءِ، وَإِكْفَاءِ الْإِنَاءِ. [جه٣٤١١/ مي٢١٧٨]

**لە ئەبی هوریرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردین بە داپۆشینی دەفر و بەستنی دەمی کوندە و جەوەندە و دەمەونوخن کردنی دەفر.**

## ٨- دەروازەی: خواردنەوە بە بینلێگرتن

**٢٧٤٦-** (خ) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، وَمَعَهُ صَاحِبٌ لَهُ، فَسَلَّمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَصَاحِبُهُ، فَرَدَّ الرَّجُلُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي! وَهِيَ سَاعَةٌ حَارَّةٌ، وَهْوَ يُحَوِّلُ فِي حَائِطٍ لَهُ؛ يَعْنِي: الماءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ فِي شَنَّةٍ، وَإِلاَّ كَرَعْنَا)**، وَالرَّجُلُ يُحَوِّلُ الماءَ فِي حَائِطٍ، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللهِ! عِنْدِي مَاءٌ بَاتَ فِي شَنَّةٍ، فَانْطَلَقَ إِلَى الْعَرِيشِ،

---

[1] واتە: شوێنێکە دەکەوێتە باشووری مەدینەی منەوەرە-و.

فَسَكَبَ فِي قَدَحٍ مَاءً، ثُمَّ حَلَبَ عَلَيْهِ مِنْ دَاجِنٍ لَهُ، فَشَرِبَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ أَعَادَ، فَشَرِبَ الرَّجُلُ الَّذِي جاءَ مَعَهُ. [خ٥٦٢١ (٥٦١٣)]

(خ) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) رۆیشت بۆ لای پیاوێك لە ئەنصار، هاوڕێیەکی خۆی لەگەڵ بوو، پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵەکەی سەلامیان کرد، پیاوەکە وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، دایك و باوکم فیدات بێت، ساتێکی گەرم بوو، پیاوەکە لە باخەکەیدا دەیگواستەوە—واتە ئاوی دەدا—[1] پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئاوت لایە لە جەوەندەدا مابێتەوە باشە، ئەگەر نە، بینی لێ دەگرین[2])**، پیاوەکە ئاوەکەی لە باخەکە ئاژین دەکرد، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئاوم هەیە لە جەوەندەدا ماوەتەوە، رۆیشت بۆ لای کەپرەکە و ئاوی کردە جامێکەوە و پاشان لە مەڕێکی مۆتەماڵ[3] شیری بەسەردا دۆشی، پێغەمبەر(ﷺ) خواردییەوە و پاشان دووبارەی کردەوە، ئەو پیاوەش لەگەڵی بوو خواردییەوە.

## ٩- دەروازەی: شیرینکردنی ئاو

**٢٧٤٧**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُسْتَعْذَبُ لَهُ الْمَاءُ مِنْ بُيُوتِ السُّقْيَا.

قَالَ قُتَيْبَةُ: هِيَ عَيْنٌ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْمَدِينَةِ يَوْمَانِ. [د٣٧٣٥]

* صحيح.

لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): لە خانەکانی ئاو سارد کردن ئاویان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) سارد دەکرد.

قوتەیبە دەڵێت: ئەوە کانییەك بوو لە نێوان کانییەکە و مەدینە دوو رۆژە رێ بوو.

---

[1] واتە: ئاوی ئاژێنی باخەکەی کردبوو و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئاوەکەی دەگواستەوە—و.

[2] بینگرتن: دەمخستنە ناو کانیاو و روبارە بۆ خواردنەوە—و.

[3] واتە: حەیوانێك لە ماڵ دوورنەکەوێتەوە و مۆتی ناو ماڵ بووبێت—و.

## ١٠- دەروازەی: شیردۆش مەرەکە شەکەت ناکات[1]

**٢٧٤٨-** عَنْ ضِرَارِ بْنِ الْأَزْوَرِ قَالَ: أَهْدَيْتُ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِقْحَةً، فَأَمَرَنِي أَنْ أَحْلُبَهَا، فَحَلَبْتُهَا، فَجَهَدْتُ فِي حَلْبِهَا، فَقَالَ: (**دَعْ دَاعِيَ اللَّبَنِ**). [مي ٢٠٤٠]

* إسناده حسن.

**لە زیراری کوڕی ئەزوەرەوە، وتی: حوشترێکی تازەزاوم هەدیەی پێغەمبەر(ﷺ) کرد، فەرمانی پێکردم بیدۆشم، منیش دۆشیم و لە دۆشینەکەی شەکەتم کرد، فەرمووی: (دەستهەڵبگرە لە شیری گوانەکە).**

## ١١- دەروازەی: خواردنەوە لە کوپی کەل و لێوار شکاو

**٢٧٤٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الشُّرْبِ مِنْ ثُلْمَةِ الْقَدَحِ، وَأَنْ يُنْفَخَ فِي الشَّرَابِ. [د٣٧٢٢]

* صحيح.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە خواردنەوە لە کوپی کەل و فووکردن لە خواردنەوە.**

## ١٢- دەروازەی: ئاوگێڕ[2] دوایین کەسە دەخواتەوە

**٢٧٥٠-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**سَاقِي الْقَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْباً**).

[ت١٨٩٤/ جه٣٤٣٤/ مي٢١٨١]

* صحيح. وهو عند مسلم في حديث طويل (٦٨١).

---

(١) واتە: شەکەت کردن لە دۆشیندا: ئەوەیە بۆ بەچکەکەی هیچ لە گوانیدا نەهێڵییەوە و گوانەکان زۆر بگووشی تا حەیوانەکە شەکەت دەبێت-و.

(٢) واتە: هەر بەو جۆرە بۆ خواردنەوەی شیر و هەر خواردنەوەیەکی تری حەڵاڵ-و.

لە ئەبی قەتادەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئاوگێڕی خەڵك دوایین کەسیانە لە خواردنەوەدا)**.

* صحیح، ئەوە لە فەرموودەیەکی درێژدا لای موسلیم بوونی هەیە(٦٨١).

# بەشی پێنجەم

## خواردنەوە حەرامکراوەکان

### ١- دەروازەی: حەرامکردنی عارەق

**٢٧٥١-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ: كُنْتُ سَاقِيَ الْقَوْمِ فِي مَنْزِلِ أَبِي طَلْحَةَ، وَكَانَ خَمْرُهُمْ يَوْمَئِذٍ الْفَضِيخَ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مُنَادِياً يُنَادِي: أَلاَ إِنَّ الخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ، قَالَ: فَقَالَ لِي أَبُو طَلْحَةَ: اخْرُجْ فَأَهْرِقْهَا، فَخَرَجْتُ، فَهَرَقْتُها، فَجَرَتْ فِي سِكَكِ المدِينَةِ. فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: قَدْ قُتِلَ قَوْمٌ وَهْيَ فِي بُطُونِهِمْ، فَأَنْزَلَ الله: ﴿لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓا۟﴾الآيَةَ [المائدة:٩٣]. [خ٢٤٦٤/ م١٩٨٠]

**(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت): مەیگێڕی خەڵکەکە بووم لە ماڵی ئەبو تەلحە، لەو ڕۆژگارەدا عارەقیان لە تێکەڵەی خورمای نەگەیو و پێگەیو بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی کرد بانگکەرێك بانگ رابدێرێ: دەزانن عارەق حەرامکرا، وتی: ئەبو تەلحە پێی وتم: بڕۆ دەرەوە و بیڕێژە، لە کۆڵان و ڕێگە و بانەکانی مەدینە جاری دەبوو، یەکێك لە خەڵکەکە وتی: خەڵکانێك کوژران و عارەق لە ناو سکیان بوو[1]، خودا ئایەتی دابەزاند:** ﴿لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓا۟﴾الآيَةَ [المائدة:٩٣].

**٢٧٥٢-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ، قَالَ عُمَرُ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الخَمْرِ بَيَاناً شِفَاءً، فَنَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْبَقَرَةِ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ﴾ الْآيَةَ [البقرة:٢١٩]، قَالَ: فَدُعِيَ عُمَرُ، فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ، قَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ

[1] **واتە: دەبێ حاڵی ئەو کەسانە چۆن بێت پێش حەرامکردنی عارەق کوژران و عارەق لەناو سکیان بوو؟-و.**

بَيَاناً شِفَاءً، فَنَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي النِّسَاءِ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ﴾ [النساء: ٤٣]، فَكَانَ مُنَادِي رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ يُنَادِي: أَلاَ لاَ يَقْرَبَنَّ الصَّلاَةَ سَكْرَانُ، فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ! بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَاناً شِفَاءً، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ [المائدة: ٩١]، قَالَ عُمَرُ: انْتَهَيْنَا.

* صحيح. [د٣٦٧٠/ ت٣٠٤٩/ ن٥٥٥٥]

لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: کاتێ حەرام کردنی عارەق دابەزی، عومەر وتی: خودایە، دەربارەی عارەق بە ڕۆشنکەرەوەیەکی شفابەخش بۆمان ڕۆشنبکەرەوە، ئەو ئایەتە دابەزی لە (البقرة)دایە: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ﴾ [البقرة: ٢١٩]، وتی: عومەر بانگرا و بەسەریدا خوێنرایەوە، عومەر وتی: خودایە، دەربارەی عارەق بە ڕۆشنکەرەوەیەکی شفابەخش بۆمان ڕۆشنبکەرەوە، ئەو ئایەتە دابەزی لە (النساء)دایە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ﴾ [النساء: ٤٣]، بانگبێژی پێغەمبەری خودا گەر بانگی بدێرابایە دەیوت: ئاگادار بن، سەرخۆش لە نوێژ نزیك نەبێتەوە، عومەر بانگکرا بەسەریدا خوێنرایەوە، وتی: خودایە، دەربارەی عارەق بە ڕۆشنکەرەوەیەکی شفابەخش بۆمان ڕۆشنبکەرەوە، ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ [المائدة: ٩١]، عومەر وتی: کۆتامان پێهێنا.

## ٢- دەروازەی: تاوانی ئەو کەسەی عارەقی خواردووەتەوە و تەوبەی نەکردووە

**٢٧٥٣-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ شَرِبَ الخَمْرَ فِي الدُّنْيَا، ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا، حُرِمَهَا فِي الآخِرَةِ). [خ٥٥٧٥/ م٢٠٠٣]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە دنیا عارەق بخواتەوە و پاشان تەوبەی لێ نەکات لە دوارۆژ لێی مەحرووم دەبێت).**

**٢٧٥٤**– عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مُدْمِنُ خَمْرٍ**).

* صحيح. [جه٣٣٧٦]

**لە ئەبی دەرداوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (ئالوودەبووی عارەق ناچێتە بەهەشتەوە).**

## ٣- دەروازەی: حەرام کردنی عارەق لەدوای ئوحد بوو

**٢٧٥٥**– (خ) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: صَبَّحَ أُنَاسٌ غَدَاةَ أُحُدٍ الخَمْرَ، فَقُتِلُوا مِنْ يَوْمِهِمْ جَمِيعاً شُهَدَاءَ، وَذلِكَ قَبْلَ تَحْرِيمِهَا. [خ٤٦١٨ (٢٨١٥)]

**(خ) لە جابرەوە، وتی: بەیانی ڕۆژی ئوحد خەڵکی ڕۆژی لێبوویەوە و ژەمی بەیانی لەگەڵ عارەق بوو، ئەو ڕۆژەیان هەمووان بە شەهیدی کوژران، ئەوەش بەر لە حەرامکردنی.**

## ٤- دەروازەی: عارەق لە ترێ و شتانی تر

**٢٧٥٦**– (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: خَطَبَ عُمَرُ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ نَزَلَ تَحْرِيمُ الخَمْرِ وَهْيَ مِنْ خَمْسَةِ أَشْيَاءَ: الْعِنَبِ، وَالتَّمْرِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالْعَسَلِ، وَالْخَمْرُ ما خامَرَ الْعَقْلَ. وَثَلاَثٌ، وَدِدْتُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَمْ يُفَارِقْنَا حَتَّى يَعْهَدَ إِلَيْنَا عَهْداً: الجَدُّ، وَالْكَلاَلَةُ، وَأَبْوَابٌ مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا. [خ٥٥٨٨ (٤٦١٩)/ م٣٠٣٢]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: عومەر لەسەر مینبەری پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری دا و وتی: حەرام کردنی عارەق دابەزیوە و پێنج شتە: ترێ، وخورما، وگەنم، وجۆ، هەنگوین، خەمر ئەوەیە (خامر العقل–ئەقڵ دادەپۆشێت)،**

سێ شت ئاواتم بوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) لێمان جیانەبوایەتەوە تا بۆمان یەکلادەبوویەوە: باپیر[1]، و "کلالة[2]" و چەند دەروازەیەك لە دەروازەکانی سوو.[3]

**٢٧٥٧**– عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ مِنَ الْعِنَبِ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ التَّمْرِ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ الْعَسَلِ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ الْبُرِّ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ الشَّعِيرِ خَمْراً).
[د٣٦٧٦/ ت١٨٧٢/ جه٣٣٧٩]

لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە تری عارەق هەیە، و لە خورما عارەق هەیە، و لە هەنگوین عارەق هەیە، و لە گەنم عارەق هەیە، و لە جۆ عارەق هەیە).**

## ٥- دەروازەی: هەر خواردنەوەیەك سەرخۆش بكات حەرامە

**٢٧٥٨**– (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الْبِتْعِ؟ فَقَالَ: (كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ). [خ٥٥٨٥ (٢٤٢)/ م٢٠٠١]

(ق) لە عائیشەوە، وتی: پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا دەربارەی "البِتْع– شەرابی هەنگوین"، فەرمووی: **(هەر خواردنەوەیەك سەرخۆش بكات حەرامە).**

**٢٧٥٩**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ، فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ). [د٣٦٨١/ ت١٨٦٥/ جه٣٣٩٣]

* حسن صحيح.

---

[1] واتە: میراتی باپیر–و.

[2] "کلالة" کەسێك بمرێ و میراتێك بەجێبهێڵێ و باوك و کوڕی نەبێت مراتەکەی لێ بگرن–و.

[3] واتە: ئەوە هیوا و ئاواتێکی حەزرەتی عومەر بوو(رەزا و رەحمەتی خودای لەسر بێت) بۆ زیادە رۆشنکردنەوەی ئەو سێ بابەتە، ئەگینا ئەو دەیزانی پێغەمبەر بە کاملی و تێر و تەواوی پەیامەکەی گەیاند و خوداش دەفەرموێت: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾ [المائدة:٣] –و.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوەی زۆرەکەی سەرخۆش دەکات کەمەکەی حەرامە)**.

**٢٧٦٠–** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَنْهَاكُمْ عَنْ قَلِيلِ مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ**). [ن٥٦٢٤/ مي٢١٤٤]

* صحيح.

لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوەی زۆرەکەی سەرخۆش دەکات لە کەمەکەی نەهیتان لێ دەکەم)**.

## ٦- دەروازەی: کەراهەتی نەبیز کردن[1] لە تێکەڵەی خورما و مێوژ

**٢٧٦١–** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ، وَالْبُسْرِ وَالتَّمْرِ، وَقَالَ: (**يُنْبَذُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى حِدَتِهِ**). [م١٩٨٩]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە مێوژ و خورما، و خورمای نەگەیو و خورمای تازە پێگەیو و فەرمووی: **(هەریەك لەوانە بە جیا نەبیزیان لێ دروست دەکرێت[2])**.

**٢٧٦٢–** (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَدْ نُهِيَ أَنْ يُنْبَذَ الْبُسْرُ وَالرُّطَبُ جَمِيعاً، وَالتَّمْرُ وَالزَّبِيبُ جَمِيعاً. [م١٩٩١]

(م) لە ئیبن عومەرەوە، ئەو دەیوت: نەهیکراوە لە "خورمای نەگەیو و تازەپێگەیو" پێکەوە، هەروەها "خورما و مێوژ" پێکەوە نەبیز دروست بکرێت.

---

[1] نەبیز(نبیذ) میوە کردنە ناو ئاوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو زیاتر نەبێت لە سێ رۆژ و دوو شەو، یان سێ شەو و دوو رۆژ، خواردنەوەی ئاوەکەی لەو چەند رۆژ و شەوەدا–و.

[2] واتە: بۆ کردنی نەبیز نابێ بە یەکتر تێکەڵ بکرێن–و.

## ٧- دەروازەی: موباح کردنی نەبیز کە نەبوبێت بە سەرخۆشکەر

**٢٧٦٣-** (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُنْبَذُ لَهُ الزَّبِيبُ فِي السِّقَاءِ، فَيَشْرَبُهُ يَوْمَهُ وَالْغَدَ وَبَعْدَ الْغَدِ، فَإِذَا كَانَ مَسَاءُ الثَّالِثَةِ شَرِبَهُ وَسَقَاهُ، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ أَهَرَاقَهُ. [م٢٠٠٤]

**(م) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: نەبیز لە کوندە و جەوەندەدا لە مێوژ بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دروستدەکرا، رۆژەکەی و سبەینێ و دووسبەی دەیخواردەوە، کە دەکەوتە ئێوارەی رۆژی سێیەم دەیخواردەوە و بە کەسانی تری دەدا، گەر شتێك زیادە بمابایەوە دەیڕشت.**

**٢٧٦٤-** (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَقَدْ سَقَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، بِقَدَحِي هذَا، الشَّرَابَ كُلَّهُ: الْعَسَلَ، وَالنَّبِيذَ، وَالْمَاءَ، وَاللَّبَنَ. [م٢٠٠٨]

**(م) لە ئەنەسەوە، وتی: بەم کوپەم هەموو شەرابێکم تۆشی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کردووە: هەنگوین، ونەبیز، وئاو، وشیر.**

## ٨- دەروازەی: عارەق بە سرکە ناکرێت

**٢٧٦٥-** (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم سُئِلَ عَنِ الخَمْرِ تُتَّخَذُ خَلاًّ؟ فَقَالَ: (لاَ). [م١٩٨٣]

**(م) لە ئەنەسەوە: پرسیاری عارەق بە سرکە بکرێت[١] لە پێغەمبەر(ﷺ) کرا، فەرمووی: (نەخێر).**

---

[١] واتە: عارەقەکە بگۆڕن بۆ سرکە-و.

## ٩- دەروازەی: دەفر

**٢٧٦٦-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ تَنْتَبِذُوا فِي الدُّبَّاءِ، وَلاَ فِي الْمُزَفَّتِ**). وَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُلْحِقُ مَعَهَا: الْحَنْتَمَ وَالنَّقِيرَ. [خ٥٥٨٧/ م١٩٩٢]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە "کوولەکە و رووپۆشکراو بە زفت[1]"دا نەبیز دروست مەکەن)**، ئەبو هورەیرە: گۆزەی سەوز و داری هەڵکۆڵراوی دەکردە پاشکۆی ئەوانە[2].

**٢٧٦٧-** (م) عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**نَهَيْتُكُمْ عَنِ النَّبِيذِ إِلاَّ فِي سِقَاءٍ، فَاشْرَبُوا فِي الأَسْقِيَةِ كُلِّهَا، وَلاَ تَشْرَبُوا مُسْكِراً**). [م٩٧٧، الأشربة (٦٣)]

(م) لە بورەیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(نەهیم لێکردن لە دروستکردنی نەبیز مەگەر لە کوندە و جەوەندەدا، لە هەموو کوندە و جەوەندەیەکدا بخۆنەوە، و سەرخۆشکەر مەخۆنەوە)**.

- وفي رواية: (**كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنِ الأَشْرِبَةِ فِي ظُرُوفِ الأَدَمِ، فَاشْرَبُوا فِي كُلِّ وِعَاءٍ، غَيْرَ أَنْ لاَ تَشْرَبُوا مُسْكِراً**). [م٩٧٧ (٦٥)]

لە ریوایەتێکدا: (**نەهیم لێکردن لە خواردنەوە لە دەفری پێستدا، لە هەموو دەفرێکدا بخۆنەوە، جگە لەوەی سەرخۆشکەر مەخۆنەوە**).

- وفي رواية: قَالَ: (**نَهَيْتُكُمْ عَنِ الظُّرُوفِ، وَإِنَّ الظُّرُوفَ . أَوْ ظَرْفاً . لاَ يُحِلُّ شَيْئاً، وَلاَ يُحَرِّمُهُ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ**). [م٩٧٧ (٦٤)]

هەروەها لە ریوایەتێکی تردا: فەرمووی: **(نەهیم لێکردن لە دەفرەکان، دەفرەکان-یان دەفر-شتێك حەڵاڵ ناکەن و شتێك حەرام ناکەن، هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە)**.

---

[1] "زفت" مادەیەکە روپۆشی دەفری پێ دەکرا، (قار)یشی پێ دەوترێت-و.

[2] واتە: وەك کوولەکە و رووپۆشکراو بە زفت سەرزمێری دەکردن-و.

**٢٧٦٨**– عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ نَبِيذِ الْأَوْعِيَةِ، أَلاَ وَإِنَّ وِعَاءً لاَ يُحَرِّمُ شَيْئاً، كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ). [جه٣٤٠٦]

* صحيح.

لە ئیبن مەسعوودەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(مـن نـەهیم لێکـردن لـە نەبیزی دەفر، بزانن دەفر شتێك حەرام ناكات، هەموو سەرخۆشكەرێك حەرامە).**

## ١٠- دەروازەی: ناونانی "خمر[1]" بە ناوێکی تر جگە لە ناوەکەی خۆی

**٢٧٦٩**– عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (لَيَشْرَبَنَّ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ، يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا). [د٣٦٨٨/ جه٤٠٢٠]

لـە ئـەبی مـالیکی ئەشـعەرییەوە: ئـەو گـوێی لـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) بـوو دەیفەرموو: **(خەڵكانێك لە ئومەتەكەم "خَمْر" دەخۆنەوە بە نـاوێکی تـر جگـە لـە ناوەكەی خۆی ناوی لێدەنێن[2]).**

- زاد ابن ماجه: (يُعْزَفُ عَلَى رُؤُوسِهِمْ بِالْمَعَازِفِ وَالْمُغَنِّيَاتِ، يَخْسِفُ اللهُ بِهِمُ الأَرْضَ، وَيَجْعَلُ مِنْهُمُ القِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ).

* صحيح.

ئیبن ماجە ئەمەی زیاد كردووە: **(بەسەریانەوە مۆسیقا لێ دەدرێت و گۆرانی بێژی ئافرەت گۆرانی دەڵێت، خودا نوقمی زەوییان دەكـات و مـەیموون و بـەرازیان لـێ بەرهەم دەهێنێت).**

---

[1] "خمر" هەر شتێك ئەقڵ و هۆش داپۆشێت بریتییە لە "خمر"–و.

[2] لەم سەردەمەدا لە هەنـدێ شـوێن عارەقیـان ناونـاوە نـەبیز، لـە كاتێكدا نـەبیز حەڵاڵـە و عارەق حەرامـە، یـان نـاونراوە خواردنـەوە رۆحییـەكان، یـان خواردنـەوەی كحـول، هـەر شتێك مرۆڤ سەرخۆش بكات عارەقە و خـودا حـەرامی كـردووە، نـاو حەقیقـەتی نـاوەرۆك ناگۆرێت–و.

**٢٧٧٠**– عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَذْهَبُ اللَّيَالِي وَالأَيَّامُ، حَتَّى تَشْرَبَ فِيهَا طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ، يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا**). [جه٣٣٨٤]

* صحيح.

لە ئەبی ئومامەی باهیلییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ڕۆژ و شەو تەواو نابن تا دەستەیەك لە ئومەتەکەم (خَمْر) دەخۆنەوە و بە ناوێکی تر جگە لە ناوەکەی خۆی ناوی لێ دەنێن**).

## ١١- دەروازەی: خودا نەفرەتی لە عارەق کردووە

**٢٧٧١**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَعَنَ اللهُ الْخَمْرَ، وَشَارِبَهَا، وَسَاقِيَهَا، وَبَائِعَهَا، وَمُبْتَاعَهَا، وَعَاصِرَهَا وَمُعْتَصِرَهَا، وَحَامِلَهَا وَالْمَحْمُولَةَ إِلَيْهِ**).

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خودا لە عارەق، وعارەقخۆر، ومەیگێڕ، وفرۆشیار، وکڕیار، وگووشەر وپاڵفتەکەر[1] و گوێزەرەوە و بۆ گوێزراوە نەفرەتی کردووە[2]**).

- ولفظ ابن ماجه: (**لُعِنَتِ الْخَمْرُ عَلَى عَشْرَةِ أَوْجُهٍ: بِعَيْنِهَا، وَعَاصِرِهَا، وَمُعْتَصِرِهَا، وَبَائِعِهَا، وَمُبْتَاعِهَا، وَحَامِلِهَا، وَالْمَحْمُولَةِ إِلَيْهِ، وَآكِلِ ثَمَنِهَا، وَشَارِبِهَا، وَسَاقِيهَا**). [د٣٦٧٤/ جه٣٣٨٠]

* صحيح.

لەفزەکەی ئیبن ماجە: (**عارەق لە دە ڕووەوە نەفرەتی لێکراوە: خودی عارەقەکە، وگوشەر و پاڵفتەکەر، وفرۆشیار، وکڕیار، وگوازەرەوە، وبۆگوازراوە، وبخۆری نرخەکەی، وعارەقخۆرەکە، و مەیگێڕەکەی**).

---

[1] "گووشەر و پاڵفتەکەر" ئەو کەسانەی لە میوە عارەقەکە ئامادە دەکەن، بە دەست یان لە کارگەدا–و.

[2] "گوێزەرەوە" واتە: ئەو کەسەی عارەقەکە دەگوێزێتەوە بە دەست و شان یان بە هەر ئامرازێکی تر، وەك ئۆتۆمبێل، "بۆ گوێزراوە" ئەو کەسەی عارەقەکەی بۆ دەگوێزرێتەوە بۆ فرۆشتن و دابەش کردن لە دوکان و شوێنانی تر–و.

## ١٢- دەروازەی: عارەق دایکی پیسییەکانە

**٢٧٧٢-** عَنْ عُثْمَانَ ﷺ قَالَ: اجْتَنِبُوا الْخَمْرَ فَإِنَّهَا أُمُّ الْخَبَائِثِ، إِنَّهُ كَانَ رَجُلٌ مِمَّنْ خَلاَ قَبْلَكُمْ تَعَبَّدَ، فَعَلِقَتْهُ امْرَأَةٌ غَوِيَّةٌ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ جَارِيَتَهَا، فَقَالَتْ لَهُ: إِنَّا نَدْعُوكَ لِلشَّهَادَةِ، فَانْطَلَقَ مَعَ جَارِيَتِهَا، فَطَفِقَتْ كُلَّمَا دَخَلَ بَاباً أَغْلَقَتْهُ دُونَهُ، حَتَّى أَفْضَى إِلَى امْرَأَةٍ وَضِيئَةٍ، عِنْدَهَا غُلاَمٌ، وَبَاطِيَةُ خَمْرٍ، فَقَالَتْ: إِنِّي وَاللهِ مَا دَعَوْتُكَ لِلشَّهَادَةِ، وَلَكِنْ دَعَوْتُكَ لِتَقَعَ عَلَيَّ، أَوْ تَشْرَبَ مِنْ هَذِهِ الْخَمْرَةِ كَأْساً، أَوْ تَقْتُلَ هَذَا الْغُلاَمَ. قَالَ: فَاسْقِينِي مِنْ هَذَا الْخَمْرِ كَأْساً، فَسَقَتْهُ كَأْساً، قَالَ: زِيدُونِي فَلَمْ يَرِمْ حَتَّى وَقَعَ عَلَيْهَا، وَقَتَلَ النَّفْسَ؛ فَاجْتَنِبُوا الْخَمْرَ، فَإِنَّهَا وَاللهِ! لاَ يَجْتَمِعُ الْإِيمَانُ وَإِدْمَانُ الْخَمْرِ ؛ إِلاَّ لَيُوشِكُ أَنْ يُخْرِجَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ. [ن٥٦٨٢، ٥٦٨٣]

* صحيح موقوف.

لە عوسمانەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لە عارەق دووربکەونەوە، چونکە دایکی پیسییەکانە، پیاوێك لەوانەی پێش ئێوە خودای دەپەرست، ئافرەتێکی فریودەر عاشقی بوو، جاریەکەی خۆی نارد بۆ لای و پێی وت: ئێمە تۆ بۆ شایەتییەك بانگ دەکەین، پیاوەکە لەگەڵ جارییەکە ڕۆیشت، هەرکات دەچووە ناو ژوورێك جاریەکە بەدوایدا دەرگاکەی دادەخست، تا گەیشتە ئافرەتێکی جوان کە غولامێك و دەفرێ شەرابی لە لا بوو، ئافرەتەکە وتی: سوێند بە خودا من تۆم بۆ شایەتی بانگ نەکردووە، بەڵکو بانگم کردووی تا لەگەڵم جووت بیت، یان لەو عارەقە پیاڵەیەك بخۆیەوە، یاخود ئەو غولامە بکوژی، پیاوەکە وتی: لەو عارەقە پیاڵەیەکم پێبدە، پیاڵەیەکی دەرخوارد دا، پیاوەکە وتی: بۆم زیاد بکە، کۆڵی نەدا تا لەگەڵی جووت بوو و نەفسێکی کوشت[1]، بۆیە لە عارەق خۆتان بەدوور بگرن، چونکە سوێند بە خودا ئیمان و ئالوودەبوونی عارەق کۆنابنەوە و یەکێکیان ئەویتریان دەردەکات.

(١) واتە: زینای کرد و غولامەکەشی کوشت-و.

## ١- دەروازەی: خۆپەسەندی

**٢٧٧٣**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قال: قالَ النَّبِيُّ، أَوْ قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم: (**بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي حُلَّةٍ، تُعْجِبُهُ نَفْسُهُ، مُرَجِّلٌ جُمَّتَهُ، إِذْ خَسَفَ اللهُ بِهِ، فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ**).
[خ٥٧٨٩/ م٢٠٨٨]

(ق) لە لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: یان وتی: أبو القاسم(ﷺ) فەرمووی: **(پیاوێك لە پۆشاكێكدا بە رێگەدا دەڕۆیشت و نەفسی پێی سەرسام بوو و پرچی بەردابوویەوە، خودا ئەوی برد بە ناخی زەویدا، ئەو تا رۆژی قیامەت بە ناخی زەویدا دەچێت)**.

## ٢- دەروازەی: حەرامکردنی راکێشانی پۆشاك بەدوای خۆدا بە لەنجەوە

**٢٧٧٤**- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (**لاَ يَنْظُرُ اللهُ إِلَى مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ**). [خ٥٧٨٣ (٣٦٦٥)/ م٢٠٨٥]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا تەماشای کەسێك ناکات بە لەنجە کردنەوە پۆشاکەکەی بەدوای خۆدا رادەکێشێت)**.

- زاد البخاري في رواية: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ أَحَدَ شِقَّيْ ثَوْبِي يَسْتَرْخِي؛ إِلاَّ أَنْ أَتَعَاهَدَ ذلِكَ مِنْهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّكَ لَسْتَ تَصْنَعُ ذلِكَ خُيَلاَءَ**). [خ٣٦٦٥]

لە ریوایەتێك لە بوخاریدا ئەمە زیاد بووە: ئەبوبەکر وتی: یەکێك لە لاکانی پۆشاکەکەم بەردەبێتەوە، مەگەر هەڵیبکەم؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(تۆ ئەوە بۆ لەنجە کردن ئەنجام نادەی)**.

**٢٧٧٥**- (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**بَيْنَمَا رَجُلٌ يَجُرُّ إِزَارَهُ مِنَ الْخُيَلاَءِ خُسِفَ بِهِ، فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ فِي الأَرْضِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ**). [خ٣٤٨٥]

(خ) لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(لە کاتێکدا پیاوێك لە لەنجە و لارەوە کراسەکەی بەدوای خۆیدا رادەکێشا نوقمی زەوی کرا، ئەو لەناو زەویدا رۆدەچێت تا رۆژی قیامەت).**

**٢٧٧٦-** (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: مَرَرْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَفِي إِزَارِي اسْتِرْخَاءٌ، فَقَالَ: (يَا عَبْدَ اللهِ ارْفَعْ إِزَارَكَ)، فَرَفَعْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: (زِدْ)، فَزِدْتُ، فَمَا زِلْتُ أَتَحَرَّاهَا بَعْدُ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: إِلَى أَيْنَ؟ فَقَالَ: أَنْصَافِ السَّاقَيْنِ. [م٢٠٨٦]

(م) لە ئیبن عومەرەوە، وتی: بە پاڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) گوزەرم کرد لە کراسەکەمدا شۆڕبوونەوە هەبوو، فەرمووی: **(ئەی عەبدوڵا، کراسەکەت بەرز بکەرەوە)**، منیش بەرزم کردەوە، پاشان فەرمووی: **(زیاتر)**، منیش زیاترم کرد، لەدوای ئەوە بەردەوام دەمپشکنی و بەرزم دەکردەوە، یەکێك لە خەڵکەکە وتی: تا کوێ؟ وتی[1]: تا نیوەی دوو لاق.

## ٣- دەروازەی: ئەوەی لە خوار دوو قولاپێوەیە لە ئاگردایە

**٢٧٧٧-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (ما أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الإِزَارِ فَفِي النَّارِ). [خ٥٧٨٧]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوەی لە کراس دەکەوێتە خوار دوو پاژنەوە لە ئاگردایە).**

## ٤- دەروازەی: خۆشەویستترین پۆشاك بریتییە لە "الحِبَرَة"

**٢٧٧٨-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ أَحَبَّ الثِّيَابِ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَلْبَسَهَا: الْحِبَرَةُ. [خ٥٨١٣ (٥٨١٢)/ م٢٠٧٩]

---

[1] واتە: عەبدوڵا لە وەڵامی کەسەکەدا وتی-و.

(ق) لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە(خوا لێـی رازی بێـت)، وتـی: خۆشەویسـتترین پۆشاك لای پێغەمبەر(ﷺ) بیپۆشیبا بریتی بوو لە "الحِبَرَة[1]".

## ٥- دەروازەی: حەرام کردنی پۆشینی ئاورشم لەسەر پیاوان

**٢٧٧٩–** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ لَبِسَ الحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا، فَلَنْ يَلْبَسَهُ فِي الآخِرَةِ**). [خ٥٨٣٢/ م٢٠٧٣]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە دنیا ئاورشم بپۆشێت لە دواڕۆژ نایپۆشێت)**.

**٢٧٨٠–** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رَأَى حُلَّةً سِيَرَاءَ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! لَوِ اشْتَرَيْتَ هذِهِ، فَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الجُمُعَةِ، وَلِلْوَفْدِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّمَا يَلْبَسُ هذِهِ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ فِي الآخِرَةِ**). ثُمَّ جَاءَتْ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْهَا حُلَلٌ، فَأَعْطَى عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﷺ مِنْهَا حُلَّةً، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ! كَسَوْتَنِيهَا، وَقَدْ قُلْتَ فِي حُلَّةِ عُطَارِدٍ مَا قُلْتَ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنِّي لَمْ أَكْسُكَهَا لِتَلْبَسَهَا**)، فَكَسَاهَا عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ ﷺ أَخاً لَهُ بِمَكَّةَ مُشْرِكاً. [خ٨٨٦/ م٢٠٦٨]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: عومەری کـوڕی خـەتاب لـە دەرگـای مزگـەوت کراسێکی "سیَراء[2]"ی بینی، وتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) گـەر بتـوانی ئەمـە بکڕی و رۆژی جومعە لەبەری بکەی، هـەروەها بـۆ ئـەو وەفدانـەی گـەر بـێن بـۆ لات، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەمە کەسێك دەیپۆشێ لە دواڕۆژ بەشـی نییـە)**، پاشان چەند کراسێك لەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هێنـرا و کراسـێك لەوانـەی دا بـە

[1] "الحِبَرة" پۆشاکێکە لە کـەتان یـان لۆکـە، داودی دەڵێـت: "الحـبرة" پۆشـاکێکە هـەمووی سەوزە.

[2] "السِيَراء" پۆشاکێکە ئاورشمی پێ تێکەڵ کراوە-و.

عومەری کوڕی خەتاب، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، لەبەر منی دەکەی، پێشتر دەربارەی کراسی عوتارد ئەوەت فەرمووکە فەرمووت؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(من پێمنەداوی بیپۆشی)**، عومەری کوڕی خەتاب دای بە برایەکی هاوەڵدانەری خۆی لە مەککە.

■ وفي رواية لهما: (تَبِيعُهَا، وتُصِيبُ بِهَا حَاجَتَكَ). [خ٩٤٨]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان: **(بیفرۆشی و پێویستییەکی خۆتی پێ جێبەجێ بکەی)**.

## ٦- دەروازەی: موباح کردنی پۆشینی ئاورشم بۆ نەخۆشی خوران و بۆ جەنگ

**٢٧٨١-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَخَّصَ لِعَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَوْفٍ وَالزُّبَيْرِ فِي قَمِيصٍ مِنْ حَرِيرٍ، مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا. [خ٢٩١٩/ م٢٠٧٦]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی عبدالرحمانی کوڕی عەوف و زوبێری دا بۆ کراسی ئاورشم[1]، لەبەر خورانێك پێیانەوە بوو.

## ٧- دەروازەی: ئاورشم و زێڕ بۆ ئافرەتانە

**٢٧٨٢-** (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّهُ رَأَى عَلَى أُمِّ كُلْثُومٍ عليها السلام، بِنْتَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، بُرْدَ حَرِيرٍ سِيَرَاءَ. [خ٥٨٤٢]

(خ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: ئەو بوردەیەکی ئاورشمی "سِیَراء[2]"ی لەبەر ئوم کلسومی کچی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بینی.

**٢٧٨٣-** عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (حُرِّمَ لِبَاسُ الْحَرِيرِ وَالذَّهَبِ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي وَأُحِلَّ لِإِنَاثِهِمْ). [ت١٧٢٠/ ن٥١٦٣]

* صحيح.

---

[1] واتە: بۆ پۆشینی کراسی ئاورشم-و.

[2] "السيراء" پۆشاکێکە ئاورشمی پێ تێکەڵ کراوە-و.

لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پۆشاکی ئاورشم و زێڕ لەسەر نێرینەی ئومەتەکەم حەرام کراون و بۆ مێینەکانیان حەلاڵ کراون).**

**٢٧٨٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَدِمَتْ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم حِلْيَةٌ مِنْ عِنْدِ النَّجَاشِيِّ أَهْدَاهَا لَهُ، فِيهَا خَاتَمٌ مِنْ ذَهَبٍ، فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ، قَالَتْ: فَأَخَذَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِعُودٍ مُعْرِضاً عَنْهُ، أَوْ بِبَعْضِ أَصَابِعِهِ، ثُمَّ دَعَا أُمَامَةَ ابْنَةَ أَبِي الْعَاصِ، ابْنَةَ ابْنَتِهِ زَيْنَبَ، فَقَالَ: **(تَحَلَّيْ بِهَذَا يَا بُنَيَّةُ).** [د٤٢٣٥/ جه٣٦٤٤]

* حسن.

**لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لای نەجاشییەوە پۆشاکێك هەدیەی پێغەمبەر(ﷺ) کرابوو، ئەنگوستیلەیەکی زێڕی تێدا بوو و ناوکێکی حەبەشی تێدابوو، عائیشە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە دارێك-یان بە هەندێ لە پەنجەکانی- دەستی بۆ برد، پاشان کیژی کچەکەی خۆی زەینەب کە ناوی ئومامەی کچی ئەبی عاص بوو بانگ کرد و فەرمووی: (کچی خۆم، بەمە خۆت برازێنەوە).**

## ٨- دەروازەی: پۆشینی "المعصفر"[(١)] و نەهی لە "التزعفر"[(٢)]

**٢٧٨٥-** (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ. [خ٥٨٤٦/ م٢١٠١]

**(ق) لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد پیاو "التزعفر" بکات[(٣)].**

**٢٧٨٦-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَيَّ ثَوْبَيْنِ مُعَصْفَرَيْنِ، فَقَالَ: **(أَأُمُّكَ أَمَرَتْكَ بِهَذَا)؟** قُلْتُ: أَغْسِلُهُمَا، قَالَ: **(بَلْ أَحْرِقْهُمَا).** [م٢٠٧٧]

---

(١) "المعصفر" واتە: رەنگکراو بە "عصفر" کە بۆیاخێکی رەنگ زەردە-و.

(٢) "التزعفر" بۆیاخ کردنی پۆشاك بە بورس یان زەعفەران-و.

(٣) واتە: بە زەعفەران پۆشاك بۆیاخ بکات-و.

(م) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دوو پۆشاکی "معصفر[1]"ی لەبەر من بینی، فەرمووی: **(دایکت فەرمانی پێکردووی بەمە؟)**، وتم: دەیانشۆرم، فەرمووی: **(بەڵکو بیانسوتێنە)**.

- وفي رواية: فَقَالَ: (إِنَّ هَذِهِ مِنْ ثِيَابِ الْكُفَّارِ، فَلاَ تَلْبَسْهَا).

لە ریوایەتێکدا: فەرمووی: **(ئەمە پۆشاکی بێباوەڕانە، مەیپۆشە)**.

**٢٧٨٧**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الْمُفَدَّمِ. قَالَ يَزِيدُ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ: مَا الْمُفَدَّمُ؟ قَالَ: الْمُشْبَعُ بِالْعُصْفُرِ.　　[جه٣٦٠١]

* صحيح.

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە "المُفَدَّم"، یەزید دەڵێ: وتم بە حەسەن: "المُفَدَّم" چییە؟ وتی: تێربوو بە رەنگی زەرد.

## ٩- دەروازەی: پۆشینی رەنگی زەرد بۆ ئافرەتان

**٢٧٨٨**– (خ) عَنْ أُمِّ خَالِدٍ بِنْتِ خَالِدِ بْنِ سَعِيدٍ قَالَتْ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَعَ أَبِي، وَعَلَيَّ قَمِيصٌ أَصْفَرُ، قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(سَنَهْ سَنَهْ)**. قَالَ عَبْدُ اللهِ: وَهِيَ بِالْحَبَشِيَّةِ: حَسَنَةٌ. قَالَتْ: فَذَهَبْتُ أَلْعَبُ بِخَاتَمِ النُّبُوَّةِ، فَزَبَرَنِي أَبِي، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(دَعْهَا)**، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَبْلِي وَأَخْلِقِي، ثُمَّ أَبْلِي وَأَخْلِقِي، ثُمَّ أَبْلِي وَأَخْلِقِي)**. قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَبَقِيَتْ حَتَّى ذَكَرَ.　　[خ٣٠٧١]

(خ) لە ئوم خالیدی کچی خالیدی کچی سەعیدەوە، وتی: لەگەڵ باوکم هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، کراسێکی زەردم لەبەربوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سَنَهْ سَنَهْ)**، ئەوەش بە حەبەشی واتە "حسنة–باش و چاك و جوان"، ئوم خالید وتی: رۆیشتم یاریم دەکرد بە ئەنگوستیلەی پێغەمبەرایەتییەکە، باوکم

---

[1] "معصفر" واتە: رەنگکراو بە "عصفر" کە بۆیاخێکی رەنگ زەردە –و.

هەڕشەی لێکردم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لێیگەڕێ)**، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بپوێ و بڕزێ، پاشان بپوێ و بڕزێ، پاشان بپوێ و بڕزێ**[1]**)**، عەبدوڵا دەڵێت: لە ژیاندا مایەوە[2] تا راوییەکە لە درێژی مانەوەی ناوی هێنا[3].

## ١٠- دەروازەی: نەهی لە هەڵکردنی پۆشاك بۆ لایەکی شان و دەرکەوتنی لاکەی تری کەسەکە بەبێ پۆشاك، و نەهی لە پۆشاك لەخۆئاڵان

**٢٧٨٩-** (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ. [خ٣٦٧]

**(خ) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە "اشتمال الصَّمّاء–هەڵکردنی پۆشاك بۆ لایەکی شان"، و پیاو خۆی لە یەك پۆشاك بئاڵێنێ و لەسەر عەورەتی شتێك لەو پۆشاکە بوونی نەبێت.**

- زاد في رواية: وَالصَّمَّاءُ أَنْ يَجْعَلَ ثَوْبَهُ عَلَى أَحَدِ عَاتِقَيْهِ، فَيَبْدُو أَحَدُ شِقَّيْهِ لَيْسَ عَلَيْهِ ثَوْبٌ. [خ٥٨٢٠]

**لە ریوایەتێکدا ئەمە زیاد بووە: "الصَّمّاء" ئەوەیە پۆشاکەکە بخاتە سەر لایەکی و یەکێك لە لاکانی دەربکەوێ و پۆشاکی لەسەر نەبێت.**

## ١١- دەروازەی: نەهی لە خۆ رووتکردنەوە

**٢٧٩٠-** (م) عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ قَالَ: أَقْبَلْتُ بِحَجَرٍ، أَحْمِلُهُ، ثَقِيلٍ، وَعَلَيَّ إِزَارٌ خَفِيفٌ. قَالَ: فَانْحَلَّ إِزَارِي وَمَعِيَ الْحَجَرُ، لَمْ أَسْتَطِعْ أَنْ أَضَعَهُ حَتَّى بَلَغْتُ بِهِ إِلَى مَوْضِعِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(ارْجِعْ إِلَى ثَوْبِكَ فَخُذْهُ، وَلاَ تَمْشُوا عُرَاةً)**. [م٣٤١]

---

[1] ئەمە دوعا بۆ کردنە، واتە: تەمەنت درێژ بێت–و.

[2] واتە: ئوم خالید لە ژیاندا مایەوە–و.

[3] واتە: تا لە تەمەن درێژیدا ناوی هێنا و فەرموودەکەی لە دەم وەرگرت–و.

(م) لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە، وتی: بە بەردێکی قورسەوە کە هەڵمگرتبوو و ژێر پۆشاکێکی تەنکم لەبەر کرد بوو هاتم، وتی: ژێرپۆشاکەکە ڕەوییەوە و بەردەکەم پێ بوو نەمتوانی دایبنێم تا گەیاندمە شوێنەکەی خۆی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بگەڕێوە بۆ لای پۆشاکەکەت و هەڵیبگرەوە و بە ڕووتی مەڕۆ بە ڕێوە).**

**٢٧٩١**– عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَأَى رَجُلاً يَغْتَسِلُ بِالْبَرَازِ بِلاَ إِزَارٍ، فَصَعَدَ الْمِنْبَرَ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ اللهَ عزّ وجل** حَيِيٌّ سِتِّيرٌ، يُحِبُّ الْحَيَاءَ وَالسَّتْرَ، فَإِذَا اغْتَسَلَ أَحَدُكُمْ؛ فَلْيَسْتَتِرْ). [د٤٠١٢/ ن٤٠٤]

* صحيح.

لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێکی بینی بە بەرچاوەوە و بەبێ ژێرپۆشاك خۆی دەشۆری، سەرکەوتە سەر مینبەر و حەمد و سەنای خودای کرد و پاشان (ﷺ) فەرمووی: **(خودا بە حەیا و داپۆشەرە، حەیا و داپۆشینی پێخۆشە، گەر یەکێك لە ئێوە خۆی شۆری بە خۆی داپۆشێت).**

## ١٢- دەروازەی: ئافرەتانی پۆشتەی ڕووت

**٢٧٩٢**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ، مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ، رُؤُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ، وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا). [م٢١٢٨]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دوو پۆل لە ئەهلی ئاگر نەمبینیون[١]: کۆمەڵێك قەمچییان لە دەستە وەك کلکی گا و مانگا بەوە لە خەڵکی دەدەن، کۆمەڵێك ئافرەتی پۆشتەی ڕووت، فێرکەرانی مەیل و ڕۆیشتن بە لەنجە و لار، سەریان وەك گردە ملی خواری حوشترە، نە دەچنە بەهەشتەوە و نە بۆنی دەکەن، بۆنی بەهەشت لە دووری ئەوەندە و ئەوەندە بۆن دەکرێت).**

---

[١] واتە: هێشتا نەهاتوون و لە داهاتوودا دێن–و.

## ١٣- دەروازەی: حەرام کردنی وردبوونەوە لە عەورەت

**٢٧٩٣-** (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ، وَلاَ الْمَرْأَةُ إِلى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ، وَلاَ يُفْضِي الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَلاَ تُفْضِي الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَرْأَةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ**). [م٣٣٨]

**(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (پیاو تەماشای عەورەتی پیاو ناکات، و ژن تەماشای عەورەتی ژن ناکات، پیاو لەگەڵ پیاو لەناو یەك پۆشاکدا[1] تەنها ناکەون، ژن لەگەڵ ژن لەناو یەك پۆشاك تەنها ناکەون).**

**٢٧٩٤-** عَنْ جَرْهَدٍ ـ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ الصُّفَّةِ ـ قَالَ: جَلَسَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَنَا، وَفَخِذِي مُنْكَشِفَةٌ، فَقَالَ: (**أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْفَخِذَ عَوْرَةٌ**).

* صحيح. [د٤٠١٤/ ت٢٧٩٥/ مي٢٦٩٢]

**لە جەرهەدەوە ـ ئەو یەکێك بوو لە هاوەڵانی "الصُّفَّة"، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لامان دانیشت، رانم دەرکەوتبوو، فەرمووی: (نازانی ران عەورەتە؟).**

## ١٤- دەروازەی: خۆ چوێنان بە ئافرەتان و خۆ چوێنان بە پیاوان

**٢٧٩٥-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم المَتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجالِ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ. [خ٥٨٨٥]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەفرەتی کرد لەو پیاوانەی خۆیان بە ئافرەت دەچوێنن، و لەو ئافرەتانەی خۆیان بە پیاوان دەچوێنن.**

- وفي رواية: قال: لَعَنَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم الْمُخَنَّثِينَ مِنَ الرِّجَالِ، وَالمتَرَجِّلاَتِ مِنَ النِّسَاءِ، وَقَالَ: (**أَخْرِجُوهُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ**). قَالَ: فَأَخْرَجَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فُلاَناً، وَأَخْرَجَ عُمَرُ فُلانةً. [خ٥٨٨٦]

---

[1] واتە: بە رووتی لەگەڵ یەکتر ناچنە ژێر یەك لێفە یان بەتانی، یان هەر شتێکی تر-و.

لە ریوایەتێکدا: وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نەفرەتی کرد لە نێرەمووکان لە پیاوان و لە نێرەپیاویی[1] لە ژنان، و فەرمووی: (**لە ماڵەکانتان دەریانبکەن**)، وتی[2]: پێغەمبەر(ﷺ) فلانە پیاوی دەرکرد و عومەر فلانە ئافرەتی دەرکرد.

**٢٧٩٦**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الرَّجُلَ يَلْبَسُ لِبْسَةَ الْمَرْأَةِ، وَالْمَرْأَةَ تَلْبَسُ لِبْسَةَ الرَّجُلِ. [د٤٠٩٨]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەفرەتی کرد لە پیاو پۆشاکی ئافرەت لەبەر بکات، و لە ئافرەت پۆشاکی پیاو لەبەر بکات.

**٢٧٩٧**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أُتِيَ بِمُخَنَّثٍ، قَدْ خَضَّبَ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ بِالْحِنَّاءِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا بَالُ هَذَا**)؟ فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! يَتَشَبَّهُ بِالنِّسَاءِ، فَأَمَرَ بِهِ فَنُفِيَ إِلَى النَّقِيعِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! أَلاَ نَقْتُلُهُ، فَقَالَ: (**إِنِّي نُهِيتُ عَنْ قَتْلِ الْمُصَلِّينَ**).

قَالَ أَبُو أُسَامَةَ: وَالنَّقِيعُ نَاحِيَةٌ عَنِ الْمَدِينَةِ، وَلَيْسَ بِالْبَقِيعِ. [د٤٩٢٨]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە: نێرەمووکێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) دوو دەست و دوو قاچی بە خەنە رەنگ کردبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**ئەمە چییەتی؟**)، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆی بە ئافرەتان دەچوێنێ، فەرمانی کرد نەفی کرا بۆ "النقيع"، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، نەیکوژین؟ فەرمووی: (**من نەهیم لێکراوە نوێژکەران بکوژم**).

ئەبو ئوسامە وتی: "النقيع" لایەکە لە مەدینەوە و "البقيع" نییە.

---

[1] نێرەپیاویی لە ژنان: ئەو کەسەیە جەستەی ئافرەتە و سروشت و هەڵسوکەوتی پیاوانە ئەنجام دەدات–و.

[2] واتە: ئیبن عەباس وتی–و.

## ١٥- دەروازەی: جیاکردنەوە و لەتکردنی پرچ

**٢٧٩٨-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَسْدِلُ شَعْرَهُ، وَكَانَ المشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ رُؤُوسَهُمْ، وَكَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَسْدِلُونَ رُؤُوسَهُمْ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ فِيهِ بِشَيْءٍ، ثُمَّ فَرَقَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَأْسَهُ. [خ٣٥٥٨/ م٢٣٣٦]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرچی شۆڕ دەکردەوە، هاوەڵدانەران سەری خۆیان لە ناوەڕاست دادەهێنا و ئەهلی کیتاب پرچیان بەردەدایەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێیخۆش بوو لەگەڵ ئەهلی کیتاب تەبا بێت لە شتێك فرمانی تێدا نەکرابێت، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ناوەڕاست سەری خۆی دادەهێنا.**

**٢٧٩٩-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ: أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ أَخْبَرَهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي الْمَسْجِدِ، فَدَخَلَ رَجُلٌ ثَائِرَ الرَّأْسِ وَاللِّحْيَةِ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِيَدِهِ أَنِ اخْرُجْ، كَأَنَّهُ يَعْنِي: إِصْلاَحَ شَعْرِ رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ، فَفَعَلَ الرَّجُلُ، ثُمَّ رَجَعَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَلَيْسَ هَذَا خَيْراً مِنْ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدُكُمْ ثَائِرَ الرَّأْسِ كَأَنَّهُ شَيْطَانٌ**)؟ [ط١٧٧٠]

* مرسل.

[وانظر: **٣٧٢٤**].

**لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە: عەتای کوڕی یەسار هەواڵی پێدا و وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مزگەوت بوو، پیاوێکی سەر و ریش گەبەڵ[1] هاتە ژوورەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە دەست ئاماژەی بۆ کرد بچۆ دەرەوە، وەك ئەوەی مەبەستی بێت پرچی سەر و ریشی چاك بکات، پیاوەکە ئەوەی ئەنجامدا و پاشان گەڕایەوە، و پێغەمبەری**

---

(١) **واتە: پرچ و ریشی بە یەکتر تێکەڵ بووبوون-و.**

خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئایا ئەمە باشتر نییە لەوەی یەکێك لە ئێوە بە سەری ئاڵۆزەوە بێت وەك شەیتانێك؟)**.

## ١٦- دەروازەی: بۆیاخ کردنی پیری

**٢٨٠٠-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قال: **(إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لاَ يَصْبِغُونَ؛ فَخَالِفُوهُمْ)**. [خ٣٤٦٢/ م٢١٠٣]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(یەهوود و نەصارا بۆیاخ ناکەن سەرپێچییان لیّ بکەن[1])**.

**٢٨٠١-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أُتِيَ بِأَبِي قُحَافَةَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ. وَرَأْسُهُ وَلِحْيَتُهُ كَالثَّغَامَةِ بَيَاضاً، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(غَيِّرُوا هذَا بِشَيْءٍ، وَاجْتَنِبُوا السَّوَادَ)**. [م٢١٠٢]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: ڕۆژی فەتحی مەککە ئەبو قوحەفەیان هێنا سەر و ریشی وەك "الثغامة[2]" سپی بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەمە بە شتێك بگۆڕن، لە رەش دووربکەونەوە[3])**.

**٢٨٠٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بِن عَمْرٍو قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ نَتْفِ الشَّيْبِ، وَقَالَ: **(هُوَ نُورُ الْمُؤْمِنِ)**. [ت٢٨٢١/ جه٣٧٢١]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە هەڵکێشانی مووی سپی و فەرمووی: **(ئەوە نووری باوەڕدارە)**.

---

[1] واتە: ئێوە بۆیاخ بکەن-و.

[2] "الثغامة" ڕووەکێکە گەڵا و بەری سپییە-و.

[3] واتە: رەنگی رەشی بۆ مەکەن-و.

## ١٧- دەروازەی: نەهی لە "القَزَع[1]"

٢٨٠٣- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَنْهَى عَنِ الْقَزَعِ.

قَالَ عُبَيْدُ اللهِ: قُلْتُ: وَما الْقَزَعُ؟ فَأَشَارَ لَنَا عُبَيْدُ اللهِ قَالَ: إِذَا حُلِقَ الصَّبِيُّ، وَتُرِكَ هَاهُنَا شَعْرَةٌ وَهَاهُنَا وَهَاهُنَا، فَأَشَارَ لَنَا عُبَيْدُ اللهِ إِلَى نَاصِيَتِهِ وَجانِبَيْ رَأْسِهِ. [خ٥٩٢٠/ م٢١٢٠]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو نەهی دەکرد لە "القزع".**

**عوبەیدوڵا وتی: وتم: "القزع" چییە؟ عوبەیدوڵا ئاماژەی بۆ کردین و وتی: گەر سەری منداڵ بتاشی و لێرە و لێرە و لێرە قژ وازلێبهێنرێ، عوبەیدوڵا ئاماژەی بۆ ناوچاوان و دوو لای سەری خۆی کرد.**

- وفي رواية لأبي داود والنسائي: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَأَى صَبِيّاً قَدْ حُلِقَ بَعْضُ شَعْرِهِ وَتُرِكَ بَعْضُهُ، فَنَهَاهُمْ عَنْ ذَلِكَ، وَقَالَ: (**احْلِقُوهُ كُلَّهُ، أَوِ اتْرُكُوهُ كُلَّهُ**). [د٤١٩٥/ ن٥٠٦٣]

**لە ریوایەتێکی ئەبی داود و نەسائیدا: پێغەمبەر(ﷺ) منداڵێکی بینی هەندێ لە سەری تاشرابوو و هەندێکی وازلێهێنرا بوو، بۆیە نەهی لێکردن لەو کارە و فەرمووی: (هەمووی بتاشن یان هەمووی وازلێبهێنن).**

## ١٨- دەروازەی: ریش بەردانەوە

٢٨٠٤- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ: وَفِّرُوا اللِّحى، وَأَحْفُوا الشَّوارِبَ**).

وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ: إِذَا حَجَّ أَوِ اعْتَمَرَ قَبَضَ عَلَى لِحْيَتِهِ، فَمَا فَضَلَ أَخَذَهُ. [خ٥٨٩٢/ م٢٥٩]

---

[1] **"القزع" بریتییە لە تاشینی هەندێ لەسەر و هێڵانەوەی هەندێکی، لە کۆندا لە کوردەواریدا هەموو سەر بە چەقۆ یان بە مووس سفر دەکرا و هەندێك لە پێشەوەی سەر دەهێڵرایەوە پێیان دەوت: گودلە-و.**

(ق) لە ئیبن عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(لە هاوەڵدانەران جیاواز بن ریش زۆر بکەن و سمێڵ کورت بکەنەوە).**

ئیبن عومەر گەر حەج یان عومرەی بکردبایە بە مشت ریشی خۆی دەگرت ئـەوەی زیادبوایە دەیبڕی.

## ١٩- دەروازەی: خەسڵەتەکانی فیترەت

**٢٨٠٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(الْفِطْرَةُ خَمْسٌ: الْخِتَانُ، وَالاسْتِحْدَادُ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الآبَاطِ).**

[خ٥٨٩١ (٥٨٨٩)/ م٢٥٧]

(ق) لـە ئـەبی هورەیرەوە(خـوا لێـی رازی بێـت): گـوێم لـە پێغەمبـەر(ﷺ) بـوو دەیفەرموو: **(فیترەت پێنجن: خەتەنە، وبەرتاشین، وکورتکردنەوەی سمێڵ، و نینووك کردن، ومووی بنباڵ).**

**٢٨٠٦-** (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ، وَقَصُّ الأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ).**

قَالَ زَكَرِيَّاءُ: قَالَ مُصْعَبٌ: وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ؛ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ. [م٢٦١]

(م) لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دە شت لە فیترەتن: کورتکردنەوەی سمێڵ، وبەردانەوەی ریش، وسیواك، وئاوڕادان لە لـوت، ونینـووك کردن، وشۆرینی جومگەکانی پەنجە، وهەڵکەندنی مووی بنبـاڵ، و تاشـینی بـەر و خۆپاککردنەوە بە ئاو).**

"زکریاء" دەڵێت: موصعەب وتی: دەیەمم لەبیرچوو، مەگەر ئاوڕدان لە دەم بێت.

**٢٨٠٧-** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: وُقِّتَ لَنَا فِي قَصِّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمِ الْأَظْفَارِ، وَنَتْفِ الإِبِطِ، وَحَلْقِ الْعَانَةِ: أَنْ لاَ نَتْرُكَ أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً.　[م٢٥٨]

**(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: کاتمان بۆ دیاریکراوە لە کورتکردنەوەی سمێڵ، وکردنی نینووك، وهەڵکەندنی مووی بنباڵ، وتاشینی بەر لە چل شەو زیاتر نەبێت.**

## ٢٠- دەروازەی: قژ لەسەرنان

**٢٨٠٨-** (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ: سَأَلَتِ امْرَأَةٌ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ ابْنَتِي أَصَابَتْهَا الْحَصْبَةُ، فَامَّرَقَ شَعْرُهَا، وَإِنِّي زَوَّجْتُهَا، أَفَأَصِلُ فِيهِ؟ فَقَالَ: (لَعَنَ اللهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمَوْصُولَةَ).　[خ٥٩٤١ (٥٩٣٥)/ م٢١٢٢]

**(ق) لە ئەسمای کچی ئەبی بەکرەوە، وتی: ژنێك پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، کچەکەم تووشی ئاوڵە بووە قژی هەڵوەریوە، من بە مێردم داوە، ئایا مووی تری لەسەر بنێم؟ پێغەمبەر فەرمووی: (خودا نەفرەتی کردووە لە "الواصلة[1]" و "الموصولة[2]").**

■ وفي رواية لهما: وَزَوْجُهَا يَسْتَحِثُّنِي بِهَا، أَفَأَصِلُ رَأْسَهَا؟ [خ٥٩٣٥]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: مێردەکەی بەو کارە پێداگریم لێ دەکات، ئایا مووی لەسەر بنێم؟.**

**٢٨٠٩-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لَعَنَ اللهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ).　[خ٥٩٣٧/ م٢١٢٤]

---

[1] **"الواصلة" ئەو ئافرەتەیە مووی سەری ئافرەتێك لە سەری ئافرەتێکی تر دادەنێ–و.**

[2] **"الموصولة" ئەو ئافرەتەیە داوا دەکات ئەو کارەی بۆ بکەن، پێشی دەوترێت: "المستوصلة"–و.**

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خودا نەفرەتی کردووە لە "الواصلة" و "المستوصلة[1]" و "الواشمة[2]" و "المستوشمة[3]"**).

## ٢١- دەروازەی: حەرام کردنی کاری "الواصلة" و "الواشمة" و "النامصة[4]"

**٢٨١٠-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: لَعَنَ اللهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُوتَشِمات، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ، المغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللهِ. فَبَلَغَ ذلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالُ لَهَا: أُمُّ يَعْقُوبَ، فَجَاءَتْ فَقَالَتْ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ لَعَنْتَ كَيْتَ وَكَيْتَ، فَقَالَ: وَمَا لِي لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَمَنْ هُوَ فِي كِتَابِ اللهِ؟! فَقَالَتْ: لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ اللَّوْحَيْنِ، فَمَا وَجَدْتُ فِيهِ مَا تَقُولُ، قَالَ: لَئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيهِ لَقَدْ وَجَدْتِيهِ، أَمَا قَرَأْتِ: ﴿**وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟**﴾ [الحشر:٧]. قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: فَإِنَّهُ قَدْ نَهَى عَنْهُ. قَالَتْ: فَإِنِّي أَرَى أَهْلَكَ يَفْعَلُونَهُ، قَالَ: فَاذْهَبِي فَانْظُرِي، فَذَهَبَتْ فَنَظَرَتْ، فَلَمْ تَرَ مِنْ حَاجَتِهَا شَيْئاً، فَقَالَ: لَوْ كَانَتْ كَذلِكَ مَا جَامَعْتُنَا. [خ٤٨٨٦/ م٢١٢٥]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: خودا نەفرەتی کردووە لە "الواشمات[5]" و "الموتَشِمات[6]" و "المتنَمِّصات[7]" و "المتفلِّجات للحسن[8]" و ئەو

---

[1] "المستوصله": ئەو ئافرەتەی داوا دەکات مووی لەسەر بنێن، یان هەوڵدەدات ئەو کارە بکات-و.

[2] "الواشمة" ئەو ئافرەتەی خاڵ دەکوتێ بۆ کەسانی تر-و.

[3] "المستوشمة" ئەو ئافرەتەی داوا دەکات خاڵی بۆ بکوتن-و.

[4] "النامصة" ئەو کەسەیە موو لە روخسار و برۆی ئافرەتان هەڵدەگرێ-و.

[5] "الواشمات" کۆی وشەی "الواشمة"یە ئافرەتێك خاڵ بۆ خەڵکی بکوتێت-و.

[6] "المتوشمات" کۆی وشەی "المتوشمة"یە، ئافرەتێك داوا بکات خاڵی بۆ بکوتن-و.

[7] "المتنصمات" کۆی وشەی "المتنمصة"یە، ئافرەتێك داوا بکات روخسار و برۆی بۆ هەڵبگرن-و.

[8] "المتفلجات للحسن" کۆی وشەی "المتفلجة"یە ئەو ئافرەتەی بۆ جوانی بۆشایی دەخاتە نێوان دانەکانی پێشەوەی تا گەنج دەربکەوێت-و.

ئافرەتانەی خەلقی خودا دەگۆڕن، ئەوە گەیشتەوە بە ئافرەتێکی ئەسەد کە پێی دەوترا "أم يعقوب"، هات و وتی: پێمگەیشتووە تۆ نەفرەتت لەوە و لەوە کردووە، عەبدوڵا وتی: بۆچی نەفرەت نەکەم لە کەسێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەفرەتی لێکردووە و نەفرەت لەو کەسەی لە کتێبەکەی خودادایە؟! ئافرەتەکە وتی: من قورئانم لە نێوان دوو بەرگدا خوێندەوە و ئەوەی تۆ دەیڵێی تیایدا نەبوو، عەبدوڵا وتی: گەر بتخوێندبایەوە دەتبینییەوە، ئایا ئەمەت نەخوێندەوە: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ۚ﴾ [الحشر:٧]، وتی: با، عەبدوڵا وتی: پێغەمبەر نەهی لەوە کردووە، ئافرەتەکە وتی: من دەبینم خانەوادەکەت ئەو کارە دەکەن، وتی: بڕۆ و تەماشا بکە، ئافرەتەکە ڕۆیشت و تەماشای کرد و شتێکی لە پێویستی خۆی نەبینییەوە[1]، عەبدوڵا وتی: گەر ژنەکەم بەو جۆرە بێت لەگەڵ من کۆنابێتەوە.

## ٢٢- دەروازەی: حەرام کردنی ئەنگوستیلەی زێڕ لەسەر پیاوان

**٢٨١١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ نَهَى عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ. [خ٥٨٦٤/ م٢٠٨٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): ئەو نەهی کرد لە ئەنگوستیلەی زێڕ.

**٢٨١٢-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَأَى خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ فِي يَدِ رَجُلٍ، فَنَزَعَهُ فَطَرَحَهُ وَقَالَ: (**يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ إِلَى جَمْرَةٍ مِنْ نَارٍ، فَيَجْعَلُهَا فِي يَدِهِ**) فَقِيلَ لِلرَّجُلِ، بَعْدَمَا ذَهَبَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: خُذْ خَاتِمَكَ انْتَفِعْ بِهِ. قَالَ: لاَ، وَاللهِ لاَ آخُذُهُ أَبَداً، وَقَدْ طَرَحَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [م٢٠٩٠]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەنگوستیلەیەکی زێڕی لە دەستی پیاوێکدا بینی، لە دەستی داکەند و فڕێیدا و فەرمووی: (**یەکێك لە ئێوە**

---

[1] واتە: ژنەکەی عەبدوڵا بەو جۆرە نەبوو ئەو وتی–و.

روو لە پشکۆیەك لە ئاگر دەکات و دەیخاتە ناو دەستییەوە)، دوای ئەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) رۆیشت بە پیاوەکە وترا: ئەنگوستیلەکەت هەڵبگرە و سوودی لێ ببینە، وتی: نەخێر، سوێند بە خودا، هەرگیز هەڵیناگرمەوە لە کاتێکدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فڕێیداوە.

## ٢٣- دەروازەی: ئەنگوستیلەی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

٢٨١٣- (ق) عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَتَبَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم كِتَاباً . أَوْ أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ . فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُمْ لاَ يَقْرَؤُونَ كِتَاباً إِلاَّ مَخْتُوماً، فَاتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ فِضَّةٍ، نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي يَدِهِ. فَقُلْتُ لِقَتَادَةَ: مَنْ قَالَ نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ؟ قَالَ: أَنَسٌ. [خ٦٥/ م٢٠٩٢]

(ق) لە شوعبەوە، لە قەتادەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نوسراوێکی نووسی–یان ویستی بینووسێت– پێیوترا: ئەوان نوسراوێك ناخوێننەوە بە مۆرکراوی نەبێت، ئەنگوستیلەیەکی لە زیو دروستکرد و نەقشەکەی بریتی بوو: "محمد رسول الله"، ئێستا وەك ئەوەی تەماشای سپێتییەکەی بکەم لە دەستیدا، وتم: بە قەتادە: کێ وتی نەقشەکەی "محمد رسول الله" بوو؟ وتی: ئەنەس.

٢٨١٤- (خ) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ لَمَّا اسْتُخْلِفَ كَتَبَ لَهُ، وَكَانَ نَقْشُ الخَاتَمِ ثَلاَثَةَ أَسْطُرٍ: مُحَمَّدٌ سَطْرٌ، وَرَسُولٌ سَطْرٌ، وَاللهُ سَطْرٌ. [خ٥٨٧٨]

(خ) لە ئەنەسەوە: کە ئەبوبەکر بوو بە خەلیفە نوسراوێکی بۆ نووسی، نەقشی ئەنگوستیلەکە سێ دێڕ بوو: "محمد" دێڕێك، و "رسول" دێڕێك، و "الله" دێڕێك.

- زاد في رواية: كَانَ خاتَمُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي يَدِهِ، وَفِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ بَعْدَهُ، وَفِي يَدِ عُمَرَ بَعْدَ أَبِي بَكْرٍ، فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ، جَلَسَ عَلَى بِئْرِ أَرِيسَ، قَالَ: فَأَخْرَجَ الخَاتَمَ، فَجَعَلَ يَعْبَثُ بِهِ، فَسَقَطَ، قَالَ: فَاخْتَلَفْنَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ مَعَ عُثْمَانَ، فَنَنْزَحُ الْبِئْرَ فَلَمْ نَجِدْهُ. [خ٥٨٧٩]

لە ریوایەتێكدا ئەمەی زیاد كردووە: ئەنگوستیلەكەی پێغەمبەر(ﷺ) لە دەستیدا بوو، لەدوای ئەو لە دەستی ئەبوبەكردا بوو، لەدوای ئەبوبەكر لە دەستی عومەردا بوو، كاتێ سەردەمی عوسمان هات لەسەر بیری ئەریس دانیشتبوو، وتی: ئەنگوستیلەكەی لەدەست كردبووەوە و دەستاودەستی پێ دەكرد و بەربوویەوە، وتی: سێ رۆژ بە نۆرە لەگەڵ عوسمان بووین و ئاوی بیرەكەمان دەردەدا، بەڵام نەماندۆزییەوە.

٢٨١٥- (خ) عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ خاتَمُهُ مِنْ فِضَّةٍ، وَكَانَ فَصُّهُ مِنْهُ. [خ٥٨٧٠]

(خ) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت): ئەنگوستیلەكەی پێغەمبەر(ﷺ) لە زیو بوو، و كڵاوەكەشی هەر لە خۆی بوو.

٢٨١٦- (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَبِسَ خَاتَمَ فِضَّةٍ فِي يَمِينِهِ، فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ، كَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ. [م٢٠٩٤]

(م) لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەنگوستیلەیەكی زیوی لە دەستی راست بوو، كڵاوەیەكی حەبەشی تێدا بوو، كڵاوەكەی دەكردە رووی لەپی دەستی.

٢٨١٧- (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي هذِهِ، وَأَشَارَ إِلَى الْخِنْصِرِ مِنْ يَدِهِ الْيُسْرَى. [م٢٠٩٥]

(م) لە ئەنەسەوە، وتی: ئەنگوستیلەكەی پێغەمبەر(ﷺ) لەمەدا بوو، ئاماژەی كرد بۆ پەنجە بچكۆلەی دەستی چەپی خۆی.

٢٨١٨- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ.
* صحيح. [د٤٢٢٦/ ن٥٢١٨]

لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) ئەنگوستیلەی دەكردە دەستی راستی.

## ٢٤- دەروازەی: چاوکردن لە هاوەڵدانەران لە پۆشاك و هەڵکەوتەیان[١]

**٢٨١٩**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ**).

* حسن صحيح. [د٤٠٣١]

[وانظر في تقليدهم في اللباس: **٢٧٨٦**.

وفي فرق الشعر وصبغه: **٢٧٩٨**، **٢٨٠٠**.

وفي الشوارب واللحى: **٢٨٠٤**.

وفي اتباع الأمم السابقة: **٨٤٣**].

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس خۆی بە کۆمەڵێك بچوێنێت ئەو لەوانە).**

## ٢٥- دەروازەی: (خودا جوانە و جوانیی پێخۆشە)

**٢٨٢٠**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَرَأَى رَجُلاً شَعِثاً، قَدْ تَفَرَّقَ شَعْرُهُ، فَقَالَ: (**أَمَا كَانَ يَجِدُ هَذَا مَا يُسَكِّنُ بِهِ شَعْرَهُ**)؟ وَرَأَى رَجُلاً آخَرَ، وَعَلَيْهِ ثِيَابٌ وَسِخَةٌ، فَقَالَ: (**أَمَا كَانَ هَذَا يَجِدُ مَاءً يَغْسِلُ بِهِ ثَوْبَهُ**)؟

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لامان و پیاوێکی قژ هەڵچووی بینی، قژی سەری پەرش و بڵاو بووبوو، فەرمووی: (ئایا ئەمە شتێك نابینێتەوە قژی پێ دابمرکێنێ)؟، پیاوێکی تری بینی پۆشاکێکی پیسی لەبەر بوو، فەرمووی: (ئایا ئەمە ئاوی دەستناکەوێ پۆشاکەکەی پێ بشۆری)؟.**

- ولم يذكر النسائي أمر الثوب. [د٤٠٦٢/ ن٥٢٥١]

* صحيح.

**نەسائی باسی پۆشاکەکەی نەکردووە.**

---

[١] هەڵکەوتەیان: واتە ڕووالەتی دەرەوەیان-و.

**٢٨٢١**– عَنْ مالِكِ بْنِ نَضْلَةَ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فِي ثَوْبٍ دُونٍ، فَقَالَ: (**أَلَكَ مَالٌ**)؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (**مِنْ أَيِّ الْمَالِ**)؟ قَالَ: قَدْ آتَانِي اللهُ مِنَ الْإِبِلِ وَالْغَنَمِ وَالْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، قَالَ: (**فَإِذَا آتَاكَ اللهُ مَالاً، فَلْيُرَ أَثَرُ نِعْمَةِ اللهِ عَلَيْكَ وَكَرَامَتِهِ**).

* صحيح. [د٤٠٦٣/ ن٥٢٣٨، ٥٢٣٩، ٥٣٠٩]

له مالیکی کوڕی "نَضْلَة"ەوە، وتی: له پۆشاکێکی نزمدا هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: **(ئایا ماڵ و سامانت هەیە؟)**، وتم: بەڵێ، فەرمووی: **(چ جۆرە ماڵ و سامانێك؟)**، وتی: خودا حوشتر و مەڕ و ئەسپ و كۆیلەی پێداوم، فەرمووی: **(گەر خودا ماڵی پێداوی با ئەسەری نیعمەتەکە و ڕێزلێنانی بۆ تۆ لەسەرت ببینێت)**.

**٢٨٢٢**– عَنِ ابْنِ عَمْرِو بْنِ العاص قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ اللهَ يُحِبُّ أَنْ يُرَى أَثَرُ نِعْمَتِهِ عَلَى عَبْدِهِ**). [ت٢٨١٩]

* حسن صحيح.

له عەمری کوڕی عاصەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا پێیخۆشە ئەسەری نیعمەتەکەی لەسەر بەندەکەی ببینێت)**.

**٢٨٢٣**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ كَانَ لَهُ شَعْرٌ؛ فَلْيُكْرِمْهُ**).

* حسن صحيح. [د٤١٦٣]

[وانظر: **٣٣٩٧**].

له ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس پرچی هەیە با ڕێزی لێبنێت[1])**.

## ٢٦- دەروازەی: بۆنی خۆش ڕەد ناکرێتەوە

[انظر: **٣١٢٤**.

وانظر: **١١٠٥** من مست طيبا لا تذهب إلى المسجد].

---

[1] واتە: پاك و خاوێن ڕایبگرێ و دایبهێنێت و بۆنی خۆشی لێبدات–و.

## ٢٧- دەروازەی: ڕەنگی پۆشاک

**٢٨٢٤-** عَنْ هِلاَلِ بْنِ عَامِرٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِمِنًى يَخْطُبُ عَلَى بَغْلَةٍ، وَعَلَيْهِ بُرْدٌ أَحْمَرُ، وَعَلِيٌّ ﷺ أَمَامَهُ يُعَبِّرُ عَنْهُ. [د٤٠٧٣]

* صحيح.

**لە هیلالی کوڕی عامیرەوە، لە باوکییەوە، وتی: لە مینا پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی لەسەر ئێسترێك وتاری دەدا و بوردێکی سووری لەبەر بوو، عەلی(خوا لێی رازی بێت) لە پێشییەوە لەوەوە گوزارشتی دەدا.**

**٢٨٢٥-** عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَالَ: إِنِّي لَأُحِبُّ أَنْ أَنْظُرَ إِلَى الْقَارِئِ أَبْيَضَ الثِّيَابِ. [ط١٦٨٩]

**لە مالیکەوە، ئەو پێیگەیشتووە: عومەری کوڕی خەتاب وتی: من پێمخۆشە تەماشای خوێنەری قورئان بکەم پۆشاکی سپی بێت.**

**٢٨٢٦-** عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَلْبَسُ الثَّوْبَ الْمَصْبُوغَ بِالْمِشْقِ، وَالثَّوْبَ الْمَصْبُوغَ بِالزَّعْفَرَانِ. [ط١٦٩١]

* إسناده صحيح.

[انظر: **٢٠٤٣، ٢٧٨٥، ٢٧٨٨، ٣٧٢٣**].

**لە نافیعەوە: عەبدوڵای کوڕی عومەر پۆشاکی بۆیاخکراو بە قوڕەسوورە و بۆیاخکراو بە زەعفەرانی دەپۆشی.**

## ٢٨- دەروازەی: بە ڕاست دەستپێکردن لە پۆشیندا

**٢٨٢٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا لَبِسَ قَمِيصاً بَدَأَ بِمَيَامِنِهِ. [ت١٧٦٦]

* صحيح.

[انظر: **٩٥٠، ٢٨٤٥**].

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) کراسێکی لەبەرکردبایە بە لای راستی دەستی پێ دەکرد.

## ٢٩- دەروازەی: چی دەڵێ کاتێ پۆشاکێ نوێ دەپۆشێت

**٢٨٢٨-** عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا اسْتَجَدَّ ثَوْباً سَمَّاهُ بِاسْمِهِ، إِمَّا قَمِيصاً، أَوْ عِمَامَةً، ثُمَّ يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهِ وَخَيْرِ مَا صُنِعَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ، وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ**).

[د٤٠٢٠ . ٤٠٢٢/ ت١٧٦٧]

لە "أبي نضرة"وە، لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) پۆشاکی نوێی بپۆشیبا بە ناوی خۆی ناوی دەهێنا، کراس، یان مێزەرە، پاشان دەیفەرموو: (**"اللهم لك الحمد، أنت كسوتنه، أسألك من خيره وخير ما صُنع له، وأعوذ بك من شره وشرِ ما صُنِع له"**).

- زاد أبو داود: قَالَ أَبُو نَضْرَةَ: فَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا لَبِسَ أَحَدُهُمْ ثَوْباً جَدِيداً قِيلَ لَهُ: تُبْلِي وَيُخْلِفُ اللهُ تَعَالَى.

  * صحيح.

  [انظر: **٢٧٨٨**].

ئەبو داود ئەمەی زیاد کردووە: "أبو نضرة" وتی: گەر یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) پۆشاکێکی تازەی بپۆشیبا پێی دەوترا: دەرزێت و خودا(سبحانه وتعالی) دەمێنێتەوە[١].

---

[١] واتە: ئەوە دەرزێت و تەنها خودا بۆ تۆ دەمێنێتەوە، دەگونجێ دوعای تەمەن درێژیش بێت وەك لە فەرموودەی (٢٧٨٨)دا هاتووە—و.

## ٣٠- دەروازەی: پۆشاکی ناوبانگ[1]

**٢٨٢٩**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ فِي الدُّنْيَا، أَلْبَسَهُ اللهُ ثَوْبَ مَذَلَّةٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ أَلْهَبَ فِيهِ ناراً)**.

* حسن. [د٤٠٢٩، ٤٠٣٠/ جه٣٦٠٦، ٣٦٠٧]

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس لە دنیا پۆشاکی ناوبانگ بپۆشێت لە رۆژی قیامەت خودا پۆشاکی زەلیلی و رسوایی لەبەر دەکات، پاشان ئاگری تێبەردەدات).**

## ٣١- دەروازەی: شڕ و شێواوی و دەستگرتنەوە لە هەندێ کاتدا

**٢٨٣٠**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ التَّرَجُّلِ إِلاَّ غِبّاً.

* صحيح. [د٤١٥٩/ ت١٧٥٦/ ن٥٠٧٠]

**لە عەبدوڵای کوڕی موغەفەلەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە قژ بەردانەوە مەگەر بە کەمی.**

**٢٨٣١**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم رَحَلَ إِلَى فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، وَهُوَ بِمِصْرَ، فَقَدِمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ آتِكَ زَائِراً، وَلَكِنِّي سَمِعْتُ أَنَا وَأَنْتَ حَدِيثاً مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَجَوْتُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَكَ مِنْهُ عِلْمٌ، قَالَ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ: كَذَا وَكَذَا.

قَالَ: فَمَا لِي أَرَاكَ شَعِثاً وَأَنْتَ أَمِيرُ الْأَرْضِ؟ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَنْهَانَا عَنْ كَثِيرٍ مِنَ الْإِرْفَاهِ. قَالَ: فَمَا لِي لاَ أَرَى عَلَيْكَ حِذَاءً؟ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَأْمُرُنَا أَنْ نَحْتَفِيَ أَحْيَاناً. [د٤١٦٠/ ن٥٠٧٣، ٥٢٥٤]

* صحيح.

---

[1] پۆشاکی ناوبانگ(ثوب الشهرة) پۆشاکێکە کەسەکە لوتبەرزی و خۆبەزلزانی پێوە دەنوێنێ و فەخر و شانازی پێوە دەکات–و.

لە عەبدوڵای کوڕی بورەیدەوە: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) گەشتی کرد بۆ لای فەزالەی کوڕی عوبەید، ئەو لە مصر بوو، گەیشتە لای و وتی: من بۆ سەردانت نەهاتووم، بەڵام من و تۆ فەرموودەیەکمان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیست رجام وابوو زانستێك لای تۆ هەبێت لەوەوە، وتی: کامەیە؟ وتی: ئەوە و ئەوە.

وتی: بۆ دەبینم قژت هەڵچووە و تۆ ئەمیری زەوییەکی؟ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی لێ دەکردین لە زۆری خۆشگوزەرانی، وتی: بۆچی نابینم پێڵاوت لە پێ بێت؟ وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ دەکردین هەندێ کات پێمان پەتی بێت.

## ٣٢- دەروازەی: پۆشینی خوری

**٢٨٣٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: صَنَعْتُ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بُرْدَةً سَوْدَاءَ، فَلَبِسَهَا، فَلَمَّا عَرِقَ فِيهَا، وَجَدَ رِيحَ الصُّوفِ، فَقَذَفَهَا.

قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: وَكَانَ تُعْجِبُهُ الرِّيحُ الطَّيِّبَةُ. [د٤٠٧٤]

* صحيح.

لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: بوردەیەکی رەشم بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دروستکرد و لەبەری کرد، کاتێ ئارەقەی تێدا کردەوە بۆنی خورییەکەی کرد و فرێی دا.

وتی: پێموایە وتی: ئەو بە بۆنی خۆش سەرسام بوو.

## ٣٣- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی مێزەرە و کراس و جبە و خوف هاتووە

**٢٨٣٣-** عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا اعْتَمَّ سَدَلَ عِمَامَتَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ.

قَالَ نَافِعٌ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَسْدِلُ عِمَامَتَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ. [ت١٧٣٦]

* صحيح.

[وانظر: **٢٠٤٣**].

لە لە نافیعەوە، لە ئیبن عومەرەوە، وتی: گەر پێغەمبەر(ﷺ) مێزەرەی ببەستبا سەری مێزەرەکەی بە دوو ناوشانیدا بەردەدایەوە.

نافیع دەڵێ: ئیبن عومەریش مێزەرەکەی بە نێوان دوو شانیدا بەردەدایەوە.

**٢٨٣٤**– عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كَانَ أَحَبُّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْقَمِيصَ.
* صحيح. [د٤٠٢٥/ ت١٧٦٢/ جه٣٥٧٥]

لە ئوم سەلەمەوە، وتی: خۆشەویستترین پۆشاك لای پێغەمبەر(ﷺ) كراس بوو.

**٢٨٣٥**– عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَبِسَ جُبَّةً رُومِيَّةً ضَيِّقَةَ الْكُمَّيْنِ.
* صحيح. [ت١٧٦٨]

لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە: پێغەمبەر(ﷺ) جبەیەکی ڕۆمی قۆڵ تەسکی لەبەر کرد.

**٢٨٣٦**– عَنِ الشَّعْبِيِّ. قَالَ: قَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: أَهْدَى دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خُفَّيْنِ، فَلَبِسَهُمَا. [ت١٧٦٩]
* صحيح.

لە شەعبییەوە، وتی: موغیرەی کوڕی شوعبە وتی: دیحیەی کەلبی جووتێك خوف هەدیەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد و لەپێی کرد.

## ٣٤- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی بۆنی خۆشی پیاوان و ژنان هاتووە

**٢٨٣٧**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**طِيبُ الرِّجَالِ مَا ظَهَرَ رِيحُهُ وَخَفِيَ لَوْنُهُ، وَطِيبُ النِّسَاءِ مَا ظَهَرَ لَوْنُهُ وَخَفِيَ رِيحُهُ**).
* صحيح. [د٢١٧٤/ ت٢٧٨٧/ ن٥١٣٢، ٥١٣٣]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**بۆنی پیاوان ئەوەیە بۆنەکەی ئاشکرابێت و ڕەنگەکەی شاراوە بێت، بۆنی ئافرەتان ڕەنگەکەی ئاشکرابێت و بۆنەکەی شاراوە**).

## ٣٥- دەروازەی: چاورِشتن

٢٨٣٨- عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (عَلَيْكُمْ بِالْإِثْمِدِ عِنْدَ النَّوْمِ، فَإِنَّهُ يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ). [جه٣٤٩٦]

* صحيح.

له جابرەوە، وتی: گوێم له پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(له کاتی خەو به کلە چاوبرِێژن چونکه چاو رۆشن دەکاتەوە و موو دەروێنێ[1])**.

## ٣٦- دەروازەی: خەنە بۆ ئافرەتان

٢٨٣٩- عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ امْرَأَةً مَدَّتْ يَدَهَا إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِكِتَابٍ، فَقَبَضَ يَدَهُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَدَدْتُ يَدِي إِلَيْكَ بِكِتَابٍ فَلَمْ تَأْخُذْهُ؟ فَقَالَ: (إِنِّي لَمْ أَدْرِ، أَيَدُ امْرَأَةٍ هِيَ أَوْ رَجُلٍ) قَالَتْ: بَلْ يَدُ امْرَأَةٍ، قَالَ: (لَوْ كُنْتِ امْرَأَةً لَغَيَّرْتِ أَظْفَارَكِ بِالْحِنَّاءِ). [ن٥١٠٤]

* حسن.

له عائیشەوە: ئافرەتێك به نوسراوێك دەستی درێژ کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر دەستی کێشایەوە، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، به نوسراوێکەوە دەستم بۆ درێژ کردی وەرتنەگرت؟ فەرمووی: **(من نەمزانی ئایا دەستی ئافرەتێکه یان دەستی پیاوێك)**، وتی: بەڵکو دەستی ئافرەتە، فەرمووی: **(گەر ئافرەت بایت نینووکەکانت به خەنە دەگۆرِی)**.

## ٣٧- دەروازەی: ئافرەت بۆ چوونەدەرەوە بۆن له خۆی بدات

٢٨٤٠- عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا اسْتَعْطَرَتِ الْمَرْأَةُ، فَمَرَّتْ عَلَى الْقَوْمِ لِيَجِدُوا رِيحَهَا، فَهِيَ كَذَا وَكَذَا). قَالَ قَوْلاً شَدِيداً.

* حسن. [د٤١٧٣/ ت٢٧٨٦/ ن٥١٤١/ مي٢٦٨٨]

---

[1] واتە: برژانگ دەروێنێ-و.

**لە ئەبی موساوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (گەر ئافرەت عەتری لەخۆ دا و بە پاڵ كۆمەڵێك پیاودا گوزەری كرد تا بۆنەكەی بكەن، ئەو ئاوا و ئاوایە)، قسەی توندی لەسەر فەرموو.**

**٢٨٤١**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ، فَإِذَا خَرَجَتِ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ**). [ت١١٧٣]

* صحيح.

[انظر: **١١٠٦**].

**لە عەبدوڵای كوڕی مەسعوودەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (ئافرەت عەورەتە گەر چووە دەرەوە شەیتان لێی دەڕوانێ).**

## ٣٨- دەروازەی: حیجابی ئافرەت

**٢٨٤٢**– عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ ﴿**يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ**﴾[الأحزاب:٥٩]، خَرَجَ نِسَاءُ الْأَنْصَارِ كَأَنَّ عَلَى رُؤُوسِهِنَّ الْغِرْبَانَ مِنَ الْأَكْسِيَةِ. [د٤١٠١]

* صحيح.

**لە ئوم سەلەمەوە، وتی: كاتێك ئایەتی: ﴿يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ﴾** [الأحزاب:٥٩]، **دابەزی ئافرەتانی ئەنصار هاتنە دەرەوە وەك ئەوەی قاڵاو بەسەر سەریانەوە بێت لە سەرپۆشەوە.**

**٢٨٤٣**– عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ، دَخَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَعَلَيْهَا ثِيَابٌ رِقَاقٌ، فَأَعْرَضَ عَنْهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَقَالَ: (**يَا أَسْمَاءُ، إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتِ الْمَحِيضَ، لَمْ يَصْلُحْ أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلاَّ هَذَا وَهَذَا**)، وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ.

* صحيح، وقال أبو داود: مرسل. [د٤١٠٤]

[وانظر: في فرض الحجاب: **٧١٤، ٢٤٠٥، ٣٦٤٦**.

وانظر في الفصل بين الجنسين: **٢٤١٠، ٢٤١١**.

وانظر في عدم الدخول على النساء: **٢٤١٢، ٢٤١٣**].

لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): ئەسمای كچی ئەبوبەكر هاتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و پۆشاكی تەنكی لەبەربوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پشتی تێكرد و فەرمووی: **(ئەی ئەسما، گەر ئافرەت گەیشتە حەیز، گونجاو نییە هیچ شوێنێكی ببینرێ جگە لەمە و لەمە)**، ئاماژەی بۆ روخسار و دوو دەستی كرد.

## ٣٩- دەروازەی: دامانی ئافرەتان

**٢٨٤٤**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ، لَمْ يَنْظُرِ اللهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)**. فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: فَكَيْفَ يَصْنَعْنَ النِّسَاءُ بِذُيُولِهِنَّ؟ قَالَ: **(يُرْخِينَ شِبْراً)**، فَقَالَتْ: إِذاً تَنْكَشِفُ أَقْدَامُهُنَّ، قَالَ: **(فَيُرْخِينَهُ ذِرَاعاً، لاَ يَزِدْنَ عَلَيْهِ)**.

* صحيح. [ت١٧٣١/ ن٥٣٥١]

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس بە لار و لەنجە پۆشاكەكەی رابكێشێت خودا لە رۆژی قیامەت تەماشای ناكات)**، ئوم سەلەمە وتی: ئافرەتان چی بكەن بۆ دامانیان؟ فەرمووی: **(بستێك بەریدەدەنەوە)**، ئوم سەلەمە وتی: كەوابوو پێیەكانیان دەردەكەون، فەرمووی: **(باڵێك بەریدەدەنەوە و لەوە زیادی ناكەن)**.

## ٤٠- دەروازەی: لەپێ كردنی نەعل

**٢٨٤٥**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ، وَإِذَا انْتَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ، لِتَكُنِ الْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ وَآخِرَهُمَا تُنْزَعْ)**.

[خ٥٨٥٦/ م٢٠٩٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەكێك لە ئێوە نەعلی لەپێ كرد با بە راست دەست پێ بكات، گەر لە پێی داكەند با بە چەپ دەست پێ بكات، بۆئەوەی راستەكە یەكەمین بێت لەپێ دەكرێ و دواهەمین بێت لە پێ دادەكەنرێ)**.

**٢٨٤٦**– (م) عَنْ أَبِي رَزِينٍ قَالَ: خَرَجَ إِلَيْنَا أَبُو هُرَيْرَةَ، فَضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى جَبْهَتِهِ فَقَالَ: أَلاَ إِنَّكُمْ تَحَدَّثُونَ أَنِّي أَكْذِبُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِتَهْتَدُوا وَأَضِلَّ! أَلاَ وَإِنِّي أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِذَا انْقَطَعَ شِسْعُ أَحَدِكُمْ، فَلاَ يَمْشِ فِي الأُخْرَى حَتَّى يُصْلِحَهَا**). [م٢٠٩٨]

**(م) لە ئەبی ڕەزینەوە، وتی: ئەبو هورەیرە هاتە دەرەوە بۆ لامان، بە دەستی کێشای بە ناوچاوانیدا و وتی: دەزانن ئێوە باس لەوە دەکەن من درۆ دەکەم بە دەم پێغەمبەری خوداوە تا ئێوە هیدایەت وەربگرن و خۆم گومڕا ببم، دەزانن من شایەتی دەدەم لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست دەیفەرموو: (گەر دەمەزوانەی نەعلی یەکێك لە ئێوە پچڕا با بەوی تریانەوە بە ڕێدا نەڕوات تا چاکیدەکاتەوە).**

**٢٨٤٧**– عَنْ جَابِرٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَنْتَعِلَ الرَّجُلُ قَائِماً.
* صحيح. [د٤١٣٥]

**لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لەوەی پیاو بە پێوە نەعل لەپێ بکات.**

## بەشی یەکەم

## نەخۆش

### ١- دەروازەی: لەشساغی نیعمەتێکە لە خوداوە(سبحانه وتعالی)

**٢٨٤٨-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ خُبَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمِّهِ، قَالَ: كُنَّا فِي مَجْلِسٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَعَلَى رَأْسِهِ أَثَرُ مَاءٍ، فَقَالَ لَهُ بَعْضُنَا: نَرَاكَ الْيَوْمَ طَيِّبَ النَّفْسِ، فَقَالَ: (أَجَلْ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ). ثُمَّ أَفَاضَ الْقَوْمُ فِي ذِكْرِ الْغِنَى فَقَالَ: (لاَ بَأْسَ بِالْغِنَى لِمَنِ اتَّقَى، وَالصِّحَّةُ لِمَنِ اتَّقَى خَيْرٌ مِنَ الْغِنَى، وَطِيبُ النَّفْسِ مِنَ النَّعِيمِ). [جه٢١٤١]

* صحيح.

**لە مەعازی کوڕی عەبدولڵای کوڕی خوبەیبەوە، لە باوکییەوە، ئەویش لە مامییەوە، وتی: لە مەجلیسێك بووین، پێغەمبەر(ﷺ) هات و لەسەر سەری ئەسەری ئاو هەبوو، یەکێکمان پێمان وت: ئەمڕۆ دەتبینین (طيِّبَ النَّفْس[1])، فەرمووی: (بەڵێ، الحمد لله)، پاشان خەڵکەکە لە باسی دەوڵەمەندیدا ڕۆچوون، ئەویش فەرمووی: (دەوڵەمەندی خراپییەکی تێدا نییە بۆ کەسێك تەقوای خودای هەبێت، لەشساغی بۆ کەسێك تەقوای خودای هەبێت باشترە لە دەوڵەمەندی، نەفسی پاك و ڕەوانیش لە نیعمەتەکانە).**

### ٢- دەروازەی: پاداشتی باوەڕدار لەوەی تووشی دێت

**٢٨٤٩-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ، وَلاَ وَصَبٍ، وَلاَ هَمٍّ، وَلاَ حَزَنٍ، وَلاَ أَذًى، وَلاَ غَمٍّ، حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا؛ إِلاَّ كَفَّرَ اللهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ). [خ٥٦٤١/ م٢٥٧٣]

---

[1] واتە: دڵخۆش و بەشەوق و ڕەوان.

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، هەروەها لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر ماندووبوون و ئێش و پەژارە و دڵتەنگی و ئازار و خەمێك-تەنانەت دڕکێك دەچێت بە لاشەیدا- تووشی باوەڕدار ببێت خودا بەوانە لە گوناهەکانی هەڵدەوەرێنێت).**

**٢٨٥٠**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿**مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ**﴾ [النساء:١٢٣] بَلَغَتْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ مَبْلَغاً شَدِيداً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(قَارِبُوا وَسَدِّدُوا، فَفِي كُلِّ مَا يُصَابُ بِهِ الْمُسْلِمُ كَفَّارَةٌ، حَتَّى النَّكْبَةِ يُنْكَبُهَا، أَوِ الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا).** [م٢٥٧٤]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: کاتێ: ﴿**مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ**﴾ [النساء:١٢٣] دابەزی موسڵمانان تووشی تەنگەلانی و ناڕەحەتی هاتن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(نزیکببنەوە و ڕێك و ڕاست بن، لە هەموو ئەوەی موسڵمان تووشی دێت کەفارەت هەیە، تەنانەت هەڵکەوتنێك هەڵدەکەوێت یان دڕکێك دەچێت بە لاشەیدا).**

**٢٨٥١**- عَنْ أُمِّ الْعَلاَءِ قَالَتْ: عَادَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَنَا مَرِيضَةٌ فَقَالَ: **(أَبْشِرِي يَا أُمَّ الْعَلاَءِ! فَإِنَّ مَرَضَ الْمُسْلِمِ يُذْهِبُ اللهُ بِهِ خَطَايَاهُ، كَمَا تُذْهِبُ النَّارُ خَبَثَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ).**

* صحيح. [د٣٠٩٢]

لە ئوم عەلاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەردانی کردم و من نەخۆش بووم و فەرمووی: **(ئەی ئوم عەلا مژدەت لێ بێت، خودا بە نەخۆشی موسڵمان گوناهەکانی دەبات، وەك چۆن ئاگر خەڵتەی زێڕ و زیو دەبات).**

**٢٨٥٢**- عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم طَرَقَهُ وَجَعٌ، فَجَعَلَ يَشْتَكِي وَيَتَقَلَّبُ عَلَى فِرَاشِهِ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: لَوْ صَنَعَ هَذَا بَعْضُنَا لَوَجِدْتَ عَلَيْهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ الصَّالِحِينَ يُشَدَّدُ عَلَيْهِمْ، وَإِنَّهُ لاَ يُصِيبُ مُؤْمِناً نَكْبَةٌ مِنْ شَوْكَةٍ فَمَا فَوْقَ ذَلِكَ؛ إِلاَّ حُطَّتْ بِهِ عَنْهُ خَطِيئَةٌ وَرُفِعَ بِهَا دَرَجَةٌ).** [حم٢٥٢٦٤، ٢٥٨٠٤]

* إسناده صحيح.

لە عائیشەوە: ئێشێك دای لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، نەخۆشکەوت و لە جێگەکەی وەردەگەڕا، عائیشە وتی: گەر یەکێك لە ئێمە ئەوەی بکردبایە بەسەریدا دەهاتی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(صاڵحان لێیان توند دەکرێتەوە، ناخۆشی– دڕکێك و بۆ سەرەوە– تووشی باوەڕدارێك ببێت گوناهی لێ هەڵدەوەرێ و بەوە پلەیەك بەرز دەبێتەوە).**

## ٣- دەروازەی: ئەوەی نەخۆش پێشتر ئەنجامی دەدا لە نەخۆشییەکەی بۆی دەنوسرێت

**٢٨٥٣**– (خ) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ، أَوْ سَافَرَ، كُتِبَ لَهُ مِثْلُ ما كَانَ يَعْمَلُ مُقِيماً صَحِيحاً).** [خ٢٩٩٦]

(خ) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بەندە نەخۆشکەوت یان سەفەری کرد هەروەك ئەوەی بۆ دەنوسرێت لە نیشتەجێبوون و لەشساغیدا ئەنجامی دەدا).**

## ٤- دەروازەی: پاداشتی ئارامگرتن لەسەر نەخۆشی

**٢٨٥٤**– (ق) عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ: أَلاَ أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: هذِهِ المَرْأَةُ السَّوْدَاءُ، أَتَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: إِنِّي أُصْرَعُ، وَإِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللهَ لِي. قَالَ: **(إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الجَنَّةُ، وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللهَ أَنْ يُعَافِيَكِ)**، فَقَالَتْ: أَصْبِرُ، فَقَالَتْ: إِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللهَ لِي أَنْ لاَ أَتَكَشَّفَ، فَدَعَا لَهَا.

[خ٥٦٥٢/ م٢٥٧٦]

(ق) لە عەتای کوڕی ڕەباحەوە، وتی: ئیبن عەباس پێی وتم: دەتەوێ ئافرەتێکی ئەهلی بەهەشتت پێ نیشان بدەم؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەو ئافرەتە ڕەشپێستە، هات بۆ

لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: مـن فێـدارم و دەردەکـەوم، دوعـام لای خـودا بـۆ بکـە، فەرمووی: **(گەر دەخوازی ئارام بگرە و بەهەشتت بۆ هەیە، گەر دەشخوازی دوعات لای خودا بۆ دەکەم تا چاکت بکاتەوە)**، ژنەکە وتی: ئارام دەگرم، هەروەها وتی: من دەردەکەوم، داوام لە خودا بۆ بکە دەرنەکەوم، پێغەمبەر دوعای بۆ کرد.

## ٥- دەروازەی: پاداشتی ئەو کەسەی بینینی لەدەستداوە

**٢٨٥٥**- (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ اللهَ قَالَ: **إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ، عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الجَنَّةَ**). يُرِيدُ: عَيْنَيْهِ. [خ٥٦٥٣]

(خ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بـوو دەیفـەرموو: **(خـودا فەرموویـەتی: گـەر بەندەکـەم تاقیبکەمـەوە بـە دوو خۆشەویستەکەی و ئارامی گرت، ئەوا لەو دوانە بە بەهەشت باربووی بۆ دەکەمەوە)**. مەبەستی دوو چاویەتی.

## ٦- دەروازەی: سەردانی نەخۆش و دوعا بۆ کردنی

**٢٨٥٦**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا أَتَى مَرِيضاً أَوْ أُتِيَ بِهِ، قَالَ: (**أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ، اشْفِ وَأَنْتَ الشَّافِي، لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَماً**). [خ٥٦٧٥/ م٢١٩١]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێـت): گـەر پێغەمبـەری خـودا بڕۆیشـتبا بـۆ لای نەخۆشێك یان نەخۆشێکیان بهێنابا بۆ لای دەیفـەرموو: **(أذهـبِ البـأسَ ربَّ النـاسِ، اشفِ وأنتَ الشافي، لا شِفاءَ إلا شِفاؤُكَ، شِفاء لا يُغادِرُ سَقَما-پـەروەردگاری خـەڵك ناخۆشی لادە و شفا بنێرە، تۆ شفادەری، شفایەك نەخۆشییەك نەهێڵێتەوە)**.

**٢٨٥٧**– (خ) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ غُلَامٌ يَهُودِيٌّ يَخْدُمُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَمَرِضَ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَعُودُهُ، فَقَعَدَ عِنْدَ رَأْسِهِ، فَقَالَ لَهُ: (**أَسْلِمْ**)، فَنَظَرَ إِلَى أَبِيهِ وَهُوَ عِنْدَهُ، فَقَالَ لَهُ: أَطِعْ أَبَا الْقَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَسْلَمَ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ يَقُولُ: (**الحَمْدُ للهِ الَّذِي أَنْقَذَهُ مِنَ النَّارِ**). [خ١٣٥٦]

(خ) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: **غولامێکی یەهوودی خزمەتی پێغەمبەری(ﷺ) دەکرد و نەخۆشکەوت، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ سەردانی، لای سەریەوە دانیشت و پێی فەرموو: (موسڵمان ببە)، غولامەکە تەماشایەکی باوکی کرد کە لە لای بوو، باوکی پێی وت: گوێڕایەڵی باوکی قاسم(ﷺ) ببە، بۆیە غولامەکە موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە و ئەو دەیفەرموو: (حەمد بۆ ئەو خودایەی لە ئاگر رزگاری کرد)**.

**٢٨٥٨**– (م) عَنْ ثَوْبَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا عَادَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، لَمْ يَزَلْ فِي خُرْفَةِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَرْجِعَ**). [م٢٥٦٨]

(م) لە سەوبانەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر موسڵمان سەردانی نەخۆشی برا موسڵمانەکەی بکات بەردەوام لە میوە ڕنینی بەهەشتە تا دەگەڕێتەوە)**.

- وفي رواية: (**مَنْ عَادَ مَرِيضاً، لَمْ يَزَلْ فِي خُرْفَةِ الْجَنَّةِ**). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! وَمَا خُرْفَةُ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: (**جَنَاهَا**).

لە ریوایەتێکدا: **(هەر کەس سەردانی نەخۆشێك بکات بەردەوام لە ڕنینی میوەی بەهەشتە(خُرفة الجنة))**، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا: ڕنینی میوەی بەهەشت چییە(خرفة الجنة)؟ فەرمووی: **(لێکردنەوەی بەری)**.

**٢٨٥٩**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ عَادَ مَرِيضاً لَمْ يَحْضُرْ أَجَلُهُ، فَقَالَ عِنْدَهُ سَبْعَ مِرَارٍ: أَسْأَلُ اللهَ الْعَظِيمَ، رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ؛ إِلاَّ عَافَاهُ اللهُ مِنْ ذَلِكَ الْمَرَضِ**). [د٣١٠٦/ ت٢٠٨٣]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس سەردانی نەخۆشێك بکات وادەی مردنەکەی ئامادە نەبووبێت و حەوت جار بڵێت: "أسألُ اللهَ العظيمَ ربَّ العرشِ العظيمِ أنْ يَشفيكَ-داوا لە خودای مەزن، پەروەردگاری عەرشی مەزن دەکەم شفات بدات" خودا لەو نەخۆشییە شیفای بۆ دەنێرێت).**

## ٧- دەروازەی: ناپەسەندی ئاواتخواستن بۆ مردن

**٢٨٦٠-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ المَوْتَ مِنْ ضُرٍّ أَصَابَهُ، فَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ فَاعِلاً، فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ! أَحْيِنِي ما كَانَتِ الحَيَاةُ خَيْراً لِي، وَتَوَفَّنِي إذا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْراً لِي). [خ٥٦٧١، م٢٦٨٠]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(یەکێك لە ئێوە بە هۆی زیانێکەوە تووشیهاتووە ئاوات بۆ مردن نەخوازێت، گەر هەردەبێت ئاوات بخوازێت با بڵێت: خودایە، بمژێنە تا ژیان بۆ من خێر و باشە، و بمرێنە گەر مردن بۆ من خێر و باشە).**

**٢٨٦١-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ يَتَمَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ، وَلاَ يَدْعُ بِهِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَهُ، إِنَّهُ إِذَا مَاتَ أَحَدُكُمُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ، وَإِنَّهُ لاَ يَزِيدُ الْمُؤْمِنَ عُمْرُهُ إِلاَّ خَيْراً). [م٢٦٨٢]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(یەکێك لە ئێوە ئاوات بۆ مردن نەخوازێت، داوای نەکات بەرلەوەی بۆی بێت، چونکە گەر یەکێك لە ئێوە مرد کاری لێ دەبڕێت، زیادبوونی تەمەنی باوەڕدار تەنها خێری زیاد دەکات).**

## بەشی دووەم

# پزیشکی و روقییە و سیحر

### ١- دەروازەی: بۆ هەموو نەخۆشییەك چارەسەرێك هەیە

**٢٨٦٢-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: **(مَا أَنْزَلَ اللهُ دَاءً؛ إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً).** [خ٥٦٧٨]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا هەر دەردێکی دابەزاندبێت شیفایەکی بۆ دابەزاندووە).**

**٢٨٦٣-** (م) عَنْ جَابِرٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: **(لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ، فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ؛ بَرَأَ بِإِذْنِ اللهِ عزّ وجل).** [م٢٢٠٤]

(م) لە جابرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ئەو فەرمووی: **(بۆ هەموو دەردێك دەوایەك هەیە، گەر دەواکە تووشی دەردەکە هات بە مۆڵەتی خودا(عز وجل) چاك دەبێتەوە).**

**٢٨٦٤-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، وَأَصْحَابُهُ كَأَنَّمَا عَلَى رُؤُوسِهِمُ الطَّيْرُ، فَسَلَّمْتُ ثُمَّ قَعَدْتُ، فَجَاءَ الْأَعْرَابُ مِنْ هَاهُنَا وَهَاهُنَا فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَتَدَاوَى؟ فَقَالَ: **(تَدَاوَوْا، فَإِنَّ اللهَ عزّ وجل لَمْ يَضَعْ دَاءً؛ إِلاَّ وَضَعَ لَهُ دَوَاءً، غَيْرَ دَاءٍ وَاحِدٍ: الْهَرَمُ).** [د٣٨٥٥/ ت٢٠٣٨/ جه٣٤٣٦]

لە ئوسامەی کوڕی شەریکەوە، وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وەك ئەوەی هاوەڵانی باڵندە لەسەر سەریان بێت، سەلامم کرد و پاشان دانیشتم، ئەعراب لێرە و لەوێوە هاتن و وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا دەوا بەکاربهێنین؟ ئەویش

**فەرمووی: (دەوا بەکاربهێنن، چونکە خودا(عز وجل) هەر دەردێکی دانا بێت دەوایەکی بۆ داناوە، جگە لە یەك دەرد: پیری).**

▪ وفي رواية لأحمد: (إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً، عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ، وَجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ). [حم١٨٤٥٦]

* صحيح.

لە ریوایەتێکی ئەحمەددا: **(شیفای بۆ دابەزاندووە، ئەوەی دەیزانێت زانیویەتی و ئەوەی نایزانێت نەیزانیوە).**

## ٢- دەروازەی: شیفا لە سیاندایە

**٢٨٦٥-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(الشِّفَاءُ فِي ثَلاَثَةٍ: فِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ، أَوْ شَرْبَةِ عَسَلٍ، أَوْ كَيَّةٍ بِنَارٍ، وَأَنَا أَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ).** [خ٥٦٨١ (٥٦٨٠)]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(شیفا لە سیاندایە: مژینی کەڵەشاخ، یان خواردنەوەیەکی هەنگوین، یان داخکردن بە ئاگر، من نەهی دەکەم لە ئومەتەکەم لە داخکردن).**

## ٣- دەروازەی: چارەسەر بە هەنگوین

**٢٨٦٦-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: أَخِي يَشْتَكِي بَطْنَهُ، فَقَالَ: **(اسْقِهِ عَسَلاً)**، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ، فَقَالَ: **(اسْقِهِ عَسَلاً)**، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ فَقَالَ: **(اسْقِهِ عَسَلاً)**. ثُمَّ أَتَاهُ فَقَالَ: قَدْ فَعَلْتُ؟ فَقَالَ: **(صَدَقَ اللهُ، وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ، اسْقِهِ عَسَلاً)**. فَسَقَاهُ، فَبَرَأَ. [خ٥٦٨٤/ م٢٢١٧]

(ق) لە ئەبی سەعیدەوە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: براکەم ئازاری سکی هەیە، فەرمووی: **(هەنگوینی پێ نۆش بکە)**، پاشان دووەم جار هات و پێی فەرموو: **(هەنگوینی پێ نۆش بکە)**، پاشان سێیەم جار هات و پێی فەرموو: **(هەنگوینی پێ نۆش بکە)**، پاشان هات و وتی: ئەوەم ئەنجامدا، پێغەمبەر فەرمووی:

**(خودا راست دەکات و سکی براکەت درۆ دەکات، هەنگوینی پێ نۆش بکە)**، پیاوەکە هەنگوینی پێ نۆش کرد و چاکبوویەوە.

## ٤- دەروازەی: چارەسەر بە کەڵەشاخ

**٢٨٦٧**- (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ أَجْرِ الحَجَّامِ، فَقَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ، وَأَعْطَاهُ صَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ، وَكَلَّمَ مَوَالِيَهُ فَخَفَّفُوا عَنْهُ، وَقَالَ: **(إِنَّ أَمْثَلَ ما تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ، وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيُّ)**، وَقَالَ: **(لاَ تُعَذِّبُوا صِبْيَانَكُمْ بِالْغَمْزِ مِنَ الْعُذْرَةِ، وَعَلَيْكُمْ بِالْقُسْطِ)**. [خ٥٦٩٦ (٢١٠٢)/ م١٥٧٧]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت)، ئەو پرسیاری لێکرا لە کرێی کەڵەشاخگر، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەڵەشاخی کرد، ئەبو تەیبە کەڵەشاخی بۆ گرت، دوو "صاع[1]" لە خورمای پێدا، پێغەمبەر قسەی کرد لەگەڵ مەوالییەکانی ئەبی تەیبە[2] و زەریبەکەیان لەسەر سووک کرد، پێغەمبەر فەرمووی: **(باشترین شتێك وەك دەوا بەکارتان هێنابێت کەڵەشاخ و چیلکەی هندییە)**، هەروەها فەرمووی: **(ئازاری منداڵەکانتان مەدەن بە گووشینی هەوکردنی زمانە بچکۆلە، لەسەرتانە چیلکەی هندی[3] بەکاربهێنن)**.

**٢٨٦٨**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِمَّا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ خَيْرٌ، فَالْحِجَامَةُ)**. [د٣٨٥٧/ جه٣٤٧٦]

* صحيح.

---

[1] صاع: کەمەکەی نزیك بە دوو کیلۆیە و زۆرەکەی نزیك بە چوار کیلۆ-الموسوعة الحديثية.

[2] مەوالییەکانی بریتی بوون لە بەنو حاریسە و مەولاکەی بریتی بوو لە مەحیصەی کوڕی مەسعوود-الموسوعة الحديثية.

[3] چیلکەی هندی: جۆرە گیایەکە-الموسوعة الحديثية.

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر شتێك لەوانەی چارەسەری پێ دەکەن خێری تێدا بێت بریتییە لە کەڵەشاخ).**

## ٥- دەروازەی: چارەسەر بە داخکردن

**٢٨٦٩-** (خ) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أَبَا طَلْحَةَ وَأَنَسَ بْنَ النَّضْرِ كَوَيَاهُ، وَكَوَاهُ أَبُو طَلْحَةَ بِيَدِهِ.
[خ٥٧١٩]

**(خ) لە ئەنەسەوە: ئەبو تەلحە و ئەنەسی کوڕی نەزر داخیان کرد، ئەبو تەلحە بە دەستی خۆی داخی کرد.**

**٢٨٧٠-** (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ طَبِيباً، فَقَطَعَ مِنْهُ عِرْقاً، ثُمَّ كَوَاهُ عَلَيْهِ.
[م٢٢٠٧]

**(م) لە لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پزیشکێکی نارد بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب، ڕەگێکی بڕی و پاشان داخکردنی لەسەر کرد.**

**٢٨٧١-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الْكَيِّ، فَاكْتَوَيْنَا، فَمَا أَفْلَحْنَا وَلاَ أَنْجَحْنَا.
[د٣٨٦٥/ ت٢٠٤٩/ جه٣٤٩٠]

* صحيح.

**لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لە داخ کردن، ئێمە داخ کردنمان ئەنجام دا، نە پێی سەرفرازبووین و نە سەرکەوتووبووین.**

## ٦- دەروازەی: چارەسەر بە ڕەشکە

**٢٨٧٢-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(فِي الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ؛ إِلاَّ السَّامَ).**
قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَالسَّامُ: الْمَوْتُ، وَالْحَبَّةُ السَّوْدَاءُ: الشُّونِيزُ.		[خ٥٦٨٨، م٢٢١٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: ئەو گوێی لێ بوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: **(لە "حبة السوداء-رەشکە"دا شفا هەیە بۆ هەموو دەردێك، جگە لە "السام-مردن").**

ئیبن شیهاب وتی: "السام" بریتییە لە مردن، "حبة السوداء"یش بریتییە لە "الشُّنيز".

## ٧- دەروازەی: چارەسەر بە چیلکەی هندی

**٢٨٧٣-** (ق) عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ. وَكَانَتْ مِنَ المهَاجِرَاتِ الأُوَلِ اللَّاتِي بَايَعْنَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَهِيَ أُخْتُ عُكَّاشَةَ بْنِ مِحْصَنٍ. أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِابْنٍ لَهَا قَدْ عَلَّقَتْ عَلَيْهِ مِنَ الْعُذْرَةِ، فَقَالَ: **(اتَّقُوا اللهَ عَلَى مَا تَدْغَرْنَ أَوْلاَدَكُنَّ بِهَذِهِ الأَعْلاَقِ، عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ، مِنْهَا ذَاتُ الجَنْبِ).**

يُرِيدُ الْكُسْتَ؛ يَعْنِي: الْقُسْطَ. وَهِيَ لُغَةٌ. [خ٥٧١٨ (٥٦٩٢)/ م٢٢١٤]

(ق) لە ئوم قەیسی کچی میحصەنەوە-یەکێك بوو لە ئافرەتە کۆچکەرە یەکەمەکان بەیعەتیان بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد-ئەو خوشکی عوکاشەی کوڕی میحصەنە- کوڕێکی خۆی هێنا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو بە پەنجە چارەسەری بۆ هەوکردنی زمانە بچکۆلەی کوڕەکەی کرد بوو، پێغەمبەر فەرمووی: **(لە خودا بترسن لەسەر ئەوەی بە پەنجە قوڕگی منداڵەکانتانی پێ دەگوشن، ئەم چیلکە هندییە بەکاربهێنن، چونکە حەوت شیفای تێدایە لەو شیفایانە شیفای "ذات الجنب"[1]").**

مەبەستی "الكُستَ"، واتە: "القسط"، ئەوەش شێوەزارێکە.

- وفي رواية لهما: قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(عَلَيْكُمْ بِهَذَا العُودِ الْهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ: يُسْتَعَطُ بِهِ مِنَ الْعُذْرَةِ، وَيُلَدُّ بِهِ مِنْ ذَاتِ الجَنْبِ).** [خ٥٦٩٢]

---

[1] "ذات الجنب" بریتییە لە ئازاری لاکان، وتراویشە هەوکردنی سییە-الموسوعة الحديثية.

لە ریوایەتێکی هەردووکیاندا: ئوم قەیس وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(لەسەرتانە ئەم چیلکە هندییە بەکاربهێنن، چونکە حەوت شیفای تێدایە، لە هەوکردنی قورگ بۆنەکەی هەڵدەمژرێ و لە هەوکردنی سییەکان دەکرێتە لا لەغاوەی).**

## ٨- دەروازەی: ئاوی دومبەڵان شیفایە بۆ چاو

**٢٨٧٤-** (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ**). [خ٤٤٧٨/م٢٠٤٩]

(ق) لە لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **دومبەلان لە "المنّ-گەزۆیە"، ئاوەکەی شیفایە بۆ چاو).**

**٢٨٧٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**الْعَجْوَةُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَفِيهَا شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ، وَالْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ**). [ت٢٠٦٦/ مي٢٨٨٢]

* حسن صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(عەجوە لە بەهەشتەوەیە و شیفای تێدایە لە ژەهر، دومبەلان لە گەزۆیە، و ئاوەکەی شیفایە بۆ چاو).**

## ٩- دەروازەی: حەرام کردنی چارەسەر بە عارەق و پیسییەکان

**٢٨٧٦-** (م) عَنْ طَارِقِ بْنِ سُوَيْدٍ الْجُعْفِيِّ: أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الْخَمْرِ؟ فَنَهَاهُ، أَوْ كَرِهَ أَنْ يَصْنَعَهَا، فَقَالَ: إِنَّمَا أَصْنَعُهَا لِلدَّوَاءِ، فَقَالَ: (**إِنَّهُ لَيْسَ بِدَوَاءٍ، وَلَكِنَّهُ دَاءٌ**).

[م١٩٨٤]

(م) لە تاریقی کوڕی سوەیدی جوعفییەوە: ئەو پرسیاری عارەقی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد؟ ئەویش نەهی لێکرد، یا لای ناپەسەند بوو دروستی بکات، وتی: بۆ دەوا دروستی دەکەم، فەرمووی: **(ئەوە دەوا نییە، بەڵکو دەردە).**

## ١٠- دەروازەی: تا لە هاڵاوی دۆزەخە

**٢٨٧٧**- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ**). [خ٣٢٦٤/ م٢٢٠٩]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (تا لە هاڵاوی دۆزەخە، بۆیە بە ئاو ساردی بکەنەوە).**

## ١١- دەروازەی: تاعوون

**٢٨٧٨**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الشَّامِ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِسَرْغَ لَقِيَهُ أُمَرَاءُ الأَجْنَادِ، أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ وَأَصْحَابُهُ، فَأَخْبَرُوهُ: أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِأَرْضِ الشَّامِ.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقَالَ عُمَرُ: ادْعُ لِي المهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ، فَدَعَاهُمْ، فاسْتَشَارَهُمْ، وَأَخْبَرَهُمْ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّامِ، فاخْتَلَفُوا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَدْ خَرَجْتَ لأَمْرٍ، وَلاَ نَرَى أَنْ تَرْجِعَ عَنْهُ، وَقَالَ: بَعْضُهُمْ: مَعَكَ بَقِيَّةُ النَّاس وَأَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَلاَ نَرَى أَنْ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هذَا الْوَبَاءِ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي. ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِي الأَنْصَارَ، فَدَعَوْتُهُمْ، فَاسْتَشَارَهُمْ، فَسَلَكُوا سَبِيلَ المهَاجِرِينَ، وَاخْتَلَفُوا كَاخْتِلاَفِهِمْ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي. ثُمَّ قالَ: ادْعُ لِي مَن كَانَ هَاهُنَا مِنْ مَشْيَخَةِ قُرَيْشٍ مِنْ مُهَاجِرَةِ الْفَتْحِ، فَدَعَوْتُهُمْ، فَلَمْ يَخْتَلِفْ مِنْهُمْ عَلَيْهِ رَجُلاَنِ، فَقَالُوا: نَرَى أَنْ تَرْجِعَ بِالنَّاسِ وَلاَ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هذا الوْبَاءِ. فَنَادَى عُمَرُ فِي النَّاسِ: إِنِّي مُصَبِّحٌ عَلَى ظَهْرٍ، فَأَصْبِحُوا عَلَيْهِ.

قال أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ: أَفِرَاراً مِنْ قَدَرِ اللهِ؟ فَقَالَ عُمَرُ: لَوْ غَيْرُكَ قالَهَا يا أَبَا عُبَيْدَةَ؟ نَعَمْ، نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ إِلَى قَدَرِ اللهِ، أَرَأَيْتَ إنْ كَانَتْ لَكَ إِبِلٌ هَبَطَتْ وَادِياً لَهُ عُدْوَتَانِ: إِحْدَاهُمَا خَصْبَةٌ، وَالأُخْرَى جَدْبَةٌ، أَلَيْسَ إِنْ رَعَيْتَ الخَصْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللهِ، وَإِنْ رَعَيْتَ الجَدْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللهِ؟

قالَ: فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ عَوْفٍ، وَكَانَ مُتَغَيِّباً في بَعْضِ حَاجَتِهِ، فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي فِي هذَا عِلْماً، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ، فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا، فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَاراً مِنْهُ). قَالَ: فَحَمِدَ اللهَ عُمَرُ، ثُمَّ انْصَرَفَ.

[خ٥٧٢٩/ م٢٢١٩]

(ق) لە عەبدولاّی کوڕی عەباسەوە: عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) رۆیشت بۆ شام تا گەیشتە "سَرْغ"، لەو شوێنە ئەمیرانی سەربازان پێیگەیشتن، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و هاوەڵانی، هەواڵیان پێدا: تاعوون لە زەوی شام سەریهەڵداوە.

ئیبن عەباس وتی: عومەر وتی: کۆچکەرانی پێشەنگم بۆ بانگ بکەن، ئەویش بانگی کردن و عومەر راوێژی پێکردن، هەواڵی پێدان پەتایەك لە شام رویداوە، جیاوازی کەوتە نێوانیان، هەندێکیان وتیان: تۆ بۆ کاروبارێك هاتووی و پێمان باش نییە لێی پەشیمان ببیەوە، هەندێکی تریان وتیان: خەڵکانی تر و هاوەڵانی پێغەمبەری خودات(ﷺ) لەگەڵە، پێمان باش نییە رووبەڕووی ئەم پەتایەیان بکەیەوە، عومەر وتی: هەستن لە لام و بڕۆن، پاشان وتی: ئەنصارم بۆ بانگ بکەن، منیش بۆم بانگ کردن، راوێژی پێکردن، ئەوانیش رێگەی کۆچکەرانیان گرتەبەر و هەروەك ئەوان جیاوازی کەوتە نێوانیان، عومەر وتی: لە لام هەستن و بڕۆن، پاشان وتی: ئەوانەم بۆ بانگ بکە هۆ ئا لەو جێگەن لە پیرانی قورەیش لە کۆچکەرانی فەتح، منیش ئەوانەم بۆ بانگ کرد، دوو پیاو لەوان ناکۆکی نەکەوتە نێوانیان و وتیان: پێمان باشە خەڵکەکە بگێڕیتەوە و رووبەڕووی ئەم پەتایەیان نەکەیەوە، عومەر بانگی کرد، من بەیانی موسافیرم و ئێوەش لەسەر ئەوە رۆژ بکەنەوە.

ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح وتی: ئایا لە قەدەری خودا هەڵدێی؟ عومەر وتی: گەر جگە لە تۆ کەسێکی تر ئەو قسەی بکردبایە، ئەی ئەبو عوبەیدە؟ بەڵێ، لە قەدەری خودا هەڵدێین بۆ قەدەری خودا، باشە گەر حوشترت هەبێت و لە شیوێك دابەزیبیت و دوو لای هەبێت، یەکێکیان بەپیت و پڕ لەوەڕ و ئەویتریان وشك و بێ لەوەڕ، باشە گەر لە بەپیت و پڕ لەوەڕەکە بیان لەوەڕێنی بە قەدەری خودا نییە، گەر لە وشك و بێ لەوەڕەکەشدا بیان لەوەڕێنی بە قەدەری خودا نییە؟

وتی: عبدالرحمانی کوڕی عەوف هات-ئەو بۆ هەندێ پێویستی خۆی بزر بووبوو- و وتی: من لەمەدا زانستێکم پێیە، گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(گەر بیستتان لە زەوییەك سەریهەڵداوە[1] رووی لێ مەکەن، گەر لە زەوییەك سەریهەڵدا و ئێوەی تێدا بوو وەك هەڵهاتن لێی مەچنە دەرەوە)**، وتی: عومەر حەمدی خودای کرد، و پاشان رۆیشت.

**٢٨٧٩**- (ق) عَنْ عامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ سَمِعَهُ يَسْأَلُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ: ماذَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم في الطَّاعُونِ؟ فَقَالَ أُسَامَةُ: قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الطَّاعُونُ رِجْسٌ، أُرْسِلَ عَلَى طَائِفَةٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ. أَوْ: عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ. فَإِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ؛ فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا؛ فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَاراً مِنْهُ)**.
[خ٣٤٧٣/ م٢٢١٨]

(ق) لە عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە، لە باوکییەوە: ئەو گوێی لێبووە باوکی پرسیاری لە ئوسامەی کوڕی زەید دەکرد: چیت بیستووە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی تاعوون؟ ئوسامە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(تاعوون پیسییەکە، بۆ سەر دەستەیەك لە بەنی ئیسرائیل رەوانە کرا-یان بۆ سەر ئەوانەی پێش ئێوە- گەر بیستتان لە زەوییەك سەریهەڵداوە رووی لێ مەکەن، گەر لە زەوییەك روویدا و ئێوەی تێدا بوو وەك هەڵهاتن لێی مەچنە دەرەوە)**.

**٢٨٨٠**- (خ) عَنْ عائِشَةَ ﵂ . زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم . قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الطَّاعُونِ، فَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ: **(عَذَابٌ يَبْعَثُهُ اللهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ، وَأَنَّ اللهَ جَعَلَهُ رَحْمَةً لِلْمُؤْمِنِينَ، لَيْسَ مِنْ أَحَدٍ يَقَعُ الطَّاعُونُ، فَيَمْكُثُ في بَلَدِهِ صَابِراً مُحْتَسِباً، يَعْلَمُ أَنَّهُ لاَ يُصِيبُهُ إِلاَّ ما كَتَبَ اللهُ لَهُ؛ إِلاَّ كانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ شَهِيدٍ)**. [خ٣٤٧٤]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)-هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- وتی: پرسیاری تاعوونم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد؟ ئەویش هەواڵی پێدام تاعوون: **(سزایەکە خودا**

---

[1] واتە: پەتای تاعوون-و.

**ڕەوانەی دەکات بۆ سەر هەر کەس بخوازێت، خودا کردوویەتی بە ڕەحمەت بۆ باوەڕداران، هەر کەس تاعوون سەرهەڵبدات و بە مەبەستی ئارامگرتن و پاداشت لای خودا لە شار و وڵاتەکەی خۆی بمێنێتەوە و بزانێت تەنها ئەوە تووشی دەبێت خودا بۆی نوسیوە وەك پاداشتی شەهید پاداشتی بۆ هەیە).**

## ١٢- دەروازەی: کەنارگیری لە ئاوڵە

**٢٨٨١**– (م) عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ بْنِ سُوَيْدٍ الثَّقَفِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ رَجُلٌ مَجْذُومٌ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّا قَدْ بَايَعْنَاكَ، فَارْجِعْ)**. [م٢٢٣١]

(م) لە عەمری کوڕی شەریدی کوڕی سوەیدی سەقەفییەوە، لە باوکییەوە، وتی: لە وەفدەکەی سەقیف پیاوێکی ئاوڵەدار هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی بۆ نارد: **(ئێمە بەیعەتمان لێ وەرگرتی و بگەڕێوە).**

**٢٨٨٢**– (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ عَدْوَى، وَلاَ طِيَرَةَ، وَلاَ هَامَةَ، وَلاَ صَفَرَ، وَفِرَّ مِنَ الْمَجْذُومِ كَمَا تَفِرُّ مِنَ الأَسَدِ)**. [خ. ٥٧٠٧معلق]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **("عدوی و هامة و صفر[1]" نییە، لە ئاوڵەدار هەڵبێ وەك چۆن لە شێر هەڵدێی).**

**٢٨٨٣**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تُدِيمُوا النَّظَرَ إِلَى الْمَجْذُومِينَ)**.
* حسن صحيح. [جه٣٥٤٣]

**لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (زۆر تەماشای ئاوڵەداران مەکەن).**

---

[1] عدوی: گواستنەوەی نەخۆشی، مەبەست ئەوەیە بکەری ڕاستەقینەی نەخۆشینەکان بریتییە لە خودا و نەخۆشی بۆ خۆی ناتوانێ بگوێزێتەوە و زیان بگەیەنێت، مەبەست خۆپارێزی نییە لە نەخۆشی، چونکە لە کۆتایی فەرموودەکەدا دەفەرموێ لە نەخۆشی ئاوڵە هەڵبێ و خۆت بپارێزە وەك چۆن لە شێر هەڵدێی، هامة: شوومی کوندەپەپوو، صفر: کوڵە چوارشەمەی مانگی سەفەری عەرەبی–و.

## ١٣- دەروازەی: چاو حەقە

**٢٨٨٤**- (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْعَيْنُ حَقٌّ، وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ سَبَقَتْهُ الْعَيْنُ، وَإِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ؛ فَاغْسِلُوا**). [م٢١٨٨]

**(م) لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (چاو حەقە، گەر شتێك لە قەدەر پێش بکەوتبایە چاو پێشی دەکەوت، گەر داوای شۆرینتان لێکرا بشۆرن[1]).**

**٢٨٨٥**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ يُؤْمَرُ الْعَائِنُ، فَيَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ الْمَعِينُ.
* صحيح الإسناد. [د٣٨٨٠]

**لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: فەرمان بە کەسە چاوتێبڕەکە دەکرا دەستنوێژی دەگرت و پاشان کەسە کارلێکراوەکە خۆی بە ئاوەکە دەشۆری.**

## ١٤- دەروازەی: روقییە کردنی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٨٨٦**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَقُولُ لِلْمَرِيضِ: (**بِاسْمِ اللهِ، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، يُشْفَى سَقِيمُنَا، بِإِذْنِ رَبِّنَا**). [خ٥٧٤٥/ م٢١٩٤]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) بە نەخۆشی دەفەرموو: ("بسم الله، تربة أرضنا، بريقة بعضنا، يُشفى سقيمُنا، بإذن ربنا").**

**٢٨٨٧**- (خ) عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَثَابِتٌ عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، فَقَالَ ثَابِتٌ: يَا أَبَا حَمْزَةَ اشْتَكَيْتُ، فَقَالَ أَنَسٌ: أَلاَ أَرْقِيكَ بِرُقْيَةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: (**اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ، مُذْهِبَ الْبَاسِ، اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لاَ شَافِيَ إِلاَّ أَنْتَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَماً**). [خ٥٧٤٢]

---

[1] گەر کەسە چاوتێبڕەکە داوای ئاوی شۆرینی خۆ(دەستنوێژی خۆ)ی لێکرا با خۆی بشۆرێ و ئاوی خۆشۆرینەکە(دەستنوێژەکە) بدات بەو کەسەی چاوی ئەو کاری لێکردووە، ئەویش ئاوەکە بڕژێنێ بەسەر خۆدا، بەو هۆیەوە شفای بۆ بێت-و.

(خ) لە عەبدولعەزیزی كوڕی صوهەیبەوە، وتی: من و سابیت چووینە ژوورەوە بۆ لای ئەنەسی كوڕی مالیك، سابیت وتی: ئەی باوكی حەمزە، ناساغم، ئەنەس وتی: دەتەوێ بە روقییەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) روقییەت بۆ بكەم؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: (**"اللهم ربَّ الناس، مُذهِبَ البأس، اشفِ أنت الشافي، لا شافي إلا أنت، شفاء لا يُغادرُ سَقَما"**).

**٢٨٨٨**- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُعَوِّذُ الحَسَنَ وَالحُسَيْنَ، وَيَقُولُ: (**إِنَّ أَبَاكُمَا كانَ يُعَوِّذُ بِهَا إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَةِ، مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لاَمَّةٍ**). [خ٣٣٧١]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بۆ حەسەن و حوسەین پەنای دەگرت بە خودا و دەیفەرموو: (**باوكتان بەمە ئیسماعیل و ئیسحاقی پەنا دەگرت بە خودا: "أعوذ بكلمات الله التامة، من كل شيطان وهامة، ومن كلِّ عين لامة"**).

## ١٥- دەروازەی: روقییەی جیبریل(علیه السلام)

**٢٨٨٩**- (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ: أَنَّ جِبْرِيلَ أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ اشْتَكَيْتَ؟ فَقَالَ: (**نَعَمْ**)، قَالَ: بِاسْمِ الله أَرْقِيكَ، مَنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ الله يَشْفِيكَ، بِاسْمِ الله أَرْقِيكَ. [م٢١٨٦]

(م) لە ئەبی سەعیدەوە: جیبریل(علیە السلام) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی: ئەی محەمەد، ناساغی؟ فەرمووی: (**بەڵێ**)، جیبریل فەرمووی: **"بسم الله أُرَقِّيكَ، من كلِّ شيء يؤذيك، من شرِّ كلِّ نفس أو عين حاسد الله يشفيك، بسم الله أرقيك"**.

## ١٦- دەروازەی: دوعا و دانانی دەست لەسەر شوێنی ئازارەكە

**٢٨٩٠**- (م) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ الثَّقَفِيِّ: أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَجَعاً، يَجِدُهُ فِي جَسَدِهِ مُنْذُ أَسْلَمَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**ضَعْ يَدَكَ عَلَى الَّذِي تَأَلَّمَ مِنْ جَسَدِكَ، وَقُلْ: بِاسْمِ الله، ثَلاَثاً، وَقلْ سَبْعَ مَرَّاتٍ: أَعُوذُ بِالله وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ**). [م٢٢٠٢]

(م) لە عوسمانی کوڕی ئەبی عاصی سەقەفییەوە: ئەو سکاڵای ئازارێکی بردە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، لە جەستەی خۆیدا هەستی پێ دەکرد لەو کاتەوە موسڵمان بووبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: **(دەستت لەسەر ئەو شوێنە دابنێ ئازار دەکات لە جەستەت و بڵێ: "بسم الله(سێ جار)" هەروەها حەوت جار بڵێ: "أعوذُ بالله وقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ ما أجدُ وأحاذِر")**.

## ١٧- دەروازەی: روقییە بە "مَعَوِّذات"

**٢٨٩١**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا اشْتَكَى نَفَثَ عَلَى نَفْسِهِ بالمعوّذَاتِ، وَمَسَحَ عَنْهُ بِيَدِهِ، فَلَمَّا اشْتكى وَجعَهُ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، طَفِقْتُ أَنْفُثُ عَلَى نَفْسِهِ بِالمعَوِّذَاتِ الَّتِي كَانَ يَنْفُثُ، وَأَمْسَحُ بِيَدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم عِنْهُ.

[خ٤٤٣٩/ م٢١٩٢]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): گەر پێغەمبەر(ﷺ) ناساغ بوایە بە "معوذات" بە فوویەکی هێواش فووی بە خۆیدا دەکرد و لەو خوێندنەوە دەستی بە خۆیدا دەهێنا، کاتێ ئەو ئازارەی تووشهات تیایدا وەفاتی کرد، بە فوویەکی هێواش ئەو "معوذات"ەی پێشتر فووی بە خۆیدا پێ دەکرد من بۆم ئەنجام دەدا و لە ئەوەوە دەمهێنا بە دەستی پێغەمبەردا.

**٢٨٩٢**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَتَعَوَّذُ مِنَ الْجَانِّ، وَعَيْنِ الْإِنْسَانِ، حَتَّى نَزَلَتِ الْمُعَوِّذَتَانِ، فَلَمَّا نَزَلَتَا أَخَذَ بِهِمَا، وَتَرَكَ مَا سِوَاهُمَا.

* صحيح. [ت٢٠٥٨/ ن٥٥٠٩٠/ جه٣٥١١]

لە ئەبی سەعیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پەنای دەگرت لە جنۆکە و لە چاوی مرۆڤ، تا (المعوذتان) دابەزین، کاتێ دابەزین دەستی بەو دوانەوە گرت و جگە لەو دوانەی وازلێهێنا.

## ١٨- دەروازەی: روقییە بە سورەتی "الفاتحة"

**٢٨٩٣**- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ نَفَراً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مَرُّوا بِمَاءٍ، فِيهِمْ لَدِيغٌ أَوْ سَلِيمٌ، فَعَرَضَ لَهُمْ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الماءِ، فَقَالَ: هَلْ فِيكُمْ مِنْ رَاقٍ؟ إِنَّ فِي الماءِ رَجُلاً لَدِيغاً أَوْ سَلِيماً. فَانْطَلَقَ رَجُلٌ مِنْهُمْ، فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ عَلى شَاءٍ فَبَرَأَ، فَجَاءَ بِالشَّاءِ إِلَى أَصْحَابِهِ، فَكَرِهُوا ذلِكَ وَقالُوا: أَخَذْتَ عَلَى كِتَابِ الله أَجْراً! حَتَّى قَدِمُوا المدِينَةَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ الله، أَخَذَ عَلَى كِتَابِ الله أَجْراً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ أَحَقَّ ما أَخَذْتُمْ عَلَيْهِ أَجْراً كِتَابُ الله**). [خ٥٧٣٧]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە: چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بە ئاوەدانییەکدا گوزەریان کرد، کەسێکی مارگەستە یان گەزراویان تێدا بوو، یەکێك لە ئەهلی ئاوەکە ئەمەی بۆ خستنەڕوو و پێی وتن: کەسێك هەیە لە ناو ئێوەدا روقییە بکات؟ لەم ئاوەدانییە کەسێکی مارگەستە یان گەزراو هەیە، پیاوێك لەوان رۆیشت بۆ لای و "فاتحة الکتاب" بەرانبەر چەند مەڕێك بەسەردا خوێندەوە و کەسەکە چاکبوویەوە، مەڕەکانی هێنا بۆ لای هاوەڵەکانی، ئەوان ئەوەیان لا ناپەسەند بوو و وتیان: لەسەر کتێبەکەی خودا کرێت وەرگرتووە، تا هاتنەوە بۆ مەدینە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، لەسەر کتێبەکەی خودا کرێی وەرگرتووە، پێغەمبەری خودا فەرمووی: (لەپێشترین شتێك لەسەری کرێ وەربگرن کتێبەکەی خودایە).**

## ١٩- دەروازەی: روقییەی چاو

**٢٨٩٤**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قالَتْ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم . أَوْ أَمَرَ . أَنْ يُسْتَرْقَى مِنَ الْعَيْنِ. [خ٥٧٣٨/م٢١٩٥]

**(ق) لە لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردم-یان فەرمانی کرد- لە چاو[(١)] داوای روقییە بکرێت.**

---

(١) واتە: کەسێك چاو کاری تێکردبێت داوای روقییەی بۆ بکرێت-و.

**٢٨٩٥**– عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ وَلَدَ جَعْفَرٍ تُسْرِعُ إِلَيْهِمُ العَيْنُ، أَفَأَسْتَرْقِي لَهُمْ؟ فَقَالَ: (**نَعَمْ، فَإِنَّهُ لَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ**).

* صحيح. [ت٢٠٥٩/ جه٣٥١٠]

**لە ئەسمای کچی عومەیسەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، کوڕەکەی جەعفەر زوو چاو کاری تێدەکات، ئایا داوای روقییەیان بۆ بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ، چونکە گەر شتێك پێش قەدەر بکەوتبایە چاو پێشی دەکەوت).**

## ٢٠- دەروازەی: روقییە لە تا و شتی تر

**٢٨٩٦**– (ق) عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عائِشَةَ عَنِ الرُّقْيَةِ مِنَ الحُمَةِ، فَقَالَتْ: رَخَّصَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي الرُّقْيَةِ مِنْ كُلِّ ذِي حُمَةٍ. [خ٥٧٤١/ م٢١٩٣]

**(ق) لە ئەسوەدەوە، وتی: پرسیارم کرد لە عائیشە دەربارەی روقییە لە تا، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) رێگەی روقییەی دا بۆ هەموو تادارێك.**

- ولفظ مسلم: رَخَّصَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لأَهْلِ بَيْتٍ مِنَ الأَنْصَارِ فِي الرُّقْيَةِ مِنْ كُلِّ ذِي حُمَةٍ.

**لەفزەکەی موسلیم: پێغەمبەری خودا(ﷺ) رێگەی دا خانەوادەیەك لە ئەنصار روقییە بکەن بۆ هەموو تادارێك.**

**٢٨٩٧**– (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: رَخَّصَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي الرُّقْيَةِ مِنَ الْعَيْنِ، وَالْحُمَةِ، وَالنَّمْلَةِ. [م٢١٩٦]

**(م) لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا مۆڵەتی دا روقییە بکرێت لە چاو و تا و دومەڵ.**

**٢٨٩٨**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ قَالَ حِينَ يُمْسِي ثَلاَثَ مَرَّاتٍ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، لَمْ يَضُرَّهُ حُمَةٌ تِلْكَ اللَّيْلَةَ**).

* صحيح. [ت ملحق٣٦٧٥]

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس کاتێ ئێوارەی بەسەردا دێت سێ جار بڵێ: "أعوذ بكلمات التامات من شرّ ما خلق" ئەو شەوە "تا" زیانی پێ ناگەیەنێت).**

## ٢١- دەروازەی: روقییە خراپ نییە گەر هاوەڵدانان نەبێت

**٢٨٩٩**– (م) عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ قَالَ: كُنَّا نَرْقِي فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ الله، كَيْفَ تَرَى فِي ذلِكَ؟ فَقَالَ: (**اعْرِضُوا عَلَيَّ رُقَاكُمْ، لاَ بَأْسَ بِالرُّقَى مَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ شِرْكٌ**).
[م٢٢٠٠]

(م) لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعییەوە، وتی: لە سەردەمی نەفامیدا روقییەمان دەکرد، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوە چۆن دەبینی؟ فەرمووی: **(روقییەکانتانم بۆ بخەنە روو، روقییە خراپ نییە گەر هاوەڵدانان نەبێت).**

## ٢٢- دەروازەی: "عدوى[١] و طِيَرَة[٢] و هامة[٣] و صفر[٤]" بوونیان نییە

**٢٩٠٠**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ عَـدْوَى، وَلاَ طِيَرَةَ، وَلاَ هَامَةَ، وَلاَ صَفَرَ). [خ٥٧٥٧ (٥٧٠٧)/ م٢٢٢٠]

---

(١) "عدوى" گواستنەوەی نەخۆشی خۆی بۆ خۆی و بەبێ ویست و خواستی خودا وەك چۆن سەردەمی نەفامی باوەڕیان بەو جۆرە بوو.

(٢) "طيرة" شوومخوازی بەهۆی باڵندەوە.

(٣) "هامة": ترۆپکی سەر، عەرەب باوەڕیان وابوو گەر پیاوێك بکوژرێ و تۆڵەی نەکرێتەوە باڵندەیەك لە ترۆپکی سەری دێتە دەرەوە و لەسەر گۆڕەکەی هاوار دەکات: ئاوم پێ بدەن من تینووم تا بکوژەکەی دەکوژرێتەوە، ئیسلام هات و ئەوەی پووچ کردەوە، یان شوومی بە هۆی کونەپەپووەوە.

(٤) "صَفَر": نەخۆشییەکە تووشی سك دەبێت، لای عەرەب زووتر و خێراتر لە گەڕی دەگوێزرێتەوە، مەبەست لە نەرێ کردنی "صفر" ئەو بیروباوەڕە بوو عەرەبی سەردەمی نەفامی هەیانبوو دەربارەی نەخۆشییەکە، یان شوومی بە کۆڵە چوارشەمەی مانگی سەفەر.

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**"عدوى و طِيَرَة و هامة و صفر" بوونیان نییە**).

- وفي رواية لهما: قَالَ أَعْرَابِيٌّ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَمَا بَالُ إِبِلِي تَكُونُ فِي الرَّمْلِ كَأَنَّهَا الظِّبَاءُ، فَيَأْتِي الْبَعِيرُ الأَجْرَبُ فَيَدْخُلُ بَيْنَهَا فَيُجْرِبُهَا؟ فَقَالَ: (**فَمَنْ أَعْدَى الأَوَّلَ**) ؟! [خ٥٧١٧]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: ئەعرابییەك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی حوشترەکەم چییەتی لەناو رەملّ دەبێت وەك ئەوەی ئاسك بێت حوشترێکی گەڕ دێت و دەچێتە ناویانەوە و تووشی گەڕی دەکات؟ فەرمووی: (ئەی کێ یەکەمی تووش کرد؟!).**

## ٢٣- دەروازەی: "الفأل والشؤم-خۆشبینی و شوومی"

**٢٩٠١-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ، وَيُعْجِبُنِي الْفَأْلُ** الصَّالِحُ: الكَلِمَةُ الحَسَنَةُ). [خ٥٧٥٦/ م٢٢٢٤]

(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**نە "عدوى" هەیە نە "طِيَرَة"، سەرسامم بە "الفأل الصالح–خۆشبینی باش و چاك": وشەی باش و چاك**[1]).

**٢٩٠٢-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ طِيَرَةَ، وَخَيْرُهَا الْفَأْلُ**). قالُوا: وَما الْفَأْلُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**الْكَلِمَةُ الصَّالِحَةُ يَسْمَعُهَا أَحَدُكُمْ**).
[خ٥٧٥٥ (٥٧٥٤)/ م٢٢٢٣]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**"طِيَرَة" بوونی نییە، باشترینی خۆشبینی(الفأل)ە**)، وتیان: خۆشبینی(الفأل) چییە؟ فەرمووی: (**وشەیەکی چاك و باش یەکێك لە ئێوە بیبیستێت**).

**٢٩٠٣-** (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ فَفِي: الْمَرْأَةِ، وَالْفَرَسِ، وَالْمَسْكَنِ). [خ٢٨٥٩/ م٢٢٢٦]

---

[1] پێغەمبەر(ﷺ) "الفأل الصالح"ی بە وشەی چاك و باش تەفسیر کرد و لێکدایەوە.

(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر لە شتێکدا هەبێت[1] لە : ئافرەت، و ئەسپ، و شوێنی نیشتەجێبووندایە)**.

- زاد في رواية مسلم: يعني: الشُّؤْمَ.

**لە ڕیوایەتەکەی موسلیم ئەمە زیادبووە: واتە: شوومی.**

**٢٩٠٤**– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُعْجِبُهُ إِذَا خَرَجَ لِحَاجَةٍ أَنْ يَسْمَعَ: يَا رَاشِدُ! يَا نَجِيحُ!. [ت١٦١٦]

* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: گەر پێغەمبەر(ﷺ) بڕۆیشتبا بۆپێویستییەك سەرسام بوو بەوەی "یا راشِد یا نجیح[2]" ببیستێت.**

**٢٩٠٥**– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا كُنَّا فِي دَارٍ، كَثِيرٌ فِيهَا عَدَدُنَا، وَكَثِيرٌ فِيهَا أَمْوَالُنَا، فَتَحَوَّلْنَا إِلَى دَارٍ أُخْرَى، فَقَلَّ فِيهَا عَدَدُنَا، وَقَلَّتْ فِيهَا أَمْوَالُنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(ذَرُوهَا ذَمِيمَةً)**. [د٣٩٢٤]

* حسن.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە لە خانوویەکدا بووین، ژمارەمان تیایدا زۆر بوو، و ماڵ و سامانمان تیایدا زۆر بوو، گواستمانەوە بۆ خانوویەکی تر، ژمارەمان تیایدا کەمی کرد و ماڵ و سامانمان تیایدا کەمی کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەجێیبهێڵن کاتێ دەبینن خراپ و ناپەسەندە).**

---

[1] واتە: گەر شوومی لە شتێکدا هەبێت–و.

[2] واتە: ئەی ڕێنموونیکار، ئەی سەرخەر–و.

**٢٩٠٦**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَتَفَاءَلُ وَلاَ يَتَطَيَّرُ، وَيُعْجِبُهُ الاِسْمُ الْحَسَنُ. [حم٢٣٢٨]

* حسن لغيره.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆشبینی دەکرد و "طیرة[١]"ی نەدەکرد، سەرسام بوو بە ناوی باش و چاك.**

## ٢٤- دەروازەی: خاوەن ئاژەڵی نەخۆش لە شوێنی خاوەن ئاژەڵی ساغ نەخواتەوە

**٢٩٠٧**- (ق) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ: سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ صَلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يُورِدَنَّ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ)**. وَأَنْكَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ الْحَدِيثَ الأَوَّلَ، قُلْنَا: أَلَمْ تُحَدِّثْ أَنَّهُ: **(لاَ عَدْوَى)**، فَرَطَنَ بِالْحَبَشِيَّةِ، قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: فَمَا رَأَيْتُهُ نَسِيَ حَدِيثاً غَيْرَهُ. [خ٥٧٧١/ م٢٢٢١]

**(ق) لە ئەبی سەلەمەوە: گوێی لە ئەبو هورەیرە بوو دەیوت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خاوەن ئاژەڵی نەخۆش لە شوێنی خاوەن ئاژەڵی ساغ نەخواتەوە[٢])، ئەبو هورەیرە ئینکاری فەرموودەی یەکەمی کرد، وتمان: ئەی تۆ فەرموودەی: ("عدوی" نییە[٣])ت نەگێڕایەوە؟ بە حەبەشی زمانی تێکەڵ کرد، ئەبو سەلەمە وتی: نەمبینیوە جگە لەو فەرموودە فەرموودەی تری لەبیر بچێت.**

---

[١] واتە: لە ڕێگەی باڵندەوە باشی و خراپی سەفەری دیاری نەدەکرد-و.

[٢] واتە: ئاژەڵەکانی ئاو نەدات-و.

[٣] مەبەستی فەرموودەی (لا عدوی)یە کە باس لەوە دەکات گواستنەوەی نەخۆشی بوونی نییە و زانایان دەڵێن: مەبەست ئەوەیە بکەری ڕاستەقینەی گواستنەوەی نەخۆشی بریتییە لە خودا، ئەگینا نەخۆشی بۆ خۆی ناتوانێ بگوێزێتەوە و زیان بگەیەنێت-و.

## ٢٥- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی خۆپارێزی

**٢٩٠٨-** عَنْ أُمِّ الْمُنْذِرِ بِنْتِ قَيْسٍ الْأَنْصَارِيَّةِ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَمَعَهُ عَلِيٌّ عليه السلام، وَعَلِيٌّ نَاقِهٌ، وَلَنَا دَوَالِي مُعَلَّقَةٌ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَأْكُلُ مِنْهَا، وَقَامَ عَلِيٌّ لِيَأْكُلَ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ لِعَلِيٍّ: **(مَهْ! إِنَّكَ نَاقِهٌ)**، حَتَّى كَفَّ عَلِيٌّ عليه السلام.

قَالَتْ: وَصَنَعْتُ شَعِيراً وَسِلْقاً، فَجِئْتُ بِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(يَا عَلِيُّ، أَصِبْ مِنْ هَذَا، فَهُوَ أَنْفَعُ لَكَ)**.　[د٣٨٥٦/ ت٢٠٣٧/ جه٣٤٤٢]

* حسن.

**لە ئوم مونزیری کچی قەیسی ئەنصارییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لام و عەلی(خوا لێی رازی بێت) لەگەڵ بوو، عەلی تازە لە نەخۆشی چاکبووبوویەوە و خورمای کاڵمان هەڵواسی بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستا و لە خورماکەی دەخوارد، عەلی هەستا لێی بخوات، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە عەلی دەفەرموو: (بوەستە، تۆ تازە لە نەخۆشی چاکدەبییەوە)، تا عەلی(خوا لێی رازی بێت) دەستی گرتەوە.**

**ئوم مونزیر وتی: جۆ و سڵقم ئامادە کرد و هێنام، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عەلی، لەمە بخۆ، ئەمە بۆ تۆ بەسوودترە).**

**٢٩٠٩-** عَنْ قَتَادَةَ بْنِ النُّعْمَانِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا أَحَبَّ اللهُ عَبْداً حَمَاهُ الدُّنْيَا، كَمَا يَظَلُّ أَحَدُكُمْ يَحْمِي سَقِيمَهُ الْمَاءَ)**.　[ت٢٠٣٦]

* صحيح.

**لە قەتادەی کوڕی نیعمانەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر خودا بەندەیەکی خۆشویست لە دنیا دەیپارێزێت، وەك چۆن یەکێك لە ئێوە نەخۆشەکەی لە ئاو دەپارێزێت[١]).**

---

[١] واتە: وەك چۆن ئێوە لە هەندێ نەخۆشیدا نەخۆشەکانتان لە خواردنەوەی ئاو دەپارێزن—الموسوعة الحديثية.

## ٢٦- دەروازەی: خواردنی نەخۆش

**٢٩١٠-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تُكْرِهُوا مَرْضَاكُمْ عَلَى الطَّعَامِ، فَإِنَّ اللهَ يُطْعِمُهُمْ وَيَسْقِيهِمْ)**. [ت٢٠٤٠/ جه٣٤٤٤]

له عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنییەوه، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(نەخۆشەکانتان ناچار مەکەن بە خواردن، چونکە خودا خواردنیان دەرخوارد دەدات و خواردنەوەیان پێ نۆش دەکات)**.

- زاد ابن ماجه: (والشَّرابِ).

* حسن.

**ئیبن ماجه ئەمەی زیاد کردووه: (و خواردنەوه).**

## ٢٧- دەروازەی: دەوای "عِرْق النسا[1]"

**٢٩١١-** عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(شِفَاءُ عِرْقِ النَّسَا، أَلْيَةُ شَاةٍ أَعْرَابِيَّةٍ تُذَابُ، ثُمَّ تُجَزَّأُ ثَلاَثَةَ أَجْزَاءٍ، ثُمَّ يُشْرَبُ عَلَى الرِّيقِ فِي كُلِّ يَوْمٍ جُزْءٌ)**.

* صحيح. [جه٣٤٦٣]

له ئەنەسی کوڕی مالیکەوه، وتی: گوێم له پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(شیفای "عِرْق النسا" دووگی مەڕێکی ئەعرابییە بتوێنرێتەوه، پاشان بکرێت بە سێ بەشەوه، پاشان بە سکی خاڵی هەموو ڕۆژێك بەشێکی بخورێتەوه)**.

---

[1] "عِرق النسا" نەخۆشییەکی دەمارییە له خوار پشتەوە دەست پێ دەکات بۆ ئەژنۆکان و خوارەوە—و.

## ٢٨- دەروازەی: "التمائم[١]"

**٢٩١٢-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَنْ تَعَلَّقَ تَمِيمَةً؛ فَلاَ أَتَمَّ اللهُ لَهُ، وَمَنْ تَعَلَّقَ وَدَعَةً؛ فَلاَ وَدَعَ اللهُ لَهُ). [حم١٧٤٠٤]

* حديث حسن.

له عوقبەی کوڕی عامیرەوە، وتی: گوێم له پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس "تمیمة"یەك هەڵبواسێت، خودا بۆی تێر و تەواو نەکات، هەر کەس "وَدَعَة[٢]"یەك هەڵبواسێت خوداماڵئاوایی لیّ نەکات).**

## ٢٩- دەروازەی: حەرامکردنی کەهانە (الکهانة)

**٢٩١٣-** (م) عَنْ صَفِيَّةَ، عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ أَتَى عَرَّافاً فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةُ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً). [م٢٢٣٠]

(م) له صەفییەوە، له یەکێك له ژنەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ)، له پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بچێت بۆ لای عەرافێك و پرسیار و داوای شتێکی لیّ بکات چل شەو نوێژی لیّ قبووڵ ناکرێت).**

---

[١] "التمائم" کۆی وشەی "تمیمة"یە، ئەوەش هەڵواسینی مووروو بوو بە منداڵدا وەك چاوەزار.

[٢] "ودعة" ئەسڵی "ودعة" قاوغێکی سپییە و قەبارەی گەورە و بچووکی هەیە، بۆشییەك لە ناوەکەیدایە هەندێ لە گیاندارە نەرمۆڵەکان دەیکەنە پەناگەی خۆیان بۆ خۆ حەشاردان لە دوژمنەکانیان، وەك هێلکە شەیتانۆکە، ئەو قاوغانە هێنراون و بە منداڵدا هەڵواسراون گوایە پارێزگاری دەکەن لە منداڵ لە نەخۆشی و چاوی پیسی، شەرع نەهی لەو کارە کردووە.

## ٣٠- دەروازەی: حەرامکردنی سیحر

**٢٩١٤-** (خـ) وَقَالَ قَتَادَةُ: قُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: رَجُلٌ بِهِ طِبٌّ، أَوْ يُؤَخَّذُ عَنِ امْرَأَتِهِ، أَيُحَلُّ عَنْهُ أَوْ يُنَشَّرُ؟ قَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ، إِنَّمَا يُرِيدُونَ بِهِ الْإِصْلاَحَ، فَأَمَّا مَا يَنْفَعُ النَّاسَ فَلَمْ يُنْهَ عَنْهُ.
[خ. الطب، باب ٤٩]

**(خـ) قەتادە دەڵێت: بە سەعیدی کوڕی موسەییەبم وت: پیاوێك سیحری لێکراوە، یان لە ژنەکەی بەستراوە، ئایا لێیدەکرێتەوە یان بەستنەکەی دەکرێتەوە؟ وتی: خراپییەك نییە لەوەدا، چونکە مەبەستیان پێی چاکەیە، ئەوەی سوود بە خەڵکی دەگەیەنێت نەهی لێ نەکراوە[1].**

**٢٩١٥-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ: سَحَرَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ، فَاشْتَكَى لِذَلِكَ أَيَّاماً، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عليه السلام فَقَالَ: إِنَّ رَجُلاً مِنَ الْيَهُودِ سَحَرَكَ، عَقَدَ لَكَ عُقَداً فِي بِئْرِ كَذَا وَكَذَا، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَاسْتَخْرَجُوهَا، فَجِيءَ بِهَا، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ، فَمَا ذَكَرَ ذَلِكَ لِذَلِكَ الْيَهُودِيِّ، وَلاَ رَآهُ فِي وَجْهِهِ قَطُّ.
* صحيح الإسناد. [ن٤٠٩١]
[وانظر: **٣٣٤٠**]

**لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە، وتی: پیاوێك لە یەهوود سیحری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، چەندین ڕۆژ لەوەوە ناساغ بوو، جیبریل(علیه السلام) هات بۆ لای و فەرمووی: پیاوێك لە یەهوود سیحری لێکردوویت، چەندین گرێی لێ بەستوویت لە بیری ئەوە و ئەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) چەند کەسێکی ڕەوانە کرد و دەریانهێنا و سیحرەکە هێنرا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستایە سەر پێ وەك ئەوەی لە بەستنەوەیەك[2] ڕزگاری بووبێت، هەرگیز ئەوەی بۆ ئەو یەهوودییە باس نەکرد و هەرگیز نەیدا لە ڕووی.**

---

[1] بۆ ڕەواندنەوەی سیحر و کردنەوەی بەستن ناچێت بۆ لای ساحیر و فاڵچی، چونکە نەهی لەو کارە کراوە، بەڵکو ڕێگەی شەرعی دەگرێتەبەر-و.

[2] واتە: کۆت و بەندێك-و.

## ٣١- دەروازەی: بەرپرسیارێتی پزیشك

**٢٩١٦**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ تَطَبَّبَ، وَلاَ يُعْلَمُ مِنْهُ طِبٌّ قَبْلَ ذلِكَ، فَهُوَ ضَامِنٌ**). [د٤٥٨٦/ ن٤٨٤٥/ جه٣٤٦٦]

* حسن.

**له عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس کاری پزیشکی بکات و بەر لەوە پزیشکیی لێ نەبینرابێت، ئەو دەستەبەرکارە[(١)]).**

## ٣٢- دەروازەی: ئامۆژگاری تەندروستی گشتی

[انظر في الإغتسال كل سبعة ايام: **٩٨٨**.

وانظر في المضمضة من الطعام: **٩٥٢**.

وانظر في غسل اليدين قبل الطعام: **٢٦٦٤**.

وانظر في النهي عن التخلي في الطرق والظلال والماء الراكد: **٨٧٨، ٨٧٩، ٩٨٩**.

وانظر في نظافة البدن: **٣١٧١**].

---

(١) واتە: گەر بە کارە پزیشکییەکەی زیانێکی بە نەخۆشەکە گەیاند دەبێ دەستەبەری زیانەکە بکات، چونکە کاری پزیشکی نەزانیوە و دەستی بۆ بردووە-و.

# بەشی سێیەم

## خەون

### ١- دەروازەی: خەونی صالح بەشێکە لە پێغەمبەرایەتی

**٢٩١٧**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ). [خ٦٩٨٨/ م٢٢٦٣]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خەونی باوەڕدار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی)**.

- وفي رواية للبخاري: (إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ، لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ تَكْذِبُ، وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ). [خ٧٠١٧]

[وانظر: ١٢٣٧].

لە ریوایەتێکی بوخاریدا: **(کاتێ زەمان نزیك دەبێتەوە**[(١)]**، خەریکە خەونی باوەڕدار درۆ نەکات، خەونی باوەڕدار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی)**.

### ٢- دەروازەی: کەسێك لە خەوندا پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" ببینێت

**٢٩١٨**- (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَنْ رَآنِي فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَكَوَّنُنِي). [خ٦٩٩٧]

(خ) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس لە خەون من ببینێت حەقی بینیوە، شەیتان ناتوانێ خۆی بکات بە من)**.

---

(١) نزیکبوونەوەی زەمان لە نیشانەکانی قیامەتە-و.

**٢٩١٩**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ، فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَمَثَّلُ بِي). [ت٢٢٧٦/ جه٣٩٠٠/ مي٢١٨٥]

* صحيح.

له عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، له پێغەمبەرەوه(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس له خەون من ببینێت منی بینیوه، چونکه شەیتان ناتوانێ خۆی بکات به من).**

## ٣- دەروازەی: گەر له خەوندا شتێکی بینی لای ناخۆش و ناپەسەند بوو

**٢٩٢٠**- (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَمَنْ رَأَى شَيْئاً يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عَنْ شِمَالِهِ ثَلاَثاً، وَلْيَتَعَوَّذْ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهَا لاَ تَضُرُّهُ). [خ٦٩٩٥ (٣٢٩٢)/ م٢٢٦١]

(ق) لە ئەبی قەتادەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(خەونی صالح له خوداوەیه، خەونی تێکەڵ و پێکەڵ له شەیتانەوه، هەر کەس شتێکی بینی لای ناخۆش و ناپەسەند بوو با سێ جار فوو به لای چەپی خۆیدا بکات و پەنا بگرێت له شەیتان، ئەو خەونە زیانی پێ ناگەیەنێت).**

**٢٩٢١**- (م) عَنْ جَابِرٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (إِذَا رَأَى أَحَدُكُمُ الرُّؤْيَا يَكْرَهُهَا؛ فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاَثاً، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ ثَلاَثاً، وَلْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ). [م٢٢٦٢]

(م) له جابرەوە، له پێغەمبەری خوداوه(ﷺ)، ئەو فەرمووی: **(گەر یەکێك له ئێوه خەونێکی بینی لای ناخۆش و گران بوو، با به لای چەپدا سێ جار تف بکات و سێ جار پەنا بگرێت به خودا له شەیتان، و ئەو لایەی لەسەری خەوتبوو ئاڵوگۆڕی بکات).**

## ٤- دەروازەی: مژدەکان

**٢٩٢٢**- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الْمُبَشِّرَاتُ)، قَالُوا: وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: (الرُّؤْيَا الصَّالِحَةِ). [خ٦٩٩٠]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(لە پێغەمبەرایەتی تەنها مژدەکان ماون)**، وتیان: مژدەکان چین؟ فەرمووی: **(خەونی صالّح)**.

## ٥- دەروازەی: کەسێك لە خەونەکەی درۆ بکات

**٢٩٢٣**- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ تَحَلَّمَ بِحُلُمٍ لَمْ يَرَهُ كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ، وَلَنْ يَفْعَلَ، وَمَنِ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ، وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ، أَوْ يَفِرُّونَ مِنْهُ، صُبَّ فِي أُذُنِهِ الآنُكُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ صَوَّرَ صُورَةً عُذِّبَ، وَكُلِّفَ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ). [خ٧٠٤٢]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس وا نیشان بدات خەونێکی بینیوە و نەیبینی بوو، داوای لێ دەکرێت دوو دەنکە جۆ پێکەوە گرێ بدات، ئەوەش ناتوانێت ئەنجام بدات، هەر کەس گوێی گرت بۆ قسەی کۆمەڵێك و ئەوان پێیان ناخۆش بوو، یان لە ئەو هەڵدەهاتن لە ڕۆژی قیامەت قوڕقوشمی تواوە دەچۆڕێنرێتە گوێیەوە، هەر کەس وێنەیەك بکێشێت سزا دەدرێت و داوای لێ دەکرێت فوو بە بەریدا بکات، ئەویش فووکەر نییە)**.

**٢٩٢٤**- (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ مِنْ أَفْرَى الْفِرَى أَنْ يُرِيَ عَيْنَهُ مَا لَمْ تَرَ). [خ٧٠٤٣]

(خ) لە ئیبن عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(مەزنترین درۆ ئەو درۆیە شتێ نیشانی چاوی بدات و نەیبینیبێت)**.

## ٦- دەروازەی: خەونی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٩٢٥**- (ق) عَنْ أَبِي مُوسى . أُرَاهُ . عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أُهَاجِرُ مِنْ مَكَّةَ إِلَى أَرْضٍ بِهَا نَخْلٌ، فَذَهَبَ وَهَلِي إِلَى أَنَّهَا الْيَمَامَةُ أَوْ هَجَرُ، فَإِذَا هِيَ الْمَدِينَةُ يَثْرِبُ، وَرَأَيْتُ فِي رُؤْيَايَ هذِهِ: أَنِّي هَزَزْتُ سَيْفاً فَانْقَطَعَ صَدْرُهُ، فَإِذَا هُوَ ما أُصِيبَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، ثُمَّ هَزَزْتُهُ بِأُخْرَى فَعَادَ أَحْسَنَ ما كَانَ، فَإِذَا هُوَ ما جاءَ اللهُ بِهِ مِنَ الْفَتْحِ وَاجْتِمَاعِ الْمُؤْمِنِينَ، وَرَأَيْتُ فِيهَا بَقَراً، وَاللهُ خَيْرٌ، فَإِذَا هُمُ الْمُؤْمِنُونَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَإِذَا الْخَيْرُ ما جاءَ اللهُ بِهِ مِنَ الْخَيْرِ وَثَوَابِ الصِّدْقِ الَّذِي آتَانَا اللهُ بَعْدَ يَوْمِ بَدْرٍ). [خ٣٦٢٢/ م٢٢٧٢]

(ق) لە ئەبی موساوە –وەك ئەوەی دەیبینم– لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(لە خەوندا بینیم من لە مەککەوە کۆچم دەکرد بۆ زەوییەك دارخورمایەکی تێدا بوو خەیاڵم بۆ ئەوە چوو ئەو زەوییە یەمامە یان هەجەر بێت، کەچی مەدینە بوو، یەسریب، لەو خەونەمدا بینیم: شمشێرێکم راوەشاند پێشەوەی شمشێرەکە لەت بوو، ئەوە ئەو موسیبەتە بوو رۆژی ئوحد تووشی باوەڕداران هات، پاشان بە دەستەکەی ترم راموەشاند شمشێرەکە باشتر لە یەکەمجار هاتەوە، ئەوە بریتی بوو لەو فەتحەی خودا هێنای و کۆبوونەوەی باوەڕداران و باشکردنی حاڵیان، گایەك(بقرا)م تێدا بینی، خودا بە خێری گێڕا، ئەوە[1] بریتی بوو لە باوەڕداران لە رۆژی ئوحد، خێرەکەش ئەو خێرە بوو خودا هێنای و ئەو پاداشتی راستگۆییە بوو خودا لەدوای رۆژی بەدر پێیداین).**

**٢٩٢٦**- (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (رَأَيْتُ كَأَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ ثَائِرَةَ الرَّأْسِ، خَرَجَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ، حَتَّى قامَتْ بِمَهْيَعَةَ . وَهِيَ الْجُحْفَةُ . فَأَوَّلْتُ أَنَّ وَبَاءَ الْمَدِينَةِ نُقِلَ إِلَيْهَا). [خ٧٠٣٨]

[وانظر: ٢١٣١، ٣٧٠١].

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(بینیم وەك ئەوەی ئافرەتێکی رەشپێست سەری پەتی بێت لە مەدینە**

[1] واتە: بینینی گایەکە–و.

**چووە دەرەوە تا لە "مَهْيَعَة"–کە بریتییە لە "الجُحْفَة"– وەستا، وام تەئویل کرد پەتاکەی مەدینە گوازراوەتەوە بۆ ئەو شوێنە).**

## ٧- دەروازەی: گەر خەونت تەعبیر کرد رودەدات

**٢٩٢٧**– عَنْ أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**الرُّؤْيَا عَلَى رِجْلِ طَائِرٍ مَا لَمْ تُعَبَّرْ، فَإِذَا عُبِّرَتْ وَقَعَتْ**)، قَالَ: . وَأَحْسِبُهُ قَالَ: (**وَلاَ تَقُصَّهَا إِلاَّ عَلَى وَادٍّ، أَوْ ذِي رَأْيٍ**).

* صحيح. [د٥٠٢٠]

لە ئەبی رەزینی عوقەیلییەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خەون گەر تەعبیر نەکرێت لەسەر پێی باڵندەیەکە[1]، گەر تەعبیر کرا رودەدات)**، پێموایە فەرمووی: **(تەنها بۆ کەسی بەسۆز یان خاوەن رای بگێڕەرەوە)**.

## ٨- دەروازەی: بینینی پەروەردگار(تعالى) لە خەوندا

**٢٩٢٨**– عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَائِشٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ، قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلَأُ الْأَعْلَى؟ فَقُلْتُ: أَنْتَ أَعْلَمُ يَا رَبِّ! قَالَ: فَوَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ، فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ، فَعَلِمْتُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَتَلاَ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ﴾** [الأنعام: ٧٥]).

* إسناده صحيح. [مي٢١٩٥]

[وانظر: ٢٢٩٢].

لە عبدالرحمانی کوڕی عائیشەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(پەروەردگارم لە باشترین و جوانترین شێوەدا بینی، فەرمووی: کۆڕی باڵا**

---

[1] واتە: خەونەکە مۆلەق و هەڵواسراوە و روونادات گەر تەعبیر نەکرێت، بۆیە نەهی کراوە لە گێڕانەوەی خەونی ناخۆش–و.

دەربارەی چی نەیارییان لە نێواندایە؟ وتم: تۆ زاناتری، ئەی پەروەردگار، فەرمووی: لەپی دەستی خستە نێوان دوو شانم، هەستم بە فێنکییەکەی کرد لە نێوان دوو مەمکم، هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا بوو زانیم، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ٧٥﴾ [الأنعام: ٧٥]).

## بەشی یەکەم

# مۆڵەت وەرگرتن

## ١- دەروازەی: مۆڵەت وەرگرتن لەپێناو بینین

**٢٩٢٩**- (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ: أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ مِنْ جُحْرٍ فِي دَارِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَالنَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَحُكُّ رَأْسَهُ بِالْمِدْرَى، فَقَالَ: (**لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ تَنْظُرُ، لَطَعَنْتُ بِهَا فِي عَيْنِكَ، إِنَّمَا جُعِلَ الإِذْنُ مِنْ قِبَلِ الإِبْصَارِ**). [خ٥٩٢٤/ م٢١٥٦]

**(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدەوە: پیاوێك لە کونێکەوە تەماشای ناوەوەی ماڵێکی پێغەمبەری(ﷺ) دەکرد، و پێغەمبەر بە شانە سەری خۆی دەخوراند، فەرمووی: (گەر بمزانیبا تۆ تەماشا دەکەی شانەکەم دەکێشا بە چاوتدا، مۆڵەت لەبەر بینین دانراوە[1]).**

**٢٩٣٠**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَوْ أَنَّ امْرَأً اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ، فَحَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ، فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ جُنَاحٌ**).

[خ٦٩٠٢ (٦٨٨٨)/ م٢١٥٨]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: ئەبو قاسم(ﷺ) فەرمووی: (گەر کەسێك بەبێ مۆڵەت تەماشای کردی و چەوت پێدا کێشا و چاوێکی کوێر بوو لەسەر تۆ گوناهێك بوونی نییە).**

---

[1] واتە: مۆڵەتی چوونە ژوورەوە بۆ ماڵان بۆ ئەوە دانراوە مرۆڤ چاوی بە عەورەتی ئەهلی خانوو و ماڵەکە نەکەوێت-و.

## ٢- دەروازەی: مۆڵەت وەرگرتن سێ جارە

**٢٩٣١**– (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدْرِيِّ قَالَ: كُنْتُ فِي مَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ الأَنْصَارِ، إِذْ جَاءَ أَبُو مُوسى كَأَنَّهُ مَذْعُورٌ، فَقَالَ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى عُمَرَ ثَلاَثاً، فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي فَرَجَعْتُ، فَقَالَ: ما مَنَعَكَ؟ قُلْتُ: اسْتَأْذَنْتُ ثَلاَثاً فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي فَرَجَعْتُ، وَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدُكُمْ ثَلاَثاً، فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، فَلْيَرْجِعْ**). فَقَالَ: وَاللهِ لَتُقِيمَنَّ عَلَيْهِ بَيِّنَةً، أَمِنْكُمْ أَحَدٌ سَمِعَهُ مِنَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَقَالَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ: وَاللهِ لاَ يَقُومُ مَعَكَ إِلاَّ أَصْغَرُ الْقَوْمِ، فَكُنْتُ أَصْغَرَ الْقَوْمِ، فَقُمْتُ مَعَهُ، فَأَخْبَرْتُ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ ذلِكَ.

[خ٦٢٤٥ (٢٠٦٢)/ م٢١٥٣]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: لە مەجلیسێك بووم لە مەجلیسەكانی ئەنصار، ئەبو موسا هات وەك ئەوەی ترسی لێ نیشتبێت و شڵەژا بێت، وتی: سێ جار مۆڵەتم لە عومەر وەگرت، مۆڵەتم نەدرا، بۆیە گەڕامەوە، عومەر وتی: چی ڕێگری لێكردی؟ وتم: سێ جار مۆڵەتم وەرگرت مۆڵەتم نەدرا بۆیە گەڕامەوە، چونكە پێغەمبەری خودا فەرمووی: **(گەر یەكێك لە ئێوە سێ جار مۆڵەتی خواست و مۆڵەتی نەدرا با بگەڕێتەوە)**، عومەر وتی: سوێند بە خودا، بەڵگەیەك لەسەر ئەوە دەهێنی، ئایا كەسێك لە ئێوە لە پێغەمبەری(ﷺ) بیستووە؟ ئوبەی كوڕی كەعب وتی: سوێند بە خودا بچووكترینی ئەم خەڵكە لەگەڵ تۆ ڕاستدەبێتەوە، من بچووكترینی خەڵكەكە بووم، لەگەڵی ڕاستبوومەوە و هەواڵم دا بە عومەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی فەرمووە.

## ٣- دەروازەی: ناپەسەندنی قسەی ئەو كەسەی مۆڵەت وەردەگرێت بڵێت: "منم"

**٢٩٣٢**– (ق) عَنْ جابِرٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فِي دَيْنٍ كَانَ عَلَى أَبِي، فَدَقَقْتُ الْبَابَ، فَقَالَ: (مَنْ ذَا) ؟ فَقُلْتُ: أَنَا، فَقَالَ: (أَنَا، أَنَا)، كَأَنَّهُ كَرِهَهَا.

[خ٦٢٥٠ (٢١٢٧)/ م٢١٥٥]

(ق) لە جابرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: بۆ قەرزێك لەسەر باوكم بوو هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، لە دەرگاکەم دا، فەرمووی: **(ئەوە كێیە؟)**، وتم: منم، فەرمووی: **(منم، منم)**، وەك ئەوەی لای ناپەسەند بێت.

## ٤- دەروازەی: مۆڵەت بكرێت بە بەرزكردنەوەی پەردە

**٢٩٣٣-** (م) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذْنُكَ عَلَيَّ أَنْ يُرْفَعَ الْحِجَابُ، وَأَنْ تَسْتَمِعَ سِوَادِي، حَتَّى أَنْهَاكَ)**. [م٢١٦٩]

(م) لە ئیبن مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: **(مۆڵەتی تۆ بۆ لای من ئەوەیە پەردەکە لابدرێت و ورتە ورتم ببیستی تا نەهیت لێ دەکەم)**.

## ٥- دەروازەی: وردبوونەوەی لەناكاو

**٢٩٣٤-** (م) عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ نَظَرِ الْفُجَاءَةِ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَصْرِفَ بَصَرِي. [م٢١٥٩]

(م) لە جەریری كوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) كرد دەربارەی وردبوونەوەی لەپڕ و لەناكاو، فەرمانی پێكردم چاوم لابدەم.

**٢٩٣٥-** عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِعَلِيٍّ: **(يَا عَلِيُّ، لاَ تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ، فَإِنَّ لَكَ الْأُولَى، وَلَيْسَتْ لَكَ الْآخِرَةُ)**. [د٢١٤٩/ ت٢٧٧٧]

* حسن.

لە بورەیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە عەلی فەرموو: **(ئەی عەلی، وردبوونەوەیەك بەدوای وردبوونەوەیەكی تردا مەڵمەدە، چونكە یەكەمیان بۆ تۆیە و ئەویتریان لەسەر تۆیە)**.

## ٦- دەروازەی: چۆن مۆڵەت وەردەگرێت؟

**٢٩٣٦**– عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ قَالَ: حَدَّثَنَا رَجُلٌ مَنْ بَنِي عَامِرٍ: أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ فِي بَيْتٍ، فَقَالَ: أَلِجُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لِخَادِمِهِ: (**اخْرُجْ إِلَى هَذَا، فَعَلِّمْهُ الاِسْتِئْذَانَ، فَقُلْ لَهُ: قُلْ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، أَأَدْخُلُ**) ؟ فَسَمِعَهُ الرَّجُلُ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، أَأَدْخُلُ، فَأَذِنَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَدَخَلَ. [د٥١٧٧ . ٥١٧٩]

* صحيح.

**له ڕیبعی کوڕی حیراشەوە، وتی: پیاوێك لە بەنی عامیر بۆی باس کردین، ئەو داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر(ﷺ) کردووە و پێغەمبەر لە ماڵێکدا بووە، وتویەتی: بێمە ژوورەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) بە خزمەتکارەکەی فەرموو: (بچۆ دەرەوە بۆ لای ئەوە و فێری مۆڵەت وەرگرتنی بکە، پێی بڵێ: بڵێ: السلام علیکم، بێمە ژوورەوە؟)، پیاوەکە گوێی لێبوو و وتی: السلام علیکم، بێمە ژوورەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دا و هاتە ژوورەوە.**

**٢٩٣٧**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَتَى بَابَ قَوْمٍ لَمْ يَسْتَقْبِلِ الْبَابَ مِنْ تِلْقَاءِ وَجْهِهِ، وَلَكِنْ مِنْ رُكْنِهِ الْأَيْمَنِ أَوْ الْأَيْسَرِ، وَيَقُولُ: (**السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ**)، وَذَلِكَ أَنَّ الدُّورَ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا يَوْمَئِذٍ سُتُورٌ. [د٥١٨٦]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی بوسرەوە، وتی: گەر پێغەمبەر(ﷺ) بهاتبایە بۆ دەرگای ماڵی خەڵکانێك ڕووی لە دەرگاکە نەدەکرد، بەڵکو لە لای ڕاستییەوە یان لای چەپییەوە[١]، و دەیفەرموو: (السلام علیکم، السلام علیکم)، ئەوەش چونکە لەو کاتەدا ماڵەکان پۆشەریان[٢] نەبوو.**

---

[١] واتە: لای ڕاست یان لای چەپی دەرگاکەوە دەوەستا و پشتی لە ماڵەکە بوو–و.

[٢] واتە: پەردە و حیجابێك خانەوادەکە بەتەواوی داپۆشێت، وەك دیواری حەوشەی بەرز و دەرگای ئەستوور و داخراو–و.

## بەشی دووەم

# بینای ماڵەکان و راخەر و سەلامەتییان

## ١- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی بینا هاتووە

**٢٩٣٨-** (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُنِي مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بَنَيْتُ بِيَدِي بَيْتاً يُكِنُّنِي مِنَ المطَرِ، وَيُظِلُّنِي مِنَ الشَّمْسِ، ما أَعانَنِي عَلَيْهِ أَحَدٌ مِنْ خَلْقِ اللهِ. [خ٦٣٠٢]

**(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: خۆمم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بینی، بە دەستی خۆم ماڵێکم دروست کرد لە باران پەنای دەدام و لە خۆر سێبەری بۆ دەکردم، هیچ کەس لە دروستکراوانی خودا یارمەتی نەدام لەسەری.**

## ٢- دەروازەی: بیناکردن بەبێ بوونی پێویستی

**٢٩٣٩-** (خ) عَنْ قيسِ بْنِ أَبِي حازِمٍ قَالَ: أَتَيْتُ خَبَّاباً، وَهُوَ يَبْنِي حائِطاً لَهُ، فَقَالَ: إِنَّ أَصْحَابَنَا الَّذِينَ مَضَوْا لَمْ تَنْقُصْهُمُ الدُّنْيَا شَيْئاً، وَإِنَّا أَصَبْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ شَيْئاً، لاَ نَجِدُ لَهُ مَوْضِعاً إِلاَّ التُّرَابَ. [خ٦٤٣١ (٥٦٧٢)]

**(خ) لە قەیسی کوڕی ئەبی حازمەوە، وتی: هاتم بۆ لای خەبباب، ئەو بینای دیوارێکی خۆی دەکرد، وتی: ئەو هاوەڵانەی ئێمە کە رۆیشتن دنیا شتێکی لەوان کەم نەکردەوە، ئێمە لەدوای ئەوان تووشی شتێك هاتین، شوێنێکی بۆ نابینینەوە جگە لە خاك.**

- وفي رواية: قال: إِنَّ المسْلِمَ لَيُؤْجَرُ فِي كُلِّ شَيْءٍ يُنْفِقُهُ؛ إِلاَّ فِي شَيْءٍ يَجْعَلُهُ فِي هَذَا التُّرَابِ. [خ٥٦٧٢]

**لە ریوایەتێکدا: وتی: موسڵمان لە هەر شتێك خەرجی دەکات پاداشت دەدرێتەوە، جگە لە شتێك لەم خاکەدا دایبنێت.**

- وعند الترمذي وابن ماجه: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ الْعَبْدَ لَيُؤْجَرُ فِي نَفَقَتِهِ كُلِّهَا، إِلاَّ فِي التُّرَابِ)، أَوْ قَالَ: (فِي الْبِنَاءِ). [ت٢٤٨٣/ جه٤١٦٣]

لای ترمزی و ئیبن ماجه: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(بەندە لە هەموو خەرجییەکدا پاداشت دەدرێتەوە، جگە لە خاك)**، یان فەرمووی: **(جگە لە بینا)**.

## ٣- دەروازەی: نەهی کردن لە راخستنی ئاورشم

**٢٩٤٠**– (ق) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (لاَ تَلْبَسُوا الحَرِيرَ، وَلاَ الدِّيبَاجَ، وَلاَ تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلاَ تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا، وَلَنَا فِي الآخِرَةِ). [خ٥٤٢٦/ م٢٠٦٧]

(ق) لە حوزەیفەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(ئاورشم و "دیباج"[1] مەپۆشن و لە جامی زێڕ و زیودا مەخۆنەوە و لە دەفری ئەوانەدا مەخۆن، چونکە ئەوانە لە دنیا بۆ ئەوانە[2] و لە دواڕۆژ بۆ ئێمەیە)**.

## ٤- دەروازەی: نەهی لە دەفر و جامی زێڕ و زیو

**٢٩٤١**– (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ـ زَوجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الَّذِي يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ، إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ). [خ٥٦٣٤/ م٢٠٦٥]

(ق) لە ئوم سەلەمەوە –هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)–: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەو کەسەی لە دەفری زیودا دەخواتەوە دەنگی خواردنەوەی ئاگری دۆزەخ لە ناو سکی دەبیستێت)**.

---

[1] دیباج: پۆشاکی تان و پۆ ئاورشم، یان نیوە ئاورشم–ە.

[2] واتە: ئاورشم و دیباج و دەفری زێڕ و زیو لە دنیا بۆ بێباوەڕانە و لە دواڕۆژ بۆ باوەڕداران–ە.

- في رواية لمسلم: (مَنْ شَرِبَ فِي إِنَاءٍ مِنْ ذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ..).

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا: (هەر کەس لە دەفری زێڕ یان زیو...).**

## ٥- دەروازەی: خشڵ بە شتی تر جگە لە زێڕ و زیو

**٢٩٤٢**- (خ) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: لَقَدْ فَتَحَ الْفُتُوحَ قَوْمٌ، ما كَانَتْ حِلْيَةُ سُيُوفِهِمُ الذَّهَبَ وَلاَ الْفِضَّةَ، إِنَّمَا كانَتْ حِلْيَتُهُمُ الْعَلاَبِيَّ وَالآنُكَ وَالحَدِيدَ. [خ٢٩٠٩]

**(خ) لە ئەبی ئومامەوە، وتی: خەڵکانێك چەندین فەتحیان ئەنجامدا، خشڵی شمشێرەکانیان زێڕ و زیو نەبوو[1]، بەڵکو خشڵەکانیان بریتی بوو لە پێستی دەباغی نەکراو و قورقوشم و ئاسن.**

## ٦- دەروازەی: ناپەسەندی ئەوەی پێویستی زیادەیە لە شتومەکی ناوماڵ

**٢٩٤٣**- (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَن رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لهُ: (فِرَاشٌ لِلرَّجُلِ، وَفِرَاشٌ لاِمْرَأَتِهِ، وَالثَّالِثُ لِلضَّيْفِ، وَالرَّابعُ لِلشَّيْطَانِ). [م٢٠٨٤]

[وانظر قوله صلّى الله عليه وسلّم: (إن الله لم يأمرنا أن نكسو الحجارة والطين-**خودا فەرمانی پێ نەکردووین پۆشاك بکەینەبەر بەرد و قوڕ**) : **٢٩٥٩**.

وانظر: **٣٧٤٧**.

وانظر في فراشه صلّى الله عليه وسلّم -**دەربارەی جێنووستنی پێغەمبەر تەماشای: ٣٧٥٦**] **بکە.**

**(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: (جێگەیەك بۆ پیاو و جێگەیەك بۆ ژنەکەی، و جێگەیەك بۆ میوان و چوارەمیش بۆ شەیتان).**

---

[1] واتە: دەسکی شمشێرەکانیان بە خشڵ لە زێڕ و زیو نەنەخشاندبوو-و.

## ٧- دەروازەی: راخستنی دۆشەك

**٢٩٤٤-** (ق) عَنْ جابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**هَلْ لَكُمْ مِنْ أَنْمَاطٍ**) ؟ قُلْتُ: وَأَنَّى يَكُونُ لَنَا الأَنْمَاطُ؟ قَالَ: (**أَمَا إِنَّهُ سَيَكُونُ لَكُمُ الأَنْمَاطُ**)، فَأَنَا أَقُولُ لَهَا ـ يَعْنِي: امْرَأَتَهُ ـ: أَخِّرِي عَنِّي أَنْمَاطَكِ، فَتَقُولُ: أَلَمْ يَقُلِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّهَا سَتَكُونُ لَكُمُ الأَنْمَاطُ**). فَأَدَعُهَا. [خ٣٦٣١/ م٢٠٨٣]

(ق) لە جابرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**ئایا دۆشەکەتان هەیە**)؟، وتم: لە کوێ دۆشەکەمان هەبێت؟ فەرمووی: (**لە داهاتوو دۆشەکەتان دەبێت**)، من پێی دەڵێم-واتە: بە ژنەکەی-: دۆشەکەکانتم لێ دووربخەرەوە، ئەویش دەڵێت: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) نەیفەرموو: (**لە داهاتوو دۆشەکەتان دەبێت**)؟، منیش لێیدەگەڕێم.

**٢٩٤٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَتَى فَاطِمَةَ ﷺ فَوَجَدَ عَلَى بَابِهَا سِتْراً، فَلَمْ يَدْخُلْ، قَالَ: وَقَلَّمَا كَانَ يَدْخُلُ إِلاَّ بَدَأَ بِهَا، فَجَاءَ عَلِيٌّ ﷺ فَرَآهَا مُهْتَمَّةً، فَقَالَ: مَا لَكِ؟ قَالَتْ: جَاءَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَيَّ فَلَمْ يَدْخُلْ، فَأَتَاهُ عَلِيٌّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ فَاطِمَةَ اشْتَدَّ عَلَيْهَا أَنَّكَ جِئْتَهَا فَلَمْ تَدْخُلْ عَلَيْهَا، قَالَ: (**وَمَا أَنَا وَالدُّنْيَا؟ وَمَا أَنَا وَالرَّقْمَ**) ؟ فَذَهَبَ إِلَى فَاطِمَةَ فَأَخْبَرَهَا بِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَتْ: قُلْ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَا يَأْمُرُنِي بِهِ؟ قَالَ: (**قُلْ لَهَا: فَلْتُرْسِلْ بِهِ إِلَى بَنِي فُلاَنٍ**). [د٤١٤٩، ٤١٥٠]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لای فاتیمە(خوا لێی رازی بێت) بینی پۆشەرێك لەسەر دەرگاکەیەتی، پێغەمبەر نەچووە ژوورەوە، وتی: زۆر کەم دەچووە ژوورەوە تا بە ئەو دەستی پێ دەکرد، عەلی(خوا لێی رازی بێت) هات و فاتیمەی بینی پەژارە دایگرتبوو، وتی: چیتە؟ وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لام و نەهاتە ژوورەوە، عەلی(خوا لێی رازی بێت) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، فاتیمە زۆری لەبەر دڵ گرانە تۆ هاتووی و نەچوویتە ژوورەوە بۆ لای، فەرمووی: (**من و دنیا لە کوێ؟ من و پەردەی نەخشکراو لە کوێ؟**)، عەلی

رۆیشت بۆ لای فاتیمە و هەواڵی پێدا بە فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، فاتیمە وتی: بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بڵێ: فەرمانم بە چی پێ دەکات دەربارەی؟ فەرمووی: **(پێی بڵێ: بینێرێ بۆ "بني فُلان")**.

- زاد في رواية: وَكَانَ سِتْراً مَوْشِيّاً.

له ریوایەتێکدا ئەمە زیاد بووە: پۆشەرێکی رەنگداری نەخشکراو بوو.

## ٨- دەروازەی: گرتنەبەری رێکاری سەلامەتی لە ماڵدا

**٢٩٤٦-** (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا كانَ جُنْحُ اللَّيْلِ ـ أَوْ أَمْسَيْتُمْ ـ فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ، فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ، فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَحُلُّوهُمْ، فَأَغْلِقُوا الأَبْوَابَ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَفْتَحُ بَاباً مُغْلَقاً، وَأَوْكُوا قِرَبَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ، وَخَمِّرُوا آنِيَتَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضُوا عَلَيْهَا شَيْئاً، وَأَطْفِئُوا مَصَابِيحَكُمْ)**. [خ٥٦٢٣ (٣٢٨٠)/ م٢٠١٢]

(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کە تاریك داهات-یان ئێوارەتان بەسەردا هات- منداڵەکانتان لە بڵاوەکردن بگرنەوە، چونکە لەو کاتەدا شەیتانەکان بڵاوە دەکەن، گەر ساتێك لە شەو گوزەری کرد وازیان لێ بهێنن، دەرگاکان دابخەن و ناوی خودا بهێنن، چونکە شەیتانەکان دەرگای داخراو ناکەنەوە، کوندە و جەوەندەی ئاوخواردنەوەکانتان ببەستن و ناوی خودایان لەسەر بهێنن، دەفرەکانتان داپۆشن و ناوی خودایان لەسەر بهێنن بە دانانی شتێکیش بێت لەسەریان، چراکانتان بکوژێننەوە)**.

## ٩- دەروازەی: پارێزگاری لە منداڵ کاتی خۆرئاوابوون

**٢٩٤٧-** (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تُرْسِلُوا فَوَاشِيَكُمْ وَصِبْيَانَكُمْ إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ حَتَّى تَذهَبَ فَحْمَةُ الْعِشَاءِ؛ فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَنْبَعِثُ إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ حَتَّى تَذْهَبَ فَحْمَةُ الْعِشَاءِ)**. [م٢٠١٣]

(م) لـە جـابرەوە، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: **(ئـاژەڵان و منداڵەکانتان لە کاتی خۆرئاوابوون بڵاوە پێ مەکەن تا تاریکی و رەشی شێوان دەڕوات، چونکە شەیتانەکان گەر خۆرئاوابوو بەئاگادێن و چالاك دەبن تا تاریکی و رەشی شێوان دەڕوات)**.

## ١٠- دەروازەی: کوژاندنەوەی ئاگر لە کاتی خەوتن

**٢٩٤٨-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تَتْرُكُوا النَّارَ فِي بُيُوتِكُمْ حِينَ تَنَامُونَ)**. [خ٦٢٩٣/ م٢٠١٥]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومـەرەوە، لـە پێغەمەمبـەرەوە(ﷺ) فـەرمووی: **(کـاتێ دەخەون لە ماڵەکانتان ئاگر بەجێمەهێڵن)**.

**٢٩٤٩-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسى ﷺ قَالَ: احْتَرَقَ بَيْتٌ بِالمدِينَةِ عَلَى أَهلِهِ مِنَ اللَّيْلِ، فَحُدِّثَ بِشَأْنِهِمُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ: **(إِنَّ هَذِهِ النَّارَ إِنَّمَا هِيَ عَدُوٌّ لَكُمْ، فَإِذَا نِمْتُمْ؛ فَأَطْفِئُوهَا عَنْكُمْ)**. [خ٦٢٩٤/ م٢٠١٦]

(ق) لە ئەبی موساوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: شەوێك لە مەدینـە ماڵێـك بەسـەر خانەوەدەکەیدا سوتا، لەو بارەیەوە بـاس بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ) کـرا، فـەرمووی: **(ئـەم ئاگرە دوژمنی ئێوەیە، گەر خەوتن لە خۆتانی بکوژێننەوە)**.

## ١١- دەروازەی: دەربارەی پێستی پڵنگ و دڕندە

**٢٩٥٠-** عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَرْكَبُوا الخَزَّ وَلاَ النِّمَارَ)**. [د٤١٢٩/ جه٣٦٥٦]

لە موعاویەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لەسەر ئاورشم و پێستی پڵنگ سوار مەبن[(١)])**.

- ولفظ ابن ماجه: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَنْهَى عَنْ رُكُوبِ النُّمُورِ.
  * صحيح.

لەفزەکەی ئیبن ماجە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی دەکرد لە سواربوونی پێستی پڵنگ.

## ١٢- دەروازەی: خەوتن لەسەر بانێك ستارەی نەبێت

**٢٩٥١**- عَنْ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ بَاتَ عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ لَيْسَ لَهُ حِجَارٌ، فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ)**. [د٥٠٤١]
* صحيح.

لە عەلی کوڕی شەیبانەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لەسەر بانی ماڵێك ستارەی نەبێت شەو بمێنێتەوە خۆی تووشی مەترسی کردووە و گیانی خۆی بەفیڕۆداوە)**.

## ١٣- دەروازەی: ماڵی بەرین

**٢٩٥٢**- عَنْ نَافِعِ بْنِ عَبْدِ الْحَارِثِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مِنْ سَعَادَةِ الْمَرْءِ: الْجَارُ الصَّالِحُ، وَالْمَرْكَبُ الْهَنِيءُ، وَالْمَسْكَنُ الْوَاسِعُ)**. [حم١٥٣٧٢]
* حديث صحيح لغيره.

لە نافیعی کوڕی عەبدولحاریسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە بەختەوەری مرۆڤ: جیرانێکی صالح، و وڵاخێکی سواری ئاسوودەبەخش، و شوێنێکی نیشتەجێی بەرینە)**.

---

(١) دانیشتن لەسەری یان کردنی بە سەرجل بۆ سەر پشتی وڵاخی سواری-و.

## ١٤- دەروازەی: پاکوخاوێنی ماڵەکان

**٢٩٥٣-** عن صالح بن أبي حسان قال: سمعت سعيد بن المسيب يقول: إنَّ اللَّهَ طيِّبٌ يحبُّ الطَّيِّبَ، نظيفٌ يحبُّ النَّظافةَ، كريمٌ يحبُّ الكرمَ جوادٌ يحبُّ الجودَ فنظِّفوا أُراهُ قالَ أفنيتَكُم ولا تشبَّهوا باليَهودِ.

قال: فذكرت ذلك لمهاجر بن مسمار فقال: حدثنيه عامر بن سعيد بن أبي وصال، عن أبيه، عن النبيّ صلّى الله عليه وسلّم مثله، إلا أنه قال: (نظِّفوا أفنيتَكُم). [ت٢٧٩٩]

* ضعيف إلا قوله: (إن الله جواد...). **ضعيف جگە لە: (خودا زۆر بەخشەرە).**

**لە صالّحی کوڕی ئەبی حەسسانەوە، وتی: گوێم لە سەعیدی کوڕی موسەییەب بوو وتی: خودا پاکە و پاکی پێخۆشە، پاکوخاوێنە و پاکوخاوێنی پێخۆشە، بەخشندەیە و بەخشندەیی پێخۆشە، زۆر بەخشەرە و بەخشینی پێخۆشە، بۆیە پاك و خاوێن بن- پێموایە وتی:- حەوشەکانتان[1]، خۆتان بە یەهوود مەچوێنن.**

**وتی: ئەوەم بۆ موهاجیری کوڕی میسمار باس کرد وتی: عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ئەوەی بۆ باس کردم، لە باوکییەوە، لە پێغەمبەرەوە، بەهەمان شێوە، جگە لەوەی فەرمووی: (حەوشەکانتان پاك بکەنەوە).**

## ١٥- دەروازەی: هەر کەس خانوویەکی فرۆشت با هاوشێوەی ئەوە بگرێتەوە

**٢٩٥٤-** عن صعيد بن حُريث قال: سمعت رسول الله صلّى الله عليه وسلّم يقول: **(من باع دارًا أو عقارًا فلم يجعَلْ ثمَنَه في مِثلِه، كانَ قمِنًا أن لاَ يبارَكَ فيه).** [جه٢٤٩٠/ مي٢٦٦٧]

* صحيح، وفي (الزوائد): ضعيف.

**لە سەعیدی کوڕی حورەیسەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەر کەس خانوویەك یان زەوییەکی فرۆشت نرخەکەی لە نموونەی ئەوەدا دانەنێت شایستەیە بەوەی بەرەکەتی تێنەخرێت).**

---

[1] واتە: با حەوش و پەنای ماڵەکانتان پاك و خاوێن بێت-و.

## بەشی سێیەم

# جوانکردنی ماڵ و کەلوپەلی ناوماڵ بە وێنە

## ١- دەروازەی: فریشتە ناچێتە ماڵێك وێنەی تێدا بێت

**٢٩٥٥**- (ق) عَنْ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَدْخُلُ المَلاَئِكَةُ بَيْتاً فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ تَصَاوِيرُ)**. [خ٥٩٤٩ (٣٢٢٥)/ م٢١٠٦]

(ق) لە ئەبی تەلحەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(فریشتە ناچنە ماڵێك سەگ و وێنەی تێدا بێت)**.

**٢٩٥٦**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتاً فِيهِ تَمَاثِيلُ أَوْ تَصَاوِيرُ)**. [م٢١١٢]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(فریشتە ناچنە ماڵێك پەیکەر یان وێنەی تێدا بێت)**.

## ٢- دەروازەی: سزای وێنەکێشان

**٢٩٥٧**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ الَّذِينَ يَصْنَعُونَ هذِهِ الصُّوَرَ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُقَالُ لَهُمْ: أَحْيُوا ما خَلَقْتُمْ)**. [خ٥٩٥١/ م٢١٠٨]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوانەی ئەم وێنانە دروست دەکەن لە رۆژی قیامەت سزا دەدرێن، پێیان دەوترێت: ئەوەی ئێوە دروستتان کرد زیندوویان بکەنەوە)**.

**٢٩٥٨**- (ق) عَنْ أَبِي زُرْعَةَ قالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ دَاراً بِالمدِينَةِ، فَرَأَى أَعْلاَهَا مُصَوِّراً يُصَوِّرُ، قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ كَخَلْقِي، فَلْيَخْلُقُوا حَبَّةً، وَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً**). [خ٥٩٥٣/ م٢١١١]

**(ق) لە ئەبی زورعەوە، وتی: لە مەدینە لەگەڵ ئەبی هورەیرە چووینە ناو ماڵێك، لە سەرەوەی وێنەکێشی بینی وێنەی دەکێشا، وتی[1]: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (کێ ستەمکارترە لەو کەسەی دەچێت وەك دروستکراوی من دروست دەکات، گەر دەتوانن با دەنکە گەنمێك یان مێرووڵەیەکی بچووك دروست بکەن).**

## ٣- دەروازەی: بەکارهێنانی سەرینی نەقشکراو بە وێنە

**٢٩٥٩**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ سَفَرٍ، وَقَدْ سَتَرْتُ بِقِرَامٍ لِي عَلَى سَهْوَةٍ لِي فِيهَا تَمَاثِيلُ، فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم هَتَكَهُ وَقَالَ: (**أَشَدُّ النَّاسِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُضَاهُونَ بِخَلْقِ اللهِ**) قالَتْ: فَجَعَلْنَاهُ وِسَادَةً أَوْ وِسَادَتَيْنِ.

[خ٥٩٥٤ (٢٤٧٩)/ م٢١٠٧]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە سەفەرێك هاتەوە بە پۆشەرێکی ناسك سندووقێکی گەنجینەی بچووکم لە دیوارەکەدا داپۆشی بوو، سندووقەکە بووکەڵە یارییەکانی منی تێدا بوو، کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بینی لێی کردەوە و فەرمووی: (توندترین سزا لە رۆژی قیامەت سزای ئەوانەیە شێوەی دروستکراوی خودا دەردێنن)، عائیشە وتی: کردمان بە سەرینێك یان دوو سەرین.**

- وفي رواية لهما: فَاتَّخَذَتْ مِنْهُ نُمْرُقَتَيْنِ، فَكَانَتَا فِي الْبَيْتِ يَجْلِسُ عَلَيْهِمَا. [خ٢٤٧٩]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: دوو پشتی بچووکی لێ دروست کرد لە ماڵەکە لەسەریان دادەنیشت.**

---

[1] واتە: ئەبو هورەیرە وتی-و.

## ٤- دەروازەی: وێنەکردنی شتانێك رۆحلەبەر نین

**٢٩٦٠-** (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الحَسَنِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبَّاسٍ! إِنِّي إِنْسَانٌ، إِنَّمَا مَعِيشَتِي مِنْ صَنْعَةِ يَدِي، وَإِنِّي أَصْنَعُ هٰذِهِ التَّصَاوِيرَ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لاَ أُحَدِّثُكَ إِلاَّ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: **(مَنْ صَوَّرَ صُورَةً فَإِنَّ اللهَ مُعَذِّبُهُ حَتَّى يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ فِيهَا أَبَداً)**. فَرَبَا الرَّجُلُ رَبْوَةً شَدِيدَةً وَاصْفَرَّ وَجْهُهُ، فَقَالَ: وَيْحَكَ! إِنْ أَبَيْتَ إِلاَّ أَنْ تَصْنَعَ، فَعَلَيْكَ بِهٰذَا الشَّجَرِ، كُلِّ شَيْءٍ لَيْسَ فِيهِ رُوحٌ. [خ٢٢٢٥/ م٢١١٠]

(ق) لە سەعیدی کوڕی ئەبی حەسەنەوە، وتی: لای ئیبن عەباس(خوایان لێ رازی بێت) بووم، پیاوێك هات بۆ لای و وتی: ئەی ئیبن عەباس، من مرۆڤم، گوزەرانم لە پیشەی دەستمە، من ئەم وێنانە دەکێشم، ئیبن عەباس وتی: تەنها ئەوەت بۆ باس دەکەم لە پێغەمبەرم بیستووە و فەرموویەتی، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس وێنەیەك بکێشێت خودا سزای دەدات تا رۆحی دەکات بە بەردا، ئەو هەرگیز ناتوانێ رۆح بکات بە بەریدا)**، پیاوەکە ترس و تۆقینێکی زۆر رووی لێکرد و رەنگی زەردهەڵگەڕا، ئیبن عەباس وتی: هاوار بە حاڵت گەر هەر دروست دەکەی ئەم دار و درەختانە دروست بکە، هەر شتێك رۆحی لەبەر نەبێت.

## ٥- دەروازەی: شکاندن و تێکدانی وێنە و خاچ

**٢٩٦١-** (خ) عَنْ عائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَمْ يَكُنْ يَتْرُكُ فِي بَيْتِهِ شَيْئاً فِيهِ تَصَالِيبُ إِلاَّ نَقَضَهُ. [خ٥٩٥٢]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵەکەی هەر شتێك شێوەی خاچی پێوە بوایە وازیلێنەدەهێنا و دەیشکاند و تێکیدەدا.

## بەشی چوارەم

# حوکمی گیانداران و مێرووی ماڵان

## ١- دەروازەی: نەهی کردن لە راگرتنی سەگ و زەنگ

**٢٩٦٢**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ تَصْحَبُ الْمَلاَئِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا كَلْبٌ، وَلاَ جَرَسٌ**). [م٢١١٣]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(فریشتە یاوەری کۆمەڵێك ناکات سەگ و زەنگیان[1] لەناودا بێت).**

**٢٩٦٣**- (م) وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْجَرَسُ مَزَامِيرُ الشَّيْطَانِ**). [م٢١١٤]

(م) هەر لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(زەنگ جووزەلەی شەیتانە).**

## ٢- دەروازەی: ناپەسەندی هەڵواسینی ژێی کەوان بە گەردنی حوشتردا

**٢٩٦٤**- (ق) عَنْ أَبِي بَشِيرٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ. قَالَ عَبْدُ اللهِ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ. وَالنَّاسُ فِي مَبِيتِهِمْ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَسُولاً: (**أَنْ لاَ يَبْقَيَنَّ فِي رَقَبَةِ بَعِيرٍ قِلاَدَةٌ مِنْ وَتَرٍ. أَوْ قِلاَدَةٌ. إِلاَّ قُطِعَتْ**).

[خ٣٠٠٥/ م٢١١٥]

---

[1] ئەو زەنگ و زەنگۆڵانەی دەکرێنە گەردنی حوشتر و ئاژەڵان-و.

(ق) لە ئەبی بەشیری ئەنصارییەوە: ئەو لە هەندێ لە سەفەرەکانی لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو-عەبدولاّ وتی: پێموایە ئەو وتی: خەڵکی لە شوێنی مانەوەی شەویان بوون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) نێراوێکی نارد: **(بە گەردنی حوشترێکەوە هەڵواسراوێك لە ژێی کەوان-یان هەر هەڵواسراوێك- نەمێنێتەوە گەرەکە ببڕێن).**

- زاد مسلم وأبو داود: قَالَ مَالِكٌ: أُرَى ذَلِكَ مِنَ الْعَيْنِ.

**موسلیم و ئەبو داود ئەمەیان زیاد کردووە: مالیك وتی: وا دەبینم ئەو هەڵواسینە لە چاوەوە بوویێت.**

## ٣- دەروازەی: نەهی کردن لە نیشانەکردنی ئاژەڵ لە روخساری

**٢٩٦٥-** (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الضَّرْبِ فِي الْوَجْهِ، وَعَنِ الْوَسْمِ فِي الْوَجْهِ. [م٢١١٦]

**(م) لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە لێدان لە روخسار و نیشانە کردنی دەموچاو.**

**٢٩٦٦-** (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: وَرَأَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حِمَاراً مَوْسُومَ الْوَجْهِ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ، قَالَ: **(فَوَاللهِ! لاَ أَسِمُهُ إِلاَّ فِي أَقْصَى شَيْءٍ مِنَ الْوَجْهِ)**. فَأَمَرَ بِحِمَارٍ لَهُ فَكُوِيَ فِي جَاعِرَتَيْهِ، فَهُوَ أَوَّلُ مَنْ كَوَى الْجَاعِرَتَيْنِ. [م٢١١٨]

**(م) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) گوێدرێژێکی بینی روخساری نیشانە کرا بوو، ئەوەی لا ناپەسەند بوو و فەرمووی: (سوێند بە خودا، من لە روخسارەوە لە دوورترین شوێنەوە نیشانەی دەکەم). بۆیە فەرمانی کرد گوێدرێژەکەی لەسەر دوو سمت نیشانە بکەن، ئەو یەکەمین کەس بوو دوو سمتی مۆر کرد.**

## ٤- دەروازەی: کوشتنی مار

**٢٩٦٧-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: (**اقْتُلُوا الحَيَّاتِ، وَاقْتُلُوا ذَا الطُّفْيَتَيْنِ وَالأَبْتَرَ، فَإِنَّهُمَا يَطْمِسَانِ البَصَرَ، وَيَسْتَسْقِطَانِ الحَبَلَ**).

قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَبَيْنَا أَنَا أُطَارِدُ حَيَّةً لِأَقْتُلَهَا، فَنَادَانِي أَبُو لُبَابَةَ: لاَ تَقْتُلْهَا، فَقُلْتُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَدْ أَمَرَ بِقَتْلِ الحَيَّاتِ. قَالَ: إِنَّهُ نَهى بَعْدَ ذلِكَ عَنْ ذَوَاتِ البُيُوتِ، وَهِيَ الْعَوَامِرُ. [خ٣٢٩٧، ٣٢٩٨/ م٢٢٣٣]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو لەسەر مینبەر وتاری دەدا و دەیفەرموو: (مار بکوژن، ئەوانە بکوژن دوو خەت لە پشتیاندایە، هەروەها کوڵەکوێرە، چونکە ئەو دوانە چاو کوێر دەکەن و سکی ئافرەت لەبار دەبەن).**

**عەبدوڵا وتی: کاتێ من مارێکم راودەنا بۆئەوەی بیکوژم، ئەبو لوبابە وتی: مەیکوژە، وتم: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی کردووە بە کوشتنی مار، ئەو وتی: ئەو لەدوای ئەوە نەهی کرد لە کوشتنی ئەوانەی هاوەڵی ماڵانن، "ئەوانە ئاوەدانکەرەوەکانن"[(١)].**

**٢٩٦٨-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ كُلَّهُنَّ**، فَمَنْ خَافَ ثَأْرَهُنَّ، فَلَيْسَ مِنِّي). [د٥٢٤٩/ ن٣١٩٣]

* صحيح.

**لە ئیبن مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەموو مارێك بکوژن، هەر کەس لە تۆڵەیان بترسێت لە من نییە).**

---

(١) ئەوانە ئاوەدانکەرەوەکانن: ئەوە لە قسەی زوهرییە، هۆی ناونانیان بەو ناوە لەبەر زۆری مانەوەیانە لە ماڵان.

## ٥- دەروازەی: کوشتنی "الوزغ- قومقمۆکە"

**٢٩٦٩-** (ق) عَنْ أُمِّ شَرِيكٍ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَمَرَهَا بِقَتْلِ الأَوْزَاغِ.
[خ٣٣٠٧/ م٢٢٣٧]

(ق) لە ئوم شەریکەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد بە کوشتنی قومقمۆکە.

- وزاد في رواية للبخاري: وقال صلّى الله عليه وسلّم: (**كانَ يَنْفُخُ عَلَى إِبْرَاهِيمَ عليه السلام**).

[خ٣٣٥٩]

لە ریوایەتێکی بوخاریدا ئەمە زیاد کراوە: هەروەها فەرمووی: **(قومقمۆکە فووی بە سەر ئیبراهیمدا(علیە السلام) دەکرد[١])**.

**٢٩٧٠-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ قَتَلَ وَزَغَةً فِي أَوَّلِ ضَرْبَةٍ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً، وَمَنْ قَتَلَهَا فِي الضَّرْبَةِ الثَّانِيَةِ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً، لِدُونِ الأُولَى، وَإِنْ قَتَلَهَا فِي الضَّرْبَةِ الثَّالِثَةِ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً، لِدُونِ الثَّانِيَةِ**). [م٢٢٤٠]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بە یەکەم لێدان قومقمۆکەیە بکوژێت ئەوەندە و ئەوەندە چاکەی بۆ هەیە، هەر کەس بە لێدانی دووەم بیکوژێت ئەوەندە و ئەوەندە چاکەی بۆ هەیە، لەخوار یەکەمەوە[٢]، هەر کەس بە لێدانی سێیەم بیکوژێت ئەوەندە و ئەوەندە چاکەی بۆ هەیە، لەخوار دووەمەوە)**.

---

[١] واتە: کاتێ هۆزەکەی دەیانویست ئاگر بکەنەوە بۆ سوتاندنی قوقمۆکە بە فووی خۆی ئاگرەکەی خۆشدەکرد-و.

[٢] واتە: چاکەکەی لە خوار چاکەی یەکەمەوەیە-و.

## ٦- دەروازەی: چاکە لەگەڵ گیانداران و ئاژەڵان

**٢٩٧١**- عَنْ سَهْلِ ابْنِ الْحَنْظَلِيَّةِ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِبَعِيرٍ قَدْ لَحِقَ ظَهْرُهُ بِبَطْنِهِ، فَقَالَ: (**اتَّقُوا اللهَ فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ الْمُعْجَمَةِ، فَارْكَبُوهَا صَالِحَةً، وَكُلُوهَا صَالِحَةً**).

* صحيح. [د٢٥٤٨]

لە سەهلی کوڕی حەنزەلییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پاڵ حوشترێکدا گوزەری کرد پشتی بە سکییەوە نووسابوو، و فەرمووی: **(لە خودا بترسن دەربارەی ئەم ئاژەڵە بێزمانانە، بە باشی سواریان بن و بە باشی بیانخۆن)**.

**٢٩٧٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِيَّاكُمْ أَنْ تَتَّخِذُوا ظُهُورَ دَوَابِّكُمْ مَنَابِرَ، فَإِنَّ اللهَ إِنَّمَا سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُبَلِّغَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلاَّ بِشِقِّ الأَنْفُسِ، وَجَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ، فَعَلَيْهَا فَاقْضُوا حَاجَتَكُمْ**). [د٢٥٦٧]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هۆشداریتان پێ دەدەم پشتی وڵاخە چوارپێکانتان مەکەن بە مینبەر[1]، چونکە خودا ئەوانەی بۆ ئێوە رامهێناوە تا بتانگەیەننە شار و وڵاتێك بە ناڕەحەتی زۆر نەبێت نەتاندەتوانی بیگەنێ، هەروەها زەوی بۆ رامهێناون، بۆیە لەسەر زەوی پێویستییەکانی خۆتان جێبەجێ بکەن)**.

**٢٩٧٣**- عَنِ الشَّعْبِيِّ يَرْفَعُ الْحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (**مَنْ تَرَكَ دَابَّةً بِمَهْلَكٍ، فَأَحْيَاهَا رَجُلٌ، فَهِيَ لِمَنْ أَحْيَاهَا**). [د٣٥٢٥]

* حسن.

---

[1] واتە: شوێنێ وتاری تێدا بدەن و قسەی تێدا بکەن یان بە پێوە لەسەری بوەستن، چونکە ئەوە ئازار و شەکەتی بۆ وڵاخی سوارییەکە دروست دەکات-و.

لە شەعبییەوە، فەرموودەکە بەرزدەکاتەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو فەرمووی: **(هەر کەس گیاندارێك لە تیابەرێکدا[1] وازلێبهێنێ و پیاوێك زیندووی بکاتەوە، گیاندارەکە بۆ ئەو کەسەیە زیندووی کردووەتەوە).**

## ٧- دەروازەی: ئەو نەهیکراوە لە کوشتنی

**٢٩٧٤**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنَ الدَّوَابِّ: النَّمْلَةُ، وَالنَّحْلَةُ، وَالْهُدْهُدُ، وَالصُّرَدُ. [د٥٢٦٧/ جه٣٢٢٤/ مي٢٠٤٢]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لە کوشتنی چوار جۆر لە گیانداران: مێرووله، وهەنگ، وپەپووسولەیمانە، وباڵندەی عایلەمەن(الصُّرَد).**

## ٨- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی دەنگی گیانداران هاتووە

**٢٩٧٥**– عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَسُبُّوا الدِّيكَ، فَإِنَّهُ يُوقِظُ لِلصَّلاَةِ)**. [د٥١٠١]

* صحيح.

لە زەیدی کوڕی خالیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(قسە بە کەڵەشێر مەڵێن، چونکە ئەو بۆ نوێژ بەئاگادەهێنێت).**

**٢٩٧٦**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم **(إِذَا سَمِعْتُمْ نُبَاحَ الْكِلاَبِ وَنَهِيقَ الْحُمُرِ بِاللَّيْلِ، فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ، فَإِنَّهُنَّ يَرَيْنَ مَا لاَ تَرَوْنَ)**. [د٥١٠٣]

* صحيح.

---

[1] واتە: شوێن و جێگەیەك ببێتە هۆی تیاچوونی گیاندارەکە، ئەوەش بە هۆی نەبوونی ئاو و لەوەڕ–و.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر لە شەودا وەڕەی سەگ و زەڕەی گوێدرێژتان بیست پەنابگرن بە خودا، ئەوان شتانێك دەبینن ئێوە نایانبینن)**.

## ٩- دەروازەی: گوێدرێژ لە ماین ناپەڕێنرێت

**٢٩٧٧-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: أُهْدِيَتْ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَغْلَةٌ فَرَكِبَهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: لَوْ حَمَلْنَا الْحَمِيرَ عَلَى الْخَيْلِ، فَكَانَتْ لَنَا مِثْلُ هَذِهِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّمَا يَفْعَلُ ذَلِكَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ**).　　[د٢٥٦٥/ ٣٥٨٢ن]

* صحيح.

لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ئێسترێك هەدیەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا و سواری بوو، عەلی وتی: گەر بتوانین گوێدرێژ لە ماین بپەڕێنین، نموونەی ئەمەمان دەبێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوانەی نازانن ئەو کارە دەکەن[1])**.

## ١٠- دەروازەی: پیاو لەپێشترە بە پێشەوەی وڵاخی سوارییەکەی

**٢٩٧٨-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: قَضَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّ صَاحِبَ الدَّابَّةِ أَحَقُّ بِصَدْرِهَا.　　[حم١١٩]

* حسن لشواهده.

لە عومەری کوڕی خەتابەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بەوە قەزاوەتی کرد خاوەن وڵاخی سواری لەپێشترە بە پێشەوەی وڵاخەکەی.

---

[1] نەهییە لە کارەکە گەر مرۆڤ ئەنجامی بدات، لەبەر پێشێل کردنی حەیا و حیشمەت، گەر بە ڕێگەی سروشتی خۆی کارەکە ئەنجام بدرێت ناچێتە خانەی نەهیلێکراو، چونکە ئێسترەکەی پێغەمبەر لەو کارەوە -جووتبوونی گوێدرێژ و ماین- بەرهەم هاتبوو-و.

## ١- دەروازەی: ئاسایش پێویستییەكی زەرووڕە

**٢٩٧٩**- عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مِحْصَنٍ الخَطْمِيِّ. وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ. قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِناً فِي سِرْبِهِ، مُعَافًى فِي جَسَدِهِ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ؛ فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا**). [ت٢٣٤٦/ جه٤١٤١]

* حسن.

لە عوبەیدوڵای كوڕی میحصەنی خەتمییەوە -ئەو هاوەڵییەكی هەبوو- وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس لە ئێوە لەناو گەلەكەی بە ئاسایشەوە ڕۆژی لێبووبێتەوە، و لە جەستەیدا عافییەتی هەبوو، و بژێوی ئەو ڕۆژەی هەبوو، وەك ئەوەی هەموو دنیای بۆ كۆبووبێتەوە).**

## ٢- دەروازەی: حورمەتی ماڵان

**٢٩٨٠**- عَن عُبادة بن الصّامت: أن رسولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قال: (**الدارُ حَرَمٌ، فمن دخل عليك حَرَمَكَ؛ فاقتلْهُ**). [حم٢٢٧٧٢]

إسناده ضعيف.

لە عوبادەی كوڕی صامیتەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ماڵ حەرەمی تۆیە هەركەس هاتە ژوورەوە بۆ سەرت لە حەرەمەكەت بیكوژە).**

[وانظر (لا يحل لمسلم أن يروع مسلماً): **٣٤٣٧**.
وانظر في الاستئذان: ٢٩٢٩ وما بعده].

## ١- دەروازەی: پێویستییە بنچینەییەکان نابێت تاك ببێتە خاوەنی

**٢٩٨١**– عَنْ أَبِي خِدَاشٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ثَلاَثاً أَسْمَعُهُ يَقُولُ: (**الْمُسْلِمُونَ شُرَكَاءُ فِي ثَلاَثٍ: فِي الْكَلإِ، وَالْمَاءِ، وَالنَّارِ**). [د٣٤٧٧]

* صحيح.

**لە ئەبی خیداشەوە، لە پیاوێك لە کۆچکەرانەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) سێ غەزام کرد، دەمبیست دەیفەرموو: (موسڵمانان لە سێ شتدا هاوبەشن: لە لەوەڕگا، وئاو، وئاگر).**

**٢٩٨٢**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**ثَلاَثٌ لاَ يُمْنَعْنَ: الْمَاءُ، وَالْكَلأُ، وَالنَّارُ**). [جه٢٤٧٣]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سێ شت رێگرییان لێ ناکرێت: ئاو، ولەوەڕگا، وئاگر).**

**٢٩٨٣**– عَنْ أَبْيَضَ بْنِ حَمَّالٍ: أَنَّهُ اسْتَقْطَعَ الْمِلْحَ الَّذِي يُقَالُ لَهُ: مِلْحُ شَذاً بِمَأْرِبٍ، فَأَقْطَعَهُ لَهُ، ثُمَّ إِنَّ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ التَّمِيمِيَّ أَتَى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي قَدْ وَرَدْتُ الْمِلْحَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَهُوَ بِأَرْضٍ لَيْسَ بِهَا مَاءٌ، وَمَنْ وَرَدَهُ أَخَذَهُ، وَهُوَ مِثْلُ الْمَاءِ الْعِدِّ.

فَاسْتَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَبْيَضَ بْنَ حَمَّالٍ فِي قَطِيعَتِهِ فِي الْمِلْحِ، فَقَالَ: قَدْ أَقَلْتُكَ مِنْهُ عَلَى أَنْ تَجْعَلَهُ مِنِّي صَدَقَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**هُوَ مِنْكَ صَدَقَةٌ، وَهُوَ مِثْلُ الْمَاءِ الْعِدِّ، مَنْ وَرَدَهُ أَخَذَهُ**).

قَالَ فَرَجٌ: وَهُوَ الْيَوْمَ عَلَى ذَلِكَ: مَنْ وَرَدَهُ أَخَذَهُ.

قَالَ: فَقَطَعَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَرْضاً وَنَخْلاً بِالْجَوْفِ، جَوْفِ مُرَادٍ، مَكَانَهُ حِينَ أَقَالَهُ مِنْهُ. لفظ ابن ماجه. [د٣٠٦٤/ت١٣٨٠/جه٢٤٧٥/مي٢٦٥٠]

لە "أبیض بن حمّال"ەوە: ئەو داوای کرد ئەو خوێیەی لە مەئرەبە و پێی دەوترێت "مِلح شذا" پێغەمبەر بۆی ببڕێتەوە[1]، ئەویش بۆی بڕییەوە، پاشان ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من لە سەردەمی نەفامی دەچووم بۆ سەر ئەو خوێیە، ئەوە لە زەوییەکدایە ئاوی تێدا نییە، هەر کەس بچێتە سەری لێی دەبات، ئەو خوێیە وەك ئاوێکی بەردەوامە و بۆ کەس نابڕێتەوە.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) "أبیض بن حمال"ی لادا لەو خوێیەی بۆی بڕیبووەوە، "أبیض" وتی: دەیدەمە دەستی تۆ لەسەر ئەوەی بیکەی بە صەدەقە بۆ من[2]، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوە لە تۆوە صەدەقەیە، و وەك ئاوی بەردەوام وایە و هەر کەس بچێتە سەری لێی دەبات).**

فەرەج دەڵێت: ئەمڕۆش لەسەر ئەوەیە و بەو جۆرەیە و هەر کەس بچێتە سەری لێی دەبات.

وتی: پێغەمبەر(ﷺ) زەوییەك و دارخورمای لە "الجوف" بۆ بڕییەوە، دۆڵی موراد، ئەو شوێنەی خۆی کە پێغەمبەر ئەوی لەسەر لادا. لەفزەکەی ئیبن ماجە.

وفي لفظ أبي داود: عَنْ أَبْيَضَ بْنِ حَمَّالٍ: أَنَّهُ وَفَدَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَاسْتَقْطَعَهُ الْمِلْحَ الَّذِي بِمَأْرِبَ، فَقَطَعَهُ لَهُ.

* حسن.

لە لەفزەکەی ئەبی داوددا: لە "أبیض بن حمال"ەوە: ئەو وەك وەفدێك بە زیوەوە هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و داوای لێکرد ئەو خوێیەی بۆ ببڕێتەوە لە مەئرەبە، ئەویش بۆی بڕییەوە.

---

[1] واتە: پێیبدا لەسەری کار بکات-و.

[2] واتە: دیارە زەوییەکە موڵکی ئەو بووە و خوێیەکەی ناوی موڵکی گشتی وەك چۆن ئاو و کانیاوێك لە زەوی کەسێك جاری دەبێت و خەڵك دەتوانن لێی بخۆنەوە-و.

**٢٩٨٤**– عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ، عَنْ جَدِّهِ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم بِفِضَّةٍ فَقَالَ: هَذِهِ مِنْ مَعْدِنٍ لَنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**سَتَكُونُ مَعَادِنُ يَحْضُرُهَا شِرَارُ النَّاسِ**). [حم٢٣٦٤٥]

* حسن لغيره.

[وانظر ما جاء بشأن العمل الجماعي: **٩٤٥**].

**لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە: لە پیاوێك لە بەنی سولەیم، لە باپیرییەوە: ئەو بە زیوەوە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەمە لە کانزای ئێمەیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لە داهاتوو کانزا خراپرینی خەڵك ئامادەی دەکەن).**

## ١- دەروازەی: حەڵاڵ ڕۆشنە و حەرامیش ڕۆشن

**٢٩٨٥-** (ق) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(الْحَلاَلُ بَيِّنٌ، وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشَبَّهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الْمُشَبَّهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ: كَرَاعٍ يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى، يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ. أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمىً، أَلاَ إِنَّ حِمَى اللهِ فِي أَرْضِهِ مَحَارِمُهُ، أَلاَ وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً: إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ)**. [خ٥٢/ م١٥٩٩]

(ق) لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(حەڵاڵ ڕۆشنە، و حەرامیش ڕۆشنە، لە نێوانیان "مُشَبَّهات"[١] هەن کە زۆربەی خەڵك نایانزانن، هەر کەس لە "المشبّهات" خۆی بپارێزێت دین و حەیا و ناموسی خۆی ڕزگار کردووە، هەر کەس بەریوویەوە بۆ ناو شوبوهات: وەك ئەو شوانە وایە بە دەوری پاوەنێکدا دەلەوەڕێنێ ها خەریکە بکەوێتە ناوییەوە، دەزانن بۆ هەموو مەلیکێك پاوەنێك هەیە، دەزانن پاوەنی خودا لە زەوییەکەی بریتییە لە حەرامکراوەکانی، دەزانن لە جەستەدا پارچە گۆشتێك هەیە: گەر بێتە ڕاستە هەموو جەستە دێتە ڕاستە، گەر تێکبچێت هەموو جەستە تێکدەچێت، دەزانن ئەوە بریتییە لە دڵ)**.

**٢٩٨٦-** عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ السَّعْدِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ: مَا حَفِظْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَ: حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم **(دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكَ)**. [ت٢٥١٨/ ن٥٧٢٧/ مي٢٥٧٤]

لە ئەبی حەورای سەعدییەوە، وتی: بە حەسەنی کوڕی عەلیم وت: چیت لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لەبەرکردووە؟ وتی: لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ئەمەم لەبەرکرد: **(وازبهێنە لەوەی شکت لێی هەیە بۆ لای ئەوەی شکت لێی نییە)**.

[١] واتە: لێڵ و ناڕوون، ڕوویەکی حەڵاڵ و ڕوویەکی حەرامی تێدایە-و.

▪ زاد الترمذي: (فَإِنَّ الصِّدْقَ طُمَأْنِينَةٌ، وَإِنَّ الْكَذِبَ رِيبَةٌ).

* صحيح.

**تیرمزی ئەمەی زیاد کردووە: (صدق بریتییە لە ئارامی و سوکنایی دڵ و درۆ بریتییە لە ئاڵۆزی و دڵکرمێنی).**

**٢٩٨٧**- عَنِ الْعَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْقُوبَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: لاَ يَبِعْ فِي سُوقِنَا؛ إِلاَّ مَنْ قَدْ تَفَقَّهَ فِي الدِّينِ. [ت٤٨٧]

* حسن الإسناد.

[وانظر في طلب الحلال: **٢٢٢٧، ٣١٩٦**].

[وانظر في البعد عن الشبهات: **١٧٩٨، ٣٣٥٢**].

**لە عەلای کوڕی عبدالرحمانی کوڕی یەعقووبەوە، لە باوکییەوە، لە باپیرییەوە، وتی: عومەری کوڕی خەتاب وتی: تەنها ئەو کەسە لە بازاڕی ئێمە دەفرۆشێت لە دین حاڵی بووە.**

## ٢- دەروازەی: کەسێك لە بەدەستهێنانی ماڵ و سامان باکێکی نەبێت

**٢٩٨٨**- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، لاَ يُبَالِي الْمَرْءُ بِمَا أَخَذَ الْمَالَ، أَمِنْ حَلاَلٍ أَمْ مِنْ حَرَامٍ). [خ٢٠٨٣ (٢٠٥٩)]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (ڕۆژگارێك بەسەر خەڵکیدا دێت مرۆڤ باکێکی نییە لە کوێوە ماڵ بەدەست دەهێنێت، ئایا لە حەڵاڵەوەیە، یان لە حەرامەوە).**

**٢٩٨٩**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (يَا كَعْبُ بْنَ عُجْرَةَ، إِنَّهُ لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ لَحْمٌ نَبَتَ مِنْ سُحْتٍ). [مي٢٨١٨]

* إسناد قوي.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی کەعبی کوڕی عوجرە، گۆشتێك لە حەرامەوە رووابێت ناچێتە بەهەشتەوە).**

## ٣- دەروازەی: فەزڵی کەسابەتی پیاو و کارکردن بە دەستی خۆی

**٢٩٩٠-** (خ) عَنِ الْمِقْدَامِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَاماً قَطُّ، خَيْراً مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللهِ دَاوُدَ عليه السلام كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ).** [خ٢٠٧٢]

(خ) لە میقدامەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەرگیز کەسێك خواردنێکی نەخواردووە باشتر و چاکتر لە کاری بەری دەستی خۆی، پێغەمبەری خودا داود(علیه السلام) لە کاری بەری دەستی خۆی دەیخوارد).**

**٢٩٩١-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُّ الْكَسْبِ أَطْيَبُ؟ قَالَ: **(عَمَلُ الرَّجُلِ بِيَدِهِ، وَكُلُّ بَيْعٍ مَبْرُورٍ).** [حم١٧٢٦٥]

* حسن لغيره.

لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە، وتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، چ جۆرە کەسابەتێك پاکترین و باشترینە؟ فەرمووی: **(کاری پیاو بە دەستی خۆی و هەموو فرۆشتنێکی حەڵاڵ و دروست).**

## ٤- دەروازەی: جێگیربوونی بژاردەی مەجلیس بۆ دوو فرۆشیارەکە

**٢٩٩٢-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(الْمُتَبَايِعَانِ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ عَلَى صَاحِبِهِ، مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا؛ إِلاَّ بَيْعَ الْخِيَارِ).**

[خ٢١١١ (٢١٠٧)/ م١٥٣١]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دوو فرۆشیارەکە هەریەکەیان سەرپشکە بەسەر هاوەڵەکەیدا گەر لەیەکتر جیانەبووبنەوە، جگە لە فرۆشتنی سەرپشك کردن[1])**.

**٢٩٩٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَفْتَرِقَنَّ اثْنَانِ؛ إِلاَّ عَنْ تَرَاضٍ)**. [د٣٤٥٨/ ت١٢٤٨]

* حسن صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دووان بە رەزامەندی هەردووکیان نەبێت لە یەکتر جیانابنەوە[2])**.

## ٥- دەروازەی: کەسێك لە فرۆشتن فریوکاری بکات

**٢٩٩٤-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً ذَكَرَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي الْبُيُوعِ، فَقَالَ: **(إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ: لاَ خِلاَبَةَ)**. [خ٢١١٧/ م١٥٣٣]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پیاوێك بۆ پێغەمبەری(ﷺ) باس کرد ئەو لە کڕین و فرۆشتن فریوی لێ دەکرێت، فەرمووی: **(گەر کڕین و فرۆشتنت کرد بڵێ: فریوکاری نییە)**.

## ٦- دەروازەی: راستگۆیی و دروستی لە فرۆشتن

**٢٩٩٥-** (ق) عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا . أَوْ قَالَ: حَتَّى يَتَفَرَّقَا . فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا، وَإِنْ كَتَمَا وَكَذَبَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا)**. [خ٢٠٧٩/ م١٥٣٢]

---

[1] بۆ نموونە پێی بڵێ تا سێ رۆژ مۆڵەتت دەدەم گەر بتەوێ تیایدا پاشگەز ببیەوە—و.

[2] واتە: دەبێ کڕین و فرۆشتنەکە رەزامەندی کڕیار و فرۆشیاری تێدا بێت ئەوجا لە یەکتر جیاببنەوە—و.

(ق) لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دوو فرۆشیارەکە لە سەرپشکیدان تا جیانەبوونەتەوە –یان فەرمووی: تا جیادەبنەوە– گەر ڕاست بکەن و ڕۆشن ئەنجامیان دابێت بەرەکەت دەکەوێتە ناو فرۆشتنەکەیان، گەر بشارنەوە و درۆ بکەن بەرەکەتی فرۆشتنەکەیان دەپوکێتەوە).**

## ٧- دەروازەی: لێبوردەیی لە کڕین و فرۆشتن

**٢٩٩٦–** (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (رَحِمَ اللهُ رَجُلاً سَمْحاً إِذَا بَاعَ، وَإِذَا اشْتَرَى، وَإِذَا اقْتَضَى). [خ٢٠٧٦]

(خ) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ڕەحمەتی خودا لە کەسێك لێبوردەیە لە فرۆشتن و لە کڕین، و لە داوای مافی).**

## ٨- دەروازەی: ئەوەی لە کڕین و فرۆشتن ناپەسەندە لە سوێندخواردن

**٢٩٩٧–** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (الحَلِفُ مَنْفَقَةٌ لِلسِّلْعَةِ، مَمْحَقَةٌ لِلْبَرَكَةِ). [خ٢٠٨٧/ م١٦٠٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(سوێند شمەکەکە دەفرۆشێت و بەرەکەتە دەپوکێنێتەوە).**

**٢٩٩٨–** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَقَامَ سِلْعَةً، وَهُوَ فِي السُّوقِ، فَحَلَفَ بِاللهِ لَقَدْ أُعْطِيَ بِهَا مَا لَمْ يُعْطَ، لِيُوقِعَ فِيهَا رَجُلاً مِنَ المسْلِمِينَ، فَنَزَلَتْ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾[آل عمران:٧٧]. [خ٢٠٨٨]

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە(خوا لێی ڕازی بێت): پیاوێك شمەکێکی لە بازاڕ ساغ دەکردەوە، سوێندی بە خودا خوارد ئەوەندەی پێدراوە و ئەوەندەشی پێ نەدرابوو تا یەکێك لە موسڵمانانی پێ فریو بدات، ئایەت دابەزی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾[آل عمران:٧٧].

## ٩- دەروازەی: فرۆشتنی خۆراك بە خۆراك

**٢٩٩٩-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم اسْتَعْمَلَ رَجُلاً عَلَى خَيْبَرَ، فَجَاءَهُ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا**). قَالَ: لاَ، وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّا لَنَأْخُذُ الصَّاعَ مِنْ هَذَا بِالصَّاعَيْنِ، وَالصَّاعَيْنِ بِالثَّلاَثَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَفْعَلْ، بِعِ الجَمْعَ بِالدَّرَاهِمِ، ثُمَّ ابْتَعْ بِالدَّرَاهِمِ جَنِيباً**). [خ٢٢٠١/ م١٥٩٣]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودری و ئەبی هورەیرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێکی لەسەر خەیبەر دامەزراند، ئەویش خورمای باڵا و باشی هێنا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئایا هەموو خورمای خەیبەر بەم جۆرەیە؟)، وتی: نەخێر، سوێند بە خودا، ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە صاعێك لەم خورما بە دوو صاع، و دوو صاع بە سێ صاع دەکڕین، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە مەکە، خورمای خراپ بە درهەم بفرۆشە و پاشان بە درهەمەکان خورما چاکەکە بکڕە).**

**٣٠٠٠-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: جاءَ بِلاَلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِتَمْرٍ بَرْنِيٍّ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**مِنْ أَيْنَ هَذَا**) ؟. قَالَ بِلاَلٌ: كانَ عِنْدَنَا تَمْرٌ رَدِيٌّ، فَبِعْتُ مِنْهُ صَاعَيْنِ بِصَاعٍ، لِنُطْعِمَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَ ذلِكَ: (**أَوَّهْ أَوَّهْ، عَيْنُ الرِّبَا عَيْنُ الرِّبَا، لاَ تَفْعَلْ، وَلكِنْ إِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَشْتَرِيَ، فَبِعِ التَّمْرَ بِبَيْعٍ آخَرَ، ثُمَّ اشْتَرِ بِهِ**). [خ٢٣١٢/ م١٥٩٤]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: بیلال بە خورمای بەرنییەوە[١] هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (ئەمە لە کوێوەیە؟)، بیلال وتی: خورمای خراپمان هەبوو، هەندێکم لێ فرۆشت بەمە دوو (صاع[٢]) بە (صاع)ێك تا**

---

(١) باشترین جۆری خورمایە-و.

(٢) صاع: بە چەندین بڕ دیاریکراوە بەپێی مەزهەبەکان و جیاوازی پێوانەی وڵاتان، لە دوو کیلۆ و شەسەد گرامەوە دەست پێ دەکات تا نزیك بە چوار کیلۆ-و.

خواردن بە پێغەمبەر(ﷺ) بدەین، لەو بارەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ئۆه، ئۆه، خودی سووە، خودی سووە، ئەوە مەكە، بەڵام گەر ویستت بكڕی خورماكە بە فرۆشتنێكی تر بفرۆشە، و پاشان ئەوەی پێ بكڕە)**.

٣٠٠١- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (التَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَالْحِنْطَةُ بِالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرُ بالشَّعِيرِ، وَالْمِلْحُ بالْمِلْحِ، مِثْلاً بِمِثْلٍ، يَداً بِيَدٍ، فَمَنْ زَادَ أَوِ اسْتَزَادَ؛ فَقَدْ أَرْبَى؛ إِلاَّ مَا اخْتَلَفَتْ أَلْوَانُهُ). [م١٥٨٨]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خورما بە خورما، و گەنم بە گەنم، و جۆ بە جۆ، و خوێ بە خوێ، هاوتا بە هاوتا، دەست بە دەست، هەر كەس زیادی بكات یان داوای زیادكردن بكات ریبای ئەنجامداوە، جگە لەوانەی رەنگەكانیان جیاوازن)**.

## ١٠- دەروازەی: ریبا و مامەڵە

٣٠٠٢- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدريِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ؛ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ؛ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبِيعُوا مِنْهَا غَائِباً بِنَاجِزٍ). [خ٢١٧٧ (٢١٧٦)/ م١٥٨٤]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن، مەگەر سەر بە سەر، هەندێكی بەسەر هەندێكی تردا فەزڵ مەدەن، زیو بە زیو مەفرۆشن، مەگەر سەر بە سەر، هەندێكی بەسەر هەندێكی تردا فەزڵ مەدەن، بزر و نائامادە لەوانە[1] بە حازر و ئامادە مەفرۆشن)**.

٣٠٠٣- (ق) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلاَّ سَوَاءً بِسَوَاءٍ، وَالْفِضَّةَ بِالْفِضَّةِ إِلاَّ سَوَاءً بِسَوَاءٍ، وَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالْفِضَّةِ، وَالْفِضَّةَ بِالذَّهَبِ، كَيْفَ شِئْتُمْ). [خ٢١٧٥/ م١٥٩٠]

---

[1] واتە: زێڕ و زیو-و .

(ق) لە ئەبی بەکرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن، مەگەر سەر بە سەر، زیو بە زیویش مەفرۆشن مەگەر سەر بە سەر، زێڕ بە زیو بفرۆشن، و زیو بە زێڕ بفرۆشن، هەر چۆن دەخوازن).**

**٣٠٠٤-** (ق) عَنْ أَبِي صَالِحٍ الزَّيَّاتِ: أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ ﷺ يَقُولُ: الدِّينَارُ بِالدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ، فَقُلْتُ لَهُ: فَإِنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ لاَ يَقُولُهُ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: سَأَلْتُهُ، فَقُلْتُ: سَمِعْتَهُ مِنَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، أَوْ وَجَدْتَهُ فِي كِتَابِ اللهِ؟ قَالَ: كُلَّ ذلِكَ لاَ أَقُولُ، وَأَنْتُمْ أَعْلَمُ بِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنِّي، وَلكِنْ أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ رِباً إِلاَّ فِي النَّسِيئَةِ).** [خ٢١٧٨/ م١٥٩٦]

(ق) لە ئەبی صاڵحی زەییاتەوە: ئەو گوێی لێبوو ئەبو سەعیدی خودری دەیوت: دینار بە دینار، و درهەم بە درهەم، پێم وت: ئیبن عەباس ئەوە ناڵێت، ئەبو سەعید وتی: پرسیارم لێکرد و وتم: لە پێغەمبەرت(ﷺ) بیستووە، یان لە کتێبەکەی خودا بینیوتە؟ ئەو[1] وتی: هیچ کام لەوانە ناڵێم، ئێوە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە من زاناترن، بەڵام ئوسامە هەواڵی پێدام: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: **(سوو تەنها لە "النسیئة-دواخستن"دا هەیە).**

**٣٠٠٥-** (ق) عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ: أَنَّهُ الْتَمَسَ صَرْفاً بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَدَعَانِي طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ، فَتَرَاوَضْنَا حَتَّى اصْطَرَفَ مِنِّي، فَأَخَذَ الذَّهَبَ يُقَلِّبُهَا فِي يَدِهِ، ثُمَّ قَالَ: حَتَّى يَأْتِيَ خَازِنِي مِنَ الغَابَةِ، وَعُمَرُ يَسْمَعُ ذلِكَ، فَقَالَ: وَاللهِ! لاَ تُفَارِقُهُ حَتَّى تَأْخُذَ مِنْهُ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ رِباً إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِباً إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِباً إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِباً إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ).** [خ٢١٧٤ (٢١٣٤)/ م١٥٨٦]

(ق) لە مالیکی کوڕی ئەوسەوە: ئەو هەوڵی مامەڵەیەکی دا بە سەد دینار، تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا بانگی کردم، کەوتینە مامەڵە تا لێی وەرگرتم، زێڕەکەی لە دەستدا وەردەگێڕا، پاشان وتی: تا گەنجینەدارەکەم لە دارستانەکە دێتەوە، عومەر گوێی لە

---

[1] واتە: ئیبن عەباس.

ئەوە بوو و وتی: سوێند بە خودا لە ئەو جیانابیتەوە تا لێی وەردەگریت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(زێڕ بە زێڕ سووە جگە لە هانێ هانێ[1]، گەنم بە گەنم سووە جگە لە هانێ هانێ، جۆ بە جۆ سووە جگە لە هانێ هانێ، خورما بە خورما سووە جگە لە هانێ هانێ)**[2].

## ١١- دەروازەی: فرۆشتنی ملوانكە بەردی بەنرخ و زێڕی تێدا بێت

**٣٠٠٦-** (م) عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَهُوَ بِخَيْبَرَ، بِقِلاَدَةٍ فِيهَا خَرَزٌ وَذَهَبٌ، وَهِيَ مِنَ الْمَغَانِمِ تُبَاعُ. فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالذَّهَبِ الَّذِي فِي الْقِلاَدَةِ فَنُزِعَ وَحْدَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ وَزْناً بِوَزْنٍ)**. [م١٥٩١]

(م) لە فەزالەی كوڕی عوبەیدی ئەنصارییەوە، وتی: ملوانكەیەك هێنرا بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو لە خەیبەر بوو، ملوانكەكە بەردی بەنرخ و زێڕی تێدا بوو، ملوانكەكە لە غەنیمەت بوو دەرۆشرا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی كرد زێڕەكە لە ملوانكەكە بەتەنها دابنرێت، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموون: **(زێڕ بە زێڕ كێش بە كێش)**.

## ١٢- دەروازەی: نەفرەتی بخۆری سوو و بریكارەكەی

**٣٠٠٧-** (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَكَاتِبَهُ، وَشَاهِدَيْهِ، وَقَالَ: هُمْ سَوَاءٌ. [م١٥٩٨]

---

[1] واتە: فرۆشیار شتەكە بە كڕیار بدا و كڕیار پارەكە یان شتەكە بە فرۆشیار بدات–و.

[2] لای حەزرەتی عومەر(خوا لێی رازی بێت) ئەو كەمە لە كات كە فرۆشیارەكە چاوەڕوانی پارەكەیە و كڕیار پێی نادات بە سوو دادەنرێت، لەم سەردەمەدا كە فیكرەی بانق بوونی هەیە تێدەگەین لەو فتوای حەزرەتی عومەر، چونكە دانانی پارە لە حسابی بانقی جێگیردا بە تێپەڕبوونی كات بڕێك پارەی سوو دێتە سەری –و.

(م) لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەفرەتی کرد لە بخۆری سوو و بریکارەکەی، و نووسەرەکەی، و دوو شاهیدەکەی، ئەو فەرمووی: ئەوان یەکسانن.

٣٠٠٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الرِّبَا ثَلاَثَةٌ وَسَبْعُونَ بَاباً). [جه٢٢٧٥]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(سوو حەفتا و سێ دەروازەیە).**

## ١٣- دەروازەی: نەهی لە قۆرخکردن و غەش کردن

٣٠٠٩- (م) عَنْ مَعْمَرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ يَحْتَكِرُ إِلاَّ خَاطِئٌ).** [م١٦٠٥]

(م) لە مەعمەری کوڕی عەبدوڵاوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(تەنها هەڵەکار قۆرخکاری ئەنجام دەدات).**

٣٠١٠- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَرَّ عَلَى صُبْرَةِ طَعَامٍ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهَا، فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلاً، فَقَالَ: **(مَا هَذَا يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ)** ؟ قَالَ: أَصَابَتْهُ السَّمَاءُ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(أَفَلاَ جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ كَيْ يَرَاهُ النَّاسُ؟ مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي).** [م١٠٢]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا بە پاڵ کۆمایەك لە خۆراکدا گوزەری کرد، دەستی خۆی خستە ناوی، پەنجەکانی تووشی تەڕی هاتن، فەرمووی: **(ئەمە چییە، ئەی خاوەن خۆراك؟)**، وتی: ئاسمانی تووشهاتووە[1]، ئەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبەر فەرمووی: **(ئەی بۆ نەتخستە سەرەوەی خۆراکەکە تا خەڵك ببیبینێت؟ هەر کەس غەش بکات لە من نییە).**

---

[1] واتە: شێی کردووەتەوە-و.

## ١٤- دەروازەی: هەتا دەستی بەسەردا نەگرێت ئەوەی کڕیویەتی لە خۆراك نافرۆشێت

**٣٠١١-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنِ ابْتَاعَ طَعَاماً، فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ). [خ٢١٢٦ (٢١٢٤)/ م١٥٢٦]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس خۆراکێك بکڕێت نەیفرۆشێت تا تێر و تەواوی دەکات و دەیکێشێت)**.

- وفي رواية لهما: (حَتَّى يَقْبِضَهُ). [خ٢١٣٦]

لە ریوایەتێکی هەردووکیاندا: **(تا دەستی بەسەردا دەگرێت)**.

**٣٠١٢-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنِ اشْتَرَى طَعَاماً فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَكْتَالَهُ)**. [م١٥٢٨]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس خۆراکێکی کڕی با نەیفرۆشێت تا دەیکێشێت)**.

## ١٥- دەروازەی: کەسێك دارخورما بفرۆشێت خورمای پێوە بێت

**٣٠١٣-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ بَاعَ نَخْلاً قَدْ أُبِّرَتْ فَثَمَرَتُهَا لِلْبَائِعِ؛ إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ). [خ٢٢٠٤ (٢٢٠٣)/ م١٥٤٣]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس درەختێکی خورمای فرۆشت و هاڵەی کرد بوو بەرەکەی بۆ فرۆشیارە، مەگەر کڕیارەکە بە مەرجی بگرێت)**.

## ١٦- دەروازەی: بەروبووم بەر لە سەرهەڵدانی باشییەکەی نافرۆشرێ و حوکمی تیاچوونی

٣٠١٤- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا، نَهَى البَائِعَ وَالمُبْتَاعَ. [خ٢١٩٤ (١٤٨٦)/ م١٥٣٤]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە فرۆشتنی بەروبووم تا باشییەکەی دەردەکەوێت، نەهی لە فرۆشیار و لە کڕیارەکە کرد.**

٣٠١٥- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى تُزْهِيَ، فَقِيلَ لَهُ: وَمَا تُزْهِي؟ قَالَ: حَتَّى تَحْمَرَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَرَأَيْتَ إِذَا مَنَعَ اللهُ الثَّمَرَةَ، بِمَ يَأْخُذُ أَحَدُكُمْ مَالَ أَخِيهِ)**. [خ٢١٩٨ (١٤٨٨)/ م١٥٥٥]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە فرۆشتنی بەروبووم تا "تُزهي"، وتیان: "تُزْهِيَ" چییە؟ وتی: تا سوور دەبێت[1]، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەی ئەگەر خودا ڕێگری لە بەرەکەی کرد، بە چی یەکێك لە ئێوەماڵی براکەی دەبات).**

## ١٧- دەروازەی: نەهی لە (المزابنة والمحاقلة والمخابرة)

٣٠١٦- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ المُزَابَنَةِ: أَنْ يَبِيعَ ثَمَرَ حَائِطِهِ إِنْ كَانَ نَخْلاً بِتَمْرٍ كَيْلاً، وَإِنْ كَانَ كَرْماً أَنْ يَبِيعَهُ بِزَبِيبٍ كَيْلاً، أَوْ كَانَ زَرْعاً، أَنْ يَبِيعَهُ بِكَيْلِ طَعَامٍ، وَنَهَى عَنْ ذلِكَ كُلِّهِ. [خ٢٢٠٥ (٢١٧١)/ م١٥٤٢]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە "المزابنة": گەر باخەکەی دارخورما بێت بەرەکەی بە کێشراو بفرۆشێت، گەر**

---

[1] سووربوون: سەرەتای پێگەیشتنەو وەك لە خورمادا-و.

تریّ بێت بە مێوژی کێشراو بیفرۆشێت، یان گەر کشتوکاڵ بێت بە پێوانەی خۆراک بیفرۆشێت، نەهی لە هەموو ئەوانە کرد.

- وفي رواية لهما: قال: والمزَابَنَةُ: أَنْ يَبِيعَ التَّمَرَ بِكَيْلٍ: إِنْ زَادَ فَلِي، وَإِنْ نَقَصَ فَعَلَيَّ. [خ٢١٧٢]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان: وتی: "المزابنة": ئەوەیە خورما بە پێوانەیەك بفرۆشێت: گەر زیاد بوو بۆ من و گەر کەم بوو لەسەر من.

- وزاد في رواية لمسلم: وَعَنْ كُلِّ ثَمَرٍ بِخَرْصِهِ..

لە ریوایەتێکی موسلمدا ئەم زیادەیە هاتووە: هەروەها لە هەر بەرێك بە لقەکەیەوە.

**٣٠١٧-** (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهى عَنْ بَيْعِ التَّمَرِ بِالتَّمْرِ، وَرَخَّصَ فِي الْعَرِيَّةِ أَنْ تُبَاعَ بِخَرْصِهَا، يَأْكُلُهَا أَهْلُهَا رُطَباً. [خ٢١٩١/ م١٥٤٠]

(ق) لە سەهلی کوڕی ئەبی حەسمەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە فرۆشتنی خورما بە خورما، لە "العريّة"[1]دا مۆڵەتی دا بفرۆشرێت بە بڕی خۆی، خەڵکی بە تازە پێگەیوی بیخۆن.

**٣٠١٨-** (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: نَهى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الْمُخَابَرَةِ وَالْمُحَاقَلَةِ، وَعَنِ المزَابَنَةِ، وَعَنْ بَيْعِ التَّمَرِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا، وَأَنْ لاَ تُبَاعَ إِلاَّ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ إِلاَّ الْعَرَايا. [خ٢٣٨١ (١٤٨٧)/ م١٥٣٦ (٨١، ٨٢)]

(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لە "المخابرة والمحاقلة[2]" هەروەها لە "المزابنة[3]"، هەروەها لە فرۆشتنی

---

[1] درەختێك بە هەژاران بەخشرابێت لە بەرەکەی بخۆن-و.

[2] "المخابرة" کارکردن لە زەوییەکدا بەرانبەر هەندێ لەوەی لە زەوییەکە بەرهەم دێت و تۆوەکە لەسەر ئەو بێت نەك لەسەر خاوەن زەوییەکە-و.

[3] "المحاقلة": بریتییە لە فرۆشتنی دانەوێڵە-وەك گەنم- بە گوڵەکەیەوە بە گەنمی پاککراو-و.

خورما تا پێگەینی دەردەکەوێت، هەروەها نەفرۆشرێت بە دینار و درهەم نەبێت، جگە لە "العرایا"[1]".

- زاد في رواية لمسلم: قَالَ عَطَاءٌ: فَسَّرَ لَنَا جَابِرٌ قَالَ: أَمَّا المخَابَرَةُ: فَالأَرْضُ الْبَيْضَاءُ يَدْفَعُهَا الرَّجُلِ إلى الرَّجُلِ فَيُنْفِقُ فِيهَا، ثُمَّ يَأْخُذُ مِنَ الثَّمَرِ. وَزَعَمَ أَنَّ الْمُزَابَنَةَ: بَيْعُ الرُّطَبِ فِي النَّخْلِ بِالتَّمْرِ كَيْلاً. وَالْمُحَاقَلَةُ فِي الزَّرْعِ عَلَى نَحْوِ ذَلِكَ، يَبِيعُ الزَّرْعَ الْقَائِمَ بِالْحَبِّ كَيْلاً.

لە ریوایەتێکی موسلیمدا ئەمە زیاد کراوە: عەتا دەڵێت: جابر بۆی تەفسیر کردین و وتی: "المخابرة" زەوییەکی سپی پیاوێك دەیدات بە پیاوێك، ئەویش خەرجی تێدا دەکات، پاشان لە بەرەکەی دەبات، پێیوابوو "المزابنة" بریتییە لە فرۆشتنی خورمای تەڕی تازەپێگەیو بە دارەوە بە خورمای تر سەربەسەر، "المحاقلة"ش لە کشتوکاڵدایە بەهەمان پێودان، کشتوکاڵی دروێنە نەکراو دەفرۆشێت بە دانەوێڵەی تر سەربەسەر.

**٣٠١٩**- قَالَ ثَابِتِ بْنِ الحَجَّاجِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الْمُخَابَرَةِ.

قُلْتُ: وَمَا الْمُخَابَرَةُ؟ قَالَ: أَنْ تَأْخُذَ الأَرْضَ بِنِصْفٍ، أَوْ ثُلُثٍ، أَوْ رُبْعٍ. [د٣٤٠٧]

* صحيح.

لە سابیتی کوڕی حەججاجەوە، دەڵێت: لە زەیدی کوڕی سابیتەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە "المخابرة".

وتم: "المخابرة" چییە؟ وتی: ئەوەیە زەوی بە نیوە، یان سێیەك، یان چارەك وەربگری.

[1] "المزابنة": بریتییە لە فرۆشتنی خورما بە دارەوە بە خورمای تەڕ، یان فرۆشتنی ترێ بە دارەوە بە مێوژ-و.

## ١٨- دەروازەی: مۆڵەتدان لە "العرايا"دا

**٣٠٢٠-** (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَخَّصَ فِي الْعَرَايَا أَنْ تُبَاعَ بِخَرْصِهَا كَيْلاً. [خ٢١٩٢ (٢١٧٣)/ م١٥٣٩/ ٦٤]

**(ق) لە زەیدی کوڕی سابیتەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە "العرايا"دا[١] مۆڵەتی دا، سەربەسەر بە بڕەکەی خۆی بفرۆشرێت.**

- وفي رواية لهما: أَن رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَخَّصَ بَعْدَ ذلِكَ فِي بَيْعِ الْعَرِيَّةِ بِالرُّطَبِ أَوْ بِالتَّمْرِ، وَلَمْ يُرَخِّصْ فِي غَيْرِهِ. [خ٢١٨٤]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: لەدوای ئەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) مۆڵەتی دا لە فرۆشتنی "العرية" بە خورمای تەڕ یان بە خورمای تر، جگە لەوە لە شتێکی تردا مۆڵەتی نەدا.**

**٣٠٢١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: رَخَّصَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي بَيْعِ الْعَرَايَا بِخَرْصِهَا مِنَ التَّمْرِ، فِيما دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ، أَوْ فِي خَمْسَةِ أَوْسُقٍ. شَكَّ دَاوُدُ فِي ذلِكَ.
[خ٢٣٨٢ (٢١٩٠)/ م١٥٤١]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) مۆڵەتی دا لە فرۆشتنی "العرايا" بە هاوتاکەی لە خورما، لە خوار پێنج ئەوسوقەوە[٢]، یان لە پێنج ئەوسوقدا، داود لەوەدا شکی بۆ دروست بووە.**

---

[١] "العرايا": ئەوەیە خورمای تەڕ بە دارەوە-لەدوای خۆشبوون و سەرەتای پێگەیشتنی- بکڕی بەرانبەر خورمای کراوە لە زەوی و بەری درەختەکە دەدرێت بە کەسی موحتاج کەی ویستی لێی بخوات، خورمای سەر درەختەکە دەخەملێنرێ و لە بری ئەوە خاوەنەکەی خورمای لێکراوە وەردەگرێت-و.

[٢] یەك ئەوسوق شەست صاعە کە لە بۆچوونێکدا نزیك بە ٦٥٣ کیلۆگرامە-و.

## ١٩- دەروازەی: حەرام کردنی فرۆشتنی عارەق و مردارەبوو و بەراز

**٣٠٢٢-** (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ عامَ الْفَتْحِ، وَهُوَ بِمَكَّةَ: **(إِنَّ اللهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الخَمْرِ وَالمَيْتَةِ وَالخِنْزِيرِ وَالأَصْنَامِ)**. فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَرَأَيْتَ شُحُومَ المَيْتَةِ، فَإِنَّهَا يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ، وَيُدْهَنُ بِهَا الجُلُودُ، وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ؟ فَقَالَ: **(لاَ، هُوَ حَرَامٌ)**. ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَ ذلِكَ: **(قاتَلَ اللهُ الْيَهُودَ! إِنَّ اللهَ لَمَّا حَرَّمَ شُحُومَهَا جَمَلُوهُ، ثُمَّ بَاعُوهُ، فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ)**. [خ٢٢٣٦/ م١٥٨١]

(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ رازی بێت): ئەو لەساڵی فەتح کە لە مەککە بوو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خودا و پێغەمبەرەکەی فرۆشتنی عارەق و مردارەوەبوو و بەراز و بتی حەرام کردووە)**، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی ئەگەر بەز و چەوری مردارەوەبوو بێت، ئەوە کەشتی پێ دەهەنوێت و پێستی پێ چەور دەکرێت و خەڵکی دەیکەنە چراوە؟ فەرمووی: **(نەخێر، ئەوە حەرامە)**، پاشان لەو بارەدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا یەهوود بکوژێت، کاتێ خودا بەز و چەوری چوارپێ و ئاژەڵی لەسەر حەرام کردن دەیانتواندەوە و پاشان دەیانفرۆشت و نرخەکەیان دەخوارد)**.

**٣٠٢٣-** (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَخْطُبُ بِالْمَدِينَةِ قَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّ اللهَ تَعَالَى يُعَرِّضُ بِالْخَمْرِ. وَلَعَلَّ اللهَ سَيُنْزِلُ فِيهَا أَمْراً، فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهَا شَيْءٌ؛ فَلْيَبِعْهُ، وَلْيَنْتَفِعْ بِهِ). قَالَ: فَمَا لَبِثْنَا إِلاَّ يَسِيراً حَتَّى قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ اللهَ تَعَالَى حَرَّمَ الْخَمْرَ، فَمَنْ أَدْرَكَتْهُ هَذِهِ الآيَةُ وَعِنْدَهُ مِنْهَا شَيْءٌ، فَلاَ يَشْرَب وَلاَ يَبِعْ)**. قَالَ: فَاسْتَقْبَلَ النَّاسُ بِمَا كَانَ عِنْدَهُ مِنْهَا، فِي طَرِيقِ الْمَدِينَةِ، فَسَفَكُوهَا. [م١٥٧٨]

(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو لە مەدینە وتاری دەدا و دەیفەرموو: **(ئەی خەڵکینە، خودا باس لە عارەق دەکات، رجا وایە خودا دەربارەی ئەوە فەرمانێك دابەزێنێت، هەر کەس شتێك لە عارەقی لایە با بیفرۆشێت و سوودی لێ ببینێت)**، وتی: زۆر نەماینەوە تا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(خودا(تعالی) عارەقی حەرام کردووە، هەر کەس ئەم ئایەتەی پێگەیشت و شتێك لە**

**عارەقی لە لا بوو نەیخواتەوە و نەیفرۆشێت)، وتی: خەڵکی روویان کرد لەوەی لە لایان بوو لە ڕێگەی مەدینە، قلْپیان کردەوە.**

**٣٠٢٤-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: كَانَ عِنْدَنَا خَمْرٌ لِيَتِيمٍ، فَلَمَّا نَزَلَتِ الْمَائِدَةُ، سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْهُ، وَقُلْتُ: إِنَّهُ لِيَتِيمٍ، فَقَالَ: **(أَهْرِيقُوهُ)**. [ت١٢٦٣]
* صحيح.

**لە ئەبی سەعیدەوە، وتی: عارەقی منداڵێکی بێبابمان لە لا بوو، کاتێك (المائدة) دابەزی، پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی، وتم: عارەقی منداڵێکی بێبابە، فەرمووی: (بیڕێژن).**

## ٢٠- دەروازەی: نەهی لە نرخی سەگ و مارەیی لەشفرۆش و شیرینی کەهانە

**٣٠٢٥-** (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ: أَن رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ. [خ٢٢٣٧/ م١٥٦٧]

**(ق) لە ئەبی مەسعوودی ئەنصارییەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە نرخی سەگ و مارەیی لەشفرۆش و شیرینی کەهانە.**

**٣٠٢٦-** (م) عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ قَالَ: سَأَلْتُ جَابِراً عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَالسِّنَّوْرِ؟ قَالَ: زَجَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ ذَلِكَ. [م١٥٦٩]

**(م) لە ئەبی زوبەیرەوە، وتی: دەربارەی نرخی سەگ و پشیلە پرسیارم لە جابر کرد، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری کرد لەوانە.**

## ٢١- دەروازەی: نەهی کردن لە کڕین و فرۆشتنی "الملامسة والمنابذة والحصاة"

**٣٠٢٧-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: نَهى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ لِبْسَتَيْنِ وَعَنْ بَيْعَتَيْنِ، نَهى عَنِ الملاَمَسَةِ وَالمنَابَذَةِ فِي الْبَيْعِ. وَالملاَمَسَةُ: لَمْسُ الرَّجُلِ ثَوْبَ الآخَرِ بِيَدِهِ

بِاللَّيْلِ أَوْ بِالنَّهَارِ، وَلاَ يُقَلِّبُهُ إِلاَّ بِذلِكَ. وَالمُنَابَذَةُ: أَنْ يَنْبِذَ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ بِثَوْبِهِ، وَيَنْبِذَ الآخَرُ ثَوْبَهُ، وَيَكُونَ ذلِكَ بَيْعَهُمَا عَنْ غَيْرِ نَظَرٍ وَلاَ تَرَاضٍ. [خ٥٨٢٠ (٣٦٧)/ م١٥١٢]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە دوو پۆشین[١] و دوو فرۆشتن، نەهی کرد لە "الملامسة والمنابذة" لە فرۆشتندا، "الملامسة" پیاو بە دەستی دەست بدات لە شمەکی پیاوێکی تر، بە شەو یان بە رۆژ، تەنها بەوە تاوتوێی بکات، "المنابذة" پیاوێك پۆشاکەکەی هەڵبدات بۆ پیاوێکی تر، ئەویتریش پۆشاکەکەی هەڵبدات، ئەوە کڕین و فرۆشتنیان بێت بەبێ وردبوونەوە و رەزامەندی.**

**٣٠٢٨-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ بَيْعِ الْحَصَاةِ، وَعَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ. [م١٥١٣]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە "بیع الحصاة[٢]" و "بیع الغرر[٣]".**

## ٢٢- دەروازەی: فرۆشتنی موزایەدە(زیاد کردن)

**٣٠٢٩-** (خ) وَقَالَ عَطَاءٌ: أَدْرَكْتُ النَّاسَ لاَ يَرَوْنَ بَأْساً بِبَيْعِ الْمَغَانِمِ فِيمَنْ يَزِيدُ. [البيوع، باب ٥٩]

[انظر: **٢٤٣٢**].

**(خ) عەتا دەڵێت: بە خەڵکانێك گەیشتم بە خراپیان نەدەبینی شمەك بفرۆشن بە کەسێك زیاتر بدات.**

---

[١] دوو پۆشینەکە: یەکەمیان پۆشاك بە جەستەوە بئاڵێنی و هیچ قوڵ و دەرچەیەکی نەبێت وەك چۆن یەهوود ئەنجامیان دەدا، دووەمیان: دابنیشێ و ئەژنۆکانی لە باوەش بگرێ و لاقەکانی بە سك و پشتییەوە -بە پۆشاکێك- ببەستێتەوە-و.

[٢] "بیع الحصاة": ئەوەیە کڕیارەکە یان فرۆشیارەکە چەوێك هەڵبدات وەك نیشانە بۆ دامەزرانی کڕین و فرۆشتنەکە-و.

[٣] "بیع الغرر": بریتییە لە کڕین و فرۆشتن بە فێڵ و فریو-و.

## ٢٣- دەروازەی: حەرام کردنی فرۆشتنی "حَبَل الحَبَلَة"

**٣٠٣٠-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الحَبَلَةِ، وَكَانَ بَيْعاً يَتَبَايَعُهُ أَهْلُ الجَاهِلِيَّةِ، كَانَ الرَّجُلُ يَبْتَاعُ الجَزُورَ إِلَى أَنْ تُنْتَجَ النَّاقَةُ، ثُمَّ تُنْتَجُ الَّتِي فِي بَطْنِهَا. [خ٢١٤٣/ م١٥١٤]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی لە فرۆشتنی "حَبَلِ الحَبَلَة"[1]، ئەوە فرۆشتنێك بوو ئەهلی سەردەمی نەفامی ئەنجامیان دەدا، پیاو حوشترێکی مێیەی دەکڕی تا سکێکی دەکرد، پاشان ئەوەش لە سکیدا بەرێکی دەدا.**

## ٢٤- دەروازەی: فرۆشتنی نەهیلێکراو: (رۆیشتن بە دەم قافڵەی کاروانییەوە بۆ دەستپێشخەری لە کڕین، فرۆشتنی شارنشین بۆ لادێیی و بیابانشین، زیاد کردنی نرخ بەبێ ویستی کڕینی شتەکە، نەدۆشینی شیر لە گوانی مەڕ و بزن و وڵاخ و حوشتر بۆ فریوکاری لە فروشتنی حەیوانەکە)

**٣٠٣١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَن رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تَلَقَّوُا الرُّكْبَانَ، وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلاَ تَنَاجَشُوا، وَلاَ يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَلاَ تُصَرُّوا الْغَنَمَ، وَمَنِ ابْتَاعَهَا فَهْوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْتَلِبَهَا: إِنْ رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ سَخِطَهَا رَدَّهَا وَصَاعاً مِنْ تَمْرٍ).**
[خ٢١٥٠ (٢١٤٠)/ م١٥١٥/(١١)]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (مەچنە بەردەمی سوارەکان، هەندێکتان بەسەر هەندێکی ترتاندا کڕین و فرۆشتن مەکەن، بێ مەبەستی کڕین نرخ زیاد مەکە، ئامادە بۆ دەشتنشین نافرۆشێت، شیر نەهێڵنەوە لە گوانی مەڕەکان، هەر کەس کڕی ئەو یەکێك لە باشترینی ئەم دوو**

---
[1] "حبل الحبلة" بریتییە لە فرۆشتنی کۆرپەی حوشتر و وڵاخ و ماڵات لە سکی دایکدا-و.

**ڕێگەی لەبەردەمە لەدوای ئەوەی دۆشی: گەر ڕازی بوو لای خۆی دەیهێڵێتەوە، گەر ڕازی نەبوو دەیگێڕێتەوە لەگەڵ "صاع"ێك لە خورما).**

٣٠٣٢- (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ، دَعُوا النَّاسَ يَرْزُقِ اللهُ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ).** [م١٥٢٢]

**(م) لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (شارنشین بۆ دەشتنشین نافرۆشێت، لە خەڵکی بگەڕێن خودا لە هەندێکیان ڕۆزی هەندێکیان بدات).**

## ٢٥- دەروازەی: مەرجەکان لە فرۆشتندا و کاروباری عورف

٣٠٣٣- (ق) عَنْ جابِرٍ ﷺ: أَنَّهُ كانَ يَسِيرُ عَلَى جَمَلٍ لَهُ قَدْ أَعْيَا، فَمَرَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَضَرَبَهُ، فَدَعا لَهُ، فَسَارَ بِسَيْرٍ لَيْسَ يَسِيرُ مِثْلَهُ، ثُمَّ قَالَ: **(بِعْنِيهِ بِأُوقِيَّةٍ)**، قُلْتُ: لاَ، ثُمَّ قَالَ: **(بِعْنِيهِ بِأُوقِيَّةٍ)** ؛ فَبِعْتُهُ، فَاسْتَثْنَيْتُ حُمْلاَنَهُ إِلَى أَهْلِي. فَلَمَّا قَدِمْنَا أَتَيْتُهُ بِالجَمَلِ وَنَقَدَنِي ثَمَنَهُ، ثُمَّ انْصَرَفْتُ، فَأَرْسَلَ عَلَى إِثْرِي قَالَ: **(ما كُنْتُ لآخُذَ جَمَلَكَ، فَخُذْ جَمَلَكَ ذَلِكَ، فَهُوَ مالُكَ).**
[خ٢٧١٨ (٤٤٣)/ م. المساقاة: ٧١٥ (١٠٩)]

**(ق) لە جابرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): ئەو لەسەر حوشترێکی خۆی کە شەکەت بوو بوو ڕێگەی دەبڕی، پێغەمبەر(ﷺ) گوزەری کرد، ئەویش لە حوشترەکەی دەدا، بۆیە دوعای بۆ کرد، بە ڕۆیشتنێك ڕۆیشت نموونەی نەبوو لە ڕۆیشتن، پاشان پێغەمبەر فەرمووی: (بە ئۆقەیەك پێم بفرۆشە)، وتم: نا، پاشان فەرمووی: (بە ئۆقەیەك پێم بفرۆشە)، پێم فرۆشت و بە مەرجم گرت سواری بم تا گەیشتنەوە بە خانەوادەکەم، کاتێ هاتینەوە حوشترەکەم بۆ هێنا و نرخەکەی پێدام، پاشان ڕۆیشتم، ناردی بە دوامدا و فەرمووی: (نەمدەویست حوشترەکەت ببەم، ئەوە حوشترەکەتە بیگرە، ئەوە ماڵی تۆیە).**

٣٠٣٤- (ق) عَنْ عائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: جاءَتْ بَرِيرَةُ فَقَالَتْ: إِنِّي كاتَبْتُ أَهْلِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ، في كُلِّ عامٍ أُوقِيَّةٌ، فَأَعِينِينِي، فَقَالَتْ عائِشَةُ: إِنْ أَحَبَّ أَهْلُكِ أَنْ أَعُدَّهَا لَهُمْ عَدَّةً وَاحِدَةً

وَأُعْتِقَكِ فَعَلْتُ، وَيَكُونُ وَلاَؤُكِ لِي. فَذَهَبَتْ إِلَى أَهْلِهَا، فَأَبَوْا ذلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ عَرَضْتُ ذلِكَ عَلَيْهِمْ، فَأَبَوْا إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الْوَلاَءُ لَهُمْ. فَسَمِعَ بِذلِكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَسَأَلَنِي فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: **(خُذِيهَا فَأَعْتِقِيهَا، وَاشْتَرِطِي لَهُمُ الْوَلاَءَ، فَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ)**.

قالَتْ عائِشَةُ: فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي النَّاسِ فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: **(أَمَّا بَعْدُ، فَمَا بَالُ رِجالٍ مِنْكُمْ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطاً لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللهِ، فَأَيُّمَا شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَهُوَ بَاطِلٌ، وَإِنْ كانَ مِائَةَ شَرْطٍ، فَقَضَاءُ اللهِ أَحَقُّ، وَشَرْطُ اللهِ أَوْثَقُ. مَا بَالُ رِجَالٍ مِنْكُمْ يَقُولُ أَحَدُهُمْ: أَعْتِقْ يَا فُلاَنُ وَلِيَ الْوَلاَءُ، إِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ)**. [خ٢٥٦٣ (٤٥٦)/ م١٥٠٤]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: بەریرە هات و وتی: من بە نۆ ئۆقە موکاتەبەم لەگەڵ خانەوادەکەم کردووە، بۆ هەر ساڵێك ئۆقەیەك، بۆیە یارمەتیم بدە، عائیشە وتی: گەر خانەوادەکەت پێیخۆشە بە یەکجار پێیان بدەم و ڕزگارت بکەم، ئەوا ئەو کارە دەکەم، ئەو کات وەلات[1] بۆ من دەبێت، بەریرە ڕۆیشت بۆ لای خانەوادەکەی، ئەوەیان پێ باش نەبوو[2]، بەریرە وتی: ئەوەم بۆ خستنە ڕوو، وتیان دەبێت وەلات بۆ ئێمە بێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی بیست، پرسیاری لێکردم و منیش هەواڵم پێدا[3]، بۆیە فەرمووی: **(بیبە و ڕزگاری بکە، وەلایان لێ بە مەرج بگرە، چونکە وەلا بۆ ئەو کەسەیە ڕزگار دەکات)**.

عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەناو خەڵکدا ڕاستبوویەوە و حەمدی خودای کرد و سەنای لەسەر کرد و پاشان فەرمووی: **(پاشان، پیاوانێك لە ئێوە چییانە مەرجگەلێك دەگرن لە کتێبەکەی خودادا نین، هەر مەرجێك لە کتێبەکەی خودادا نەبێت باتڵە، با سەد مەرجیش بێت، قەزاوەتی خودا لەپێشترە و مەرجی خودا توندوتۆڵترە، پیاوانێ لە ئێوە چییانە یەکێکیان دەڵێ: خۆت ئازاد بکە ئەی فلان، و وەلات بۆ منە، بەڵکو وەلا بۆ ئەو کەسەیە ڕزگاری دەکات)**.

---

[1] گەر بەندە ڕزگارکراوەکە وەلای بۆ ئەو بێت کاتێ بمرێ و میراتگری نەبێت میراتەکەی دەچێت بۆ ئەو کەسەی ڕزگاری کردووە—و.

[2] واتە: ئەوەی بەریرە وەلای بۆ خاتوو عائیشە بێت نەك بۆ ئەوان—و.

[3] واتە: پێغەمبەر پرسیاری لە خاتوو عائیشە کرد و ئەویش باسەکەی بۆ گێڕایەوە—و.

## ٢٦- دەروازەی: سەلەم

**٣٠٣٥-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم المدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ بِالتَّمْرِ السَّنَتَيْنِ وَالثَّلاَثَ، فَقَالَ: (**مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَفِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ**). [خ٢٢٤٠ (٢٢٣٩)/ م١٦٠٤]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ مەدینە و ئەوان دوو ساڵ و سێ ساڵ سەلەمیان بە خورما دەکرد، فەرمووی: (هەر کەس لە شتێکدا سەلەمی کرد با بە پێوانەیەکی زانراو، و کێشێکی زانراو، و بۆ ماوەیەکی زانراو بێت).**

**٣٠٣٦-** (خ) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي الْمُجالِدِ قَالَ: اخْتَلَفَ عَبْدُ اللهِ بْنُ شَدَّادِ بْنِ الْهَادِ وَأَبُو بُرْدَةَ فِي السَّلَفِ، فَبَعَثُونِي إِلَى ابْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: إِنَّا كُنَّا نُسْلِفُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: فِي الْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ وَالزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ. وَسَأَلْتُ ابْنَ أَبْزَى، فَقَالَ مِثْلَ ذلِكَ. [خ٢٢٤٢، ٢٢٤٣]

**(خ) لە محەمەدی کوڕی ئەبی موجالیدەوە، وتی: عەبدوڵای کوڕی شەددادی کوڕی هاد و ئەبو بوردە دەربارەی سەلەم جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە، بۆیە ڕەوانەیان کردم بۆ لای ئیبن ئەبی ئەوفا(خوا لێی ڕازی بێت)، منیش پرسیارم لێکرد، وتی: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەردا لە گەنم و جۆ و مێوژ و خورمادا سەلەممان دەکرد، پرسیاریشم لە ئیبن ئەبزا کرد هەمان قسەی کرد.**

**٣٠٣٧-** عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنِ السلف في الحَيَوان. [ك٢٣٤١]

* قال الذهبي: صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە سەلەم لە گیانداردا.**

**٣٠٣٨**– عَنْ ابْنِ عُمَر رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ نَهَى عَنْ بَيْعِ الكالئ بالكالئ. [ك٢٣٤٢]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): ئەو نەهی کرد لە فرۆشتنی قەرز بە قەرز.**

**٣٠٣٩**– عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ خُلَيْدَةَ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ عَنِ السَّلَفِ، قُلْتُ: إِنَّا نُسْلِفُ فَنَقُولُ: إِنْ أُعْطِينَا بُرّاً فَبِكَذا، وَإِنْ أُعْطِينَا تَمْراً فَبِكَذا.

قَالَ: أَسْلِمْ فِي كُلِّ صِنْفٍ وَرِقاً مَعْلُومَةً، فَإِنْ أَعْطَاكَهُ، وَإِلاَّ فَخُذْ رَأْسَ مَالِكَ، وَلا تَرُدَّه فِي سِلْعَةٍ أُخْرَى. [هق٦/٣٠]

**لە محەمەدی کوڕی زەیدی کوڕی خولەیدەوە، وتی: پرسیارم کرد لە ئیبن عومەر دەربارەی سەلەم و وتم: ئێمە سەلەم دەکەین و دەڵێین: گەر گەنمان پێدرا بەوەندە و گەر خورمامان پێدرا بەوەندە.**

**وتی: لە هەریەك لەو جۆرانە بە پارەیەکی زانراو سەلەم بکە، گەر پێیدای باشە، ئەگەر نە، سەرمایەکەی خۆت وەگرەوە و لە شمەکێکی تر مەیگێڕەوە.**

## ٢٧- دەروازەی: "الشُّفْعَة[١]"

**٣٠٤٠**– (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قالَ: قَضى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ مَالٍ لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الحُدُودُ، وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ، فَلاَ شُفْعَةَ.

[خ٢٢١٤ (٢٢١٣)/ م١٦٠٨]

---

[١] **"الشفعة": بەشێك بدەیە پاڵ بەشێکی تر، گەر یەکێك لە ماڵ و زەوییەکی شەریکیدا بەشەکەی خۆی فرۆشت بە کەسێك ئەوا شەریکەکان بۆیان هەیە بە هەمان نرخ بەشەکەی لێ وەربگرن و ئەوان بەو کڕینە لەپێشترن–و.**

(ق) لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە هەر ماڵێكدا دابەش نەكرابێت قەزاوەتی كرد بە "الشُّفْعَة"، گەر سنوور دیاریكرا و ڕێگەكان جیاكرانەوە "شُفعة"یەك بوونی نییە[1].

**٣٠٤١-** عَنْ سَمُرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (جَارُ الدَّارِ أَحَقُّ بِدَارِ الْجَارِ، أَوْ الأَرْضِ). [د٣٥١٧/ ت١٣٦٨]

لە سەمورەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(جیرانی خانوویەك لەپێشترە بە خانووی جیرانەكە، یان بە زەوییەكە).**

- ولم يذكر الترمذي الْأَرْضِ.

* صحيح.

**تیرمزی (زەوییەكەی) باس نەكردووە.**

**٣٠٤٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (الْجَارُ أَحَقُّ بِشُفْعَةِ جَارِهِ، يُنْتَظَرُ بِهَا، وَإِنْ كَانَ غَائِباً، إِذَا كَانَ طَرِيقُهُمَا وَاحِداً).

* صحيح. [د٣٥١٨/ ت١٣٦٩/ جه٢٤٩٤/ مي٢٦٦٩]

لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(جیران لەپێشترە بە شتی جیرانەكەی، پێی چاوەڕوان دەكرێت[2]، با بزر و نادیاریش بێت، گەر ڕێگەی هەردووكیان یەك ڕێگە بوو).**

---

[1] واتە: گەر بەشەكان دابەش كران "شفعة" بوونی نییە-و.

[2] واتە: گەر جیرانەكە لە سەفەرێك بوو چاوەڕوانی دەكرێت تا دەگەڕێتەوە و باسی فرۆشتنی خانووەكەی بۆ دەكرێت تا بزانرێ ئەو دەیەوێ بیكڕێت یان نە-و.

## ٢٨- دەروازەی: بارمتە (الرهن)

**٣٠٤٣-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم اشْتَرَى طَعَاماً مِنْ يَهُودِيٍّ إِلَى أَجَلٍ، وَرَهَنَهُ دِرْعاً مِنْ حَدِيدٍ. [خ٢٠٦٨/ م١٦٠٣]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) خواردنێکی کڕی لە یەهودییەك بۆ ماوەیەك، درعێك لە ئاسنی بارمتە کرد.**

- وفي رواية للبخاري: قالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَدِرْعُهُ مَرْهُونَةٌ عِنْدَ يَهُودِيٍّ، بِثَلاَثِينَ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ. [خ٢٩١٦]

**لە ریوایەتێکی بوخاریدا: عائیشە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد و درعەکەی لای یەهوودییەك بارمتە بوو، بە سی "صاع" لە خورما.**

**٣٠٤٤-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الظَّهْرُ يُرْكَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُوناً، وَلَبَنُ الدَّرِّ يُشْرَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُوناً، وَعَلَى الَّذِي يَرْكَبُ وَيَشْرَبُ النَّفَقَةُ)**. [خ٢٥١٢ (٢٥١١)]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (پشتی وڵاخ گەر رەهنکراو بێت بە خەرجی بۆ کردنی سواری پشتی دەبێت، هەروەها شیری ئاژەڵی شیردار بە خەرجی بۆ کردنی دەخورێتەوە گەر رەهنکراو بێت، خەرجییەکە لەسەر ئەو کەسەیە سوار دەبێت و دەخواتەوە).**

## ٢٩- دەروازەی: شەراکەت

**٣٠٤٥-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ قَالَ: خَرَجَ عَبْدُ اللهِ وَعُبَيْدُ اللهِ ابْنَا عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فِي جَيْشٍ إِلَى الْعِرَاقِ، فَلَمَّا قَفَلاَ، مَرَّا عَلَى أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ . وَهُوَ أَمِيرُ الْبَصْرَةِ . فَرَحَّبَ بِهِمَا وَسَهَّلَ، ثُمَّ قَالَ: لَوْ أَقْدِرُ لَكُمَا عَلَى أَمْرٍ أَنْفَعُكُمَا بِهِ لَفَعَلْتُ، ثُمَّ قَالَ: بَلَى، هَاهُنَا مَالٌ مِنْ مَالِ اللهِ، أُرِيدُ أَنْ أَبْعَثَ بِهِ إِلَى أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، فَأُسْلِفُكُمَاهُ، فَتَبْتَاعَانِ بِهِ مَتَاعاً مِنْ مَتَاعِ الْعِرَاقِ، ثُمَّ تَبِيعَانِهِ بِالْمَدِينَةِ، فَتُؤَدِّيَانِ رَأْسَ الْمَالِ إِلَى أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، وَيَكُونُ الرِّبْحُ لَكُمَا، فَقَالاَ: وَدِدْنَا ذَلِكَ.

فَفَعَلَ، وَكَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ أَنْ يَأْخُذَ مِنْهُمَا الْمَالَ، فَلَمَّا قَدِمَا، بَاعَا، فَأُرْبِحَا، فَلَمَّا دَفَعَا ذَلِكَ إِلَى عُمَرَ، قَالَ: أَكُلُّ الْجَيْشِ أَسْلَفَهُ مِثْلَ مَا أَسْلَفَكُمَا؟ قَالاَ: لاَ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: ابْنَا أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ فَأَسْلَفَكُمَا، أَدِّيَا الْمَالَ وَرِبْحَهُ. فَأَمَّا عَبْدُ اللهِ فَسَكَتَ، وَأَمَّا عُبَيْدُ اللهِ فَقَالَ: مَا يَنْبَغِي لَكَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ هَذَا، لَوْ نَقَصَ هَذَا الْمَالُ، أَوْ هَلَكَ لَضَمِنَّاهُ! فَقَالَ عُمَرُ: أَدِّيَاهُ. فَسَكَتَ عَبْدُ اللهِ، وَرَاجَعَهُ عُبَيْدُ اللهِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ جُلَسَاءِ عُمَرَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، لَوْ جَعَلْتَهُ قِرَاضاً، فَقَالَ عُمَرُ: قَدْ جَعَلْتُهُ قِرَاضاً، فَأَخَذَ عُمَرُ رَأْسَ الْمَالِ وَنِصْفَ رِبْحِهِ، وَأَخَذَ عَبْدُ اللهِ وَعُبَيْدُ اللهِ ابْنَا عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ نِصْفَ رِبْحِ الْمَالِ. [ط١٣٩٦]

* إسناده صحيح.

**لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لە باوکییەوە، ئەو وتی: عەبدوڵا و عوبەیدوڵا دوو کوڕەکەی عومەری کوڕی خەتاب لە سوپایەکدا دەرچوون بۆ عێراق، کاتێك قافڵەیان بەست هەردووکیان بە پاڵ ئەبو موسای ئەشعەریدا گوزەریان کرد، ئەو ئەمیری بەصرە بوو، پێشوازی و خۆشهاتنی لێکردن، پاشان وتی: گەر بتوانم کارێك ئەنجام بدەم سوودێکتان پێ بگەیەنم ئەنجامی دەدەم، پاشان وتی: با، هۆ ئا لەوێ ماڵ و سامانێك هەیە لە ماڵ و سامانی خودا، دەمەوێ ڕەوانەی بکەم بۆ ئەمیری باوەڕداران، بە سەلەم بە ئێوەی دەدەم، شتێك لە شتومەکی عێراقی پێ بکڕن و پاشان لە مەدینە بیفرۆشن، سەرمایەکەی بدەن بە ئەمیری باوەڕداران و قازانجەکەی بۆ خۆتان، ئەوانیش وتیان: ئەوەمان پێخۆشە.**

**ئەبو موسا ئەوەی ئەنجام دا، بۆ عومەری کوڕی خەتابی نووسی ماڵەکەیان لێ وەربگرێت، کاتێك هاتنەوە بۆ مەدینە شمەکەکەیان فرۆشت و قازانجیان کرد، کاتێ ئەوەیان دا بە عومەر، وتی: ئایا سەلەمی داوە بە هەموو سوپاکە وەك چۆن سەلەمی بە ئێوە داوە؟ وتیان: نەخێر، عومەری کوڕی خەتاب وتی: دوو کوڕەکەی ئەمیری باوەڕدارانن، بۆیە سەلەمی پێداون، ماڵ و سامانەکە و قازانجەی بهێنن، عەبدوڵا بێدەنگ بوو، عوبەیدوڵا وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەمە بۆ تۆ نابێت، گەر ئەم ماڵە کەمی بکردبایە یان تیابچوایە ئێمە دەستەبەرمان دەکرد، عومەر وتی: بیگێڕنەوە، عەبدوڵا بێدەنگ بوو، و عوبەیدوڵا کەوتەوە قسە، پیاوێك لەوانەی لە**

مەجلیسەکەی عومەر دانیشتبوو وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، گەر بیکەیت بە دوو لەتەوە، عومەر وتی: ئەوا کردم بە دوو لەتەوە، عومەر سەرمایەکە و نیوەی قازانجەکەی وەرگرت و عەبدوڵا و عوبەیدوڵاش-دوو کوڕەکەی عومەر- نیوەکەی تری قازانجەکەیان وەرگرت.

## ٣٠- دەروازەی: نەهی لە فرۆشتنی "العينة"

**٣٠٤٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ، وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ، وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ، وَتَرَكْتُمُ الجِهَادَ، سَلَّطَ اللهُ عَلَيْكُمْ ذُلاً لاَ يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ ). [د٣٤٦٢]

* صحيح.

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(گەر بە "العينة"[1] " کڕین فرۆشتننتان کرد و کلکی گاتان گرتەبەر، و ڕازیبوون بە کشتوکاڵ و وازتانهێنا لە جیهاد، خودا زەلیلی بەسەر ئێوەدا زاڵ دەکات لەسەر ئێوەی لانابات تا دەگەڕێنەوە بۆ ئایینەکەتان).**

**٣٠٤٧-** عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ وَرَجُلٌ يَسْأَلُهُ عَنْ رَجُلٍ سَلَّفَ فِي سَبَائِبَ، فَأَرَادَ بَيْعَهَا قَبْلَ أَنْ يَقْبِضَهَا، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: تِلْكَ الْوَرِقُ بِالْوَرِقِ، وَكَرِهَ ذَلِكَ.

* إسناده صحيح. [ط١٣٦٥]

لە قاسمی کوڕی محەمەدەوە، ئەو وتی: گوێم لە عەبدوڵای کوڕی عەباس بوو کاتێ پیاوێك پرسیاری لێ کرد دەربارەی پیاوێك لە لەتە قوماشێکدا سەلەم دەکات، دەیەوێت بیفرۆشێت بەرلەوەی بگاتە دەستی، ئیبن عەباس وتی: ئەوە پارە بە پارەیە، و ئەوەی لا ناپەسەند بوو.

---

[1] "بيع العينة": بریتییە لە فرۆشتنی شتێك بە نرخێکی دواخراو پاشان کڕینەوەی بە نرخێکی کەمتر-و.

## ٣١- دەروازەی: نەهی لە دوو فرۆشتن لە فرۆشتنێکدا

**٣٠٤٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ بَاعَ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ فَلَهُ أَوْكَسُهُمَا، أَوْ الرِّبَا). [د٣٤٦١/ ت١٢٣١/ ٤٦٤٦٥]

* حسن.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس دوو فرۆشتن لە یەك فرۆشتندا[1] ئەنجام بدات کەمترین نرخ لە دوو نرخەکەی بۆ هەیە، یان سووە).**

**٣٠٤٩-** عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِرَجُلٍ: ابْتَعْ لِي هَذَا الْبَعِيرَ بِنَقْدٍ حَتَّى أَبْتَاعَهُ مِنْكَ إِلَى أَجَلٍ، فَسُئِلَ عَنْ ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، فَكَرِهَهُ، وَنَهَى عَنْهُ. [ط١٣٦٨]

**لە مالیکەوە، ئەو پێیگەیشتووە: پیاوێك بە پیاوێکی وت: ئەم حوشترەم لێبکڕە بە پارەی حازر، تا من بە موددەیەك لێت بکڕمەوە، لەو بارەیەوە پرسیار کرا لە عەبدوڵای کوڕی عومەر لای ناپەسەند بوو، و نەهی لێکرد.**

**٣٠٥٠-** عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ اشْتَرَى سِلْعَةً بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ نَقْداً، أَوْ بِخَمْسَةَ عَشَرَ دِينَاراً إِلَى أَجَلٍ، فَكَرِهَ ذَلِكَ، وَنَهَى عَنْهُ. [ط١٣٦٩]

[وانظر: ٣٠٥٢].

**لە مالیکەوە، ئەو پێیگەیشتووە: پرسیار لە قاسمی کوڕی محەمەد کرا دەربارەی پیاوێك شمەکێکی بە دە دینار پارەی حازر کڕی، یان بە پازدە دینار بۆ ماوەیەك[2]، ئەوەی لا ناپەسەند بوو و نەهی لێکرد.**

---

[1] شتێك بە نرخێکی دواخراو بفرۆشێ و پاشان بە نرخێکی ئامادە بیکڕێتەوە، گەر لەو دوو فرۆشتنە زیادەی وەرگرت سووە—و.

[2] واتە: نرخەکەی پاش ماوەیەك پێ بدات، ئەمە شێوە سووە، چونکە وەك ئەوە وایە پارەی بە قەرز دابێت و زیادەی خستبێتە سەر چونکە نرخی ئامادە فرۆشییەکەی(دە دینار) و جیاوازە لە نرخی قەرز فرۆشیەکەی(پازدە دینار) لە کاتێکدا شمەکەکە یەك جۆرە شمەکە—و.

## ٣٢- دەروازەی: ئەوەی لە لای نییە نایفرۆشێ

**٣٠٥١-** عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! يَأْتِينِي الرَّجُلُ فَيُرِيدُ مِنِّي الْبَيْعَ لَيْسَ عِنْدِي، أَفَأَبْتَاعُهُ لَهُ مِنَ السُّوقِ؟ فَقَالَ: **(لاَ تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ)**.

* صحيح.　　　　[د٣٥٠٣/ ت١٢٣٢/ ن٤٦٢٧/ جه٢١٨٧]

**لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، پیاو دێت بۆ لام و دەیەوێت شتێکی پێ بفرۆشم لە لام نییە، ئایا لە بازاڕ بۆی بکڕم؟ فەرمووی: (شتێکت لە لا نەبێت مەیفرۆشە).**

**٣٠٥٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَحِلُّ سَلَفٌ وَبَيْعٌ، وَلاَ شَرْطَانِ فِي بَيْعٍ، وَلاَ رِبْحُ مَا لَمْ تَضْمَنْ، وَلاَ بَيْعُ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ)**.

* حسن صحيح.　　　　[د٣٥٠٤/ ت١٢٣٤/ ن٤٦٢٥/ جه٢١٨٨/ مي٢٦٠٢]

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سەلەمێك و فرۆشتنێك حەڵاڵ نییە[1]، دوو مەرج لە فرۆشتنێکدا نییە[2]، قازانج نییە گەر دەستەبەری نەکەی، فرۆشتن نییە گەر لە لات نەبێت).**

## ٣٣- دەروازەی: فرۆشتنی "العربون"

**٣٠٥٣-** عَنْ عبد الله بْنِ عَمْرٍو قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ بَيْعِ الْعُرْبَانِ.

* ضعيف.　　　　[د٣٥٠٢/ جه٢١٩٢]

---

(١) شمەکێك بفرۆشی و بڵێی: پێم فرۆشتی لەسەر ئەوەی ئەوەندە پارەم بە سەلەم پێ بدەی-و.

(٢) شمەکێك بە نرخێکی دواخراو بفرۆشی و پاشان بە کەمتر لەو نرخە بە نرخی ئامادە بیکڕییەوە-و.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە فرۆشتنی "العربون"[1].

## ٣٤- دەروازەی: فرۆشتنی تریێ بۆ دۆشاو

**٣٠٥٤-** عَنْ عَبْدِ الْوَاحِدِ الْبُنَانِيِّ قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي أَشْتَرِي هَذِهِ الْحِيطَانَ تَكُونُ فِيهَا الْأَعْنَابُ، فَلاَ نَسْتَطِيعُ أَنْ نَبِيعَهَا كُلَّهَا عِنَباً حَتَّى نَعْصِرَهُ، قَالَ: فَعَنْ ثَمَنِ الْخَمْرِ تَسْأَلُنِي؟ سَأُحَدِّثُكَ حَدِيثاً سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: كُنَّا جُلُوساً مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِذْ رَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، ثُمَّ أَكَبَّ وَنَكَتَ فِي الْأَرْضِ، وَقَالَ: (**الْوَيْلُ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ**) ! فَقَالَ عُمَرُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، لَقَدْ أَفْزَعَنَا قَوْلُكَ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ، فَقَالَ: (**لَيْسَ عَلَيْكُمْ مِنْ ذَلِكَ بَأْسٌ، إِنَّهُمْ لَمَّا حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ فَتَوَاطَؤُوهُ، فَيَبِيعُونَهُ، فَيَأْكُلُونَ ثَمَنَهُ، وَكَذَلِكَ ثَمَنُ الْخَمْرِ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ**). [حم٥٩٨٢]

* إسناده حسن.

لە عبدالواحیدی بونانییەوە، وتی: لەگەڵ ئیبن عومەر بووم، پیاوێك هات بۆ لای و وتی: ئەی باوکی عبدالرحمان، من ئەم باخانە دەکڕم، ترێیان تێدایە، ناتوانین هەمووی بە ترێیی بفرۆشین تا دۆشاوی لێ دروست دەکەین[2]، وتی: لە نرخی عارەق پرسیارم لێ دەکەی؟ فەرموودەیەکت بۆ باس دەکەم لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین، سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، پاشان سەری دانەواند و پەنجەی دەدا لە زەوی و فەرمووی: (**وەیل بۆ بەنی ئیسرائیل**)،

---

[1] "بیع العربون": دانانی بڕێك پارە بۆ کڕینی شتێك تا خاوەنەکەی شتەکە نەفرۆشێ و چاوەڕوانی کڕیارەکە بێت بۆ ماوەیەك تا پارەکەی دێتە دەست و بۆ فرۆشیارەکەی دەهێنێت، گەر نەیتوانی لەو ماوەدا پارەکە بهێنێ بۆ کڕینی شتەکە پارە پێشەکییەکەی بۆ کەسە فرۆشیارەکە بێت یان بەپێی ڕێکەوتنیان، دروستتر شەریعبوونی ئەم جۆرە فرۆشتنەیە—و.

[2] واتە: هەندێکی عارەقی لێ دروست دەکەین بۆ فرۆشتن—و.

عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا فەرموودەکەت بۆ بەنی ئیسرائیل ئێمەی ترساند، فەرمووی: **(لەوەدا خراپەیەك لەسەر ئێوە نییە، ئەوان کاتێ بەزیان لەسەر حەرام کرا لەسەر ئەوە رێکەوتن بیفرۆشن و نرخەکەی بخۆن، هەر بەو جۆرە نرخی عارەقیش لەسەر ئێوە حەرامە)**.

## ٣٥- دەروازەی: ئاشکرا کردنی نەنگی و عەیبی شت

**٣٠٥٥-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، ولاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ بَاعَ مِنْ أَخِيهِ بَيْعاً فِيهِ عَيْبٌ، إِلاَّ بَيَّنَهُ لَهُ**). [جه٢٢٤٦]

* صحيح.

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(موسڵمان برای موسڵمانە، حەڵاڵ نییە بۆ موسڵمان شتێکی بە براکەی فرۆشتووە عەیبێکی تێدایە، مەگەر بۆی ئاشکرا کردبێت)**.

## ٣٦- دەروازەی: فرۆشتن بە رەزامەندی

**٣٠٥٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّمَا الْبَيْعُ عَنْ تَرَاضٍ**). [جه٢١٨٥]

* صحيح.

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(فرۆشتن بە رەزامەندییە)**.

## ٣٧- دەروازەی: هەڵوەشاندنەوە

**٣٠٥٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ أَقَالَ مُسْلِماً أَقَالَهُ اللهُ عَثْرَتَهُ**). [د٣٤٦٠/ جه٢١٩٩]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس تەبا بێت لەگەڵ موسڵمانێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی فرۆشتن خودا هەڵە و تێکەوتنەکانی دەسڕێتەوە).**

- زاد ابن ماجه: (**يَوْمَ الْقِيَامَةِ**).

ئیبن ماجە ئەمەی زیاد کردووە: **(لە ڕۆژی قیامەت).**

## ٣٨- دەروازەی: لەغو و درۆ لە بازرگانیدا

**٣٠٥٨-** عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ قَالَ: كُنَّا فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نُسَمَّى السَّمَاسِرَةَ، فَمَرَّ بِنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَسَمَّانَا بِاسْمٍ هُوَ أَحْسَنُ مِنْهُ، فَقَالَ: (**يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ! إِنَّ الْبَيْعَ يَحْضُرُهُ اللَّغْوُ وَالْحَلْفُ، فَشُوبُوهُ بِالصَّدَقَةِ**).

لە قەیسی کوڕی ئەبی غەرەزەوە، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێیان دەوتین: "السماسرة–دەلاڵ"، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پالماندا تێپەڕی ناوێکی باشتر و جوانتر لەو ناوەی لێناین و فەرمووی: **(ئەی کۆمەڵی بازرگانان، فرۆشتن لەغو و سوێندی تێدەکەوێت، بۆیە صەدەقەی پێ تێکەڵ بکەن).**

- وفي رواية: (**يَحْضُرُهُ الْكَذِبُ وَالْحَلْفُ**). وفي أخرى: (**اللَّغْوُ وَالْكَذِبُ**).

* صحيح.　　　　[د٣٣٢٦/ ت١٢٠٨/ ن٣٨٠٦/ جه٢١٤٥]

لە ڕیوایەتێکدا: **(درۆ و سوێندنی تێدا ئامادە دەبێت)**، لە ڕیوایەتێکی تردا: **(لەغو و درۆ).**

**٣٠٥٩-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِبْلٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ التُّجَّارَ هُمُ الْفُجَّارُ**) قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَوَلَيْسَ قَدْ أَحَلَّ اللهُ الْبَيْعَ؟ قَالَ: (**بَلَى، وَلَكِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ فَيَكْذِبُونَ، وَيَحْلِفُونَ وَيَأْثَمُونَ**).　　　　[حم١٥٥٣٠]

* حديث صحيح، وإسناده قوي.

لــە عبــدالرحمانی كــوڕی شــیبلەوە، وتــی: پێغەمبــەری خــودا(ﷺ) فــەرمووی: **(بازرگانان بەدڕەفتارانن)**، وتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، بۆ مەگەر خودا كڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ نەكردووە؟ فەرمووی: **(با، بەڵام ئەوان قسە دەكەن و درۆ دەكەن، و سوێند دەخۆن و گوناهبار دەبن)**.

## ٣٩- دەروازەی: میانەگیری لە هەوڵی گوزەران

**٣٠٦٠-** عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَجْمِلُوا فِي طَلَبِ الدُّنْيَا، فَإِنَّ كُلاًّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ)**. [جه٢١٤٢]

* صحيح.

لە ئەبی حومەیدی ساعیدییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە هەوڵ و داوای دنیا باش و جوان بن، چونكە هەركەس كارئاسانی بۆ كراوە بۆ ئەوەی لەپێناوی خولقێنراوە)**.

## ٤٠- دەروازەی: كێشانە و پێوانە

**٣٠٦١-** عَنْ سُوَيْدِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: جَلَبْتُ أَنَا وَمَخْرَفَةُ الْعَبْدِيُّ بَزّاً مِنْ هَجَرَ، فَأَتَيْنَا بِهِ مَكَّةَ، فَجَاءَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَمْشِي، فَسَاوَمَنَا بِسَرَاوِيلَ، فَبِعْنَاهُ، وَثَمَّ رَجُلٌ يَزِنُ بِالْأَجْرِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(زِنْ وَأَرْجِحْ)**.

* صحيح. [د٣٣٣٦/ ت١٣٠٥/ ن٤٦٠٦/ جه٢٢٢٠]

لە سوەیدی كوڕی قەیسەوە، وتی: من و مەخرەفەی عەبدی قوماشی لۆكە و كەتانمان لە "هَجَر"ەوە هێنا بۆ مەككە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لامان بە پێیـان دەڕۆیشـت، مامەڵەی شەرواڵێكی لەگەڵ كردین پێمان فرۆشت، پیاوێـك لەوێـدا بـوو بـە كـرێ پێوانـەی دەكرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: **(بكێشە و پارسەنگ بدە[1])**.

[1] پارسەنگدان: كەمێك زیادەیە بچێت بە لای كڕیاردا لە پێوانە و كێشانەی فرۆشیار-و.

**٣٠٦٢**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا وَزَنْتُمْ فَأَرْجِحُوا**).

* صحيح. [جه٢٢٢٢]

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**گەر کێشانەتان کرد پارسەنگ بدەن**).

## ٤١- دەروازەی: نرخدانان

**٣٠٦٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! سَعِّرْ، فَقَالَ: (**بَلْ أَدْعُو**)، ثُمَّ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! سَعِّرْ، فَقَالَ: (**بَلْ اللهُ يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ، وَإِنِّي لَأَرْجُو أَنْ أَلْقَى اللهَ، وَلَيْسَ لِأَحَدٍ عِنْدِي مَظْلَمَةٌ**). [د٣٤٥٠]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە: پیاوێك هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، نرخ دابنێ، فەرمووی: (**بەڵکو دوعا دەکەم**)، پاشان پیاوێك هات بۆ لای و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، نرخ دابنێ، فەرمووی: (**خودا بەرز دەکاتەوە و نزم دەکاتەوە، من رجام وایە بە خزمەتی خودا بگەم و هیچ کەس مافێکی پێشێلکراوی لەسەر من نەبێت**).

**٣٠٦٤**- عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ النَّاسُ: يَا رَسُولَ اللهِ! غَلاَ السِّعْرُ، فَسَعِّرْ لَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ اللهَ هُوَ الْمُسَعِّرُ الْقَابِضُ الْبَاسِطُ الرَّازِقُ، وَإِنِّي لَأَرْجُو أَنْ أَلْقَى اللهَ، وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْكُمْ يُطَالِبُنِي بِمَظْلَمَةٍ فِي دَمٍ وَلاَ مَالٍ**). [د٣٤٥١/ ت١٣١٤/ جه٢٢٠٠]

* صحيح.

لە ئەنەسەوە، وتی: خەڵکی وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، نرخ گران بووە، بۆیە نرخمان بۆ دیاری بکە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خودا نرخدانەر و بەرتەسککار و بەرینکار و رۆزیدەرە، من رجام وایە بە خودا بگەم و هیچ کام لە ئێوە داوای مافێکی پێشێلکراوم لێ نەکات، نە لە خوێن، نە لە ماڵ و سامان**).

## ٤٢- دەروازەی: فرۆشتنی چەك

**٣٠٦٥-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ كَانَ يَأْخُذُ مِنْ قَوْمٍ بِمَكَّةَ دَرَاهِمَ، ثُمَّ يَكْتُبُ بِهَا إِلَى مُصْعَبِ بْنِ الزُّبَيْرِ بِالعِرَاقِ فَيَأْخُذُونَهَا مِنْهُ، فَسُئِلَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ ذَلِكَ فَلَمْ يَرَ بِهِ بَأْساً، فَقِيلَ لَهُ: إِنْ أَخَذُوا أَفْضَلَ مِنْ دَرَاهِمِهِمْ قَالَ: لاَ بَأْسِ إِذَا أَخَذُوا بِوَزْنِ دَرَاهِمِهِمْ. [هق٥/٣٥٢]

**لە عەتای کوڕی ئەبی رەباحەوە: عەبدوڵای کوڕی زوبەیر لە مەککە درهەمی لە خەڵکانێك وەردەگرت، پاشان بۆ موصعەبی کوڕی زوبەیری دەنووسی کە لە عێراق بوو درهەمەکانیان لە ئەو وەردەگرت، پرسیاری ئەوەیان لە عەباس کرد بە خراپی نەبینی، پێی وترا: گەر باشتر لە درهەمەکانی خۆیان وەربگرن؟ وتی: خراپ نییە گەر بە کێشی درهەمەکانی خۆیان وەربگرن.**

## ١- دەروازەی: پارێزگاری لە ماڵ و سامان و بەفیڕۆنەدانی

**٣٠٦٦-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ أَدَاءَهَا أَدَّى اللهُ عَنْهُ، وَمَنْ أَخَذَ يُرِيدُ إِتْلاَفَهَا أَتْلَفَهُ اللهُ**). [خ٢٣٨٧]

[وانظر عدم إضاعة المال: **٢٦٢٠، ٣٣٣٣**].

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس ماڵ و سامانی خەڵکی وەرگرت و بیەوێت بیگێڕێتەوە خودا لە ئەوەوە دەیگێڕێتەوە، هەر کەسیش وەریبگرێت بیەوێت بەفیڕۆی بدات خودا ئەو تیادەبات).**

## ٢- دەروازەی: هەڵگرتنی ماڵ و سامان بۆ گێڕانەوەی قەرز

**٣٠٦٧-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَوْ كَانَ لِي مِثْلُ أُحُدٍ ذَهَباً، ما يَسُرُّنِي أَنْ لاَ يَمُرَّ عَلَيَّ ثَلاَثٌ وَعِنْدِي مِنْهُ شَيْءٌ، إِلاَّ شَيْءٌ أُرْصِدُهُ لِدَيْنٍ**).

[خ٢٣٨٩/م٩٩١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر هاوشێوەی چیای ئوحد زێڕم هەبێت خۆشحاڵ نیم سێ ڕۆژ بەسەرمدا گوزەر بکات و شتێکم لە لا بمێنێتەوە، مەگەر شتێك بۆ قەرزێکی هەڵبگرم).**

## ٣- دەروازەی: پلە و پایەی چاوپۆشی لە کەسی دەستتەنگ

**٣٠٦٨-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**كَانَ تَاجِرٌ يُدَايِنُ النَّاسَ، فَإِذَا رَأَى مُعْسِراً قَالَ لِفِتْيَانِهِ: تَجَاوَزُوا عَنْهُ، لَعَلَّ اللهَ أَنْ يَتَجَاوَزَ عَنَّا، فَتَجَاوَزَ اللهُ عَنْهُ**).

[خ٢٠٧٨/ م١٥٦٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(بازرگانێك قەرزی بە خەڵك دەدا، گەر دەستتەنگێکی[1] ببینیبایە بە کاریەدەستەکانی خۆی دەوت: چاوپۆشی لێ بکەن، بەڵکو خودا چاوپۆشی لە ئێمە بکات، خودا چاوپۆشی لێکرد).**

**٣٠٦٩-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ: أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ طَلَبَ غَرِيماً لَهُ فَتَوَارَى عَنْهُ، ثُمَّ وَجَدَهُ، فَقَالَ: إِنِّي مُعْسِرٌ. فَقَالَ: آللهِ؟ قَالَ: أَللهِ. قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُنْجِيَهُ اللهُ مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَلْيُنَفِّسْ عَنْ مُعْسِرٍ، أَوْ يَضَعْ عَنْهُ).**
[م١٥٦٣]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی قەتادەوە: ئەبو قەتادە بەدوای قەرزارێکی خۆیدا گەڕا، ئەویش خۆی لێ بزر کرد، پاشان بینییەوە و وتی: من دەستم تەنگە، ئەبو قەتادە وتی: سوێند دەخۆی بە خودا؟ وتی: سوێند دەخۆم بە خودا، ئەبو قەتادە وتی: من لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست دەیفەرموو: **(هەرکەس پێیخۆشە خودا لە تەنگانەی ڕۆژی قیامەت رزگاری بکات با دەروو لە دەستتەنگێك بکاتەوە، یان لەسەری لا ببات).**

**٣٠٧٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً أَوْ وَضَعَ لَهُ، أَظَلَّهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَحْتَ ظِلِّ عَرْشِهِ، يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ).** [ت١٣٠٦]
* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە دەستتەنگێك بخایەنێت، یان لەسەری لاببات، لە ڕۆژی قیامەت خودا دەیخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆی، ڕۆژێك هیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری عەرشەوکەی).**

[1] دەستتەنگ: واتە هەژار و کەم دەرامەت ـو.

## ٤- دەروازەی: داواکردنەوەی قەرز بە جوانی و باشی

**٣٠٧١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَتَقَاضَاهُ، فَأَغْلَظَ، فَهَمَّ بِهِ أَصحَابُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(دَعُوهُ، فَإِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالاً)**. ثُمَّ قَالَ: **(أَعْطُوهُ سِنّاً مِثْلَ سِنِّهِ)**. قَالوا: يَا رَسُولَ اللهِ! لا نَجِدُ إِلاَّ أَمْثَلَ مِنْ سِنِّهِ، فَقَالَ: **(أَعْطُوهُ، فَإِنَّ مِنْ خَيْرِكُمْ أَحْسَنَكُمْ قَضَاءً)**. [خ٢٣٠٦ (٢٣٠٥)/ م١٦٠١]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای قەرزی لێکردەوە، توندی نواند، هاوەڵانی پێغەمبەر ویستیان تەمبێی بکەن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لێیگەڕێن، چونکە خاوەن حەق قسەی بۆ هەیە)، پاشان فەرمووی: (حوشترێکی یەکسان بە حوشترەکەی پێ بدەن)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، تەنها باشتر لە حوشترەکەی ئەو شك دەبەین، فەرمووی: (پێیبدەن، چونکە باشترینی ئێوە باشترینتانە لە گێڕانەوەی قەرز).**

- وفي رواية للبخاري: كَانَ لِرَجُلٍ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم سِنٌّ مِنْ الْإِبِلِ، فَجَاءَهُ يَتَقَاضَاهُ.. فَقَالَ: **(أَعْطُوهُ)**، فَقَالَ: أَوْفَيْتَنِي، أَوْفَى اللهُ بِكَ. [خ٢٣٠٥]

**لە ریوایەتێکی بوخاریدا: پیاوێك حوشترێکی لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) هەبوو، هات و داوای کردەوە، پێغەمبەر فەرمووی: (پێیبدەن)، کابرا وتی: وەفات پێ کردم، خودا وەفات پێ بکات.**

**٣٠٧٢-** عَنْ مُجَاهِدٍ أَنَّهُ قَالَ: اسْتَسْلَفَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ مِنْ رَجُلٍ دَرَاهِمَ، ثُمَّ قَضَاهُ دَرَاهِمَ خَيْراً مِنْهَا، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ! هَذِهِ خَيْرٌ مِنْ دَرَاهِمِي الَّتِي أَسْلَفْتُكَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: قَدْ عَلِمْتُ، وَلَكِنْ نَفْسِي بِذَلِكَ طَيِّبَةٌ. [ط١٣٨٥]

* إسناده قوي.

**لە موجاهیدەوە، ئەو وتی: عەبدوڵای کوڕی عومەر کۆمەڵێك درهەمی لە پیاوێك قەرز کردبوو، پاشان بە کۆمەڵێك درهەمی باشتر و چاکتر لەوە قەرزەکەی بۆ گێڕایەوە، پیاوەکە وتی: ئەی باوکی عبدالرحمن، ئەمانە لە درهەمەکانی من باشترن**

كە بە قەرز پێمدای[1]، عەبدوڵای كوڕی عومەر وتی: ئەوەم زانی، بەڵام نەفسم بەو كارە خۆشحاڵە.

## ٥- دەروازەی: پەسەندی دابەزاندن لە قەرز و بەخشینی

**٣٠٧٣-** (ق) عَنْ كَعْبِ بْنِ مالِكٍ: أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْناً كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي المسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا، حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ، فَنَادَى: (**يَا كَعْبُ**) ! قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (**ضَعْ مِنْ دَيْنِكَ هَذَا**)، وَأَوْمَأَ إِلَيْهِ: أَيِ الشَّطْرَ، قَالَ: لَقَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (**قُمْ فَاقْضِهِ**). [خ٤٥٧/ م١٥٥٨]

(ق) لە كەعبی كوڕی مالیكەوە: ئەو لە مزگەوت داوای قەرزێكی لە ئیبن ئەبی حەدرەد كردەوە كە لەسەری بوو، دەنگی هەردووكیان بەرزبوویەوە، تا پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ماڵەوە گوێی لە دەنگەكە بوو، هاتە دەرەوە بۆ لایان، تا پەردەی ژوورەكەی لادا و بانگی كرد: (**ئەی كەعب**)، وتی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (**لەو قەرزەت دابەزێنە**)، ئاماژەی پێ كرد: واتە: نیوەی[2]، كەعب وتی: ئەوا ئەوەم ئەنجامدا، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (**هەستە، قەرزەكەی بۆ بگێڕەوە**)[3].

## ٦- دەروازەی: تكاكاری بۆ دابەزاندنی قەرز

**٣٠٧٤-** (خ) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّ أَبَاهُ تُوُفِّيَ وَتَرَكَ عَلَيْهِ ثَلاَثِينَ وَسْقاً لِرَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ، فَاسْتَنْظَرَهُ جابِرٌ، فَأَبَى أَنْ يُنْظِرَهُ، فَكَلَّمَ جابِرٌ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم

---

[1] دیارە ئەو سەردەمە لێدانی سكەی درهەمەكان یەك جۆر نەبوون، هەیانبووە باش و هەیانبووە ناباش، بەڵام هەمان بەها و نرخیان بووە، گەر نرخیان جیاواز بووایە عەبدوڵا ئەو كارەی نەدەكرد، چونكە دەبێتە سوو-و.

[2] واتە: پێغەمبەر بە دەست ئاماژەی كرد نیوەی قەرزەكەی لەسەر لابە-و.

[3] واتە: بە ئیبن ئەبی حەدرەدی فەرموو هەستە قەرزەكەی بۆ بگێڕەوە-و.

لِيَشْفَعَ لَهُ إِلَيْهِ، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَكَلَّمَ الْيَهُودِيَّ لِيَأْخُذَ ثَمَرَ نَخْلِهِ بِالَّذِي لَهُ، فَأَبَى، فَدَخَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم النَّخْلَ فَمَشَى فِيهَا، ثُمَّ قَالَ لِجَابِرٍ: (**جُدَّ لَهُ، فَأَوْفِ لَهُ الَّذِي لَهُ**). فَجَدَّهُ بَعْدَمَا رَجَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَوْفَاهُ ثَلاَثِينَ وَسْقاً، وَفَضَلَتْ لَهُ سَبْعَةَ عَشَرَ وَسْقاً، فَجَاءَ جابِرٌ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِيُخْبِرَهُ بِالَّذِي كانَ، فَوَجَدَهُ يُصَلِّي الْعَصْرَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَخْبَرَهُ بِالْفَضْلِ، فَقَالَ: (**أَخْبِرْ ذلِكَ ابْنَ الخَطَّابِ**). فَذَهَبَ جابِرٌ إِلى عُمَرَ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَقَدْ عَلِمْتُ حِينَ مَشَى فِيهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَيُبَارَكَنَّ فِيهَا. [خ٢٣٩٦ (٢١٢٧)]

**(خ) لە جابری كوڕی عەبدولاوە(خوایان لێ رازی بێت): باوكی كۆچی دوایی كرد و سی وەسق**[1] **قەرزی پیاوێك لە یەهوودی بەسەرەوە بەجێهێڵا، جابر داوای مۆڵەتی لێكرد، ئەویش نەیویست مۆڵەتی بدات، جابر قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) كرد تا لای ئەو جوولەكە تكای بۆ بكات، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات و قسەی لەگەڵ یەهوودییەكە كرد بۆئەوەی بەری دارخورماكانی ببات بەو قەرزەی هەیەتی لەسەری، كابرا نەیویست، پێغەمبەری خودا(ﷺ) رۆیشتە ناو دارخورماكانی و پیایدا گەڕا و پاشان بە جابری فەرموو: (بەرەكەی بكەرەوە و ئەو قەرزەی هەیەتی بۆی بگێڕەوە)، لەدوای ئەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەڕایەوە جابر بەرەكەی كردەوە و سی وەسقی بۆ كابرا گێڕایەوە و حەڤدە وەسقیشی زیاد بوو، جابر هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) تا هەواڵی ئەوەی پێبدا روویدا، بینی نوێژی عەصر دەكات، كاتێ تەواو بوو هەواڵی پێ دا بە خورما زیادەكە، پێغەمبەر فەرمووی: (هەواڵی ئەوە بدە بە كوڕەكەی خەتاب)، جابر رۆیشت بۆ لای عومەر و هەواڵی پێدا، عومەر پێی وت: كاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیایدا گەڕا زانیم بەرەكەتی تێ دەكەوێت.**

---

[1] یەك وەسق شەست (صاع)ە، یەك (صاع) چوار (مُدّ)، یەك (مُدّ) بریتییە لە لێوان لێوی دوو لەپی دەستی پیاوێكی مامناوەند—و.

## ٧- دەروازەی: کەسێك بمرێ و قەرزی لەسەر بێت

**٣٠٧٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ المُتَوَفَّى، عَلَيْهِ الدَّيْنُ فَيَسْأَلُ: **(هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ فَضْلاً)** ؟. فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ لِدَيْنِهِ وَفَاءً صَلَّى؛ وَإِلاَّ قَالَ لِلْمُسْلِمِينَ: **(صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ)**. فَلَمَّا فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ الْفُتُوحَ، قَالَ: **(أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ تُوُفِّيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فَتَرَكَ دَيْناً فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مالاً فَلِوَرَثَتِهِ)**.
[خ٢٢٩٨/ م١٦١٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پیاوی مردوو دەهێنرا بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) قەرزی لەسەر بوو دەیپرسی: **(ئایا بۆ قەرزەکەی شتێکی بەجێهێڵاوە؟)**، گەر باسی بۆ کرابا شتێکی بۆ قەرزەکەی بەجێهێڵاوە نوێژی لەسەر دەکرد، ئەگەر نە، بە موسڵمانانی دەفەرموو: **(لەسەر هاوەڵەکەتان نوێژ بکەن)**، کاتێ خودا دەرگاکانی بۆ واڵا کرد فەرمووی: **(من بە باوەڕداران لە خودی خۆیان لەپێشترم، هەر کەس لە باوەڕداران مرد و قەرزی لەسەر بەجێما قەرزەکەی لەسەر من، هەر کەس ماڵێکی بەجێهێڵا بۆ میراتگرانی)**.

**٣٠٧٦-** عَنْ سَمُرَةَ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(هَاهُنَا أَحَدٌ مِنْ بَنِي فُلاَنٍ)** ؟ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ قَالَ: **(هَاهُنَا أَحَدٌ مِنْ بَنِي فُلاَنٍ)** ؟ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ قَالَ: **(هَاهُنَا أَحَدٌ مِنْ بَنِي فُلاَنٍ)** ؟ فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ! فَقَالَ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَا مَنَعَكَ أَنْ تُجِيبَنِي فِي الْمَرَّتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ؟ إِنِّي لَمْ أُنَوِّهْ بِكُمْ إِلاَّ خَيْراً، إِنَّ صَاحِبَكُمْ مَأْسُورٌ بِدَيْنِهِ)**، فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أُدِّيَ عَنْهُ حَتَّى مَا أَحَدٌ يَطْلُبُهُ بِشَيْءٍ. [د٣٣٤١/ ن٤٦٩٩]

* حسن.

لە سەموورەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری بۆ داین و فەرمووی: **(ئالەوێندەر کەسێك هەیە لە بەنی فلان؟)**، کەس وەڵامی نەدایەوە، پاشان فەرمووی: **(ئالەوێندەر کەسێك هەیە لە بەنی فلان؟)**، پیاوێك هەستا و وتی: من ئەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(چی رێگری لێ کردی لە یەکەمین دوو جار وەڵام**

**بدەیەوە؟ من تەنها خێر لەسەر ئێوە دەڵێم، هاوەڵەكەتان بە قەرزارییەكەیەوە گیرۆدە بووە)، من بۆ خۆم بینیم قەرزەكەی بۆ درایەوە تا هیچ كەس شتێكی لێ داوا نەدەكرد.**

**٣٠٧٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ، حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ**). [ت١٠٧٨/ جه٢٤١٣/ مي٢٦٣٣]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نەفسی باوەڕدار بە قەرزارییەكەیەوە هەڵواسراوە تا قەرزەكە لەسەر ئەو لادەبرێت).**

## ٨- دەروازەی: شاندانە ژێر قەرزی مردوو

**٣٠٧٨-** (خ) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ ﷺ قالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِذْ أُتِيَ بِجَنَازَةٍ، فَقَالُوا: صَلِّ عَلَيْهَا، فَقَالَ: (**هَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ**) ؟ قَالُوا: لاَ، قالَ: (**فَهَلْ تَرَكَ شَيْئاً**) ؟ قَالُوا: لاَ، فَصَلَّى عَلَيْهِ. ثُمَّ أُتِيَ بِجَنَازَةٍ أُخْرَى، فَقَالوا: يَا رَسُولَ اللهِ، صَلِّ عَلَيْهَا، قالَ: (**هَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ**) ؟ قِيلَ: نَعَمْ، قالَ: (**فَهَلْ تَرَكَ شَيْئاً**) ؟ قالُوا: ثَلاَثَةَ دَنَانِيرَ، فَصَلَّى عَلَيْهَا. ثُمَّ أُتِيَ بِالثَّالِثَةِ، فَقَالُوا: صَلِّ عَلَيْهَا، قالَ: (**هَلْ تَرَكَ شَيْئاً**) ؟ قالُوا: لاَ، قالَ: (**فَهَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ**) ؟ قالُوا: ثَلاَثَةُ دَنَانِيرَ، قالَ: (**صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ**).

قالَ أَبُو قَتَادَةَ: صَلِّ عَلَيْهِ يَا رَسُولَ اللهِ وَعلَيَّ دَيْنُهُ، فَصَلَّى عَلَيْهِ. [خ٢٢٨٩]

**(خ) لە سەلەمەی كوڕی ئەكوەعەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین لەو كاتەدا جەنازەیەك هێنرا، وتیان: نوێژی لەسەر بكە، فەرمووی: (ئایا قەرزێكی لەسەرە؟)، وتیان: نەخێر، فەرمووی: (ئایا شتێكی بەجێهێڵاوە؟)، وتیان: نەخێر، پێغەمبەر نوێژی لەسەر كرد، پاشان جەنازەیەكی تر هێنرا و وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، نوێژی لەسەر بكە، فەرمووی: (ئایا قەرزێكی لەسەرە؟)، وترا: بەڵێ، فەرمووی: (ئایا شتێكی بەجێهێڵاوە؟)، وتیان: سێ دینار، پێغەمبەر نوێژی لەسەر كرد، پاشان جەنازەی سێیەم هێنرا و وتیان: نوێژی لەسەر بكە، فەرمووی:**

**(ئایا شتێکی بەجێهێڵاوە؟)**، وتیان: نەخێر، فەرمووی: **(ئایا قەرزێکی لەسەرە)**، وتیان: سێ دینار، فەرمووی: **(ئێوە نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن)**.

ئەبو قەتادە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، نوێژی لەسەر بکە، قەرزەکەی لەسەر من، پێغەمبەر نوێژی لەسەر کرد.

## ٩- دەروازەی: مایەپووچ (الْمُفْلس)

**٣٠٧٩**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، أَوْ قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَنْ أَدْرَكَ مالَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَ رَجُلٍ، أَوْ إِنْسَانٍ، قَدْ أَفْلَسَ فَهْوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ**). [خ٢٤٠٢/ م١٥٥٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: یان وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس پیاگەیشت بە خودی ماڵ و سامانەکەی خۆی لای پیاوێك، یان لای مرۆڤێك مایەپووچ بووبێت، ئەوا ئەو لەپێشترە بەو ماڵ و سامانە لە هەر کەسێکی تر[1])**.

**٣٠٨٠**- (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا، فَكَثُرَ دَيْنُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ**)، فَتَصَدَّقَ النَّاسُ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِغُرَمَائِهِ: (**خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ، وَلَيْسَ لَكُمْ إِلاَّ ذَلِكَ**). [م١٥٥٦]

(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە بەروبوومێك کڕیبووی تووشهات و قەرزی لەسەر زۆر بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(صەدەقەی پێ بکەن)**، خەڵکیش صەدەقەیان پێ کرد، بەڵام ئەوە نەگەیشتە

---

[1] واتە: کەسی تر لە خاوەن قەرزەکان مافی ئەوەیان نییە ماڵ و سامانی دیاریکراوی ئەو پیاوە لای کابرای مایەپووچ ببات جگە لە خاوەنە دیاریکراوەکەی-و.

**بەشـی گێڕانـەوەی قەرزەکـە لەسـەری، پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) بـە خـاوەن قـەرزەکانی فەرموو: (ئەوەی دەیبیننەوە بیبەن، جگە لەوە شتێکی ترتان بۆ نییە).**

**٣٠٨١**- عَنْ كَعْبِ بنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَجرَ عَلى مُعَاذٍ مَالَهُ وَبَاعَهُ بِدَيْنٍ كَانَ عَلَيْهِ. [ك٧٠٦٠]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە کەعبی کوڕی مالیکەوە(خوا لێـی رازی بێـت): پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) حیجـری خستە سەر ماڵەکەی موعاز و فرۆشتی بە قەرزێك کە لەسەری بوو.**

## ١٠- دەروازەی: دواخـستنی گێڕانەوەی قەرز لە لایەن کەسی دەوڵەمەندەوە ستەمە

**٣٠٨٢**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (**مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، فَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيٍّ، فَلْيَتْبَعْ**). [خ٢٢٨٧/ م١٥٦٤]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: (دواخستنی دەوڵەمەند ستەمە[1]، گـەر قـەرزی یـەکێك لـە ئێـوە هەڵدرایـە سـەر دەوڵەمەندێك با قبووڵی بکات).**

## ١١- دەروازەی: حەواڵە

**٣٠٨٣**- (خ) وَقَالَ الْحَسَنُ وَقَتَادَةُ: إِذَا كَانَ يَوْمَ أَحَالَ عَلَيْهِ مَلِيّاً، جَازَ.

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: يَتَخَارَجُ الشَّرِيكَانِ وَأَهْلُ الْمِيرَاثِ، فَيَأْخُذُ هَذَا عَيْناً، وَهَذَا دَيْناً، فَإِنْ تَوِيَ لِأَحَدِهِمَا لَمْ يَرْجِعْ عَلَى صَاحِبِهِ. [الحوالة، باب ١]

[وانظر: الباب قبله].

---

[1] واتە: دواخستن و نەدانەوەی قەرز لە لایەن کەسی دەوڵەمەندەوە ستەمە-و.

(خـ) حەسەن و قەتادە دەڵێن: گەر ئەو ڕۆژەی حەواڵەکەی بۆ سەر کرا[1] دەوڵەمەند بوو دروستە.

ئیبن عەباس دەڵێت: دوو شەریکەکە و ئەهلی میرات یەکێکیان ئەویتریان دەردەکات[2]، ئەمەیان بەشێکی دیاریکراو و ئەوەیان قەرزێك دەبات، گەر بۆ یەکێکیان تیاچوو ناگەڕێتەوە بۆ هاوەڵەکەی.

## ١٢- دەروازەی: کەفالەت

**٣٠٨٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَجُلاً لَزِمَ غَرِيماً لَهُ بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ، فَقَالَ: وَاللهِ لاَ أُفَارِقُكَ حَتَّى تَقْضِيَنِي أَوْ تَأْتِيَنِي بِحَمِيلٍ. فَتَحَمَّلَ بِهَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَتَاهُ بِقَدْرِ مَا وَعَدَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(مِنْ أَيْنَ أَصَبْتَ هَذَا الذَّهَبَ)** ؟ قَالَ: مِنْ مَعْدِنٍ، قَالَ: **(لاَ حَاجَةَ لَنَا فِيهَا، لَيْسَ فِيهَا خَيْرٌ)**، فَقَضَاهَا عَنْهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [د٣٣٢٨/ جه٢٤٠٦]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە: پیاوێك پەیوەست بوو بە قەرزارەکەیەوە بۆ دە دینار و وتی: سوێند بە خودا لێت جیانابمەوە تا قەرزەکەم بۆ دەگێڕییەوە یان کەسێکم بۆ دەهێنی قەرزەکەت لە کۆڵ بکاتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) شانی دایە ژێر، کابرای قەرزار ئەو بڕەی بۆ هێنا بەڵێنی پێدابوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: **(لە کوێ ئەو زێڕەت هێناوە؟)**،

---

[1] واتە: گەر ئەو ڕۆژەی حەواڵەی قەرزەکە کرا بۆ سەر کەسێکی تر دەوڵەمەند بوو حەواڵەکردنەکە دروستە، بۆ نموونە: ئەلیف قەرزێکی لای بایە، با هەژارە و نییەتی قەرزەکە بگێڕێتەوە، جیم دەڵێ من دەچمە ژێر قەرزەکەی، گەر ئەو ڕۆژەی شان دەداتە ژێر قەرزەکەی دەوڵەمەند بوو دروستە، گەر ئەویش وەك کەسە قەرزارەکەی یەکەم هەژار بوو دروست نییە–و.

[2] واتە: لە ماڵە بەجێماوەکەدا هەردووکیان یەکسانن–و.

وتی: لە مەعدەن[1]، فەرمووی: (**پێویستییەکمان لەمەدا نییە، خێری تێدا نییە**)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ئەوەوە قەرزەکەی بۆ گێڕایەوە[2].

**٣٠٨٥**- عَنْ سُلَيْمَانَ الشَّيْبَانِي قَالَ: سَمِعْتُ حَبِيباً الَّذِي كَانَ يُقَدِّمُ الْخُصُومَ إِلَى شُرَيْحٍ، قَالَ: خَاصَمَ رَجُلٌ ابْناً لِشُرَيْحٍ إِلَى شُرَيْحٍ كَفِلَ لَهُ بِرَجُلٍ عَلَيْهِ دَيْنٌ فَحَبَسَهُ شُرَيْحٌ، فَلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ قَالَ: اذْهَبْ إِلَى عَبْدِ اللهِ بِفِرَاشٍ وَطَعَامٍ، وَكَانَ ابْنُهُ يُسَمَّى عَبْدَ اللهِ. [هق٦/٧٧]
[وانظر: **٣٠٨٧**].

**لە سولەیمانی شەیبانییەوە، وتی: گوێم لە حەبیب بوو، ئەو کەسەی نەیارانی دەبردە لای شورەیح، وتی: پیاوێك سکاڵای خۆی بردە لای شورەیح لەدەست کوڕێکی شورەیح، کەفالەتی بۆ کرد بوو لە پیاوێك قەرزێکی ئەوی لەسەر بوو، شورەیح خستییە بەندیخانەوە[3]، کاتێ شەو داهات وتی: جێگەی نوستن و خواردن بۆ عەبدوڵا ببە، کوڕەکەی ئەو[4] ناوی عەبدوڵا بوو.**

## ١٣- دەروازەی: وەکالەت

**٣٠٨٦**- (خ) وَقَدْ وَكَّلَ عُمَرُ وَابْنُ عُمَرَ فِي الصَّرْفِ. [الوكالة، باب ٣]
وَكَتَبَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو إِلَى قَهْرَمَانِهِ، وَهُوَ غَائِبٌ عَنْهُ، أَنْ يُزَكِّيَ عَنْ أَهْلِهِ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ. [الوكالة، باب ٥]

**(خـ) عومەر و ئیبن عومەر لە "الصَّرف"دا[5] وەکیلیان گرتبوو.**

---

[1] هەر شتێك لە سکی زەوی دەربهێنرێت کانزایە-و.

[2] واتە: دە دینارەکەی بۆ خاوەن قەرزەکە گێڕایەوە، نەك زێڕەکە-و.

[3] واتە: قازی شورەیح کوڕەکەی خۆی خستە بەندیخانەوە-و.

[4] واتە: کوڕەکەی شورەیح ناوی عەبدوڵا بوو-و.

[5] واتە: دەستوەردان و کڕین و فرۆشتن بە ماڵ و سامانەوە-و.

عەبدوڵای کوڕی عومەر بۆ وەکیلە خەزنەدارەکەی خۆی نووسی، ئەو لای ئامادە نەبوو: لە خانەوادەکەیەوە بچووك و گەورە زەکاتی فیتر دەربکات.

## ١٤- دەروازەی: "العارية[١]"

٣٠٨٧- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ فِي الْخُطْبَةِ، عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ: (**الْعَارِيَةُ مُؤَدَّاةٌ، وَالزَّعِيمُ غَارِمٌ، وَالدَّيْنُ مَقْضِيٌّ**). [د٣٥٦٥/ ت١٢٦٥/ جه٢٣٩٨]

* صحيح.

**لە ئەبی ئومامەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە وتاردا لە حەجیماڵئاوایی دەیفەرموو: ("العارية" دەدرێتەوە، کەفیل دەستەبەرە، قەرز دەگەڕێتەوە).**

٣٠٨٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: كُنَّا نَعُدُّ الْمَاعُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَارِيَةَ الدَّلْوِ وَالْقِدْرِ. [د١٦٥٧]

* حسن.

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفر و مەنجەڵی کاسەدراوسێمان بە "عارية-خوازراو" دادەنا.**

٣٠٨٩- عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم اسْتَعَارَ مِنْهُ أَدْرَاعاً يَوْمَ حُنَيْنٍ، فَقَالَ: أَغَصْبٌ يَا مُحَمَّدُ؟ فَقَالَ: (**لاَ، بَلْ عَارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ**). [د٣٥٦٢]

* صحيح.

**لە صەفوانی کوڕی ئومەییەوە: لە ڕۆژی حونەین پێغەمبەری خودا چەند درعێکی لێ خواست، وتی: ئایا داگیرکارییە ئەی محەمەد؟ فەرمووی: (نەخێر، "عارية"یەکی دەستەبەرکراوە[٢]).**

---

[١] العارية: بریتییە لە (تمليك المنافع بغير عِوض-گرتنە دەستی سوودبەخشەکان بەبێ بریتی)-و.

[٢] واتە: داگیرکاری نییە، بەڵکو خوازراوە و گەر تیاچوون بۆت دەستەبەر دەکەم-و.

## ١٥- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی "الوديعة" هاتووە

**٣٠٩٠**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ أُودِعَ وَدِيعَةً، فَلاَ ضَمَانَ عَلَيْهِ). [جه١٢٤٠١]

* حسن.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس "وديعة"[1]–سپاردە"یەکی لا دانرا دەستەبەریی لەسەر نییە[2]).**

**٣٠٩١**- عَنْ عَائِشَةَ فِي هِجْرَةِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَتْ: وَأَمَرَ . تَعْنِي رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم. عَلِيّاً ﷺ أَنْ يَتَخَلَّفَ عَنْهُ بِمَكَّة حَتَّى يُؤَدِّي عَنْ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم الْوَدَائِعَ الَّتِي كَانَتْ عِنْدَهُ لِلنَّاسِ. [هق ٢٨٩/٦]

**لە عائیشەوە: دەربارەی کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) وتی: فەرمانی کرد–مەبەستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو– بە عەلی(خوا لێی رازی بێت) لە مەککە لە جێگەی ئەو بمێنێتەوە تا لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەو سپاردانە کە لە لای بوون بۆ خەڵك بگێڕێتەوە.**

## ١٦- دەروازەی: قەرز

**٣٠٩٢**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ قَالَ: اسْتَقْرَضَ مِنِّي النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَرْبَعِينَ أَلْفاً، فَجَاءَهُ مَالٌ فَدَفَعَهُ إِلَيَّ، وَقَالَ: (بَارَكَ اللهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ، إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ: الْحَمْدُ وَالْأَدَاءُ). [ن٤٦٩٧/ جه٢٤٢٤]

* حسن.

---

[1] الوديعة: بريتييە لە سپاردە، دانانی شتێك یان ماڵێك لای کەسێك بە مەبەستی هەڵگرتن و پاراستنی–و.

[2] واتە: گەر کەسێك شتێکی بە سپاردە لای کەسێك دانا و شتەکە تیاچوو دەستەبەرکردن لەسەر ئەو کەسە نییە شتەکەی لا دانراوە، چونکە خاوەن شتەکە ئازادانە و بە بڕیاری خۆی شتەکەی لای ئەو داناوە–و.

لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی رەبیعەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) چل هەزاری لێ قەرز کردم، ماڵێکی بۆ هات و بۆی گێڕامەوە و فەرمووی: **(خودا بەرەکەت بخاتە ناو خانەوادە و ماڵ و سامانەکەت، پاداشتی قەرز: حەمد[1] و گێڕانەوەیە)**.

**٣٠٩٣**– عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ: أَنَّ مَيْمُونَةَ . زَوْجَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم . اسْتَدَانَتْ، فَقِيلَ لَهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، تَسْتَدِينِينَ، وَلَيْسَ عِنْدَكِ وَفَاءٌ؟ قَالَتْ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(مَنْ أَخَذَ دَيْناً وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يُؤَدِّيَهُ، أَعَانَهُ اللهُ عزّ وجل)**. [ن٤٧٠١]

* صحيح.

لە عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عوتبەوە: مەیموونە –هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)– داوای قەرزی کرد، پێی وترا: دایکی باوەڕداران، داوای قەرز دەکەی و شتێکت لا نییە بۆ گێڕانەوەی؟ وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس قەرزێك وەربگرێت و ئەو دەیویست بیگێڕێتەوە خودا(عز وجل) کۆمەکی دەکات)**.

## ١٧- دەروازەی: توندکردنەوە لە قەرز

**٣٠٩٤**– عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جَحْشٍ قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، ثُمَّ وَضَعَ رَاحَتَهُ عَلَى جَبْهَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: **(سُبْحَانَ اللهِ! مَاذَا نُزِّلَ مِنَ التَّشْدِيدِ)** ؟ فَسَكَتْنَا وَفَزِعْنَا. فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ، سَأَلْتُهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا هَذَا التَّشْدِيدُ الَّذِي نُزِّلَ؟ فَقَالَ: **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ رَجُلاً قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ أُحْيِيَ، ثُمَّ قُتِلَ، ثُمَّ أُحْيِيَ، ثُمَّ قُتِلَ، وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، مَا دَخَلَ الْجَنَّةَ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ دَيْنُهُ)**. [ن٤٦٩٨]

* حسن.

لە محەمەدی کوڕی جەحشەوە، وتی: لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتبووین سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، پاشان لەپی دەستی خۆی لەسەر ناوچاوانی دانا،

[1] واتە: شوکر–و.

پاشان فەرمووی: **(سبحان الله، چی دابەزێنراوە لە توندکردنەوە؟)**، بێدەنگبووین و ترساین، کاتێ کەوتینە سبەینێ پرسیارم لێکرد: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەو توندکردنەوە کامەیە دابەزێنراوە؟ فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی منی لەدەستدایە، گەر پیاوێك لە ڕێگەی خودا بکوژرێت، پاشان زیندوو بکرێتەوە و پاشان بکوژرێت، پاشان زیندوو بکرێتەوە و پاشان بکوژرێت، و قەرزێکی لەسەر بێت ناچێتە بەهەشتەوە تا لە ئەوەوە قەرزەکە دەگێڕنەوە)**.

## ١٨- دەروازەی: بە باشی و جوانی داواکردنەوەی ماف

**٣٠٩٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ وَعَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ طَالَبَ حَقّاً فَلْيَطْلُبْهُ فِي عَفَافٍ، وَافٍ أَوْ غَيْرِ وَافٍ)**. [جه ٢٤٢١]

* صحيح.

**لە ئیبن عومەر و عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس حەقێکی داواکردەوە بە پاکی داوای بکاتەوە، تێر و تەواو وەریگرتەوە یان نا تێر و تەواو)**.

**٣٠٩٦-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: دَخَلَ نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْمَسْجِدَ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ مُلاَزِمٌ رَجُلاً، قَالَ: فَصَلَّى وَقَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ خَرَجَ فَإِذَا هُوَ مُلاَزِمُهُ، قَالَ: **(حَتَّى الآنَ يَا أُبَيُّ، حَتَّى الآنَ يَا أُبَيُّ، مَنْ طَلَبَ أَخَاهُ فَلْيَطْلُبْهُ بِعَفَافٍ وَافٍ أَوْ غَيْرِ وَافٍ)**. فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ تَرَكَهُ وَتَبِعَهُ، قَالَ: فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ قُلْتَ قَبْلُ: مَنْ طَلَبَ أَخَاهُ فَلْيَطْلُبْهُ بِعَفَافٍ وَافٍ أَوْ غَيْرِ وَافٍ، قَالَ: **(نَعَمْ)**، قَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ مَا الْعَفَافُ؟ قَالَ: **(غَيْرَ شَاتِمِهِ، وَلاَ مُتَشَدِّدٍ عَلَيْهِ، وَلاَ مُتَفَحِّشٍ عَلَيْهِ، وَلاَ مُؤْذِيهِ)**، قَالَ: وَافٍ أَوْ غَيْرِ وَافٍ؟ قَالَ: **(مُسْتَوْفٍ حَقَّهُ أَوْ تَارِكٍ بَعْضَهُ)**. [هق ٦/٥٣]

لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ناو مزگەوت و ئوبەی کوڕی کەعب بە پیاوێکەوە لکابوو، وتی: نوێژی کرد و پێویستییەکەی جێبەجێ کرد، پاشان ڕۆیشتە دەرەوە و ئەو هەر پێیەوە لکابوو، پێغەمبەر فەرمووی: **(هەتا ئێستا، ئەی ئوبەی، هەتا ئێستا ئەی ئوبەی، هەر کەس داوای لە براکەی کرد بە پاکی داوای بکاتەوە،**

**"واف أو غير واف—تێر و تەواو وەریبگرێتەوە یان نا تێر و تەواو")**، پرسی: "واف أو غير واف" یانی چی؟ فەرمووی: **(مافەکەی وەریبگرێتەوە یان هەندێکی وازلێبهێنێت)**.

## ١٩- دەروازەی: دەسەڵاتێك بۆ خاوەن ماف هەیە

**٣٠٩٧-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَتَقَاضَاهُ دَيْناً كَانَ عَلَيْهِ، فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ حَتَّى قَالَ لَهُ: أُحَرِّجُ عَلَيْكَ إِلاَّ قَضَيْتَنِي، فَانْتَهَرَهُ أَصْحَابُهُ، وَقَالُوا: وَيْحَكَ! تَدْرِي مَنْ تُكَلِّمُ؟ قَالَ: إِنِّي أَطْلُبُ حَقِّي، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(هَلاَّ مَعَ صَاحِبِ الْحَقِّ كُنْتُمْ)** ؟ ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى خَوْلَةَ بِنْتِ قَيْسٍ، فَقَالَ لَهَا: **(إِنْ كَانَ عِنْدَكِ تَمْرٌ، فَأَقْرِضِينَا، حَتَّى يَأْتِيَنَا تَمْرُنَا، فَنَقْضِيَكِ)**، فَقَالَتْ: نَعَمْ، بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: فَأَقْرَضَتْهُ، فَقَضَى الْأَعْرَابِيَّ وَأَطْعَمَهُ، فَقَالَ: أَوْفَيْتَ، أَوْفَى اللهُ لَكَ، فَقَالَ: **(أُولَئِكَ خِيَارُ النَّاسِ، إِنَّهُ لاَ قُدِّسَتْ أُمَّةٌ لاَ يَأْخُذُ الضَّعِيفُ فِيهَا حَقَّهُ غَيْرَ مُتَعْتَعٍ)**. [جه٢٤٢٦]

* صحيح.

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: ئەعرابییەك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای قەرزێکی لێ کردەوە کە لەسەری بوو، ئەعرابییەکە لێی توند کردەوە تا پێی وت: گەر بۆم نەگێڕیتەوە تەنگەتاوت دەکەم، هاوەڵانی پێغەمبەر هەڕەشەیان لێکرد و وتیان: هاوار بە حاڵت، دەزانی لەگەڵ کێ قسە دەکەی؟ وتی: من مافی خۆم داوا دەکەمەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(بۆچی لەگەڵ خاوەن ماف نین[1]؟)**، پاشان ناردی بۆ لای خەولەی کچی قەیس و پێی فەرموو: **(گەر خورمات لە لایە بە قەرز پێمان بدە تا خورمای خۆمان[2] بۆ دێت بۆت دەگێڕینەوە)**، وتی: بەڵێ، باوکم فیدات بێت، ئەی پێغەمبەری خودا، وتی: خەولە قەرزەکەی پێدا و پێغەمبەر قەرزەکەی بۆ ئەعرابییەکە گێڕایەوە و خواردنی پێدا، ئەعرابییەکە وتی: وەفات بە قەرزەکەت کرد خودا

---

[1] واتە: شایستە بە ئێوە ئەوەیە لەگەڵ خاوەن ماف بن کە ئەعرابییەکەیە—و.

[2] لە خەیبەر و شوێنانی ترەوە بۆی بێت—و.

پاداشتت بداتەوە، پێغەمبەر فەرمووی: **(ئەوانە هەڵبژاردەی ناو خەڵکن[1]، ئوممەتێك پاك و پاکژ نابێت تیایدا لاواز بێ تەنگەتاوکردن مافی خۆی وەرنەگرێتەوە[2])**.

## ٢٠- دەروازەی: داگرتن لە قەرز بەرانبەر خێرا کردنی

**٣٠٩٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ يَكُونُ لَهُ الدَّيْنُ عَلَى الرَّجُلِ إِلَى أَجَلٍ، فَيَضَعُ عَنْهُ صَاحِبُ الْحَقِّ، وَيُعَجِّلُهُ الْآخَرُ، فَكَرِهَ ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَنَهَى عَنْهُ.

* إسناده صحيح. [ط١٣٧٧]

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: ئەو پرسیاری پیاوێکی لێکرا قەرزێکی لەسەر پیاوێك هەیە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، خاوەن مافەکە هەندێ لە قەرزەکەی لەسەر دادەگرێت و ئەویش گێڕانەوەی قەرزەکە خێرا دەکات، عەبدوڵای کوڕی عومەر ئەوەی لا ناپەسەند بوو و نەهی لێکرد.**

[1] واتە: ئەوانەی وەفا بە دانەوەی قەرز دەکەن باشترینی خەڵکن-و.

[2] واتە: ئەو ئوممەتەی تیایدا مافی لاواز پێشێل دەکرێ و کەسی لاواز تەنگەتاو دەکرێ و پێدانەوەی قەرزی دوادەخرێ ئوممەتێکی پاك و پاکژ نییە-و.

## ١- دەروازەی: فەزڵی چاندن و ناشتن

**٣٠٩٩-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(ما مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْساً، أَوْ يَزْرَعُ زَرْعاً، فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ، أَوْ إِنْسانٌ، أَوْ بَهِيمَةٌ؛ إِلاَّ كانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ).**
[خ٢٣٢٠/ م١٥٥٣]

(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر موسڵمانێك دارێك بنێژێت، یا كشتوكاڵێك بچێنێت، باڵندەیەك، یان مرۆڤێك، یان گیاندارێك لێی بخوات بەوە صەدەقە بۆ ئەو هەیە).**

**٣١٠٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنْ قَامَتْ عَلَى أَحَدِكُمُ الْقِيَامَةُ، وَفِي يَدِهِ فَسِيلَةٌ؛ فَلْيَغْرِسْهَا).** [حم١٢٩٠٢]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر قیامەت لەسەر یەكێك لە ئێوە بەرپا بوو و لە دەستیدا نەمامێك هەبوو با بینێژێت).**

## ٢- دەروازەی: كشتوكاڵ بە نیوە و هاوشێوەی ئەوە

**٣١٠١-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عامَلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ ما يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ، فَكانَ يُعْطِي أَزْوَاجَهُ مِائَةَ وَسْقٍ: ثَمَانُونَ وَسْقَ تَمْرٍ، وَعِشْرُونَ وَسْقَ شَعِيرٍ. فَقَسَمَ عُمَرُ خَيْبَرَ، فَخَيَّرَ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يُقْطِعَ لَهُنَّ مِنَ الماءِ وَالأَرْضِ، أَوْ يُمْضِيَ لَهُنَّ، فَمِنْهُنَّ مَنِ اخْتَارَ الأَرْضَ، وَمِنْهُنَّ مَنِ اخْتَارَ الْوَسْقَ، وَكانَتْ عائِشَةُ اخْتَارَتِ الأَرْضَ. [خ٢٣٢٨ (٢٢٨٥)/ م١٥٥١]

(ق) لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) خەیبەری بە نیوەی ئەوەی بەرهەم دێت لە خورما یان كشتوكاڵ مامەڵە كرد، سەد "وَسْق"ی

**دەدا بە ژنەکانی: هەشتا "وَسْق" خورما و بیست "وَسْق" جۆ، عومەر خەیبەری دابەش کرد، ژنەکانی پێغەمبەری(ﷺ) سەرپشك کرد ئاو و زەوییان بۆ جیابکاتەوە، یان بەو جۆرەی هەبووە لەسەری بڕۆن، هەیانبوو زەوی هەڵبژارد و هەیانبوو "الوسْق"ی هەڵبژارد، عائیشە زەوی هەڵبژارد.**

- وفي رواية لهما: عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رضي الله عنهما أَجْلَى الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ أَرْضِ الحِجَازِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، لَمَّا ظَهَرَ عَلَى خَيْبَرَ، أَرَادَ إِخْرَاجَ الْيَهُودِ مِنْهَا، وَكَانَتِ الأَرْضُ حِينَ ظَهَرَ عَلَيْهَا للهِ وَلِرَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم وَلِلْمُسْلِمِينَ، وَأَرَادَ إِخْرَاجَ الْيَهُودِ مِنْهَا، فَسَأَلَتِ الْيَهُودُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِيُقِرَّهُمْ بِهَا أَنْ يَكْفُوا عَمَلَهَا، وَلَهُمْ نِصْفُ الثَّمَرِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**نُقِرُّكُمْ بِهَا عَلَى ذَلِكَ ما شِئْنا**). فَقَرُّوا بِهَا حَتَّى أَجْلاَهُمْ عُمَرُ إِلَى تَيْماءَ وَأَرِيحَاءَ. [خ٢٣٣٨]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: لە ئیبن عومەرەوە: عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) یەهوود و نەصارای لە زەوی حیجاز راگوێزا، کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرکەوت بەسەر خەیبەردا ویستی یەهوودی لێ دەربکات، کاتێ سەرکەوت بەسەریدا زەوییەکە بۆ خودا و پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان بوو و ویستی یەهوودی لێ دەربکات، یەهوود داوایان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد بیانهێڵێتەوە و کاری بۆ بکەن و نیوەی خورماکە بۆ ئەوان بێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموون: (چەند بمانەوێ لەسەر ئەوە دەتانهێڵینەوە)، ئەوان تیایدا مانەوە تا عومەر راگوێزی کردن بۆ "تَيْماء و أريحاء".**

**٣١٠٢**– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: لَمَّا افْتَتَحَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَيْبَرَ، أَعْطَاهَا عَلَى النِّصْفِ. [جه٢٤٦٩]

* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەیبەری فەتح کرد لەسەر نیوە پێیدانەوە.**

## ٣- دەروازەی: کرێی زەوی

**٣١٠٣-** (ق) عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا أَكْثَرَ الأَنْصَارِ حَقْلاً، فَكُنَّا نُكْرِي الأَرْضَ، فَرُبَّمَا أَخْرَجَتْ هذِهِ وَلَمْ تُخْرِجْ ذِهِ، فَنُهِينَا عَنْ ذلِكَ، وَلَمْ نُنْهَ عَنِ الْوَرِقِ.

[خ٢٧٢٢ (٢٢٨٦)/ م١٥٤٧/ ١١٧]

**(ق) لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ئێمە لە ئەنصاردا زۆرترین کێڵگەمان هەبوو، زەویمان بە کرێ دەدا، لەوانەیە ئەم بەشە لە زەوییەکە بەری بدایا و ئەویتر بەری نەدایا، بۆیە لەو کارە نەهیمان لێکرا، بەڵام بە پارەی زیو نەهیمان لێ نەکرا[1].**

- ولفظ مسلم: كُنَّا نُكْرِي الأَرْضَ، عَلَى أَنَّ لَنَا هَذِهِ، وَلَهُمْ هَذِهِ...

**لەفزەکەی موسلیم: زەویمان بە کرێ دەدا، لەسەر ئەوەی ئەمە بۆ ئێمە بێت و ئەوەش بۆ ئەوان بێت..**

- وفي رواية لمسلم: أَمَّا بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ فَلاَ بَأْسَ بِهِ. وقال: إِنَّمَا كَانَ النَّاسُ يُؤَاجِرُونَ، عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، عَلَى الْمَاذِيَانَاتِ، وَأَقْبَالِ الْجَدَاوِلِ، وَأَشْيَاءَ مِنَ الزَّرْعِ، فَيَهْلِكُ هَذَا وَيَسْلَمُ هَذَا، وَيَسْلَمُ هَذَا وَيَهْلِكُ هَذَا. فَلَمْ يَكُنْ لِلنَّاسِ كِرَاءٌ إِلاَّ هَذَا، فَلِذَلِكَ زُجِرَ عَنْهُ، فَأَمَّا شَيْءٌ مَعْلُومٌ مَضْمُونٌ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ.

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا: بەڵام بە زێڕ و زیو خراپی تێدا نییە، هەروەها وتی: خەڵکی لە سەردەمی پێغەمبەری(ﷺ) لەسەر رووباوی قەراغ چەم و سەرەتای جۆگەلە و شتانێك لە کشتوکاڵ ئیجارەیان دەکرد، ئەمەیان تیادەچوو و ئەوەیان سەلامەت دەبوو، یان ئەمەیان سەلامەت دەبوو و ئەوەیان تیادەچوو، خەڵکیش تەنها ئەو کرێیەیان هەبوو، بۆیە نەهی لێکرا، وەلێ شتێکی زانراوی دەستەبەرکراو خراپییەکی تێدا نییە.**

---

[1] **واتە: بە کرێدانی بە پارەی زیو نەهیمان لێنەکرا-و.**

## ٤- دەروازەی: پێدانی زەوی

٣١٠٤- (ق) عَنْ جابِرٍ ﷺ قَالَ: كانَتْ لِرِجالٍ مِنَّا فُضُولُ أَرَضِينَ، فَقَالُوا: نُؤَاجِرُهَا بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ وَالنِّصْفِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ كانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ لِيَمْنَحْهَا أَخاهُ، فَإِنْ أَبَى، فَلْيُمْسِكْ أَرْضَهُ**). [خ٢٦٣٢ (٢٣٤٠)/ م١٥٣٦/(٨٩)]

(ق) لە جابرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پیاوانێك لە ئێمە دوو زەوی زیاتریان هەبوو، وتیان: بە سێیەك، یان چارەك، یان نیوە دەیدەین بە ئیجار، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**هەر كەس زەوییەکی هەیە با بیچێنێت، یان با بیدات بە براکەی، گەر نەیویست بیدات با زەوییەکەی خۆی لەدەستدا بێت**).

٣١٠٥- (ق) عن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ إِلَى أَرْضٍ تَهْتَزُّ زَرْعاً، فَقَالَ: (لِمَنْ هذِهِ) ؟ فَقَالُوا: اكْتَرَاهَا فُلاَنٌ، فَقَالَ: (**أَمَا إِنَّهُ لَوْ مَنَحَهَا إِيَّاهُ، كانَ خَيْراً لَهُ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا أَجْراً مَعْلُوماً**). [خ٢٦٣٤ (٢٣٣٠)/ م١٥٥٠ (١٢١)]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) رۆیشت بۆ زەوییەك بە كشتوكاڵ دەشەكایەوە، فەرمووی: (**ئەمە هی كێیە؟**)، وتیان: فڵان بە كرێی گرتووە، فەرمووی: (**بەڵام گەر پێیبدایا بۆ ئەو باشتر بوو لەوەی لەسەر كرێیەکی زانراو وەربگرێت**).

## ٥- دەروازەی: كرێی كرێكار

٣١٠٦- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**قَالَ اللهُ: ثَلاَثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرّاً فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيراً فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُعْطِ أَجْرَهُ**). [خ٢٢٢٧]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**خودا فەرمووی: سێ كەس لە رۆژی قیامەت من نەیاریانم: پیاوێك بە ناوی من پەیمان**

**دەدات و پاشان غەدر دەکات، پیاوێك مرۆڤێکی ئازاد دەفرۆشێت و نرخەکەی دەخوات، پیاوێکیش کرێکارێك دەگرێت و باش دەیڕەتێنێ و کرێکەی پێ نادات).**

**٣١٠٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَعْطُوا الْأَجِيرَ أَجْرَهُ قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُهُ**). [جه٢٤٤٣]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەرلەوەی ئارەقەی کرێکار وشك ببێتەوە کرێکەی پێ بدەن).**

## ٦- دەروازەی: کرێی جووتبوونی نێرەی ئاژەڵان

**٣١٠٨-** (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ. [خ٢٢٨٤]

**(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لە کرێی جووتبوونی نێرەی ئاژەڵان.**

**٣١٠٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ كِلاَبٍ، سَأَلَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ، فَنَهَاهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نُطْرِقُ الْفَحْلَ فَنُكْرَمُ، فَرَخَّصَ لَهُ فِي الْكَرَامَةِ.

* صحيح. [ت١٢٧٤/ ن٤٦٨٦]

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پیاوێك لە کیلاب پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد دەربارەی وەرگرتنی کرێی جووتبوونی ئاژەڵان، پێغەمبەر نەهی لێکرد، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە نێرەی ئاژەڵانمان لێ دەخوازرێت و بەخششمان پێ دەدرێت، پێغەمبەر لەسەر بەخشش پێدان مۆڵەتی دا.**

## ٧- دەروازەی: ئاوی زیادە ڕێگری لێ ناکرێت

**٣١١٠**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ تَمْنَعُوا فَضْلَ الْمَاءِ لِتَمْنَعُوا بِهِ فَضْلَ الْكَلإِ**). [خ٢٣٥٤ (٢٣٥٣)/ م١٥٦٦]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ڕێگری مەکەن لە ئاوی زیادە تا بەوە لەوەڕگای زیاد ڕێگری لێ بکەن[(١)]).**

## ٨- دەروازەی: گرتنەوەی ئاو

**٣١١١**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، خاصَمَ الزُّبَيْرَ عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم في شِرَاجِ الحَرَّةِ، الَّتِي يَسْقُونَ بِهَا النَّخْلَ، فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ المَاءَ يَمُرُّ، فَأَبَى عَلَيْهِ، فَاخْتَصَمَا عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِلزُّبَيْرِ: (**اسْقِ يَا زُبَيْرُ! ثُمَّ أَرْسِلِ المَاءَ إِلَى جارِكَ**). فَغَضِبَ الأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ؟ فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ قَالَ: (**اسْقِ يَا زُبَيْرُ! ثُمَّ احْبِسِ المَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الجَدْرِ**). فَقَالَ الزُّبَيْرُ: وَاللهِ! إِنِّي لأَحْسِبُ هذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذلِكَ: ﴿**فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ**﴾ [النساء:٦٥]. [خ٢٣٥٩/ م٢٣٥٧]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی زوبەیرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پیاوێك لە ئەنصار لای پێغەمبەر(ﷺ) شکاتی لە زوبەیر کرد دەربارەی جۆگەلە ئاوی "الحَرَّة" کە دارخورمایان پێ ئاو دەدا، ئەنصارییەکە وتی: ئاوەکە بەربدەوە با گوزەر بکات، زوبەیر نەیدەویست ئەوە بکات، لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵایان کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە زوبەیری فەرموو: (ئەی زوبەیر، ئاوی خۆت بدە و ئاوەکە بۆ جیرانەکەت**

---

(١) واتە: کەسێك ئاوی هەبێت ئاژەڵ ړووی لێ دەکات و هەندێ لەوەڕی دەوری ئاوەکە دەخۆن، پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لەوەی ئاوەکە ڕێگری لێ بکات لەبەر هێڵانەوەی لەوەڕگاکەی-و.

**بەریدەوە)**، ئەنصارییەکە تووڕە بوو و وتی: کوڕی پوورتە[1]؟ ڕوخساری پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوورهەڵگەڕا، پاشان فەرمووی: **(ئەی زوبەیر، ئاوی خۆت بدە و پاشان ئاوەکە بگرەوە تا دەگەڕێتەوە بۆ کۆما خۆڵی دارخورماکان)**، زوبەیر وتی: سوێند بە خودا، من وادادەنێم ئەم ئایەتە دەربارەی ئەوە دابەزی: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ [النساء:٦٥].

- وفي رواية للبخاري: فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ثُمَّ قَالَ: **(اسْقِ، ثُمَّ احْبِسْ حَتَّى يَبْلُغَ الجَدْرَ)**. فَاسْتَوْعى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حِينَئِذٍ حَقَّهُ لِلزُّبَيْرِ، وَكانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَبْلَ ذلِكَ أَشَارَ عَلَى الزُّبَيْرِ بِرَأْيٍ سَعَةٍ لَهُ وَلِلأَنْصَارِيِّ، فَلَمَّا أَحْفَظَ الأَنْصَارِيُّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم اسْتَوْعَى لِلزُّبَيْرِ حَقَّهُ في صَرِيحِ الحُكْمِ. [خ٢٧٠٨]

لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا: ڕوخساری پێغەمبەری خودا سوورهەڵگەڕا و پاشان فەرمووی: **(ئاوی درەختەکانت بدە و پاشان بیگرەوە تا دەگاتە کۆما خۆڵەکانی دەوری درەختەکان)**، ئەوکات پێغەمبەری خودا حەقی ئاوەکەی بە تێر و تەواوی دا بە زوبەیر، پێشتر پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاماژەی بە زوبەیر دا چاوپۆشی و لێبووردەیی هەبێت، کاتێ ئەنصارییەکە پێغەمبەری خودای(ﷺ) تووڕە کرد بە حوکمی ڕاشکاو مافی تێر و تەواوی بە زوبەیر دا.

- وفي رواية: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَقَدَّرَتِ الأَنْصَارُ وَالنَّاسُ قَوْلَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: **(اسْقِ، ثُمَّ احْبِسْ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الجَدْرِ)**. وَكانَ ذلِكَ إِلَى الْكَعْبَيْنِ. [خ٢٣٦٢]

لە ڕیوایەتێکی تری بوخاریدا ئیبن شیهاب دەڵێ: ئەنصار و خەڵکی ئەو فەرموودەی پێغەمبەریان(ﷺ): **(ئاوی درەختەکانت بدە و پاشان بیگرەوە تا دەگاتە کۆما خۆڵەکانی دەوری درەختەکان)** ئەوەش تا دوو قولاپێ بوو[2].

---

[1] واتە: کوڕی پوورتە بۆیە حوکمت کرد یەکەمجار ئەو ئاوی باخەکەی بدات ئەوجا بەریبداتەوە.

[2] واتە: گەر تا قولاپێ زەوییەکەی تەڕ کرد ئەوجا بەریبداتەوە بۆ جیرانەکەی–و.

## ٩- دەروازەی: هۆشداری لە سەرئەنجامی سەرقاڵبوون بە کشتوکاڵەوە

**٣١١٢**- (خ) عَنْ أَبِي أُمامَةَ الْبَاهِلِيِّ قالَ: وَرَأَى سِكَّةً وَشَيْئاً مِنَ آلَةِ الحَرْثِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**لاَ يَدْخُلُ هَذَا بَيْتَ قَوْمٍ؛ إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللهُ الذُّلَّ**). [خ٢٣٢١]

(خ) لە ئەبی ئومامەی باهیلییەوە، وتی: گاسنێك و شتێك لە ئامرازی کێڵانی بینی، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**ئەمە بچێتە ناو ماڵی هەر کۆمەڵێك خودا زەلیلی دەباتە ناوەوە**[1]).

**٣١١٣**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَتَّخِذُوا الضَّيْعَةَ، فَتَرْغَبُوا فِي الدُّنْيَا**). [ت٢٣٢٨]

* صحيح.

[وانظر: ٣٠٤٦].

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**بە باخ و بێستانەوە خەریك مەبن حەزتان لە دنیا بۆ دروست دەبێت**).

## ١٠- دەروازەی: سەگ ڕاگرتن بۆ کشتوکاڵ

**٣١١٤**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ أَمْسَكَ كَلْباً، فَإِنَّهُ يَنْقُصُ كُلَّ يَوْمٍ مِنْ عَمَلِهِ قِيرَاطٌ؛ إِلاَّ كَلْبَ حَرْثٍ، أَوْ ماشِيَةٍ). [خ٢٣٢٢/ م١٥٧٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەر کەس سەگێك ڕابگرێت هەموو ڕۆژێ "قیراط"**[2]**"ێك لە کاری کەم دەبێتەوە، مەگەر سەگی کشتوکاڵ، یان سەگی ڕان**).

---

[1] مەبەست لە هەڕەشەکە سەرقاڵبوونە بە دنیاوە و وازهێنان لە واجبە دینییەکان–و.

[2] واتە: بڕێکی دیاریکراو لە پاداشت لای خودا–و.

**٣١١٥-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(مَنِ اقْتَنَى كَلْباً؛ إِلاَّ كَلْباً ضَارِياً لِصَيْدٍ، أَوْ كَلْبَ ماشِيَةٍ، فَإِنَّهُ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ)**.
[خ٥٤٨١ (٥٤٨٠)/ م١٥٧٤]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس سەگێك رابگرێت-مەگەر سەگێکی درندە بێت بۆ راو، یان سەگی ڕان- هەرموو ڕۆژێك دوو "قیراط" لە پاداشتی کەم دەبێتەوە)**.

## ١١- دەروازەی: زیندووکردنەوەی زەوی مردوو

**٣١١٦-** (خ) عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ أَعْمَرَ أَرْضاً لَيْسَتْ لأَحَدٍ فَهْوَ أَحَقُّ)**.　[خ٢٣٣٥]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس زەوییەکی ئاوەدان کردەوە-زەوی هیچ کەس نەبوو- ئەو لەپێشترە پێی)**.

**٣١١٧-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ أَحْيَا أَرْضاً مَيْتَةً فَهِيَ لَهُ، وَلَيْسَ لِعِرْقٍ ظَالِمٍ حَقٌّ)**.　[د٣٠٧٣/ ت١٣٧٨]
* صحيح.

لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس زەوییەکی مردوو زیندوو بکاتەوە بۆ ئەوە، لە ناشتنی کەسی ستەمکار مافێك بوونی نییە)**.

## ١٢- دەروازەی: کەسێك بە پاڵ باخێك یان رانێکدا گوزەری کرد شتێکی لێ برد

**٣١١٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا أَتَيْتَ عَلَى رَاعٍ، فَنَادِهِ ثَلاَثَ مِرَارٍ، فَإِنْ أَجَابَكَ؛ وَإِلاَّ فَاشْرَبْ فِي غَيْرِ أَنْ تُفْسِدَ، وَإِذَا أَتَيْتَ عَلَى حَائِطِ بُسْتَانٍ، فَنَادِ صَاحِبَ الْبُسْتَانِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَإِنْ أَجَابَكَ؛ وَإِلاَّ فَكُلْ فِي أَنْ لاَ تُفْسِدَ)**.　[جه٢٣٠٠]
* صحيح.

لە ئەبی سەعیدەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر هاتی بۆ لای شوانێك سێ جار بانگی بکە، گەر وەڵامی دایەوە باشە، ئەگەر نە، شیر بخۆرەوە بەبێ ئەوەی تێکبدەی**[1]**، گەر هاتی بۆ لای باخ و بێستانێك سێ جار بانگ بکە لە خاوەنی باخەکە، گەر وەڵامی دایەوە باشە، ئەگەر نە، بخۆ بەبێ ئەوەی تێکبدەی)**.

## ١٣- دەروازەی: راگرتنی ئاژەڵ

**٣١١٩**- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لَهَا: (اتَّخِذِي غَنَماً، فَإِنَّ فِيهَا بَرَكَةً).

* صحيح.		[جه٢٣٠٤]

لە ئوم هانییەوە: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: **(مەڕ رابگرە، چونکە بەرەکەتێکی تێدایە)**.

## ١٤- دەروازەی: کەسابەتی کەڵەشاخ

**٣١٢٠**- عَنْ مُحَيِّصَةَ: أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي إِجَارَةِ الْحَجَّامِ، فَنَهَاهُ عَنْهَا، فَلَمْ يَزَلْ يَسْأَلُهُ وَيَسْتَأْذِنُهُ حَتَّى أَمَرَهُ: أَنِ اعْلِفْهُ نَاضِحَكَ وَرَقِيقَكَ.

* صحيح.		[د٣٤٢٢/ ت١٢٧٧/ جه٢١٦٦]

لە موحەییصەوە: ئەو داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد بۆ وەرگرتنی کرێ لەسەر کەڵەشاخ، پێغەمبەر نەهی کرد لێی، بەردەوام پرسیاری لێ دەکرد و داوای مۆڵەتی لێ دەکرد تا فەرمانی پێکرد: کرێکە بدە بە ئالفی حوشترەکەت و خواردنی کۆیلەکەت.

---

[1] واتە: بە بڕی پێویستی خۆت شیر بدۆشە و بیخۆرەوە، بێ ئەوەی زیان بە حەیوانەکە بگەیەنی –و.

**٣١٢١-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ كَسْبِ الْحَجَّامِ. [جه٢١٦٥]

* صحيح.

**لە ئەبی مەسعوود عوقبەی کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە کەسابەتی کەڵەشاخ.**

## ١- دەروازەی: کەمێك لە هەدیە و پێدان

**٣١٢٢-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لَوْ دعِيتُ إِلَى ذِرَاعٍ، أَوْ كُرَاعٍ، لأَجَبْتُ، وَلَوْ أُهْدِيَ إِلَيَّ ذِرَاعٌ أَوْ كُرَاعٌ لَقَبِلْتُ). [خ٢٥٦٨]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بانگهێش بکرێم بۆ دەستێك یان پێچکێك[1] وەڵام دەدەمەوە، گەر دەستێك یان پێچکێکم هەدیە کرابێت وەرمگرتووە).**

## ٢- دەروازەی: پاداشت لەسەر هەدیە

**٣١٢٣-** (خ) عَنْ عائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ، وَيُثِيبُ عَلَيْهَا. [خ٢٥٨٥]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هەدیەی قبووڵ دەکرد و لەسەری پاداشتی دەدایەوە.

## ٣- دەروازەی: ئەوەی لە هەدیە رەد ناکرێتەوە و ئەوەی رەد دەکرێتەوە

**٣١٢٤-** (خ) عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّهُ كان لاَ يَرُدُّ الطِّيبَ، وَزَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كانَ لاَ يَرُدُّ الطِّيبَ. [خ٥٩٢٩ (٢٥٨٢)]

[وانظر: ٣١٩٨]

(خ) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت): ئەنەس بۆنی خۆشی رەد نەدەکردەوە، پێیوابوو پێغەمبەر(ﷺ) بۆنی خۆشی رەد نەدەکردەوە.

---

[1] پێچك بریتییە لە ئێسکی دەست و قاچی ئاژەڵان-و.

## ٤- دەروازەی: بەڵێندان بە پێدان

**٣١٢٥-** (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَوْ قَدْ جاءَ مالُ الْبَحْرَيْنِ قَدْ أَعْطَيْتُكَ هَكَذَا وهَكَذَا وهَكَذَا**). فَلَمْ يَجِيءْ مالُ الْبَحْرَيْنِ حتَّى قُبِضَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَّا جاءَ مالُ الْبَحْرَيْنِ أَمَرَ أَبُو بَكْرٍ فَنَادَى: مَنْ كانَ لَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم عِدَةٌ، أَوْ دَيْنٌ فَلْيَأْتِنَا، فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: إِنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لِي كَذَا وَكَذَا، فَحَثَى لِي حَثْيَةً، فَعَدَدْتُهَا، فَإِذَا هِيَ خَمْسُمِائَةٍ، وَقَالَ: خُذْ مِثْلَيْهَا.

[خ٢٢٩٦/ م٢٣١٤]

(ق) لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ماڵ و سامانی بەحرەین بهاتبایە ئا بەو جۆرە و ئا بەو جۆرە و ئا بەو جۆرەم پێ دەدای)**، ماڵ و سامانی بەحرەین نەهات تا پێغەمبەر(ﷺ) گیانی سپارد، كاتێ ماڵ و سامانی بەحرەین هات ئەبوبەكر فەرمانی كرد و بانگی رادا: هەر كەس لای پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێنێك یان قەرزێكی هەیە با بێت بۆ لامان، هاتم بۆ لای و وتم: پێغەمبەر(ﷺ) ئاوا و ئاوای پێ فەرمووم، بە دوو مشت[1] بۆی پێوام، منیش ژماردم بینیم پێنجسەد دوو مشتە، ئەبوبەكر وتی: دوو ئەوەندەی تریش وەربگرە.

## ٥- دەروازەی: پێدان بە منداڵ

**٣١٢٦-** (ق) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ: أَنَّ أَبَاهُ أَتَى بِهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلاَماً، فَقَالَ: (**أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَ مِثْلَهُ**) ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: (**فَارْجِعْهُ**).

[خ٢٥٨٦/ م١٦٢٣]

---

(١) واتە: پڕ بە لەپی دوو دەستی-و.

(ق) لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە: باوکی ئەوی هێنا بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: من غوڵامێکم[1] بەم کوڕەی خۆم داوە، پێغەمبەر فەرمووی: **(ئایا هەموو کوڕەکانت وەك ئەم پێتداون؟)**، وتی: نەخێر، فەرمووی: **(کەوابوو بیگێڕەوە)**.

**٣١٢٧-** عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (اعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلاَدِكُمْ، اعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلاَدِكُمْ). [د٣٥٤٤/ ن٣٦٨٩]

* صحيح.

لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە نێوان منداڵەکانتان دادپەروەری ئەنجام بدەن، لە نێوان منداڵەکانتان دادپەروەری ئەنجام بدەن)**.

## ٦- دەروازەی: هەدیەی ئەو شتەی لەبەرکردنی لا ناپەسەندە

**٣١٢٨-** (ق) عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: أَهْدَى إِلَيَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم حُلَّةَ سِيَرَاءَ، فَلَبِسْتُهَا، فَرَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، فَشَقَقْتُهَا بَيْنَ نِسَائِي. [خ٢٦١٤/ م٢٠٧١]

(ق) لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) پۆشاکێکی "السِيَراء"[2]ی هەدیە کردم، منیش لەبەرم کرد، تووڕەیم لە روخساری بینی، منیش پارچە پارچەم کرد و لە نێوان ژنەکانم[3] دابەشم کرد.

- وفي رواية لمسلم: فَقَالَ: (إِنِّي لَمْ أَبْعَثْ بِهَا إِلَيْكَ، لِتَلْبَسَهَا. إِنَّمَا بَعَثْتُ بِهَا إِلَيْكَ، لِتُشَقِّقَهَا خُمُراً بَيْنَ النِّسَاءِ).

---

[1] واتە: بەندەیەك یان خزمەتكارێك.

[2] "السيراء" پۆشاكێكە داوی ئاورشمی تێدا بێت-و.

[3] رووالەتی وشەکە وا دەگەیەنێت زیاتر لە ژنێکی هەبووبێت، لە راستیدا لەو کاتەدا تەنها یەك ژنی هەبووە کە فاتیمە بووە، بۆیە مەبەست ئافرەتانی خزم و کەسوکاری عەلییە(خوا لێی رازی بێت)-و.

لە ریوایەتێکی موسلیمدا، فەرمووی: **(من بۆ ئەوە بۆم رەوانە نەکردی بیپۆشی، بەڵکو بۆ ئەوە بۆم رەوانە کردی وەك سەرپۆش پارچە پارچەی بکەی لە نێوان ژنەکان)**.

## ٧- دەروازەی: هەدیەی هاوەڵدانەران

**٣١٢٩-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ يَهُودِيَّةً أَتَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم بِشَاةٍ مَسْمُومَةٍ فَأَكَلَ مِنْهَا، فَجِيءَ بِهَا، فَقِيلَ: أَلاَ نَقْتُلُهَا؟ قَالَ: (لاَ). فَمَا زِلْتُ أَعْرِفُهَا فِي لَهَوَاتِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٢٦١٧/ م٢١٩٠]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت): ئافرەتێکی یەهوودی بە مەڕێکی ژەهراوییەوە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش لێی خوارد، ئافرەتەکە هێنرا، وترا: نەیکوژین؟ فەرمووی: (نەخێر)، بەردەوام لە زمانەبچکۆلەی پێغەمبەری خودادا(ﷺ) دەمناسییەوە[1].**

**٣١٣٠-** عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ قَالَ: أَهْدَيْتُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم نَاقَةً، فَقَالَ: (أَسْلَمْتَ) ؟ فَقُلْتُ: لاَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنِّي نُهِيتُ عَنْ زَبْدِ الْمُشْرِكِينَ).

* حسن صحيح. [د٣٠٥٧/ ت١٥٧٧]

**لە عیازی کوڕی حیمارەوە، وتی: حوشترێکی مێیەم هەدیەی پێغەمبەر(ﷺ) کرد، فەرمووی: (موسڵمان بوویت؟)، وتم: نەخێر، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من نەهیم لێکراوە لە هەدیەی هاوەڵدانەران[2]).**

---

[1] واتە: ئەسەری ژەهرەکەم دەبینی-و.

[2] ئەوە یەکلابووەتەوە پێغەمبەر(ﷺ) هەدیەی لە مقەوقیس گەورەی مصر و نەجاشی گەورەی حەبەشە وەرگرتووە، لێرەدا مەبەستی بووە کەسەکە هانبدات بۆ موسڵمان بوون، کەسەکە ناوی (عیاض بن حمار) بوو، برادەری سەردەمی پێش بوون بە پێغەمبەری پێغەمبەر بوو، زۆری پێخۆش بوو موسڵمان ببوایە، دواتر موسڵمان دەبێت-و.

## ٨- دەروازەی: حرام کردنی پەشیمانبوونەوە لە پێدان

**٣١٣١-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**العَائِدُ فِي هِبَتِهِ، كالْكَلْبِ يَقِيءُ، ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ**). [خ٢٥٨٩/ م١٦٢٢]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ئەو کەسەی لە پێدان و بەخشینی پەشیمان دەبێتەوە وەك سەگ وایە برشێتەوە و پاشان رشانەوەکەی بگێرێتەوە[1])**.

- وفي رواية للبخاري قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ، الَّذِي يَعُودُ فِي هِبَتِهِ، كالْكَلْبِ يَرْجِعُ فِي قَيْئِهِ**). [خ٢٦٢٢]

لە ریوایەتێکی بوخاریدا، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(نموونەی خراپ بۆ ئێمە نییە، ئەو کەسەی لە پێدانەکەی پەشیمان دەبێتەوە وەك سەگ وایە رشانەوەکەی بگێرێتەوە)**.

**٣١٣٢-** عَنْ عبد الله بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ يَرْجِعْ أَحَدُكُمْ فِي هِبَتِهِ؛ إِلاَّ الْوَالِدَ مِنْ وَلَدِهِ**). [ن٣٦٩١/جه٢٣٧٨]

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هیچ کام لە ئێوە لە پێدانی پەشیمان نەبێتەوە، مەگەر باوك لە کوڕ)**.

## ٩- دەروازەی: ئایا صەدەقەی خۆی دەکڕێتەوە

**٣١٣٣-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَوَجَدَهُ يُبَاعُ، فَأَرَادَ أَنْ يَبْتَاعَهُ، فَسأَلَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**لاَ تَبْتَعْهُ، وَلاَ تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ**). [خ٢٩٧١ (١٤٨٩)/ م١٦٢١]

---

[1] واتە: بخواتەوە–و.

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): عومەری کوڕی خەتاب لە ڕێگەی خودا ئەسپێکی بۆ کەسێك کڕی، بینی دەفرۆشرێت، بۆیە ویستی بیکڕێتەوە، پرسیاری لە پێغەمبەری خودا کرد، فەرمووی: **(مەیکڕەوە و لە صەدەقەکەت پەشیمان مەبەرەوە).**

## ١٠- دەروازەی: فەزڵی پێدان بۆ سوود لێ بینین

**٣١٣٤-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَرْبَعُونَ خَصْلَةً، أَعْلاَهُنَّ مَنِيحَةُ الْعَنْزِ، ما مِنْ عامِلٍ يَعْمَلُ بِخَصْلَةٍ مِنْهَا رَجاءَ ثَوَابِهَا، وَتَصْدِيقَ مَوْعُودِهَا؛ إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللهُ بِهَا الجَنَّةَ**). [خ٢٦٣١]

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(چل خەسڵەت[1]، بالاترینیان پێدانی بزنێك سوود لە شیرەکەی ببینرێت، هەر کارکەرێك بە یەکێك لەو خەسڵەتانە کار بکات وەك رجای پاداشت و بەڕاستزانینی بەڵێنپێدراوی، بەوە خودا دەیباتە بەهەشتەوە).**

## ١١- دەروازەی: خواستن بۆ بووك

**٣١٣٥-** (خ) عَنْ أَيْمَنَ الحَبَشِيِّ المَكِّيِّ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عائِشَةَ ﵂، وَعَلَيْهَا دِرْعُ قِطْرٍ، ثَمَنُ خَمْسَةِ دَرَاهِمَ، فَقَالَتِ: ارْفَعْ بَصَرَكَ إِلَى جارِيَتِي، انْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّهَا تُزْهى أَنْ تَلْبَسَهُ فِي الْبَيْتِ، وَقَدْ كانَ لِي مِنْهُنَّ دِرْعٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَمَا كانَتِ امْرَأَةٌ تُقَيَّنُ بِالمدِينَةِ؛ إِلاَّ أَرْسَلَتْ إِلَيَّ تَسْتَعِيرُهُ. [خ٢٦٢٨]

(خ) لە ئەیمەنی حەبەشی مەکییەوە، وتی: چوومە ژوورەوە بۆ لای عائیشە(خوا لێی رازی بێت) کراسێکی لۆکەی زبری لەبەربوو، نرخەکەی پێنج درهەم بوو، ئەو

---

[1] واتە: چل سیفەت یان چل کار هەن-و.

وتی: چاوت بەرزبکەرەوە بۆ لای جاریەکەم، تەماشای بکە، ئەو لوتبەرزی دەنوێنێ لە ماڵەوە بپۆشێت، لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) لەوە کراسێکم هەبوو هەر ئافرەتێك لە مەدینە خۆی بۆ مێردەکەی برازاندبایەوە کەسێکی دەنارد بۆ لام بۆ خواستنی.

## ١٢- دەروازەی: "العُمرى والرقبى[(١)]"

**٣١٣٦-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْعُمْرَى جائِزَةٌ**). [خ٢٦٢٦/ م١٦٢٦]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: ("العُمرى" دروستە).**

- وفي رواية لمسلم: (**مِيرَاثٌ لأَهْلِهَا**).

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا: (میراتێکە بۆ خانەوادەکەی).**

**٣١٣٧-** (ق) عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَضى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِالْعُمْرَى، أَنَّهَا لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ. [خ٢٦٢٥/ م١٦٢٥]

**(ق) لە جابرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) قەزاوەتی کرد بە "العُمرى" بەوەی بۆ ئەو کەسەیە پێیدراوە.**

- وفي رواية لمسلم: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَيُّمَا رَجُلٍ أُعْمِرَ عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ، فَإِنَّهَا لِلَّذِي أُعْطِيَهَا، لاَ تَرْجِعُ إِلَى الَّذِي أَعْطَاهَا، لأَنَّهُ أَعْطَى عَطَاءً وَقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ**).

---

(١) "العمرى" شتێك بە كەسێك بدرێت بەبێ هەدیە و خواستن بە تەمەن لە لای بێت و سوودی لێ ببینێت، بۆ نموونە: كەسێك بە كەسێك بڵێت: ئەم خانووەی من تیایدا بە تا من لە ژیاندام، "الرقبى" ئەوەیە بە كەسەكە بڵێ تۆ لەم خانووەی مندا بە، گەر تۆ بەر لە من مردی بۆم دەگەڕێتەوە، گەر من بەر لە تۆ مردم بۆ تۆیە—و.

له ریوایه‌تێكی موسلیمدا: پێغه‌مبه‌ری خودا(ﷺ) فه‌رمووی: **(هه‌ر پیاوێك "عُمرى"یه‌ك درا به‌ خۆی و ئه‌وانه‌ی به‌دوایدا دێن ئه‌وه‌ بۆ ئه‌و كه‌سه‌یه‌ پێیدراوه‌، ناگه‌ڕێته‌وه‌ بۆ ئه‌و كه‌سه‌ی داویه‌تی، چونكه‌ پێدانێكی ئه‌نجامداوه‌ میراتگریی تیادا هاتووه‌ته‌دی).**

## ١٣- ده‌روازه‌ی: پیاوێك هه‌دیه‌ ده‌دات بۆ كه‌سێك تكای بۆ كردووه‌

**٣١٣٨-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ شَفَعَ لِأَخِيهِ بِشَفَاعَةٍ، فَأَهْدَى لَهُ هَدِيَّةً عَلَيْهَا فَقَبِلَهَا، فَقَدْ أَتَى بَاباً عَظِيماً مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا**). [د٣٥٤١]

* حسن. وقال شعيب: منكر.

له‌ ئه‌بی ئومامه‌وه‌، له‌ پێغه‌مبه‌ره‌وه‌(ﷺ) فه‌رمووی: **(هه‌ر كه‌س تكاكارییه‌كی بۆ براكه‌ی كرد و له‌سه‌ری هه‌دیه‌یه‌كی پێدا و قبوولی كرد ئه‌وه‌ رووی له‌ ده‌روازه‌یه‌كی گه‌وره‌ له‌ ده‌روازه‌كانی سووخۆری كردووه‌).**

## ١٤- ده‌روازه‌ی: هاندان بۆ هه‌دیه‌كردنی یه‌كتر

**٣١٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**تَهَادَوْا تَحَابُّوا**). [هق٦/١٦٩]

* قال في «المقاصد: حسن».

له‌ ئه‌بی هوره‌یره‌وه‌، له‌ پێغه‌مبه‌ره‌وه‌(ﷺ) فه‌رمووی: **(هه‌دیه‌ی یه‌كتر بكه‌ن و یه‌كترتان خۆشبوێت[1]).**

## ١٥- ده‌روازه‌ی: هه‌ر كه‌س دۆزراوه‌یه‌كی بینییه‌وه‌ با بانگی بۆ بدێرێت

**٣١٤٠-** (ق) عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ قَالَ: كُنْتُ مَعَ سَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ وَزَيْدِ بْنِ صُوحَانَ فِي غَزَاةٍ، فَوَجَدْتُ سَوْطاً، فَقَالاَ لِي: أَلْقِهِ، قُلْتُ: لاَ، وَلكِنْ إِنْ وَجَدْتُ صَاحِبَهُ وَإِلاَّ اسْتَمْتَعْتُ بِهِ. فَلَمَّا رَجَعْنَا حَجَجْنَا، فَمَرَرْتُ بِالمَدِينَةِ، فَسَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ فَقَالَ: وَجَدْتُ صُرَّةً عَلَى عَهْدِ

[1] واته‌: هه‌دیه‌كردنه‌كه‌ ده‌بێته‌ سه‌رهه‌ڵدانی خۆشه‌ویستی له‌ نێوانتان–و.

النَّبِيّ صلّى الله عليه وسلّم فِيهَا مِائَةُ دِينَارٍ، فَأَتَيْتُ بِهَا النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: (**عَرِّفْهَا حَوْلاً**). فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، ثُمَّ أَتَيْتُ، فَقَالَ: (**عَرِّفْهَا حَوْلاً**). فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَقَالَ: (**عَرِّفْهَا حَوْلاً**). فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، ثُمَّ أَتَيْتُهُ الرَّابِعَةَ فَقَالَ: (**اعْرِفْ عِدَّتَهَا، وَوِكَاءَهَا، وَوِعَاءَهَا، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا، وَإِلاَّ اسْتَمْتِعْ بِهَا**). [خ٢٤٣٧ (٢٤٢٦)/ م١٧٢٣]

**(ق) لە سوەیدی کوڕی غەفەلەوە، وتی: لە غەزایەك لەگەڵ سەلمانی کوڕی رەبیعە و زەیدی کوڕی صوحان بووم، قەمچییەکم دۆزییەوە، پێیان وتم: فڕێی بدە، وتم: نەخێر، گەر خاوەنەکەیم دۆزییەوە باشە، ئەگەر نە، سوودی لێ دەبینم، کاتێ گەڕاینەوە حەجمان کرد، بە مەدینەدا تێپەڕیم، پرسیارم لە ئوبەی کوڕی کەعب(خوا لێی رازی بێت) کرد، ئەویش وتی: لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) کیسەیەکم دۆزییەوە سەد دیناری تێدا بوو، کیسەکەم هێنا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: (سالێك بانگی بۆ بدێرە)، سالێك بانگم بۆ دێرا، پاشان هاتم، و فەرمووی: (سالێك بانگی بۆ بدێرە)، سالێك بانگم بۆ دێرا و پاشان هاتم و فەرمووی: (سالێك بانگی بۆ بدێرە)، منیش سالێك بانگم بۆ دێرا و پاشان لە چوارەمین ساڵدا هاتم بۆ لای و فەرمووی: (ژمارەکەی و پەتی کیسەکە و کیسەکەی بناسێنە گەر خاوەنەکەی هات باشە، ئەگەر نە سوودی لێ ببینە).**

## ١٦- دەروازەی: حوشتر و مەڕ و بزنی بزربوو

**٣١٤١-** (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ خالِدٍ ﷺ قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَسَأَلَهُ عَنِ اللُّقَطَةِ؟ فَقَالَ: (**اعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جاءَ صَاحِبُهَا؛ وَإِلاَّ فَشَأْنَكَ بِهَا**).

قَالَ: فَضَالَّةُ الْغَنَمِ؟ قَالَ: (**هِيَ لَكَ، أَوْ لأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ**).

قَالَ: فَضَالَّةُ الإِبِلِ؟ قَالَ: (**ما لَكَ وَلَهَا، مَعَهَا سِقَاؤُهَا وَحِذَاؤُهَا، تَرِدُ المَاءَ، وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا**). [خ٢٣٧٢ (٩١)/ م١٧٢٢]

(ق) لە زەیدی کوڕی خالیدەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری دۆزراوەی لێکرد؟ فەرمووی: **(کیسەکە و پەتی کیسەکەی بناسێنە، پاشان ساڵێك بیناسێنە، گەر خاوەنەکەی هات باشە، ئەگەر نە، ئەوە بۆ تۆیە)**.

وتی: ئەی مەڕ و بزنی بزر بوو؟ فەرمووی: **(ئەوە بۆ تۆیە، یان بۆ براکەت، یان بۆ گورگە)**.

وتی: ئەی حوشتری بزر بوو؟ فەرمووی: **(چیتداوە لەوە، ئاو و پێڵاوی خۆی پێیە، خۆی دەچێتە سەر ئاو و ڕووەك دەخوات تا خاوەنەکەی پێی دەگاتەوە)**.

## ١٧- دەروازەی: دۆزراوەی حەرەم

**٣١٤٢-** (م) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنْ لُقَطَةِ الْحَاجِّ. [م١٧٢٤]

**(م) لە عبدالرحمانی کوڕی عوسمانی تەیمییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە هەڵگرتنی دۆزراوەی حاجی.**

- زاد عند أبي داود: قَالَ أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ: قَالَ ابْنُ وَهْبٍ: يَعْنِي فِي لُقَطَةِ الْحَاجِّ، يَتْرُكُهَا حَتَّى يَجِدَهَا صَاحِبُهَا. [د١٧١٩]

[وانظر: **٢٠٤٥**].

**لای ئەبی داود ئەمە زیاد بووە: ئەحمەدی کوڕی صالح دەڵێت: ئیبن وەهب دەڵێت: مەبەست لە دۆزراوەی حاجی ئەوەیە وازیلێدەهێنێت تا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە.**

## ١٨- دەروازەی: دۆزینەوەی شتی کەمبایەخ

**٣١٤٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: رَخَّصَ لَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْعَصَا وَالسَّوْطِ وَالْحَبْلِ وَأَشْبَاهِهِ، يَلْتَقِطُهُ الرَّجُلُ يَنْتَفِعُ بِهِ. [د١٧١٧]

* ضعيف.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لـە دارعەسـا و قەمچـی و هاوشێوەکانیان مۆڵەتیدان، پیاو دەیاندۆزێتەوە و سوودیان لێ دەبینێت.**

## ١٩- دەروازەی: هۆشداریدان لە بردنی دۆزراوە

**٣١٤٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**ضَالَّةُ الْمُسْلِمِ حَرَقُ النَّارِ**). [جە٢٥٠٢]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی شیخیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فـەرمووی: (بزربـووی موسڵمان سوتانی ئاگر[1]).**

---

[1] واتە: گەر بزربووی موسڵمان بدۆزێتەوە و بیشارێتەوە و نەیناسێنێت و بانگی بۆ نـەکات و بیەوێت بۆ خۆی بێت هەڕەشەکەی سوتانی ئاگرە-و.

## ١- دەروازەی: ستەم تاریکی رۆژی قیامەتە

**٣١٤٥-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**اتَّقُوا الظُّلْمَ! فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. وَاتَّقُوا الشُّحَّ! فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، حَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ، وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ**). [م٢٥٧٨]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خۆتان لە ستەم بپارێزن، چونکە ستەم تاریکستانی رۆژی قیامەتە، خۆتان لە دەستنوقاویی و ژەنگ و ژاری دەروون بپارێزن، چونکە دەستنوقاویی و ژەنگ و ژاری دەروون ئەوانەی پێش ئێوەی تیابرد، هەڵینان بۆ سەر ئەوەی خوێنی یەکتر برِێژن و حەرامی یەکتر موباح بکەن).**

## ٢- دەروازەی: حەرام کردنی ستەم

[انظر الحديث القدسي (يا عبادي إني حرمت الظلم على نفسي]: **٣٠**.

وانظر في اليمين الغموس: **٢٣٠٦**.

وانظر المسلم أخو المسلم لا يظلمه: **٣٤٤٧**.

وانظر: **٣٤٩٧**].

## ٣- دەروازەی: هاندان بۆ گەردنی خۆ ئازاد کردن لە ستەمکاری و پێشێلکاری ماف

**٣١٤٦-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ كَانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ لأَحَدٍ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ شَيْءٍ، فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ الْيَوْمَ، قَبْلَ أَنْ لاَ يَكُونَ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ، إِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ**). [خ٢٤٤٩]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس پێشێلکارییەکی هەیە بەرانبەر کەسێك لە حەیا و نامووسی یان لە شتێك با ئەمڕۆ گەردنی خۆی لێ ئازاد بکات بەرلەوەی دینار و درهەمی نەبێت، گەر کاری چاکەی هەبێت بە ئەندازەی پێشێلکارییەکەی لێی دەبرێت، گەر چاکەی نەبێت لە خراپەی هاوەڵەکەی دەبرێت و دەخرێتە سەر شانی ئەو)**.

## ٤- دەروازەی: سزای ستەمکار

**٣١٤٧-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ اللهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ، حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ)**، قالَ: ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾ [هود: ١٠٢]. [خ٤٦٨٦/ م٢٥٨٣]

(ق) لە ئەبی موساوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا بۆ ستەمکار پەت شل دەکات تا گەر گرتی لە دەستی قوتار نابێت)**، وتی: پاشان ئەمەی خوێند: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾ [هود: ١٠٢].

## ٥- دەروازەی: دوعای کەسی مەزڵووم

**٣١٤٨-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم بَعَثَ مُعَاذاً إِلَى الْيَمَنِ، فَقَالَ: **(اتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ)**.

[خ٢٤٤٨ (١٣٩٥)/ م١٩]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) موعازی رەوانە کرد بۆ یەمەن و فەرمووی: **(لە دوعای کەسی مەزڵووم خۆت بپارێزە، چونکە لە نێوان ئەو دوعا و خودا پەردەیەك بوونی نییە)**.

## ٦- دەروازەی: هەر كەس لە زەویدا[(١)] شتێك لە ستەم ئەنجام بدات

**٣١٤٩-** (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَنْ ظَلَمَ مِنَ الأَرْضِ شَيْئاً طُوِّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ). [خ٢٤٥٢/ م١٦١٠]

(ق) لە سەعیدی كوڕی زەیدەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر كەس لە زەویدا شتێك لە ستەم ئەنجام بدات لە حەوت زەمینەكەوە بەو ستەمە ئابڵۆقە دەدرێت).**

**٣١٥٠-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عمر ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ أَخَذَ مِنَ الأَرْضِ شَيْئاً بِغَيْرِ حَقِّهِ، خُسِفَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى سَبْعِ أَرَضِينَ). [خ٢٤٥٤]

(خ) لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس لە زەوی و زاردا بە ناحەق شتێك ببات لە ڕۆژی قیامەت بە ناخی حەوت زەمینەكەدا دەچێت).**

## ٧- دەروازەی: سەرخستنی كەسی مەزڵووم

**٣١٥١-** (خ) عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِماً أَوْ مَظْلُوماً)**، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنْصُرُهُ إِذَا كَانَ مَظْلُوماً، أَفَرَأَيْتَ إِذَا كَانَ ظَالِماً كَيْفَ أَنْصُرُهُ؟ قَالَ: **(تَحْجُزُهُ - أَوْ تَمْنَعُهُ - مِنَ الظُّلْمِ، فَإِنَّ ذلِكَ نَصْرُهُ)**. [خ٦٩٥٢ (٢٤٤٣)]

(خ) لە ئەنەسەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(براكەت ستەمكار بێت یان ستەملێكراو سەریبخە)**، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر ستەملێكراو بوو سەریدەخەم، ئەی گەر ستەمكار بوو چۆن سەریبخەم؟ فەرمووی: **(بەریبگرە-یان ڕێگری لێ بكە- لە ستەم، ئەوە بریتییە لە سەرخستنی).**

---

(١) مەبەست داگیر كردنی زەوی و كێڵگەی خەڵكە-و.

▪ وفي رواية: (تَأْخُذُ فَوْقَ يَدَيْهِ). [خ٢٤٤٤]

لە ریوایەتێکی بوخاریدا: **(لەسەر دوو دەستییەوە دەستی بگرە)**.

## ٨- دەروازەی: "لا ضرر ولا ضِرار"[(١)]

**٣١٥٢**- عَنْ أَبِي صِرْمَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ ضَارَّ ضَارَّ اللهُ بِهِ، وَمَنْ شَاقَّ شَاقَّ اللهُ عَلَيْهِ). [د٣٦٣٥/ ت١٩٤٠/ جه٢٣٤٢]

* حسن.

لە ئەبی صیرمەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس زیانبگەیەنێ خودا زیانی پێ دەگەیەنێت، هەر کەس توندکردنەوە و گرانخوازی بکات خودا لەسەری توند و گران دەکات)**.

**٣١٥٣**- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَضَى أَنْ لاَ ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ. [جه٢٣٤٠]

* صحيح. وقال في (الزوائد): منقطع.

لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە: پێغەمبەری خودا بڕیاریدا: **"لا ضرر ولا ضرار"[(٢)]**

---

(١) واتە: نە زیان و نە زیان پێ گەیاندن لە تۆڵەی زیانگەیاندنەکەی، واتە: زیان بە هیچ کەس مەگەیەنن، گەر ئەوە رویدا لە تۆڵەی زیانەکە زیان بە کەسەکە مەگەیەنن، زیان بە زیان پاڵنانرێت، خۆت لە زیان گەیاندن بەدوور بگرە با خودا زیانت پێ نەگەیەنێت-و.

(٢) واتە: نە زیان و نە زیان پێ گەیاندن لە تۆڵەی زیانگەیاندنەکەی، واتە: زیان بە هیچ کەس مەگەیەنن، گەر ئەوە رویدا لە تۆڵەی زیانەکە زیان بە کەسەکە مەگەیەنن، زیان بە زیان پاڵنانرێت، خۆت لە زیان گەیاندن بەدوور بگرە با خودا زیانت پێ نەگەیەنێت-و.

## ١- دەروازەی: فەزڵی رزگار کردنی کۆیلە

**٣١٥٤-** (ق) عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْتَقَ امْرَأً مُسْلِمَاً، اسْتَنْقَذَ اللهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْواً مِنْهُ مِنَ النَّارِ**). [خ٢٥١٧/ م١٥٠٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خـوا لێـی رازی بێـت): پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: (**هـەر پیاوێك مرۆیەکی موسڵمان رزگار بکات خودا بە هەر ئەندامێك لە ئەو ئەندامێکی ئەو لە ئاگر رزگار دەکات**).

**٣١٥٥-** عَنْ عَائِشَةَ . زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم .: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم سُئِلَ عَنِ الرِّقَابِ أَيُّهَا أَفْضَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَغْلاَهَا ثَمَناً، وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا**). [ط١٥١٨]

* إسناده صحيح.

**لە عائیشەوە-هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری کۆیلەی لێکرا کامیـان باشـترینە؟ پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: (گرانترینیـان لـە رووی نرخەوە و بەنرخترینیان لای خاوەنەکەی).**

## ٢- دەروازەی: رزگار کردنی بەندەی هاوبەش

**٣١٥٦-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ أَعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فِي عَبْدٍ، فَكَانَ لَهُ مالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ، قُوِّمَ الْعَبْدُ عليهِ قِيمَةَ عَدْلٍ، فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ العبدُ، وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ**).

[خ٢٥٢٢ (٢٤٩١)/ م١٥٠١]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەر کەس بەشەکەی خۆی لە بەندەیەکی هاوبەشدا رزگار بکات و ماڵ و سامانێکی هەبوو و دەگەیشتە نرخی بەندەکە، بەندەکە بە بەهایەکی دادپەروەرانە**

**بەسەریدا دەشکێنرێتەوە و بەشی هاوبەشەکانی دەدا و بەندەکە لەسەر ئەو ئازا دەبێت، ئەگەر نە، ئەوەندەی لە ئەو رزگار کردووە کە رزگاری کردووە[1])**.

## ٣- دەروازەی: وەلا[2] بۆ ئەو کەسەیە رزگار دەکات

**٣١٥٧-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَرَادَتْ عَائِشَةُ أَنْ تَشْتَرِيَ جَارِيَةً تُعْتِقُهَا، فَأَبَى أَهْلُهَا إِلاَّ أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْوَلاَءُ، فَذَكَرَتْ ذلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. فَقَالَ: (**لاَ يَمْنَعُكِ ذلِكِ، فَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ**). [م١٥٠٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: عائیشە ویستی جاریەیەك بكڕێت و رزگاری بكات، ئەهلی جارییەكە رازی نەدەبوون مەگەر وەلای جاریەكە بۆ ئەوان بێت، عائیشە ئەوەی بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باس كرد، فەرمووی: (**چی رێگریت لێ دەكات لەوە، وەلا بۆ ئەو كەسەیە رزگار دەكات**).

## ٤- دەروازەی: فەزڵی ئەو کەسەی جاریەکەی ئەدەب دادەدا

**٣١٥٨-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**ثَلاَثَةٌ لَهُمْ أَجْرَانِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَآمَنَ بِمُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم. وَالْعَبْدُ الْمَمْلُوكُ إِذَا أَدَّى حَقَّ اللهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ. وَرَجُلٌ كَانَتْ عِنْدَهُ أَمَةٌ يَطَؤُهَا، فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا، وَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا فَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ**). [خ٩٧/ م١٥٤]

(ق) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**سیان دوو پاداشتیان بۆ هەیە: پیاوێك لە ئەهلی كیتاب، ئیمان بە پێغەمبەرەكەی خۆی و**

---

[1] واتە: گەر نە، بەشەكەی خۆی لە بەندەكەدا رزگار كردووە-و.

[2] وەلا بۆ كەسێكە بەندەكە رزگار دەكات، گەر ئەو بەندە بمرێ و ماڵ و سامانێكی هەبێت و میراتگری نەبێت میراتەكەی بۆ ئەو كەسەیە رزگاری كردووە، ئەمە گرنگی وەلادانەكەیە-و.

**ئیمان بە محەمەد(ﷺ) دەهێنێت، بەندەیەکی بە موڵککراو مانی خودا و مانی سەردارەکانی جێبەجێ دەکات، پیاوێك جاریەیەکی لە لایە دەچێتە لای و بە جوانترین ئەدەب ئەدەبی دادەدا، و بە جوانترین فێرکردن فێری دەکات، پاشان رزگاری دەکات و هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات، ئەوەش دوو پاداشتی بۆ هەیە).**

## ٥- دەروازەی: پاداشتی بەندە گەر عیبادەتەکەی باش ئەنجامدا و گوێڕایەڵی سەردارەکەی خۆی بوو

**٣١٥٩-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (الْعَبْدُ إِذَا نَصَحَ سَيِّدَهُ، وَأَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ، كانَ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ). [خ٢٥٤٦/ م١٦٦٤]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بەندە گوێڕایەڵی سەردارەکەی بێت و عیبادەتی پەروەردگاری بە باشی ئەنجام بدات دوو جار پاداشتی بۆ هەیە).**

## ٦- دەروازەی: خواردن و کاری بەندە

**٣١٦٠-** (ق) عَنِ المعْرُورِ بْنِ سُوَيْدٍ قَالَ: لَقِيتُ أَبَا ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ، وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ، وَعَلى غُلاَمِهِ حُلَّةٌ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: إِنِّي سَابَبْتُ رَجُلاً فَعَيَّرْتُهُ بِأُمِّهِ، فَقَالَ لِيَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (يَا أَبَا ذَرٍّ، أَعَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ؟ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ! إِخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ، جَعَلَهُمُ اللهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ، فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلاَ تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ). [خ٣٠/ م١٦٦١]

(ق) لە میعرووری کوڕی سوەیدەوە، وتی: لە رەبزە بە ئەبو زەڕ گەیشتم "حُلَّة[1]"یەکی لەبەر بوو، غوڵامەکەشی "حُلَّة"یەکی لەبەر بوو، لەو بارەوە پرسیارم

---

[1] جۆرە پۆشاکێکە-و.

لێکرد؟ وتی: من قسەم بە پیاوێك[1] وت و بە دایکی تانەم لێدا، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: **(ئەی ئەبا زەڕ، ئایا بە دایکی تانەی لێ دەدەی؟ تۆ مرۆیەکی نەفامییەکت تێدایە، براکانتان[2] خزمەتکاری ئێوەن، خودا ئەوانی خستووەتە ژێر دەستی ئێوە، هەرکەس براکەی لەژێر دەستی بوو با لەوەی دەیخوات خۆراکی پێ بدات و لەوەی دەیپۆشێ پێی بپۆشێ و داوایەکیان لێ نەکەن لە توانا بەدەربێت، گەر داواتان لێکردن کۆمەکیان بکەن)**.

**٣١٦١**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: **(لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ. وَلاَ يُكَلَّفُ مِنَ الْعَمَلِ؛ إِلاَّ مَا يُطِيقُ)**. [م١٦٦٢]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ئەو فەرمووی: **(بۆ "مملوك–بەموڵككراو" خواردن و خواردنەوە هەیە، تەنها ئەوەندە داوای کاری لێ دەکرێت لە توانایدایە)**.

## ٧- دەروازەی: کەفارەتی کەسێك لە بەندەکەی خۆی بدات

**٣١٦٢**- (م) عَنْ زَاذَانَ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ دَعَا بِغُلاَمٍ لَهُ، فَرَأَى بِظَهْرِهِ أَثَراً، فَقَالَ لَهُ: أَوْجَعْتُكَ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَأَنْتَ عَتِيقٌ.

قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ شَيْئاً مِنَ الأَرْضِ فَقَالَ: مَا لِي فِيهِ مِنَ الأَجْرِ مَا يَزِنُ هَذَا. إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(مَنْ ضَرَبَ غُلاَماً لَهُ، حَدّاً لَمْ يَأْتِهِ، أَوْ لَطَمَهُ، فَإِنَّ كَفَّارَتَهُ أَنْ يُعْتِقَهُ)**. [م١٦٥٧]

(م) لە "زاذان"ەوە: ئیبن عومەر غوڵامێکی خۆی بانگ کرد، بینی بە پشتییەوە ئەسەرێك هەیە، پێی وت: ئازارمدای؟ وتی: نەخێر، وتی: تۆ ئازادی.

---

[1] مەبەستی بیلالە(خوا لێی رازی بێت) وەك لە فەرموودەی تردا هاتووە–و.

[2] واتە: بەندەکان–و.

پاشان شتێ لە خاکی هەڵگرت و وتی: بە کێشی ئەمە پاداشتم لەوەدا نییە، مـن گـوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس لـە غـوڵامێکی خـۆی دا، لێـدانێك شایستەی دارلێدان نەبێت، یان زللەی لێدا، ئەوا کەفارەتەکەی ئەوەیە رزگاری بکات).**

## ٨- دەروازەی: نابێت بڵێت بەندەکەم یان کەنیزەکەکەم(عبدي وأمتي)

**٣١٦٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: **(لاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: أَطْعِمْ رَبَّكَ، وَضِّىءْ رَبَّكَ، اسْقِ رَبَّكَ، وَلْيَقُلْ: سَيِّدِي مَوْلاَيَ، وَلاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي أَمَتِي، وَلْيَقُلْ: فَتَايَ وَفَتَاتِي وَغُلاَمِي).** [خ٢٥٥٢/ م٢٢٤٩]

(ق) لـە ئـەبی هورەیرەوە(خـوا لێـی رازی بێـت)، لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ)، ئـەو فەرمووی: **(یەکێك لە ئێوە نەڵێت: خواردن بە "ربَّكَ-پەروەرێنت" بدە، دەستنوێژ بۆ پەروەرێنت ئامادە بکە، خواردنەوە بە پەروەرێنت بدە، با بڵێت: "سەردارم مەولام- سيدي مولاي"، یەکێك لە ئێوە نەڵێت: "بەندەکەم کەنیزەکەکەم-عبدي وأمتي" با بڵێت: کوڕە گەنجەکەم، و کچە گەنجەکەم، و غوڵامەکەم).**

## ١- دەروازەی: گوێڕایەڵی ئیمام لە شتانێکدا یاخیبوون نەبێت

٣١٦٤- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى المَرْءِ المُسْلِمِ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ). [خ٧١٤٤ (٢٩٥٥)/ م١٨٣٩]

(ق) لە عەبدولڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(بیستن و گوێڕایەڵی لەسەر مرۆی موسڵمان لەوەدا پێیخۆشە و پێیناخۆشە، گەر فەرمانی پێ نەکرابێت بە یاخیبوون، گەر فەرمانی پێکرا بە یاخیبوون نە بیستن هەیە نە گوێڕایەڵی).**

٣١٦٥- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ، وَمَنْ عصَانِي فَقَدْ عَصى اللهَ، وَمَنْ يُطِعِ الأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ الأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي، وَإِنَّمَا الإِمامُ جُنَّةٌ، يُقَاتَلُ مِنْ وَرَائِهِ وَيُتَّقَى بِهِ، فَإِنْ أَمَرَ بِتَقْوَى اللهِ وَعَدَلَ فَإِنَّ لَهُ بِذلِكَ أَجْراً، وَإِنْ قالَ بِغَيْرِهِ فَإِنَّ عَلَيْهِ مِنْهُ). [خ٢٩٥٧/ م١٨٣٥، ١٨٤١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس گوێڕایەڵیم بکات گوێڕایەڵی خودای کردووە، هەر کەس لێم یاخی ببێت لە خودا یاخی بووە، هەر کەس گوێڕایەڵی ئەمیر بکات گوێڕایەڵی منی کردووە، هەر کەس لە ئەمیر یاخی ببێت لە من یاخی بووە، ئیمام قەڵغانە، لە دواوەی جەنگان دەکرێت و بە ئەو خۆپارێزی دەکرێت، گەر فەرمانی کرد بە تەقوای خودا و دادپەروەری ئەنجام دا بەوە پاداشتی بۆ هەیە، گەر بە شتێکی تر فەرمانی کرد لەوەوە گوناهی لەسەر هەیە[1]).**

---

(١) واتە: ڕەعییەت بە گوناهی سوڵتان گوناهبار نابن، بە مەرجێ هەستابن بە ئەرکی سەر شانی خۆیان–و.

**٣١٦٦-** (ق) عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم سَرِيَّةً، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ، فَغَضبَ عَلَيْهِمْ، وَقَالَ: أَلَيْسَ قَدْ أَمَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ تُطِيعُونِي؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: قَدْ عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ لَمَا جَمَعْتُمْ حَطَباً وَأَوْقَدْتُمْ نَاراً، ثُمَّ دَخَلْتُمْ فِيهَا. فَجَمَعُوا حَطَباً، فَأَوْقَدُوا ناراً، فَلَمَّا هَمُّوا بِالدُّخُولِ، فَقَامُوا يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، قَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّمَا تَبِعْنَا النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فِرَاراً مِنَ النَّارِ، أَفَنَدْخُلُهَا؟ فَبَيْنَما هُمْ كَذلِكَ إِذْ خَمَدَتِ النَّارُ، وَسَكَنَ غَضَبُهُ، فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(لَوْ دَخَلُوهَا مَا خَرَجُوا مِنْهَا أَبَداً، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي المَعْرُوفِ)**. [خ٧١٤٥ (٤٣٤٠)/ م١٨٤٠]

**(ق) لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) سریەیەکی رەوانە کرد و بەسەریانەوە پیاوێك لە ئەنصاری کرد بە ئەمیر، فەرمانی پێکردن گوێڕایەڵی ئەو پیاوە بکەن، پیاوەکە لێیان تووڕە بوو و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی نەکردووە گوێڕایەڵم بن؟ وتیان: با، وتی: بڕیارم داوە دار کۆدەکەنەوە و ئاگر دەکەنەوە و پاشان دەچنە ناویەوە، ئەوانیش داریان کۆکردەوە و ئاگریان کردەوە، کاتێ ویستیان بچنە ناویەوە وەستان و هەندێکیان تەماشای هەندێکیان کرد، یەکێکیان وتی: ئێمە لە هەڵهاتن لە ئاگر شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتین، ئایا بچینە ناویەوە؟ کاتێ ئەوان لەوەدا بوون ئاگرەکە خامۆش بوو و پیاوەکە تووڕەییەکەی دامرکایەوە، ئەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرا فەرمووی: (گەر بچوونایەتە ناویەوە هەرگیز لێی نەدەهاتنە دەرەوە، گوێڕایەڵی لە مەعروفدایە).**

## ٢- دەروازەی: چاکبوونی ئومەت بە رێك و راستی ئیمامەکانییەتی

**٣١٦٧-** (خ) عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حازِمٍ قَالَ: دخَلَ أَبُو بكْرٍ عَلَى امْرَأَةٍ مِنْ أَحْمَسَ يُقَالُ لَهَا: زَيْنَبُ، فرَآهَا لاَ تَكَلَّمُ، فَقَالَ: ما لَهَا لاَ تَكَلَّمُ؟ قالُوا: حَجَّتْ مُصْمِتَةً، قالَ لَهَا: تَكَلَّمِي، فَإِنَّ هَذَا لاَ يَحِلُّ، هَذَا مِنْ عَمَلِ الجَاهِلِيَّةِ، فَتَكَلَمَتْ، فَقَالَتْ: مَنْ أَنْتَ؟ قالَ: امْرُؤٌ مِنَ المهَاجِرِينَ، قالَتْ: أَيُّ المهَاجِرِينَ؟ قالَ: مِنْ قُرَيْشٍ، قالَتْ: مِنْ أَيِّ قُرَيْشٍ أَنْتَ؟ قالَ: إِنَّكِ لَسَؤُولٌ، أَنَا أَبُو بَكْرٍ، قالَتْ: ما بَقَاؤُنَا عَلَى هَذَا الأَمْرِ الصَّالِحِ الَّذِي جاءَ اللهُ بِهِ بَعْدَ الجَاهِلِيَّةِ؟ قالَ: بَقَاؤُكُمْ

عَلَيْهِ مَا اسْتَقَامَتْ بِكُمْ أَئِمَّتُكُمْ، قالَتْ: وَما الأَئِمَّةُ؟ قالَ: أَمَا كانَ لِقَوْمِكِ رُؤُوسٌ وَأَشْرَافٌ، يَأْمُرُونَهُمْ فَيُطِيعُونَهُمْ؟ قَالَتْ: بَلَى، قالَ: فَهُمْ أُولئِكِ عَلَى النَّاسِ. [خ٣٨٣٤]

(خ) لە قەیسی کوڕی ئەبی حازمەوە، وتی: ئەبوبەکر ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای ئافرەتێك لە ئەحمەس پێی دەوترا: زەینەب، بینی قسە ناکات، ئەبوبەکر وتی: چییەتی قسە ناکات؟ وتی: بە بێدەنگی حەجی کردووە[1]، ئەبوبەکر پێی وت: قسە بکە، چونکە ئەوە حەڵاڵ نییە، ئەوە لە کاری سەردەمی نەفامییە، ژنەکە قسەی کرد و وتی: تۆ کێی؟ ئەبوبەکر وتی: پیاوێکم لە کۆچکەران، وتی: کام لە کۆچکەران؟ وتی: لە قورەیش، وتی: تۆ لە کام قورەیشی؟ ئەبوبەکر وتی: تۆ زۆر پرسیار دەکەی، من ئەبوبەکرم، ژنەکە وتی: مانەوەی ئێمە لەسەر ئەم کارە باشە کە خودا هێناویەتی لەدوای سەردەمی نەفامی تا کەیە؟ ئەبوبەکر وتی: مانەوەی ئێوە لەسەری تا ئەو کاتەیە ئیمامانتان ئێوە ڕێك و ڕاست ڕابگرن، وتی: ئیمامان چییە؟ ئەبوبەکر وتی: ئایا لە هۆزەکەت سەرکردە و شەریف بوونی نەبوو، فەرمانیان پێ دەکردن و ئێوە گوێڕایەڵیتان لێ دەکردن؟ وتی: با، ئەبوبەکر وتی: ئەوان بریتین لەوانە لەسەر خەڵك.

## ٣- دەروازەی: بەرپرسیارێتی ئیمام

**٣١٦٨**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أَلاَ كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فالإمامُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ وَهْوَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ وَهْوَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ على أَهْلِ بَيْتِ زَوْجِهَا وَوَلَدِهِ وَهِيَ مَسْؤُولَةٌ عَنْهُمْ، وَعَبْدُ الرَّجُلِ رَاعٍ عَلَى مالِ سَيِّدِهِ وَهْوَ مَسْؤُولٌ عَنْهُ، أَلاَ فَكُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ). [خ٧١٣٨ (٨٩٣)/ م١٨٢٩]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە (خوایان لێ ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: **(دەزانن ئێوە هەمووتان ئەمیندارن و هەریەکەتان بەرپرسیارە لە**

[1] واتە: لەسەر خۆی نەزر کردووە لە حەجدا قسە نەکات–و.

**ڕەعییەتەکەی خۆی، ئیمام کە لەسەر خەڵکییە ئەمینداره و بەرپرسیاره لە ڕەعییەتەکەی، پیاو لەناو خانەوادەکەی ئەمینداره و بەرپرسیاره لە ڕەعییەتەکەی، ئافرەت لە خانەوادەی مێردەکەی و منداڵەکەی ئەمینداره و بەرپرسیاره لێیان، بەندەی پیاو ئەمینداره بەسەر ماڵ و سامانی سەردارەکەیەوە و بەرپرسیاره لێی، دەزانن ئێوە هەمووتان ئەمیندارن، و هەریەکەتان بەرپرسیاره لە ڕەعییەتەکەی خۆی).**

**٣١٦٩-** (ق) عَنِ الحَسَنِ الْبَصْرِيِّ: أَنَّ عُبَيْدَ اللهِ بْنَ زِيَادٍ، عَادَ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَقَالَ لَهُ مَعْقِلٌ: إِنِّي مُحَدِّثُكَ حَدِيثاً سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللهُ رَعِيَّةً، فَلَمْ يَحُطْهَا بِنُصْحِهِ، إِلاَّ لَمْ يَجِدْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ**). [خ٧١٥٠/ م١٤٢، الإمارة: ١٤٢ (٢١، ٢٢)]

(ق) لە حەسەنی بەصرییەوە: عوبەیدوڵای کوڕی زیاد سەردانی مەعقیلی کوڕی یەساری کرد لەو نەخۆشییەی تیایدا مرد، مەعقیل پێی وت: من فەرموودەیەکت بۆ باس دەکەم لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر بەندەیەك خودا ڕەعییەتێك رادەستی بکات و بە نەصیحەت کردنیان و چاکە لەگەڵیان دەورەیان نەدا ئەو کەسە بۆنی بەهەشت ناکات).**

**٣١٧٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَا مِنْ أَمِيرِ عَشَرَةٍ؛ إِلاَّ يُؤْتَى بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، مَغْلُولَةٌ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ، أَطْلَقَهُ الْحَقُّ، أَوْ أَوْبَقَهُ**). [مي٢٥٥٧]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس ئەمیری دە کەس بێت لە ڕۆژی قیامەت دەهێنرێت، دەستی بە گەردنییەوە زنجیر کراوە، حەق ڕزگاری دەکات یان تیایدەبات).**

**٣١٧١-** عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ: أَنَّهُ قَالَ حِينَ قَدِمَ الْبَصْرَةَ: بَعَثَنِي إِلَيْكُمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، أُعَلِّمُكُمْ كِتَابَ رَبِّكُمْ، وَسُنَّتَكُمْ، وَأُنَظِّفُ طُرُقَكُمْ. [مي٥٧٩]

* إسناده صحيح.

لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە: ئەو کاتێك هات بۆ بەصرە وتی: عومەری کوڕی خەتاب منی ڕەوانە کردووە بۆ لای ئێوە، تا کتێبەکەی پەروەردگارتان و سوننەتەکانتان فێر بکەم و ڕێگاکانتان پاك بکەمەوە.

## ٤- دەروازەی: ئەمیران لە قورەیشن

**٣١٧٢-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ يَزَالُ هَذَا الأَمْرُ فِي قُرَيْشٍ ما بَقِيَ مِنْهُمْ اثْنَانِ)**. [خ٣٥٠١/ م١٨٢٠]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(بەردەوام ئەم کارە[1] لەناو قورەیشدا دەبێت تا دوانیان مابن)**.

## ٥- دەروازەی: ئامۆژگاری ئەمیران بە ئاسانکاری

**٣١٧٣-** (م) عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا بَعَثَ أَحَداً مِنْ أَصْحَابِهِ فِي بَعْضِ أَمْرِهِ، قَالَ: **(بَشِّرُوا وَلاَ تُنفِّرُوا، وَيَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا)**. [م١٧٣٢]

(م) لە ئەبی موساوە، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) یەکێك لە هاوەڵانی بۆ هەندێ لە کاروبار ڕەوانە بکردبایە دەیفەرموو: **(مژدەبدەن و خەڵك مەڕەوێنن، ئاسانکار بن و گرانخواز مەبن)**.

## ٦- دەروازەی: ئارامگرتن لەسەر ستەمی والییەکان و پابەندبوون بە جەماعەتەوە و هەڵنەوەشاندنەوەی بەیعەت

**٣١٧٤-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ كَرِهَ مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئاً فَلْيَصْبِرْ، فَإِنَّهُ مَنْ خَرَجَ مِنَ السُّلْطَانِ شِبْراً، مَاتَ مِيتَةً جاهِلِيَّةً)**. [خ٧٠٥٣/ م١٨٤٩]

---

[1] واتە: کاروباری خەلافەت و ئەمیری-و.

(ق) لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس شتێکی لە ئەمیرەکەی بە ناپەسەند بینی با ئارام بگرێت، چونکە هەر کەس بستێك لە سوڵتان دەربچێت بە مردنی نەفامی دەمرێت).**

**٣١٧٥-** (ق) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (سَتَكُونُ أَثَرَةٌ وَأُمُورٌ تُنْكِرُونَهَا)، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: (تُؤَدُّونَ الْحَقَّ الَّذِي عَلَيْكُمْ، وَتَسْأَلُونَ اللهَ الَّذِي لَكُمْ). [خ٣٦٠٣/ م١٨٤٣]

(ق) لە ئیبن مەسعوودەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(لە داهاتوو "أَثَرَة"[1] روودەدات، هەروەها کۆمەڵێك کاروبار کە بە ناپەسەندیان دەزانن)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، بە چی فەرمانمان پێ دەکەی؟ فەرمووی: **(ئەو حەقەی لەسەرتانە جێبەجێی دەکەن و ئەوەی مافی ئێوەیە لە خودای داوا دەکەن).**

**٣١٧٦-** (خ) عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ عَدِيٍّ قَالَ: أَتَيْنَا أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ مَا يَلْقَوْنَ مِنَ الحَجَّاجِ، فَقَالَ: (اصْبِرُوا، فَإِنَّهُ لاَ يَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ؛ إِلاَّ الَّذِي بَعْدَهُ شَرٌّ مِنْهُ، حَتَّى تَلْقَوْا رَبَّكُمْ)، سَمِعْتُهُ مِنْ نَبِيِّكُمْ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٧٠٦٨]

(خ) لە زوبەیری کوڕی عەدیەوە، وتی: هاتین بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالیك، سکاڵای خۆمان بردە لای لەوەی تووشیان دێت لە دەستی حەججاج، وتی: **(ئارام بگرن، چونکە هەر ڕۆژگارێکتان بەسەردا بێت ئەوەی دوای ئەو خراپترە لە ئەو، تا بە پەروەردگارتان دەگەن)**، من ئەمەم لە پێغەمبەرەکەتان(ﷺ) بیست.

**٣١٧٧-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ خَرَجَ مِنَ الطَّاعَةِ، وَفَارَقَ الْجَمَاعَةَ، فَمَاتَ، مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً. وَمَنْ قَاتَلَ تَحْتَ رَايَةٍ عُمِّيَّةٍ، يَغْضَبُ لِعَصَبَةٍ، أَوْ يَدْعُو إِلَى عَصَبَةٍ، أَوْ يَنْصُرُ عَصَبَةً، فَقُتِلَ، فَقِتْلَةٌ جَاهِلِيَّةٌ. وَمَنْ خَرَجَ عَلَى أُمَّتِي، يَضْرِبُ بَرَّهَا وَفَاجِرَهَا، وَلاَ يَتَحَاشَ مِنْ مُؤْمِنِهَا، وَلاَ يَفِي لِذِي عَهْدٍ عَهْدَهُ، فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ). [م١٨٤٨]

---

[1] واتە: کۆمەڵێك ئەمیر دێن جیاوازی دەکەن و کەسانی تر بەسەر ئێوە پێش دەخەن-و.

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، ئەو فەرمووی: **(هەر کەس لە تاعەت دەربچێت و لە جەماعەت جیاببێتەوە و مرد، بە مردنی نەفامی دەمرێت، هەر کەس لەژێر بەیداخێکی لێڵ و ناڕووندا بجەنگێ، بۆ دەمارگیرییەك توڕە ببێت، یان بانگ بۆ دەمارگیرییەك بکات، یان دەمارگیرییەك سەربخات، و بکوژرێت، ئەوە کوژرانێکی نەفامییە، هەر کەس لە ئومەتەکەم دەربچێت و لە چاك و خراپی ئومەتەکەم بدات و باکێکی نەبێت بە باوەڕداری ئومەت و وەفای نەبێت بە پەیمانی خاوەن پەیمان، ئەوە لە من نییە و منیش لە ئەو نیم)**.

**٣١٧٨**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يَدُ اللهِ مَعَ الْجَمَاعَةِ).
* صحيح. [ت٢١٦٦]

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دەستی خودا لەگەڵ جەماعەیە)**.

## ٧- دەروازەی: حوکمی ئەو کەسەی ئەمری موسڵمانان تەفرەقە تێدەخات

**٣١٧٩**– (م) عَنْ عَرْفَجَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَنْ أَتَاكُمْ، وَأَمْرُكُمْ جَمِيعٌ عَلَى رَجُلٍ وَاحِدٍ، يُرِيدُ أَنْ يَشُقَّ عَصَاكُمْ، أَوْ يُفَرِّقَ جَمَاعَتَكُمْ، فَاقْتُلُوهُ). [م١٨٥٢]

(م) لە عەرفەجەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس هات بۆ لاتان و ئەمری ئێوە لەسەر یەك پیاو کۆببوویەوە، و ئەو دەیویست دارعەسای ئێوە لەت بکات، یان جەماعەتەکەتان تەفرەقە تێبخات، بیکوژن)**.

## ٨- دەروازەی: گەر بە دوو خەلیفە بەیعەتدرا

**٣١٨٠**– (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا بُويِعَ لِخَلِيفَتَيْنِ، فَاقْتُلُوا الآخَرَ مِنْهُمَا). [م١٨٥٣]

(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بەیعەت بە دوو خەلیفە درا ئەوەی دواییان بکوژن[1])**.

## ٩- دەروازەی: ملنەدان بە ئەمیران و وازهێنان لە جەنگانیان گەر نوێژ بکەن

**٣١٨١-** (م) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ - زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم -، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؛ أَنَّهُ قَالَ: (**إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ، فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ، فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ، وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ، وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ**) قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلاَ نُقَاتِلُهُمْ؟ قَالَ: (**لاَ، مَا صَلَّوْا**). [م١٨٥٤]

(م) لە ئوم سەلەمەوە -هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، ئەو فەرمووی: **(ئەمیرانتان لەسەر بەکاردەهێنرێن، لێیان بە باش دەبینن و لێیان بە خراپ دەبینن، هەر کەس لای ناخۆش بوو خۆی بەری کردووە، هەرکەس نەهی لە مونکەر بکات سەلامەت بووە، بەڵام ئەوەی رازی بوو و شوێنکەوت)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا دژیان نەجەنگیان؟ فەرمووی: **(نەخێر، هەتا نوێژ بکەن)**.

## ١٠- دەروازەی: باشترینی ئیمامان و خراپترینیان

**٣١٨٢-** (م) عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**خِيَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ، وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ. وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ، وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ**) قَالُوا: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَلاَ نُنَابِذُهُمْ عِنْدَ ذلِكَ؟ قَالَ: (**لاَ، مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ. لاَ، مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ. أَلاَ مَنْ وَلِيَ عَلَيْهِ وَالٍ، فَرَآهُ يَأْتِي شَيْئاً مِنْ مَعْصِيَةِ اللهِ، فَلْيَكْرَهْ مَا يَأْتِي مِنْ مَعْصِيَةِ اللهِ، وَلاَ يَنْزِعَنَّ يَداً مِنْ طَاعَةٍ**). [م١٨٥٥]

(م) لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعییەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(باشترینی ئیمامانی ئێوە ئەوانەن ئێوە خۆشتاندەوێن و ئەوانیش**

---

[1] واتە: بەیعەت بۆ ئەوەی یەکەمیان دامەزراوە، نەك بۆ ئەوەی دووەم -و.

**ئێوەیان خۆشدەوێت، دوعایان بۆ دەکەن و دوعاتان بۆ دەکەن، خراپترینی ئیمامانی ئێوە ئەوانەن رقتان لێیانە و رقیان لێتانە، نەفرەتیان لێ دەکەن و نەفرەتتان لێ دەکەن)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا لەو بارەدا پشتیان تێنەکەین؟ فەرمووی: **(نەخێر، هەتا نوێژتان لەناودا ئەنجام بدەن، نەخێر، هەتا نوێژتان لەناودا ئەنجام بدەن، دەزانن هەرکەس والییەکی لەسەر دانرا بینی شتێك لە یاخیبوونی خودا ئەنجام دەدات، با ئەوەی ئەنجامی دەدات لە یاخیبوونی خودا لای ناخۆش بێت، و دەستی لە گوێڕایەڵی نەکێشێتەوە)**.

**٣١٨٣**– عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ قَالَ: اسْتَعْمَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ رَجُلاً مِنْ بَنِي أَسَدٍ عَلَى عَمَلٍ، فَجَاءَ يَأْخُذُ عَهْدَهُ، قَالَ: فَأُتِيَ عُمَرُ ﷺ بِبَعْضِ وَلَدِهِ فَقَبَّلَهُ، قَالَ: أَتُقَبِّلُ هَذَا؟! مَا قَبَّلْتُ وَلَداً قَطُّ، فَقَالَ عُمَرُ: فَأَنْتَ بِالنَّاسِ أَقَلُّ رَحْمَةً، هَاتِ عَهْدَنَا لاَ تَعْمَلْ لِي عَمَلاً أَبَداً.
[هق ٩/٤١]

لە ئەبی عوسمانی نەهدییەوە، وتی: عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) پیاوێکی لە بەنی ئەسەد لەسەر کارێك دامەزراند، هات بۆئەوەی عەهدەکەی وەربگرێت[1]، وتی: یەکێك لە منداڵەکانی هێنرا بۆ لای عومەر ماچی کرد، کەسەکە وتی: ئایا ئەوە ماچ دەکەی؟! هەرگیز منداڵم ماچ نەکردووە، عومەر وتی: کەوابوو تۆ بە خەڵك بەزەیت کەمترە، عەهدەکەمان بۆ بگێڕەوە و هەرگیز کارێکم بۆ مەکە.

## ١١- دەروازەی: نەهی لە داوای ئیمارەت

**٣١٨٤**– (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(يَا عَبْدَ الرَّحْمنِ بْنَ سَمُرَةَ! لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ، فَإِنَّكَ إِنْ أُوتِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أُوتِيتَهَا مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا)**. [خ٦٦٢٢/ م١٦٥٢، الإمارة: ١٦٥٢ (١٣)]

---

[1] واتە: نوسراوی دەستبەکاربوونەکەی.

(ق) لە عبدالرحمانی کوڕی سەمورەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی عبدالرحمانی کوڕی سەمورە، داوای ئەمارەت مەکە، چونکە گەر بە داواکردن پێت بدرێت تۆی رادەست دەکرێت، گەر بێ داواکردن پێتدرا لەسەری کۆمەکی دەکرێی)**.

**٣١٨٥**– (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلاَ تَسْتَعْمِلُنِي؟ قَالَ: فَضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى مَنْكِبِي، ثُمَّ قَالَ: (يَا أَبَا ذَرٍّ، إِنَّكَ ضَعِيفٌ، وَإِنَّهَا أَمَانَةٌ، وَإِنَّهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ خِزْيٌ وَنَدَامَةٌ، إِلاَّ مَنْ أَخَذَهَا بِحَقِّهَا، وَأَدَّى الَّذِي عَلَيْهِ فِيهَا). [م١٨٢٥]

(م) لە ئەبی زەڕەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا لەسەر کارێك بەکارمناهێنی؟ وتی: بە دەستی کێشای بە ناوشانمدا و پاشان فەرمووی: **(ئەی ئەبا زەڕ، تۆ لاوازی، ئەمەش ئەمانەتە، و لە رۆژی قیامەت شەرمەزاری و پەشیمانییە، مەگەر کەسێك بە حەقی خۆی لە دەستی گرتبێت و ئەوەی تیایدا لەسەریەتی جێبەجێی کردبێت)**.

## ١٢- دەروازەی: ئافرەت ویلایەتی بۆ نییە

**٣١٨٦**– (خ) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: لَقَدْ نَفَعَنِي اللهُ بِكَلِمَةٍ سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَيَّامَ الْجَمَلِ، بَعْدَمَا كِدْتُ أَنْ أَلْحَقَ بِأَصْحَابِ الْجَمَلِ فَأُقَاتِلَ مَعَهُمْ، قَالَ: لَمَّا بَلَغَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّ أَهْلَ فارِسَ قَدْ مَلَّكُوا عَلَيْهِمْ بِنْتَ كِسْرَى، قَالَ: (لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمُ امْرَأَةً). [خ٤٤٢٥]

(خ) لە ئەبی بەکرەوە، وتی: رۆژەکانی جەمەل خودا بە کەلیمەیەك سوودی پێ گەیاندم لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست، لەدوای ئەوەی خەریك بوو بچمە ریزی "أصحاب الجمل" و لە ریزی ئەوان بجەنگم، وتی: کاتێ بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشت ئەهلی فارس کچەکەی کیسرایان بەسەر خۆیانەوە کردووە بە مەلیك، فەرمووی: **(قەومێك سەرفراز نابێت کارەکەیان ئافرەتێك بیگرێتە دەست)**[1].

---

[1] چونکە سەرکردەی سوپای جەمەل خاتوو عائیشە بوو(خوا لێی رازی بێت)–و.

## ١٣- دەروازەی: بۆ هەر خەلیفەیەك دوو "بِطانَة" هەیە

**٣١٨٧-** (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(ما بَعَثَ اللهُ مِنْ نَبِيٍّ، وَلاَ اسْتَخْلَفَ مِنْ خَلِيفَةٍ؛ إلاَّ كانَتْ لَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالمَعْرُوفِ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالشَّرِّ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، فَالمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللهُ تَعَالَى)**. [خ٧١٩٨ (٦٦١١)]

(خ) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا هەر پێغەمبەرێکی رەوانە کردبێت و هەر خەلیفەیەکی جێنشین کردبێت دوو "بطانة"ی هەبووە: "بطانة"یەك بە چاکە فەرمانی پێکردووە و لەسەر ئەوە هانیداوە، "بطانة"یەکیش بە شەڕ فەرمانی پێکردووە و لەسەر ئەوە هانیداوە، پارێزراو کەسێکە خودا(تعالى) بیپارێزێت).**

## ١٤- دەروازەی: ئەوەی ناپەسەندە لە سەناکردنی دەسەڵاتدار

**٣١٨٨-** (خ) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: قَالَ أُنَاسٌ لِابْنِ عُمَرَ: إِنَّا نَدْخُلُ عَلَى سُلْطَانِنَا، فَنَقُولُ لَهُمْ خِلاَفَ مَا نَتَكَلَّمُ إِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِمْ، قَالَ: كُنَّا نَعُدُّهَا نِفَاقاً.
[خ٧١٧٨]

**(خ) لە محەمەدی کوڕی زەیدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: خەڵکانێك بە ئیبن عومەریان وت: ئێمە دەچینە لای سوڵتانەکانمان و پێچەوانەی ئەوەی قسەی پێ دەکەین دەیڵێین گەر لە لایان چووینە دەرەوە، ئیبن عومەر وتی: کاتی خۆی بە دووڕوویمان دادەنا.**

**٣١٨٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ لَقِيَ نَاساً خَرَجُوا مِنْ عِنْدِ مَرْوَانَ، فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ جَاءَ هَؤُلاَءِ؟ قَالُوا: خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِ الْأَمِيرِ مَرْوَانَ، قَالَ: وَكُلُّ حَقٍّ رَأَيْتُمُوهُ تَكَلَّمْتُمْ بِهِ وَأَعَنْتُمْ عَلَيْهِ، وَكُلُّ مُنْكَرٍ رَأَيْتُمُوهُ أَنْكَرْتُمُوهُ وَرَدَدْتُمُوهُ عَلَيْهِ؟ قَالُوا: لاَ، وَاللهِ! بَلْ يَقُولُ مَا يُنْكَرُ فَنَقُولُ: قَدْ أَصَبْتَ أَصْلَحَكَ اللهُ! فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِ قُلْنَا: قَاتَلَهُ اللهُ! مَا أَظْلَمَهُ وَأَفْجَرَهُ! قَالَ عَبْدُ اللهِ: كُنَّا بِعَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَعُدُّ هَذَا نِفَاقاً لِمَنْ كَانَ هَكَذَا. [حم٥٣٧٣]

* صحيح.

[وانظر: ٣٤٩١].

لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: ئەو بە خەڵکانێك گەیشت لای مەروان هاتنە دەرەوە، وتی: ئەمانە لە کوێوە هاتوون؟ وتیان: لای ئەمیر مەروان هاتینە دەرەوە، وتی: هەموو ئەوەی بە حەقی دەبینن کردتان بە قسە و لەسەری کۆمەکیتان کرد، هەموو ئەوەی بە مونکەری دەبینن نەهیتان لێ کرد و بەسەریدا رەدتان کردەوە؟ وتیان: نەخێر، سوێند بە خودا، بەڵکو شتانێك دەڵێ بە مونکەر دەزانرێ و ئێمەش دەڵێین: دروست دەڵێی، خودا ئیصلاحت بکات، گەر لە لای هاتینە دەرەوە دەڵێین: خودا بیکوژێت، چەندە ستەمکار و بەدرەفتارە! عەبدولاّ وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەمان بە دووڕوویی دادەنا بۆ کەسێك بەو جۆرە بوایە.

## ١٥- دەروازەی: بەیعەت لەسەر گوێگرتن و گوێڕایەڵی

**٣١٩٠**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قالَ: كُنَّا إِذَا بَايَعْنَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ يَقُولُ لَنَا: (فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ). [خ٧٢٠٢/ م١٨٦٧]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: گەر لەسەر بیستن و گوێڕایەڵی بەیعەتمان بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بدابایە، پێی دەفەرموین: **(لەوەی دەتوانن)**.

## ١٦- ئیمام موحاسەبەی خەڵك دەكات بەوەی لێیانەوە دەردەكەوێت

**٣١٩١**– (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ قالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ أُنَاساً كانُوا يُؤْخَذُونَ بِالْوَحْيِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَإِنَّ الْوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ، وَإِنَّمَا نَأْخُذُكُمُ الآنَ بِمَا ظَهَرَ لَنَا مِنْ أَعْمَالِكُمْ، فَمَنْ أَظْهَرَ لَنَا خَيْراً أَمِنَّاهُ وَقَرَّبْنَاهُ، وَلَيْسَ إِلَيْنَا مِنْ سَرِيرَتِهِ شَيْءٌ، اللهُ يُحَاسِبُهُ فِي سَرِيرَتِهِ، وَمَنْ أَظْهَرَ لَنَا سُوءاً لَمْ نَأْمَنْهُ وَلَمْ نُصَدِّقْهُ، وَإِنْ قالَ: إِنَّ سَرِيرَتَهُ حَسَنَةٌ. [خ٢٦٤١]

[وانظر: ١١٥٠].

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی عوتبەوە، وتی: گوێم لە عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) بوو دەیوت: خەڵکانێك لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە وەحی دەگیران، وەحی بڕا، ئێستا بەوەی بۆمان دەردەکەوێت لە کارەکانتان دەتانگرین، هەر کەس خێری بۆ نیشانداین ئەمانی پێ دەدەین و نزیکی دەکەینەوە، ئێمە شتێکمان بۆ نییە لەسەر ناخ و پەنهانی، خودا لەسەر ناخ و پەنهانی دادگایی دەکات، هەر کەس خراپەمان بۆ دەربخات ئەمانی پێ نادەین و بەڕاستی نازانین، هەرچەند بڵێت: ناخ و پەنهایی چاك و باشە.

## ١٧- دەروازەی: ڕۆزی و بژێوی خەلیفە

**٣١٩٢-** (خ) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَمَّا اسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ قَالَ: لَقَدْ عَلِمَ قَوْمِي أَنَّ حِرْفَتِي لَمْ تَكُنْ تَعْجِزُ عَنْ مُؤْونَةِ أَهْلِي، وَشُغِلْتُ بِأَمْرِ المسْلِمِينَ، فَسَيَأْكُلُ آلُ أَبِي بَكْرٍ مِنْ هَذَا المالِ، وَيَحْتَرِفُ لِلْمُسْلِمِينَ فِيهِ. [خ٢٠٧٠]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: کاتێ ئەبوبەکری صدیق بە خەلیفە کرا وتی: قەومەکەم، دەزانن پیشەکەی من دەستەوسان نەبوو لە بژێوی خانەوادەکەم، بە کاری موسڵمانەوە سەرقاڵ کراوم، ئالی ئەبوبەکر لەم ماڵ و سامانە دەخۆن و بۆ موسڵمانان شارەزایی و توانستی پیشەکەی لە بەیتولمالدا بەکاردەهێنێت.

**٣١٩٣-** عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: قَالَ لِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﵁: إِنِّي أَنْزَلْتُ نَفْسِي مِنْ مَالِ اللهِ بِمَنْزِلَةِ وَالِي الْيَتِيمِ، إِنِ احْتَجْتُ أَخَذْتُ مِنْهُ، فَإِذَا أَيْسَرْتُ رَدَدْتُهُ، وَإِنِ اسْتَغْنَيْتُ اسْتَعْفَفْتُ. [هق ٦/٤]

لە بەڕائەوە، وتی: عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) پێی وتم: من لە ماڵی موسڵماندا خۆم داناوە لە مەنزیلەتی ماڵی منداڵی بێباوك، گەر ئاتاج بووم لێی دەبەم گەر هاتەوە دەستم دەیگێڕمەوە، گەر دەوڵەمەندیش بووم عیففەت بەکاردەهێنم.

## ١٨- دەروازەی: ڕۆزی کاربەدەستان و کارکەران لەگەڵیان

٣١٩٤- عَنْ بُرَيْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ عَلَى عَمَلٍ فَرَزَقْنَاهُ رِزْقاً، فَمَا أَخَذَ بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ غُلُولٌ). [د٢٩٤٣]

* صحيح.

لە بورەیدەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەسمان لەسەر کارێک بەکارهێنا و ڕۆزییەکمان پێدا، ئەو ماڵەی لەدوای ئەوە دەیبات ناپاکییە).**

٣١٩٥- عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَنْ كَانَ لَنَا عَامِلاً، فَلْيَكْتَسِبْ زَوْجَةً، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ خَادِمٌ؛ فَلْيَكْتَسِبْ خَادِماً، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَسْكَنٌ؛ فَلْيَكْتَسِبْ مَسْكَناً).

قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أُخْبِرْتُ أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنِ اتَّخَذَ غَيْرَ ذَلِكَ، فَهُوَ غَالٌّ أَوْ سَارِقٌ).[د٢٩٤٥]

* صحيح.

لە موستەوریدی کوڕی شەددادەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس بۆ ئێمە کاربەدەست بوو، با ژنێك بهێنێت، گەر خزمەتکارێکی نەبوو با خزمەتکارێك بەدەست بهێنێت، گەر شوێنی نیشتەجێبوونی نەبوو با شوێنێکی نیشتەجێبوونی هەبێت[1]).**

## ١٩- دەروازەی: هۆشداریدان لە ڕۆچوون لە ماڵی خودادا

٣١٩٦- (خ) عَنْ خَوْلَةَ الأَنْصَارِيَّةِ رضي الله عنها قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ رِجَالاً يَتَخَوَّضُونَ فِي مالِ اللهِ بِغَيْرِ حَقٍّ، فَلَهُمُ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). [خ٣١١٨]

---

[1] واتە: لەسەر بەیتولماڵ ئەمانەی بۆ دابین دەکرێت، تاکو هیچ بیانوویەکی نەمێنێ بۆ دەستبردن بۆ ماڵ و سامانی موسڵمانان-و.

(خ) لە خەولەی ئەنصارییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(پیاوانێك بە ناحەق لە ماڵی خودادا رۆدەچن، ئاگریان بۆ هەیە لە رۆژی قیامەت).**

**٣١٩٧-** (م) عَنْ عَدِيِّ بْنِ عَمِيرَةَ الْكِنْدِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ مِنْكُمْ عَلَى عَمَلٍ، فَكَتَمَنَا مِخْيَطاً فَمَا فَوْقَهُ، كَانَ غُلُولاً يَأْتِي بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). قَالَ: فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ أَسْوَدُ، مِنَ الأَنْصَارِ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! اقْبَلْ عَنِّي عَمَلَكَ. قَالَ: (**وَمَا لَكَ**) ؟ قَالَ: سَمِعْتُكَ تَقُولُ كَذَا وَكَذَا. قَالَ: (**وَأَنَا أَقُولُهُ الآنَ: مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ مِنْكُمْ عَلَى عَمَلٍ؛ فَلْيَجِىءْ بِقَلِيلِهِ وَكَثِيرِهِ، فَمَا أُوتِيَ مِنْهُ أَخَذَ، وَمَا نُهِيَ عَنْهُ انتهى**). [م١٨٣٣]

(م) لە عەدی کوڕی عەمیرەی کیندییەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس لە ئێوەمان لەسەر کارێك بەکارهێنا، ئەویش دەرزییەك و سەرو دەرزییەك لە ئێمە بشارێتەوە ناپاکییە و رۆژی قیامەت پێیەوە دێت)**، وتی: پیاوێکی رەش لە ئەنصار هەستایە سەرپێی وەك ئەوەی ئێستا تەماشای بکەم، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، کارەکەتم لێ قبووڵ بکەرەوە، پێغەمبەر فەرمووی: **(چیتە؟)**، وتی: گوێم لێت بوو ئاوا و ئاوات دەفەرموو، پێغەمبەر فەرمووی: **(من ئێستاش دەیڵێمەوە، هەر کەسێکمان لە ئێوە لەسەر کارێك بەکارهێنا، با زۆر و کەمی بهێنێت، ئەوەی لەوە پێیدرا وەریدەگرێت، ئەوەش نەهی لێکرا دەستی لێ هەڵدەگرێت).**

## ٢٠- دەروازەی: حەرام کردنی هەدیەی کاربەدەستان و بەرتیل

**٣١٩٨-** (ق) عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم اسْتَعْمَلَ ابْنَ الأُتْبِيَّةِ عَلَى صَدَقَاتِ بَنِي سُلَيْمٍ، فَلَمَّا جاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَحَاسَبَهُ قَالَ: هَذَا الَّذِي لَكُمْ، وَهذِهِ هَدِيَّةٌ أُهْدِيَتْ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**فَهَلاَّ جَلَسْتَ فِي بَيْتِ أَبِيكَ وَبَيْتِ أُمِّكَ، حَتَّى تَأْتِيَكَ هَدِيَّتُكَ إِنْ كُنْتَ صَادِقاً**) ؟!

ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَخَطَبَ النَّاسَ، وَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (**أَمَّا بَعْدُ؛ فَإِنِّي أَسْتَعْمِلُ رِجَالاً مِنْكُمْ عَلَى أُمُورٍ مِمَّا وَلاَّنِي اللهُ، فَيَأْتِي أَحَدُكُمْ فَيَقُولُ: هَذَا لَكُمْ، وَهذِهِ**

هَدِيَّةٌ أُهْدِيَتْ لِي، فَهَلاَّ جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَبَيْتِ أُمِّهِ، حَتَّى تَأْتِيَهُ هَدِيَّتُهُ إِنْ كانَ صَادِقاً. فَوالله لاَ يَأْخُذُ أَحَدُكُمْ مِنْهَا شَيْئاً ـ قالَ هِشَامٌ: ـ بِغَيْرِ حَقِّهِ، إِلاَّ جاءَ اللهَ يَحْمِلُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أَلاَ فَلأَعْرِفَنَّ مَا جَاءَ اللهَ رَجُلٌ بِبَعِيرٍ لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بِبَقَرَةٍ لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةٍ تَيْعَرُ).

ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ: (أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ).     [خ٧١٩٧ (٩٢٥)/ م١٨٣٢]

(ق) لە ئەبی حومەیدی ساعیدییەوە: پێغەمبەر(ﷺ) "ابن أُتَبِيَّة"ی لەسەر صەدەقەی بەنی سولەیم بەکارهێنا، کاتێ هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و حسابی لەگەڵ کرد وتی: ئەمە ئەوەیە بۆ ئێوەیە، ئەمەش هەدییەیەکە هەدیەی من کراوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی بۆ لە ماڵ باوکت و لە ماڵ دایکت دانەنیشتی تا هەدییەکەت بۆ بێت گەر راست دەکەی؟!)**.

پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستا و وتاری بۆ خەڵك دا و حەمدی خودای کرد و سەنای لەسەر کرد، پاشان فەرمووی: **(پاشان، من پیاوانێ لە ئێوە بەکاردەهێنم لەسەر کۆمەڵێك کاروبار کە خودا رادەستی کردووم، یەکێك لە ئێوە دێت و دەڵێت: ئەمە بۆ ئێوەیە و ئەمەش هەدییەیەکە هەدییەی من کراوە، ئەی بۆچی لە ماڵ باوکی و لە ماڵ دایکی دانانیشێ تا هەدییەکەی بۆ بێت گەر راست دەکات، سوێند بە خودا یەکێك لە ئێوە -هیشام وتی:- بە ناحەق شتێکی لێ ببات لە رۆژی قیامەت دێت و هەڵیگرتووە، ئاگادار بن من ئەوە دەناسم پیاوێك دەیهێنێت بۆ لای خودا لە حوشترێك دەباعێنێ، یان مانگایەك دەقۆڕێنێ، یان مەڕێك دەباڕێنێ)**.

پاشان دوو دەستی هەڵبڕی تا سپێتی دوو بنباڵیم بینی: **(ئاگادار بن من گەیاندم)**.

## ٢١- دەروازەی: دەربارەی ئامار

**٣١٩٩-** (ق) عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قالَ: قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(اكْتُبُوا لِي مَنْ تَلَفَّظَ بِالإِسْلاَمِ مِنَ النَّاسِ)**، فَكَتَبْنَا لَهُ أَلْفاً وَخَمْسَمِائَةِ رَجُلٍ، فَقُلْنَا: نَخَافُ وَنَحْنُ أَلْفٌ وَخَمْسُمِائَةٍ؟! فَلَقَدْ رَأَيْتُنَا ابْتُلِينَا، حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَيُصَلِّي وَحْدَهُ وَهُوَ خَائِفٌ.

حَدَّثنا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ: فَوَجَدْنَاهُمْ خَمْسَمَائَةٍ. قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: ما بَيْنَ سِتِّمِائَةٍ إِلَى سَبْعِمِائَةٍ. [خ٣٠٦٠/م١٤٩]

(ق) لە حوزەیفەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوانەی لە خەڵك ئیسلامی ڕاگەیاندووە بۆم بنووسە)**، هەزار و پێنجسەد پیاومان بۆ نووسی، وتمان: بترسین، لە کاتێکدا ئێمە هەزار و پێنجسەدین؟! ئێمەت دەبینی تووش بووبووین تا پیاو بەتەنها نوێژی دەکرد و ئەو دەترسا.

عەبدان بۆی باس کردین، لە ئەبی حەمزەوە، لە ئەعمەشەوە: بینیمان پێنجسەدن، ئەبو موعاویە وتی: لە نێوان شەشسەد بۆ حەوتسەد.

- ولفظ مسلم: عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**أَحْصُوا لِي كَمْ يَلْفِظُ الإِسْلاَمَ**)، قَالَ: فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَتَخَافُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ مَا بَيْنَ السِتِّمِائَة إِلَى السَّبْعِمِائَة؟ قَالَ: (**إِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ، لَعَلَّكُمْ أَنْ تُبْتَلَوْا**) قَالَ: فَابْتُلِينَا، حَتَّى جَعَلَ الرَّجُلُ مِنَّا لاَ يُصَلِّي إِلاَّ سِرّاً.

لەفزەکەی موسلیم: لە حوزەیفەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین فەرمووی: **(بۆم ئامار بکەن چەند کەس ئیسلام گۆ دەکات[1])**، وتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا لەسەرمان دەترسی لە کاتێکدا ئێمە لە نێوان شەشسەد بۆ حەوتسەدین؟ فەرمووی: **(ئێوە نازانن، لەوانەیە تووشی تاقیکردنەوە بێن)**، وتی: تووشی تاقیکردنوە هاتین، تا پیاوێك لە ئێمە تەنها بە نهێنی نوێژ دەکات[2].

---

[1] واتە: چەند کەس زمانی بە شایەتمان گۆ دەکات و موسڵمان بووە–و.

[2] واتە: لە سەردەمی ستەمی دەسەڵاتدارانی ئەمەوی، چونکە هەندێ لە هاوەڵان و تابیعین و ئەوانەی دوای ئەوان لە مزگەوت نوێژیان لە پشتەوە دەکردن کە دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە نوێژەکەیان دووبارە دەکردەوە، دەسەڵاتدارانی ئەمەوی بەوەیان زانی سوێندیان پێ خواردن لە ماڵەوە نوێژەکەیان دووبارە نەکەنەوە، بۆیە بەدزییەوە نوێژەکەیان دووبارە دەکردەوە–و.

## ٢٢- دەروازەی: وەرگێڕان بۆ دەسەڵاتداران

**٣٢٠٠-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَتَعَلَّمْتُ لَهُ كِتَابَ يَهُودَ، وَقَالَ: (**إِنِّي وَاللهِ مَا آمَنُ يَهُودَ عَلَى كِتَابِي**) فَتَعَلَّمْتُهُ، فَلَمْ يَمُرَّ بِي إِلاَّ نِصْفُ شَهْرٍ حَتَّى حَذَقْتُهُ، فَكُنْتُ أَكْتُبُ لَهُ إِذَا كَتَبَ، وَأَقْرَأُ لَهُ إِذَا كُتِبَ إِلَيْهِ. [د٣٦٤٥/ ت٢٧١٥]

* حسن صحيح.

**لە زەیدی کوڕی سابیتەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردم بۆی فێری نووسینی یەهوود بووم، فەرمووی: (سوێند بە خودا، من ئەمین نیم لە یەهوود لە نووسراوەکانم)، بۆیە فێری بووم، تەنها نیو مانگ بەسەرمدا گوزەری کرد تیایدا شارەزا بووم، بۆیە گەر نووسراوی بناردبایە بۆم دەنووسی و گەر نووسراوی بۆ بهاتبایە بۆم دەخوێندەوە.**

## ٢٣- دەروازەی: بەیعەتی ئافرەتان

**٣٢٠١-** عَنْ أُمَيْمَةَ بِنْتِ رُقَيْقَةَ قَالَتْ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي نِسْوَةٍ، فَقَالَ لَنَا: (**فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ وَأَطَقْتُنَّ**)، قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَرْحَمُ بِنَا مِنَّا بِأَنْفُسِنَا. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ بَايِعْنَا . قَالَ سُفْيَانُ: تَعْنِي: صَافِحْنَا . فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّمَا قَوْلِي لِمِائَةِ امْرَأَةٍ، كَقَوْلِي لاِمْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ**). [ت١٥٩٧/ ن٤١٩٢/ جه٢٨٧٤]

* صحيح.

**لە ئومەیمەی کچی روقەیقەوە، وتی: لەناو کۆمەڵێك ئافرەت بەیعەتم بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد، پێی فەرمووین: (لەوەی لە تواناتاندایە و دەتوانن شان بدەنە ژێری)، وتم: خودا و پێغەمبەرەکەی لە خودی خۆمان بە ئێمە بەبەزەییترن، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، بەیعەتمان پێ بدە-سوفیان وتی: مەبەستی ئەوە بوو تەوقەمان لەگەڵ بکە- پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (قسەم بۆ سەد ئافرەت وەك قسەم وایە بۆ یەك ئافرەت).**

## ٢٤- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی ستەمکاران لە والییەکان هاتووە

**٣٢٠٢-** عَنْ حُذَيْفَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّهَا سَتَكُونُ أُمَرَاءُ يَكْذِبُونَ وَيَظْلِمُونَ، فَمَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ؛ فَلَيْسَ مِنَّا وَلَسْتُ مِنْهُمْ، وَلاَ يَرِدُ عَلَيَّ الْحَوْضَ. وَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ؛ فَهُوَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، وَسَيَرِدُ عَلَيَّ الْحَوْضَ).

* إسناده صحيح على شرط الشيخين. [حم٢٣٢٦٠]

**لە حوزەیفەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (لە داهاتوو کۆمەڵێك دەسەڵاتدار دێن درۆ دەکەن و ستەم دەکەن، هەر کەس بە درۆکەیان باوەڕ بکات و لەسەر ستەمەکەیان کۆمەکییان بکات لە ئێمە نییە و منیش لە ئەو نیم و نایەت بۆ سەر حەوزەکە بۆ لام، هەر کەس بە راستیان نەزانێ و لەسەر ستەمەکەیان کۆمەکییان نەکات ئەو کەسە لە منە و منیش لە ئەوم و دێت بۆ سەر حەوزەکە بۆ لام).**

**٣٢٠٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لِكَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ: (أَعَاذَكَ اللهُ مِنْ إِمَارَةِ السُّفَهَاءِ)، قَالَ: وَمَا إِمَارَةُ السُّفَهَاءِ؟ قَالَ: (أُمَرَاءُ يَكُونُونَ بَعْدِي، لاَ يَقْتَدُونَ بِهَدْيِي، وَلاَ يَسْتَنُّونَ بِسُنَّتِي، فَمَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ؛ فَأُولَئِكَ لَيْسُوا مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُمْ، وَلاَ يَرِدُوا عَلَيَّ حَوْضِي. وَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ؛ فَأُولَئِكَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ، وَسَيَرِدُوا عَلَيَّ حَوْضِي). [حم١٤٤٤١]

* إسناده على شرط مسلم.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەر(ﷺ) بە کەعبی کوڕی عوجرەی فەرمووی: (خودا لە ئیمارەتی گەمژەکان پەنات بدات)، وتی: ئیمارەتی گەمژەکان چییە؟ فەرمووی: (کۆمەڵێك کاربەدەستم لەدوای من دێن، شوێنی هیدایەتی من ناکەون و سوننەتی من ناگرنەبەر، هەر کەس باوەڕ بە درۆکەیان بکات و لەسەر ستەمەکەیان کۆمەکییان بکات لە من نین و منیش لەوان نیم، ئەوانە نایەن بۆ سەر حەوزەکە بۆ لام، هەر کەسیش باوەڕ بە درۆکەیان نەکات و لەسەر ستەمەکەیان کۆمەکییان نەکات، ئەوانە لە منن و منیش لەوانم، و دێن بۆ سەر حەوزەکە بۆ لام).**

## ٢٥- دەروازەی: دابڕانی ئەمیران

**٣٢٠٤-** عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ قَالَ: بَلَغَ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ سَعْداً لَمَّا بَنَى الْقَصْرَ قَالَ: انْقَطَعَ الصُّوَيْتُ، فَبَعَثَ إِلَيْهِ مُحَمَّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ، فَلَمَّا قَدِمَ أَخْرَجَ زَنْدَهُ، وَأَوْرَى نَارَهُ، وَابْتَاعَ حَطَباً بِدِرْهَمٍ، وَقِيلَ لِسَعْدٍ: إِنَّ رَجُلاً فَعَلَ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: ذَاكَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ. فَخَرَجَ إِلَيْهِ، فَحَلَفَ بِاللهِ مَا قَالَهُ، فَقَالَ: نُؤَدِّي عَنْكَ الَّذِي تَقُولُهُ، وَنَفْعَلُ مَا أُمِرْنَا بِهِ، فَأَحْرَقَ الْبَابَ، ثُمَّ أَقْبَلَ يَعْرِضُ عَلَيْهِ أَنْ يُزَوِّدَهُ، فَأَبَى.

فَخَرَجَ، فَقَدِمَ عَلَى عُمَرَ ﷺ، فَهَجَّرَ إِلَيْهِ، فَسَارَ ذَهَابَهُ وَرُجُوعَهُ تِسْعَ عَشْرَةَ، فَقَالَ: لَوْلاَ حُسْنُ الظَّنِّ بِكَ، لَرَأَيْنَا أَنَّكَ لَمْ تُؤَدِّ عَنَّا؟ قَالَ: بَلَى، أَرْسَلَ يَقْرَأُ السَّلاَمَ وَيَعْتَذِرُ، وَيَحْلِفُ بِاللهِ مَا قَالَهُ، قَالَ: فَهَلْ زَوَّدَكَ شَيْئاً؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَمَا مَنَعَكَ أَنْ تُزَوِّدَنِي أَنْتَ؟ قَالَ: إِنِّي كَرِهْتُ أَنْ آمُرَ لَكَ، فَيَكُونَ لَكَ الْبَارِدُ، وَيَكُونَ لِي الْحَارُّ، وَحَوْلِي أَهْلُ الْمَدِينَةِ قَدْ قَتَلَهُمُ الْجُوعُ، وَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(لاَ يَشْبَعُ الرَّجُلُ دُونَ جَارِهِ)**.　　[حم٣٩٠]

* رجاله رجال الشيخين.

**لە عەبایەی کوڕی ریفاعەوە، وتی: بە عومەر(خوا لێی رازی بێت) گەیشتەوە کاتێ سەعد کۆشکەکەی بینا کرد وتی: دەنگە دەنگ بڕا، عومەر محەمەدی کوڕی مەسلەمەی رەوانەکرد بۆ لای، کاتێ هات چەخماخەکەی دەرهێنا و ئاگری کردەوە و بە درهەمێك داری کڕی، بە سەعد وترا: پیاوێك ئاوا و ئاوای کرد، سەعد وتی: ئەوە محەمەدی کوڕی مەسلەمەیە، هاتەدەرەوە بۆ لای، سوێندی بە خودا خوارد ئەوەی نەوتووە[١]، ئەویش وتی: ئەوەی دەیڵێی لە تۆوە دەیگەیەنین و ئەوەی فەرمانمان پێکراوە ئەنجامی دەدەین، دەرگاکەی سوتاند[٢]، پاشان محەمەد رووی لێکرد و داوای لێکرد توێشووی ئامادە بکات، بەڵام سەعد بۆی ئامادە نەکرد.**

---

[١] واتە: نەیوتووە "دەنگە دەنگە بڕا"، چونکە قسەکە لای عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) خراپ بوو، بۆنی دابڕانی لێ دەهات لە خەڵك و کەنارگیری و گۆشەگیری لە موسڵمانان-و.

[٢] واتە: دەرگایماڵەکەی سەعد، چونکە عومەر(خوا لێی رازی بێت) فەرمانی پێ کردبوو-و.

محەمەد رۆیشت و هات بۆ لای عومەر(خوا لێی رازی بێت)، بە گەرما خۆی گەیاندە لای، رۆیشتن و هاتنەوەی نۆزدە رۆژ بوو، عومەر وتی: گەر گومانی باش نەبوایە بە تۆ پێمانوابوو لە ئێمەوە نەتگەیاندووە؟ محەمەد وتی: با، داوای لێ کردووم سەلامی ئەوت پێ بگەیەنم، ئەو عوزر دەهێنێتەوە و سوێند بە خودا دەخوات نەیوتووە، عومەر وتی: شتێك توێشوو و کۆمەکی پێدای؟ وتی: نەخێر، محەمەد وتی: ئەی چی رێگری لە تۆ کرد تۆ شتێك لە توێشوو و کۆمەکیم پێ بدەی؟ عومەر وتی: من لام ناپەسەند بوو بۆ تۆ فەرمان بەوە بکەم، سارد بۆ تۆ بێت و گەرم بۆ من بێت دەوبەریشم لە ئەهلی مەدینە برسێتی کوشتوونی، گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(نابێ پیاو بەبێ جیرانەکەی تێر بێت)**.

## ١- دەروازەی: ئیجتیهادی قازی

**٣٢٠٥-** (ق) عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِذَا حَكَمَ الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ؛ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ؛ فَلَهُ أَجْرٌ**).

[خ٧٣٥٢/ م١٧١٦]

(ق) لە عەمری کوڕی عاصەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(گەر حاکم حوکمی کرد و ئیجتیهادی کرد و پێکای دوو پاداشتی بۆ هەیە، گەر حوکمی کرد و ئیجیهادی کرد و پاشان هەڵەی کرد یەك پاداشتی بۆ هەیە).**

## ٢- دەروازەی: حوکمی قازی حەرامێك حەڵاڵ ناکات

**٣٢٠٦-** (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوِ مِمَّا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئاً فَلاَ يَأْخُذْه، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ**).

[خ٦٩٦٧ (٢٤٥٨)/ م١٧١٣]

(ق) لە ئوم سەلەمەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(من مرۆڤم، ئێوەش نەیاری و ناکۆکی خۆتان دێنن بۆ لام، لەوانەیە هەندێکتان زمانپاراوتر بێت بە بەڵگەکەی لە هەندێکی ترتان، منیش قەزاوەتی بۆ دەکەم لەسەر ئەوەی بیستوومە، هەر کەس شتێك لە حەقی براکەیم بۆ قەزاوەت کرد با وەرینەگرێت، چونکە من پارچەیە ئاگرم بۆ ئەو بڕیوەتەوە).**

## ٣- دەروازەی: قازی لە تووڕەییدا قەزاوەت ناکات

**٣٢٠٧-** (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: كَتَبَ أَبُو بَكْرَةَ إِلَى ابْنِهِ، وَكَانَ بِسِجِسْتَانَ، بِأَنْ لاَ تَقْضِيَ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَأَنْتَ غَضْبَانُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**لاَ يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ**). [خ٧١٥٨/ م١٧١٧]

(ق) لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبی بەکرەوە، وتی: ئەبو بەکرە بۆ کوڕەکەی خۆی نووسی، ئەو لە سجستان بوو، قەزاوەت نەکات لە نێوان دوو کەس لە کاتێکدا تووڕە بێت، چونکە من گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(حاکمێك قەزاوەت نەکات لە نێوان دووان لە کاتێکدا ئەو تووڕە بێت)**.

## ٤- دەروازەی: بەڵگە ڕۆشنەکان و سوێند لە دەعوادا

**٣٢٠٨-** (ق) عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، فَكَتَبَ إِلَيَّ: إِنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَضى: أَنَّ الْيَمِينَ عَلَى المدَّعى عَلَيْهِ. [خ٢٥١٤/ م١٧١١]

(ق) لە ئیبن ئەبی مولەیکەوە، وتی: بۆ ئیبن عەباسم نووسی، ئەویش بۆی نووسیمەوە: پێغەمبەر(ﷺ) قەزاوەتی کرد: سوێند لەسەر (المدَّعى عليه)یە.

- وفي رواية لمسلم: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ، لاَدَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهُمْ، وَلَكِنَّ الْيَمِينَ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ)**.

لە ڕیوایەتێکی موسلیمدا: لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر خەڵکی بە دەعواکانیان پێیان بدرێت خەڵکانێك داوای خوێن و ماڵ و سامانی پیاوانێك دەکەن، بەڵام سوێند لەسەر (المدّعى عليه[1])یە)**.

**٣٢٠٩-** (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَضَى بِيَمِينٍ وَشَاهِدٍ. [م١٧١٢]

(م) لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە سوێندێك و شایەتێك قەزاوەتی کرد.

**٣٢١٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بن عَمْرٍو: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ فِي خُطْبَتِهِ: **(الْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي، وَالْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ)**. [ت١٣٤١]

* صحيح.

---

[1] المدعى عليه: داوا لەسەرکراو-و.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لە وتارەکەیدا فەرمووی: (بەڵگە لەسەر "المُدَّعي[1]"یە و سوێند لەسەر "المُدَّعى عليه[2]").**

## ٥- دەروازەی: بەرپرسیارێتی قازی

**٣٢١١**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ وَلِيَ الْقَضَاءَ، فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ). [د٣٥٧١/ ت١٣٢٥/ جه٢٣٠٨]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس قەزا بگرێتە دەست بە بێ چەقۆ سەربڕاوە).**

**٣٢١٢**– عَنْ بُرَيْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الْقُضَاةُ ثَلاَثَةٌ: وَاحِدٌ فِي الْجَنَّةِ، وَاثْنَانِ فِي النَّارِ: فَأَمَّا الَّذِي فِي الْجَنَّةِ فَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ، فَقَضَى بِهِ. وَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ، فَجَارَ فِي الْحُكْمِ، فَهُوَ فِي النَّارِ. وَرَجُلٌ قَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ، فَهُوَ فِي النَّارِ).

* صحيح. [د٣٥٧٣/ ت١٣٢٢م/ جه٢٣١٥]

**لە بورەیدەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (قازیان سیانن: یەکێکیان لە بەهەشتدایە و دوانیان لە ئاگر: ئەوەیان کە لە بەهەشتدایە پیاوێکە حەقی ناسیوە و قەزاوەتی بە حەق کردووە، پیاوێکیش حەقی ناسیوە و لە حوکمدا ستەم دەکات ئەو لە ئاگردایە، پیاوێکی تر بە نەزانی قەزاوەت بۆ خەڵك دەکات ئەوەش لە ئاگردایە).**

## ٦- دەروازەی: قازی بە زانینی خۆی حوکم ناکات

**٣٢١٣**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَوْ كُنْتُ رَاجِماً أَحَداً بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ، لَرَجَمْتُ فُلاَنَةَ، فَقَدْ ظَهَرَ مِنْهَا الرِّيبَةُ فِي مَنْطِقِهَا وَهَيْئَتِهَا، وَمَنْ يَدْخُلُ عَلَيْهَا).

* صحيح. [جه٢٥٥٩]

---

[1] المدعي: داواكار–و.

[2] المدعى عليه: داوا لەسەرکراو–و.

له ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بەبێ بەڵگە کەسێکم رەجم بکردبا فڵانە ئافرەتم رەجم دەکرد، شك و گومان لە قسە و هەڵکەوتەی ئافرەتەکە و ئەو کەسەی دەچووە لای دەرکەوت).**

## ٧- دەروازەی: قازی گوێ لە دوو نەیارەکە دەگرێت

**٣٢١٤-** عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى الْيَمَنِ قَاضِياً، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، تُرْسِلُنِي وَأَنَا حَدِيثُ السِّنِّ، وَلاَ عِلْمَ لِي بِالْقَضَاءِ؟ فَقَالَ: **(إِنَّ اللهَ سَيَهْدِي قَلْبَكَ، وَيُثَبِّتُ لِسَانَكَ، فَإِذَا جَلَسَ بَيْنَ يَدَيْكَ الْخَصْمَانِ، فَلاَ تَقْضِيَنَّ حَتَّى تَسْمَعَ مِنَ الآخَرِ كَمَا سَمِعْتَ مِنَ الأَوَّلِ، فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يَتَبَيَّنَ لَكَ الْقَضَاءُ).**

قَالَ: فَمَا زِلْتُ قَاضِياً، أَوْ مَا شَكَكْتُ فِي قَضَاءٍ بَعْدُ. [د٣٥٨٢/ ت١٣٣١/ جه٢٣١٠]

* صحيح.

له عەلییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەك قازی رەوانەی کردم بۆ یەمەن، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، رەوانەم دەکەی و من هێشتا کەم تەمەنم و زانستم نییە بە قەزا؟ فەرمووی: **(خودا هیدایەتی دڵت دەدات و زمانت دامەزراو دەکات، گەر دوان لە بەردەمت دانیشتن قەزاوەت مەکە تا لەویتریش دەبیستی وەك چۆن لە یەکەمت بیست، ئەوە باشترینە تا قەزات بۆ رۆشن ببێتەوە).**

وتی: بەردەوام قازی بووم، یان لەدوای ئەوە لە قەزایەکدا شکم بۆ دروست نەبووە.

## ٨- دەروازەی: صوڵح

**٣٢١٥-** عَنْ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(الصُّلْحُ جَائِزٌ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ؛ إِلاَّ صُلْحاً حَرَّمَ حَلاَلاً أَوْ أَحَلَّ حَرَاماً، وَالْمُسْلِمُونَ عَلَى شُرُوطِهِمْ؛ إِلاَّ شَرْطاً حَرَّمَ حَلاَلاً أَوْ أَحَلَّ حَرَاماً).** [ت١٣٥٢/ جه٢٣٥٣]

ولم يذكر ابن ماجه الشروط.

* صحيح.

لە عەمری کوڕی عەوفی موزەنییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(صولح لە نێوان موسڵمانان دروستە، مەگەر صولحێك حەڵاڵێك حەرام بکات یان صولحێك حەرامێك حەڵاڵ بکات).**

## ٩- دەروازەی: قەڵەم لەسەر سیان هەڵگیراوە

**٣٢١٦-** عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ**).

* صحيح. [د٤٤٠٣/ ت١٤٢٣/ جه٢٠٤٢]

**لە عەلییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (قەڵەم لەسەر سیان هەڵگیراوە: لەسەر خەوتوو تا بەئاگا دێت، و لەسەر منداڵ تا باڵغ دەبێت، و لەسەر شێت تا دەژنەوێت).**

## ١٠- دەروازەی: هەڵە و لەبیرچوون و ناچارکردن

**٣٢١٧-** عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قال: (**إِنَّ اللهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ**). [جه٢٠٤٥]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (خودا لەسەر ئومەتەکەم هەڵە و لەبیرچوون و ئەوەی ناچار دەکرێت لەسەری هەڵگرتووە).**

## ١١- دەروازەی: هیچ کەس بە تاوانی کەسێکی تر ناگیرێت

**٣٢١٨-** عَنْ أَبِي رِمْثَةَ قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي نَحْوَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لِأَبِي: (**ابْنُكَ هَذَا**)؟ قَالَ: إِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، قَالَ: (**حَقًّا**)؟ قَالَ أَشْهَدُ بِهِ. قَالَ فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ضَاحِكاً مِنْ ثَبْتِ شَبَهِي فِي أَبِي، وَمِنْ حَلِفِ أَبِي

عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: (أَمَا إِنَّهُ لاَ يَجْنِي عَلَيْكَ، وَلاَ تَجْنِي عَلَيْهِ)، وَقَرَأَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾[الأنعام:١٦٤]. [د٤٤٩٥/ ٤٨٤٧ن/ مي٢٤٣٣]

* صحيح.

له "أبي رِمْثَة"وه، وتی: لەگەڵ باوکم روو بە پێغەمبەر(ﷺ) رۆیشتین، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە باوکمی فەرموو: **(ئەمە کوڕتە؟)**، وتی: بەڵێ، بە خودای کەعبە، فەرمووی: **(بە حەق بەو جۆرەیە؟)**، وتی: شایەتی پێ دەدەم، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەندە و پێکەنینێکی بۆ کرد لە یەکلابوونەوەی شێوەم بە باوکم و لە سوێند خواردنی باوکم لەسەر من، پاشان پێغەمبەر فەرمووی: **(تاوانی ئەو بە کۆڵی تۆ نییە و تاوانی تۆ بە کۆڵی ئەو نییە)**، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمەی خوێندەوە:﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾[الأنعام:١٦٤].

## ١٢- دەروازەی: ئەوە بەو جۆرە بوو قەزاوەتمان پێ کرد

**٣٢١٩**- عَنِ الْحَكَمِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: أَتَيْنَا عُمَرَ فِي الْمُشَرَّكَةِ فَلَمْ يُشَرِّكْ، ثُمَّ أَتَيْنَاهُ الْعَامَ الْمُقْبِلَ فَشَرَّكَ، فَقُلْنَا لَهُ، فَقَالَ: تِلْكَ عَلَى مَا قَضَيْنَاهُ، وَهَذِهِ عَلَى مَا قَضَيْنَا. [مي٦٧١]

* إسناده جيد.

لە حەکەمی کوڕی مەسعوودەوە، وتی: دەربارەی "المشَرَّكة-میراتییەکی هاوبەش[1]" هاتین بۆ لای عومەر، هاوبەشی پێ نەکرد، پاشان ساڵی داهاتوو هاتین بۆ لای بەشداری پێ کرد، لەو بارەیەوە پێمان وت، ئەویش وتی: ئەوە بەو جۆرەی قەزاوەتمان پێ کرد و ئەمەش بەو جۆرەی قەزاوەتمان پێ کرد.

[1] المشركة: بریتییە لە میراتیەك لە نێوان مێرد و دایك و برایەکی دایکی و برایەکی باوك و دایکی یان زیاتر-و.

## بەشی یەکەم

## تاوانەکان و برینداریيەکان

### ١- دەروازەی: ((هەر کەس چەك دژ بە ئێمە هەڵبگرێت لە ئێمە نییە))

**٣٢٢٠-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاَحَ فَلَيْسَ مِنَّا). [خ٦٨٧٤/ م٩٨]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس دژ بە ئێمە چەك هەڵبگرێت لە ئێمە نییە).**

**٣٢٢١-** (م) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا الْمُسْلِمَانِ، حَمَلَ أَحَدُهُمَا عَلَى أَخِيهِ السِّلاحَ، فَهُمَا عَلَى جُرُفِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا قَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، دَخَلاَهَا جَمِيعاً).** [م٢٨٨٨]

(م) لە ئەبی بەکرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر دوو موسڵمان، یەکێکیان چەکی دژ بە براکەی هەڵگرت، هەردووکیان لە لێواری دۆزەخدان، گەر یەکێکیان هاوەڵەکەی خۆی کوشت هەموویان دەچنە ناو ئاگرەوە).**

### ٢- دەروازەی: ئەوەی خوێنی موسڵمانی پێ موباح دەبێت

**٣٢٢٢-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ؛ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، والْمُفَارِقُ لِدِينِهِ التَّارِكُ لِلْجَمَاعَةِ).** [خ٦٨٧٨/ م١٦٧٦]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خوێنی مرۆیەکی موسڵمان حەڵاڵ نییە شایەتی بدات (لا إله إلا الله، و من پێغەمبەری**

**خودام)، مەگەر بە یەکێك لەم سیانە: نەفس بە نەفس، و پیری زیناکار، و جیابووەوە لە ئاینەکەی و وازهێنەر لە کۆمەڵ).**

## ٣- دەروازەی: تاوانی ئەو کەسەی کوشتنی داهێنا

**٣٢٢٣**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تُقْتَلُ نَفسٌ ظُلْماً، إلاَّ كانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا، لأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ).**

[خ٣٣٣٥/ م١٦٧٧]

(ق) لە عەبدولڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر نەفسێك بە زوڵم بکوژرێت بەشێك لە خوێنەکەی بە گەردنی یەکەمین ڕۆڵەی ئادەمە، چونکە ئەو یەکەمین کەس بوو کوشتنی داهێنا).**

## ٤- دەروازەی: گوناهی تاوانی کوشتن

**٣٢٢٤**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَوَّلُ مَا يُقْضى بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ).** [خ٦٥٣٣/ م١٦٧٨]

(ق) لە عەبدولڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(یەکەمین شتێك لە نێوان خەڵك قەزاوەتی پێ دەکرێت خوێنە).**

**٣٢٢٥**- (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَزَالُ الْمُؤْمِنُ فِي فُسْحَةٍ مِنْ دِينِهِ مَا لَمْ يُصِبْ دَماً حَرَاماً).** [خ٦٨٦٢]

(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بەردەوام باوەڕدار لەبەرینیدایە لە ئاینیدا گەر تووشی خوێنی حەرام نەبووبێت).**

## ٥- دەروازەی: تاوانی ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت

**٣٢٢٦-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى فِيهِ خالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً. وَمَنْ تَحَسَّى سُمّاً فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً. وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ، فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَجَأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً).

[خ٥٧٧٨ (١٣٦٥)/ م١٠٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە چیایەك خۆی هەڵبدێرێ و خۆی بکوژێت ئەو لە ئاگری دۆزەخ بە نەمری و بۆ هەتاهەتا تیایدا خۆی هەڵدەدێرێ، هەر کەس ژەهر بخواتەوە و خۆی بکوژێت ژەهرەکەی لە دەستیدا لەناو ئاگری دۆزەخ بە نەمری و بۆ هەتاهەتا دەیخواتەوە، هەر کەس بە ئاسنێك خۆی بکوژێت لەناو ئاگری دۆزەخ ئاسنەکەی بە دەستەوەیە و دەیکات بە سکی خۆیدا و بۆ هەتاهەتا بە نەمری تیایدا دەمێنێتەوە).**

## ٦- دەروازەی: تۆڵەکردنەوە لە نەفسدا و هاوشێوەبوون تیایدا

**٣٢٢٧-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: عَدَا يَهُودِيٌّ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى جارِيَةٍ، فَأَخَذَ أَوْضاحاً كانَتْ عَلَيْهَا، وَرَضَخَ رَأْسَهَا فَأَتَى بِهَا أَهْلُهَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهْيَ فِي آخِرِ رَمَقٍ وَقَدْ أُصْمِتَتْ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ قَتَلَكِ؟ فُلانٌ)؟ لِغَيْرِ الَّذِي قَتَلَهَا، فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا: أَنْ لاَ، قَالَ: فَقَالَ لِرَجُلٍ آخَرَ غَيْرِ الَّذِي قَتَلَهَا، فَأَشَارَتْ: أَنْ لاَ، فَقَالَ: (فَفُلاَنٌ)؟ لِقَاتِلِهَا، فَأَشَارَتْ: أَنْ نَعَمْ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَرُضِخَ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ. [خ٥٢٩٥ (٢٤١٣)/ م١٦٧٢]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پیاوێکی یەهوودی لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) دەستدرێژی لە جاریەیەك کرد، ئەو خشڵانەی بە جاریەکەوە بوو بردبووی، سەری نابووە نێوان دوو بەرد و دایپۆشی بوو، خانەوادەکەی جاریەکەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەو لە دوایین ساتەکانی گیانسپاردن بوو،

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کێ تۆی کوشت؟ فلان بوو؟)**، ناوی کەسێکی تر جیا لەوەی کوشتبووی، بە سەر ئاماژەی کرد، نەخێر، وتی: ناوی پیاوێکی تری هێنا جیا لەوەی کوشتبووی، بە سەر ئاماژەی کرد نەخێر، پێغەمبەر فەرمووی: **(کەوابوو فلان بوو؟)**، ناوی بکوژەکەی هێنا، بەسەری ئاماژەی کرد بەڵێ، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی کرد سەریان خستە نێوان دوو بەرد و بەردەبارانیان کرد.

- وفي رواية لهما: فَأُخِذَ الْيَهُودِيُّ فَاعْتَرَفَ. [خ٢٤١٣]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیاندا: یەهوودییەکە گیرا و دانینا بە تاوانەکەیدا.**

## ٧- دەروازەی: پاشگەزبوونەوە

**٣٢٢٨-** (ق) عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَدِمَ أُنَاسٌ مِنْ عُكْلٍ أَوْ عُرَيْنَةَ، فَاجْتَوَوُا المدِينَةَ، فَأَمَرَهُمُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِلِقَاحٍ، وَأَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا، فَانْطَلَقُوا، فَلَمَّا صَحُّوا، قَتَلُوا رَاعِيَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَاسْتَاقُوا النَّعَمَ، فَجَاءَ الْخَبَرُ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ، فَبَعَثَ فِي آثارِهِمْ، فَلَمَّا ارْتَفَعَ النَّهَارُ جِيءَ بِهِمْ، فَأَمَرَ فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسُمِرَتْ أَعْيُنُهُمْ، وَأُلْقُوا فِي الْحَرَّةِ، يَسْتَسْقُونَ فَلاَ يُسْقَوْنَ.

قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: فَهؤُلاَءِ سَرَقُوا، وَقَتَلُوا، وَكَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ، وَحَارَبُوا اللهَ وَرَسُولَهُ.

[خ٢٣٣/ م١٦٧١]

**(ق) لە ئەبی قیلابەوە، لە ئەنەسەوە، وتی: خەڵکانێك لە "عُكْل" یان لە "عُرَيْنَة" هاتن و مانەوەی مەدینەیان پێنەکەوت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردن بە خواردنەوەی شیر و میزی حوشتر، ئەوانیش رۆیشتن، کاتێ چاکبوونەوە شوانەکەی پێغەمبەریان(ﷺ) کوشت و حوشترەکانیان دایەبەر، سەرلەبەیانی هەواڵ هات، پێغەمبەر خەڵکی رەوانە کرد بەدوایاندا، کە رۆژ بەرزبوویەوە ئەوانیان هێنا، فەرمانی کرد دەست و لاقیانی بڕییەوە و بزماری گەرم بە چاویاندا هێنرا و هەڵدرانە بەر خۆر و گەرما، داوای ئاویان دەکرد و پێیان نەدەدرا.**

ئەبو قیلابە دەڵێت: ئەوانە دزییان کردبوو و بە کوشتن هەستابوون و لەدوای ئیمانیان بێباوەڕ بووبوون و دژ بە خودا و پێغەمبەر جەنگابوون.

## ٨- دەروازەی: موسڵمان بە بێباوەڕ ناکوژرێت

**٣٢٢٩**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ**).

* حسن صحيح. [د٤٥٠٦/ ت١٤١٣/ جه٢٦٥٩]

[وانظر: **٣٢٩، ٢١٧٦**].

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (باوەڕدار بە بێباوەڕ ناکوژرێتەوە).**

## ٩- دەروازەی: گەر کۆمەڵێك لە تاوانێکدا هاوبەش بن

**٣٢٣٠**- (خ) عَنِ الشَّعْبِيِّ: فِي رَجُلَيْنِ شَهِدَا عَلَى رَجُلٍ أَنَّهُ سَرَقَ، فَقَطَعَهُ عَلِيٌّ، ثُمَّ جَاءَا بِآخَرَ وَقَالاَ: أَخْطَأْنَا، فَأَبْطَلَ شَهَادَتَهُمَا، وَأُخِذَا بِدِيَةِ الْأَوَّلِ، وَقَالَ: لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكُمَا تَعَمَّدْتُمَا، لَقَطَعْتُكُمَا.

[خ. الديات، باب ٢١]

**(خ) لە شەعبییەوە: دەربارەی دوو پیاو شایەتییان دا لەسەر پیاوێك ئەو دزی کردووە، عەلی دەستی بڕی، پاشان ئەو دوانە کەسێکی تریان هێنا وتیان هەڵەمان کردووە، شایەتییەکەیانی پووچ کردەوە و خوێنی یەکەمیانی لێ وەرگرتن، وتی: گەر بمزانییایە ئێوە بە ئەنقەست ئەو کارەتان کردووە دەستم دەبڕین.**

**٣٢٣١**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَتَلَ نَفَراً خَمْسَةً، أَوْ سَبْعَةً، بِرَجُلٍ وَاحِدٍ قَتَلُوهُ قَتْلَ غِيلَةٍ، وَقَالَ عُمَرُ: لَوْ تَمَالأَ عَلَيْهِ أَهْلُ صَنْعَاءَ، لَقَتَلْتُهُمْ جَمِيعاً. [ط١٦٢٣]

**لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە: عومەری کوڕی خەتاب دەستەیەکی کوشتەوە، پێنج یان حەوت، بە یەك پیاو کە بە فێڵ و بە نهێنی کوشتبوویان، عومەر وتی: گەر ئەهلی صەنعا لەسەری هاوکاربوونایە هەموویانم دەکوشت.**

## ١٠- دەروازەی: باوك بە کوڕەکەی ناکوژرێتەوە

**٣٢٣٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تُقَامُ الْحُدُودُ فِي الْمَسَاجِدِ، وَلاَ يُقْتَلُ الْوَالِدُ بِالْوَلَدِ)**.　[ت١٤٠١/ جه٢٥٩٩/ مي٢٤٠٢]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (لە مزگەوتەکان "الحدود" جێبەجێ ناکرێن، و باوك بە کوڕەکەی ناکوژرێتەوە).**

## ١١- دەروازەی: "القسامة[1]"

**٣٢٣٣-** (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةَ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمْ، فَأُخْبِرَ مُحَيِّصَةُ أَنَّ عَبْدَ اللهِ قُتِلَ وَطُرِحَ فِي فَقِيرٍ . أَوْ عَيْنٍ . فَأَتَى يَهُودَ فَقَالَ: أَنْتُمْ وَاللهِ قَتَلْتُمُوهُ، قالُوا: مَا قَتَلْنَاهُ وَاللهِ. ثُمَّ أَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَوْمِهِ فَذَكَرَ لَهُمْ، فَأَقْبَلَ هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ، وَهُوَ أَكْبَرُ مِنْهُ، وَعَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ سَهْلٍ، فَذَهَبَ لِيَتَكَلَّمَ، وَهْوَ الَّذِي كانَ بِخَيْبَرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لِمُحَيِّصَةَ: (كَبِّرْ كَبِّرْ)، يُرِيدُ السِّنَّ. فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِمَّا أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ، وَإِمَّا أَنْ يُؤْذِنُوا بِحَرْبٍ)**. فَكَتَبَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَيْهِمْ بِهِ، فَكَتَبُوا: مَا قَتَلْنَاهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِحُوَيِّصَةَ وَمُحَيِّصَةَ وَعَبْدِ الرَّحْمنِ: **(أَتَحْلِفُونَ، وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ)**؟ فَقَالُوا: لاَ، قَالَ: **(أَفَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ)**؟ قَالُوا: لَيْسُوا بِمُسْلِمِينَ. فَوَدَاهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ عِنْدِهِ مِائَةَ نَاقَةٍ حَتَّى أُدْخِلَتِ الدَّارَ. قَالَ سَهْلٌ: فَرَكَضَتْنِي مِنْهَا نَاقَةٌ.　[خ٧١٩٢ (٢٧٠٢)/ م١٦٦٩]

**(ق) لە سەهلی کوڕی ئەبی حەسمەوە: عەبدوڵای کوڕی سەهل و موحەییصە بە هۆی ناخۆشییەك تووشیان هات ڕۆیشتن بۆ خەیبەر، هەواڵ بە موحەییصە درا عەبدوڵا کوژراوە و هەڵدراوەتە چاڵە ئاوێك-یان چاوگەیەك- هات بۆ لای یەهوود و وتی: سوێند بە خودا ئێوە کوشتووتانە، وتیان: سوێند بە خودا، ئێمە نەمانکوشتووە،**

[1] القسامة: سوێندێکە کەسوکاری کوژراوەکە دەیخۆن-و.

پاشان هاتەوە[1] تا گەیشتەوە بە هۆزەکەی و بۆی باس کردن، ئەو و براکەی کە ناوی حوەییصە بوو و لە ئەو گەورەتر بوو و عبدالرحمانی کوڕی سەهل هاتن، موحەییصە ڕۆیشت تا قسە بکات، چونکە ئەو بوو لە خەیبەر بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە موحەییصەی فەرموو: **(گەورەتر لە تەمەن پێش بخە)**، مەبەستی تەمەنیان بوو، بۆیە حوەییصە قسەی کرد و پاشان موحەییصە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی[2]: **(یان خوێنی هاوەڵەکەتان بدەن یان جەنگ ڕادەگەیەنین)**، پێغەمبەری خودا ئەوەی بۆ نووسین، ئەوانیش نووسییانەوە: ئێمە نەمانکوشتووە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە حوەییصە و موحەییصە و عبدالرحمانی فەرموو: **(ئایا ئێوە سوێند دەخۆن و شایستە بن بە خوێنی هاوەڵەکەتان؟)**، وتیان: نەخێر، فەرمووی: **(ئایا یەهوود سوێندتان بۆ دەخۆن؟)**، وتیان: ئەوان موسڵمان نین، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لای خۆیەوە سەد حوشتری کردە خوێنی و برانەوە بۆ ماڵەوە، سەهل وتی: یەکێك لەو حوشترانە لەقەیەکی لێدام.

- وفي رواية لهما: فَكَرِهَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يُبْطِلَ دَمَهُ، فَوَادَهُ مِائَةً مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ. [خ٦٨٩٨]

لە ڕیوایەتێکی هەردووکیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لای ناپەسەند بوو خوێنەکەی بەفیڕۆ بڕوات، بۆیە سەد حوشتری صەدەقەی کردە خوێنی.

٣٢٣٤- (م) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ـ مَوْلَى مَيْمُونَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنَ الأَنْصَارِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَقَرَّ الْقَسَامَةَ عَلَى مَا كَانَتْ عَلَيْهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ. [م١٦٧٠]

لە ئەبی سەلەمەی کوڕی عبدالرحمان و سولەیمانی کوڕی یەسارەوە -مەولای مەیموونە، هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- لە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)

---

[1] واتە: موحەییصە هاتەوە-و.

[2] واتە: پێغەمبەر(ﷺ) بۆ یەهوودی نووسی و پێی فەرموون-و.

لە ئەنصار: پێغەمبەری خودا "القسامة[1]"ی جێگیر کرد بەو جۆرەی لە سەردەمی نەفامیدا هەبوو.

## ١٢- دەروازەی: پەسەندی لێبووردن

**٣٢٣٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رُفِعَ إِلَيْهِ شَيْءٌ فِيهِ قِصَاصٌ؛ إِلاَّ أَمَرَ فِيهِ بِالْعَفْوِ. [د٤٤٩٧/ ن٤٧٩٧/ جه٢٦٩٢]

* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: هەر کات پێغەمبەرم(ﷺ) بینی بێت شتێك تۆڵەسەندنەوەی بۆ بەرزکرابێتەوە تیایدا فەرمانی کردووە بە لێبوردن.**

**٣٢٣٦-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَا مِنْ رَجُلٍ يُجْرَحُ فِي جَسَدِهِ جِرَاحَةً، فَيَتَصَدَّقُ بِهَا؛ إِلاَّ كَفَّرَ اللهُ عَنْهُ مِثْلَ مَا تَصَدَّقَ بِهِ**).

* صحيح بشواهده، ورجاله رجال الصحيح. [حم٢٢٧٠١]

**لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەر پیاوێك برینێك بکرێتە جەستەی و بیکات بە صەدەقە خودا بە نموونەی ئەوەی کردوویەتی بە صەدەقە گوناهی لێ هەڵدەوەرێنێ).**

---

[1] القسامة: سوێندی کەسوکاری کوژراو-و.

## بەشی دووەم

## خوێندانەکان

### ١- دەروازەی: بڕ و ئەندازەی خوێن

**٣٢٣٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَطَبَ يَوْمَ الْفَتْحِ بِمَكَّةَ، فَكَبَّرَ ثَلاَثاً، ثُمَّ قَالَ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، صَدَقَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ، أَلاَ إِنَّ كُلَّ مَأْثُرَةٍ كَانَتْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تُذْكَرُ وَتُدْعَى مِنْ دَمٍ أَوْ مَالٍ تَحْتَ قَدَمَيَّ؛ إِلاَّ مَا كَانَ مِنْ سِقَايَةِ الْحَاجِّ وَسِدَانَةِ الْبَيْتِ).

ثُمَّ قَالَ: (أَلاَ إِنَّ دِيَةَ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ، مَا كَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا: مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ، مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلاَدُهَا). واللفظ لأبي داود. [د٤٥٤٧/ ن٤٨٠٥/ جه٢٦٢٧/ مي٢٤٢٨]

* حسن.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: ڕۆژی فەتح لە مەککە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاریدا، سێ جار تەکبیری کرد، پاشان فەرمووی: (**"لا إله إلا الله وحده-خودا تاق و تەنهایە و هیچ خودایەك جگە لە ئەو بوونی نییە"، ڕاستی کرد لە بەڵێنەکەی، و بەندەکەی خۆی سەرخست و بەتەنها ئەحزابی بەزاند، دەزانن هەر فەخر و شانازییەکی سەردەمی نەفامی باس بکرێ و داوا بکرێت لە خوێن یان لە ماڵ و سامان لەژێر ئەم دوو پێیەمدایە، مەگەر لە ئاودانی حاجیان و زەیەوانی بەیت(سدانة البيت)**).

پاشان فەرمووی: (**دەزانن خوێنی بەهەڵە کوشتنی شێوە ئەنقەست، ئەوەی بە قەمچی و دارعەسایە: سەد حوشترە، لەوانە چلیان بەچکەکانیان لە سکیاندا بێت**[1])، لەفزەکە بۆ ئەبو داود دەگەڕێتەوە.

---

[1] واتە: گەر شەست حوشتر چلیان مێ بن و ئاوس بن دەبن بە سەد حوشتر و خوێنی کەسەکەیە-و.

**٣٢٣٨**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً دُفِعَ إِلَى أَوْلِيَاءِ الْمَقْتُولِ، فَإِنْ شَاؤُوا قَتَلُوا، وَإِنْ شَاؤُوا أَخَذُوا الدِّيَةَ، وَهِيَ: ثَلاَثُونَ حِقَّةً، وَثَلاَثُونَ جَذَعَةً، وَأَرْبَعُونَ خَلِفَةً، وَمَا صَالَحُوا عَلَيْهِ فَهُوَ لَهُمْ)** ، وَذَلِكَ لِتَشْدِيدِ الْعَقْلِ.

* حسن. [ت١٣٨٧/ جه٢٦٢٦]

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس بە ئەنقەست باوەڕدارێك بکوژێت دەدرێت بە کەسوکاری کوژراوەکە، گەر بیانەوێت دەیکوژنەوە، گەر بیشیانەوێ خوێن وەردەگرن، ئەوەش: سی "حِقَّة"[(١)] و سی "جَذَعَة"[(٢)] و چل "خَلِفَة"[(٣)]یە، ئەوەی لەسەری سوڵح دەکەن بۆ ئەوانە)، ئەوەش وەك توندکردنەوە لە خوێنی کەسی کوژراو.**

**٣٢٣٩**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَضَى أَنَّ مَنْ قُتِلَ خَطَأً فَدِيَتُهُ مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ: ثَلاَثُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ، وَثَلاَثُونَ بِنْتَ لَبُونٍ، وَثَلاَثُونَ حِقَّةً، وَعَشَرَةُ بَنِي لَبُونٍ ذَكَرٍ.

وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُقَوِّمُ دِيَةَ الْخَطَإِ عَلَى أَهْلِ الْقُرَى، أَرْبَعَمِائَةِ دِينَارٍ، أَوْ عَدْلَهَا مِنَ الْوَرِقِ وَيُقَوِّمُهَا عَلَى أَثْمَانِ الْإِبِلِ، فَإِذَا غَلَتْ رَفَعَ فِي قِيمَتِهَا، وَإِذَا هَاجَتْ رُخْصاً نَقَصَ مِنْ قِيمَتِهَا.

بَلَغَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَا بَيْنَ أَرْبَعِمِائَةِ دِينَارٍ إِلَى ثَمَانِمِائَةِ دِينَارٍ، وَعَدْلُهَا مِنَ الْوَرِقِ ثَمَانِيَةُ آلاَفِ دِرْهَمٍ.

وَقَضَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى أَهْلِ الْبَقَرِ مِائَتَيْ بَقَرَةٍ، وَمَنْ كَانَ دِيَةُ عَقْلِهِ فِي الشَّاءِ فَأَلْفَيْ شَاةٍ. [د٤٥٤١، ٤٥٦٤/ ن٤٨١٥/ جه٢٦٣٠]

---

(١) حقة: ئەو حوشترەیە سێ ساڵی تەواو کردووە و پێی لە چوار ناوە–و.

(٢) جذعة: ئەو حوشترەیە چوار ساڵی تەواو کردووە و پێی لە پێنج ناوە–و.

(٣) خليفة: بریتییە لە حوشتری ئاوس–و.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) قەزاوەتی کرد هەر کەس بە هەڵە بکوژرێت فیدییەکەی سەد حوشترە: سییان "بنت مخاض[1]"ن، سییان "بنت لبُون[2]"ن و سییان "حِقّة[3]"ن، و دەیان "بني لبون[4]"ی نێرن.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوێنی هەڵەی بەسەر ئەهلی ئاوەدانیدا دەقەبڵاند بە چوارسەد دینار، یان هاوتای ئەوە لە زیو، یان دەیقەبڵاند لەسەر نرخی حوشترەکان، گەر گران بوونایە بەهاکەی بەرز دەکردنەوە، گەر هەرزانی تاوی بسەندبا لە بەهاکەی کەم دەکردنەوە.

لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەهاکەیان گەیشتە چوارسەد دینار بۆ هەشتسەد دینار، هاوتای ئەوە لە زیو هەشت هەزار درهەم.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) قەزاوەتی کرد بەسەر ئەهلی مانگادا بە دووسەد مانگا، هەر کەسیش خوێنەکەی لە مەڕ و بزن بوو بە دوو هەزار.

- زاد أبو داود والنسائي: وَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ الْعَقْلَ مِيرَاثٌ بَيْنَ وَرَثَةِ الْقَتِيلِ عَلَى قَرَابَتِهِمْ، فَمَا فَضَلَ فَلِلْعَصَبَةِ**). وَقَضَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّ عَقْلَ الْمَرْأَةِ بَيْنَ عَصَبَتِهَا مَنْ كَانُوا، لاَ يَرِثُونَ مِنْهَا شَيْئاً؛ إِلاَّ مَا فَضَلَ عَنْ وَرَثَتِهَا، وَإِنْ قُتِلَتْ فَعَقْلُهَا بَيْنَ وَرَثَتِهَا، وَهُمْ يَقْتُلُونَ قَاتِلَهُمْ.

ئەبو داود و نەسائی ئەمەیان زیاد کردووە: هەروەها پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خوێن میراتە لە نێوان میراتگرانی کوژراوەکە لەسەر نزیکییان، هەرچی زیاد بوو بۆ "عَصَبَة[5]"یە**)، هەروەها پێغەمبەری خودا(ﷺ) قەزاوەتی کرد خوێنی

---

[1] بنت مخاض: ئەو حوشترەی ساڵێکی تەواو کردووە و پێی لە دوو ناوە-و.

[2] بنت لبون: ئەو حوشترە مێیەی دوو ساڵی تەواو کردووە و پێی لە سێ ناوە-و.

[3] حقة: ئەو حوشترەیە سێ ساڵی تەواو کردووە و پێی لە چوار ناوە-و.

[4] بني لبون: ئەو حوشترە نێرەی دوو ساڵی تەواو کردووە و پێی لە سێ ناوە-و.

[5] میراتگری نزیکی کوژراوە لە کوڕ و کچ-و.

ئافرەت لە نێوان "عصبة"کەیدایە هەر کەس بن، شتێکی لێ بە میرات ناگرن، جگە لەوەی لەسەر وەرەسەکەی زیادە، گەر کوژرابێت خوێنەکەی لە نێوان میراتگرانیدایە، ئەوان بکوژەکەیان دەکوژن.

- وزاد أبو داود في رواية: وَقَضَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي الْأَنْفِ إِذَا جُدِعَ: الدِّيَةَ كَامِلَةً، وَإِذَا جُدِعَتْ ثَنْدُوَتُهُ: فَنِصْفُ الْعَقْلِ خَمْسُونَ مِنَ الْإِبِلِ، أَوْ عَدْلُهَا مِنَ الذَّهَبِ أَوْ الْوَرِقِ، أَوْ مِائَةُ بَقَرَةٍ، أَوْ أَلْفُ شَاةٍ.

وَفِي الْيَدِ: إِذَا قُطِعَتْ نِصْفُ الْعَقْلِ. وَفِي الرِّجْلِ: نِصْفُ الْعَقْلِ.

وَفِي الْمَأْمُومَةِ: ثُلُثُ الْعَقْلِ، ثَلاَثٌ وَثَلاَثُونَ مِنَ الْإِبِلِ وَثُلُثٌ، أَوْ قِيمَتُهَا مِنَ الذَّهَبِ أَوْ الْوَرِقِ، أَوْ الْبَقَرِ، أَوْ الشَّاءِ، وَالْجَائِفَةُ مِثْلُ ذَلِكَ.

وَفِي الْأَصَابِعِ: فِي كُلِّ أُصْبُعٍ عَشْرٌ مِنَ الْإِبِلِ. وَفِي الْأَسْنَانِ: فِي كُلِّ سِنٍّ خَمْسٌ مِنَ الْإِبِلِ.

وَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَيْسَ لِلْقَاتِلِ شَيْءٌ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَارِثٌ، فَوَارِثُهُ أَقْرَبُ النَّاسِ إِلَيْهِ، وَلاَ يَرِثُ الْقَاتِلُ شَيْئاً).

ئەبو داود لە ریوایەتێکدا ئەمەی زیاد کردووە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی لووت گەر ببڕێت قەزاوەتی کرد بە خوێنی تەواو، گەر لێوارەکانی لووت بڕا بێت: نیوەی خوێن کە پەنجا حوشترە، یان هاوتای ئەوە لە زێڕ یان زیو، یان سەد مانگا، یاخود هەزار مەڕ و بزن[1].

دەربارەی دەست گەر ببڕێت قەزاوەتی کرد بە نیوەی خوێن، هەروەها لە لاقدا بە نیوەی خوێن، لە برینداری سەردا سێیەکی خوێن، سی و سێ حوشتر، هەروەها سێیەکێك، یان بەهای ئەوە لە زێڕ و زیو، یان مانگا، یان مەڕ و بزن، برینی سکیش بەهەمان شێوە.

لە پەنجەکاندا بۆ هەر پەنجەیەك دە حوشتر، لە دداندا، بۆ هەر دانێك پێنج حوشتر.

---

(١) پەنجا حوشتر یان سەد مانگا یان هەزار مەڕ و بزن نیوەی خوێنن-و.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(شتێك بۆ بکوژ نییە[1]، با میراتگریشی نەبێت، ئەوکات میراتگرەکەی نزیکترین کەسە لە ئەوەوە[2]، بکوژ هیچ میراتێك ناگرێت)**.

- ولفظ النسائي وابن ماجه: وَإِذَا هَانَتْ نَقَصَ مِنْ قِيمَتِهَا عَلَى نَحْوِ الزَّمَانِ مَا كَانَ.

* حسن.

**لەفزەکەی نەسائی و ئیبن ماجە: گەر هەرزان بوو لە بەهاکەی دادەبەزێت بەپێی ئەوەی لە ڕۆژگاردایە.**

## ٢- دەروازەی: خوێنی ئەندامەکان و برین

[انظر الباب السابق].

**٣٢٤٠**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(الْأَصَابِعُ سَوَاءٌ، وَالْأَسْنَانُ سَوَاءٌ، الثَّنِيَّةُ وَالضِّرْسُ سَوَاءٌ، هَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ)**.

[د٤٥٥٩/ ت١٣٩١/ ن٤٨٦٤/ جه٢٦٥٠]

**لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (پەنجەکان یەکسانن، ددانەکانی پێشەوە و دواوە یەکسانن، ئەمە و ئەمە یەکسانن).**

- وعند الترمذي: (فِي دِيَةِ الْأَصَابِعِ: الْيَدَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ سَوَاءٌ، عَشْرٌ مِنَ الْإِبِلِ لِكُلِّ أُصْبُعٍ).

**لای ترمزی: (دەربارەی خوێنی پەنجەکان: دوو دەست و دوو لاق یەکسانن، دە حوشتر بۆ هەر پەنجەیەك).**

- وفي رواية لابن ماجه: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَضَى فِي السِّنِّ خَمْساً مِنَ الْإِبِلِ.

* صحيح.

---

[1] ئەو کەسەی هەڵدەستێت بە کوشتنی کەسی میراتلێگیراو شتێك لە میراتی لە کەسە کوژراوەکەوە پێ ناگات-و.

[2] واتە لە کوژراوەکەوە-و.

**لە ریوایەتێکی ئیبن ماجەدا: پێغەمبەر دەربارەی ددان قەزاوەتی کرد بە پێنج حوشتر.**

**٣٢٤١**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (فِي الْمَوَاضِحِ خَمْسٌ). [د٤٥٦٦/ ت١٣٩٠/ ن٤٨٦٧/ جه٢٦٥٥/ مي٢٤١٧]

* حسن صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە سەرشکان پێنج[1] هەیە).**

## ٣- دەروازەی: خوێنی کۆرپەلە

**٣٢٤٢**– (ق) عَنِ المغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: سَأَلَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ عَنْ إِمْلاَصِ المرْأَةِ ـ هِيَ الَّتِي يُضْرَبُ بَطْنُهَا فَتُلْقِي جَنِيناً ـ فَقَالَ: أَيُّكُمْ سَمِعَ مِنَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِيهِ شَيْئاً؟ فَقُلْتُ: أَنَا، فَقَالَ: مَا هُوَ؟ قُلْتُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (فِيهِ غُرَّةٌ: عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ). فَقَالَ: لاَ تَبْرَحْ حَتَّى تَجِيئَنِي بِالْمَخْرَجِ فِيما قُلْتَ. فَخَرَجْتُ، فَوَجَدْتُ مُحَمَّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ، فَجِئْتُ بِهِ، فَشَهِدَ مَعِي: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (فِيهِ غُرَّةٌ: عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ).
[خ٧٣١٧، ٧٣١٨ (٦٩٠٥، ٦٩٠٦)/ م١٦٨٣]

**(ق) لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە، وتی: عومەری کوڕی خەتاب پرسیاری کرد دەربارەی سکی ئافرەت–ئەو ئافرەتەی بە سکیدا دەکێشرێ و کۆرپەلەکەی لەباردەچێت– وتی: کێ لە ئێوە شتێکی لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستووە؟ وتم: من، وتی: ئەوە چییە؟ وتم: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (بەندەیەکی تێدا هەیە: پیاو یان ژن[2])، وتی: برۆ کەسێکی ترم بۆ بهێنە لەوەی وتت، منیش رۆیشتم محەمەدی کوڕی**

---

[1] واتە: پێنج حوشتر–و.

[2] واتە بەندەکە پیاو بێت یان ژن–و.

مەسلەمەم بینییەوە و هێنام بۆ لای، ئەو لەگەڵم شایەتیدا ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە فەرموویەتی: **(بەندەیەکی تێدایە: ژن یان پیاو).**

## ٤- دەروازەی: خوێن لەسەر کەسوکار

**٣٢٤٣-** عَنْ مَالِك، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لَيْسَ عَلَى الْعَاقِلَةِ عَقْلٌ فِي قَتْلِ الْعَمْدِ، إِنَّمَا عَلَيْهِمْ عَقْلُ قَتْلِ الْخَطَإِ.

وَعَنْهُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّهُ قَالَ: مَضَتِ السُّنَّةُ أَنَّ الْعَاقِلَةَ لاَ تَحْمِلُ شَيْئاً مِنْ دِيَةِ الْعَمْدِ؛ إِلاَّ أَنْ يَشَاؤُوا ذَلِكَ.

وَعَنْهُ: إِنَّ ابْنَ شِهَابٍ قَالَ: مَضَتِ السُّنَّةُ فِي قَتْلِ الْعَمْدِ حِينَ يَعْفُو أَوْلِيَاءُ الْمَقْتُولِ: أَنَّ الدِّيَةَ تَكُونُ عَلَى الْقَاتِلِ فِي مَالِهِ خَاصَّةً؛ إِلاَّ أَنْ تُعِينَهُ الْعَاقِلَةُ عَنْ طِيبِ نَفْسٍ مِنْهَا. [ط١٦١٨]

**لە مالیکەوە، لە هیشامی کوڕی عورووەوە، لە باوکییەوە: ئەو دەیوت: لە کوشتنی ئەنقەست هیچ لەسەر کەسوکار نییە، ئەوان تەنها خوێنی کوشتنی هەڵەیان لەسەرە[1].**

**هەر لە ئەوەوە: لە ئیبن شیهابەوە ئەو وتی: سوننەت بەوە گوزەری کردووە کەسوکار شان ناداتە ژێر خوێنی بەئەنقەست، مەگەر خۆیان ئەوەیان بوێت.**

**هەر لە ئەوەوە: ئیبن شیهاب وتی: سوننەت لە کوشتی ئەنقەست بەوە تێپەڕیوە کاتێ کەسوکاری کوژراو دەبوورن خوێنەکە لەسەر بکوژەکەیە لەماڵ و سامانی تایبەتی خۆی، مەگەر کەسوکار بۆخۆیان لە سینە بەرینییەوە یارمەتی بدەن.**

[1] واتە کەسوکاری بکوژەکە لە کوشتنی ئەنقەستدا کۆمەکی بکوژەکە ناکەن لە دانی خوێن، تەنها لە کوشتنی هەڵەدا لەسەریانە-و.

## ١- دەروازەی: حدوود[(١)] کەفارەتن[(٢)]

**٣٢٤٤-** (ق) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ . وَكَانَ شَهِدَ بَدْراً، وَهُوَ أَحَدُ النُّقَبَاءِ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ . أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ . وَحَوْلَهُ عِصَابَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ .: **(بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللهِ شَيْئاً، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ، وَلاَ تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُم وَأَرْجُلِكُمْ، وَلاَ تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ. فَمنْ وَفَّى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذلِكَ شَيْئاً فَعُوقِبَ فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذلِكَ شَيْئاً ثُمَّ سَتَرَهُ اللهُ فَهُوَ إِلَى اللهِ، إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ)**. فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذلِكَ. [خ١٨/ م١٧٠٩]

(ق) لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە(خوا لێی ڕازی بێت) ئەو لە غەزوەی بەدر ئامادە بووبوو، هەروەها ئەو یەکێك بوو لە نەقیبەکانی شەوی عەقەبە، پێغەمبەری خودا(ﷺ)-کە بە دەوریدا دەستەیەك لە هاوەڵان هەبوون- فەرمووی: **(بەیعەتم پێ بکەن لەسەر ئەوەی هاوەڵ بۆ خودا دانەنێن، و دزی نەکەن، و منداڵەکانی خۆتان نەکوژن، و بوختانێك لە نێوان دەست و پێتان هەڵنەبەستن، و لە چاکەدا یاخی نەبن، هەر کەس لە ئێوە وەفای بەمە کرد پاداشتەکەی لەسەر خودایە، هەر کەس تووشی شتێك لەوانە بوو و لە دنیا سزا درا ئەوە کەفارەتە بۆی، هەر کەس تووشی شتێك لەوانە بوو و پاشان خودا دایپۆشی ئەوە لە لای خودایە، گەر بیەوێت سزای دەدات، گەر بیەوێت لێی دەبووڕێت)**، ئێمەش لەسەر ئەوە بەیعەتمان پێ کرد.

**٣٢٤٥-** عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ أَصَابَ حَدّاً فَعُجِّلَ عُقُوبَتَهُ فِي الدُّنْيَا، فَاللهُ أَعْدَلُ مِنْ أَنْ يُثَنِّيَ عَلَى عَبْدِهِ الْعُقُوبَةَ فِي الْآخِرَةِ. وَمَنْ أَصَابَ حَدّاً فَسَتَرَهُ اللهُ عَلَيْهِ، وَعَفَا عَنْهُ، فَاللهُ أَكْرَمُ مِنْ أَنْ يَعُودَ إِلَى شَيْءٍ قَدْ عَفَا عَنْهُ)**.

* قال الذهبي: على شرطهما. [ك٣٦٦٤/ ت٢٦٢٦/ جه٢٦٠٤]

---

(١) کۆمەڵێك سزای دیاریکراون بۆ تاوان و پێشێلکاری ماف-و.

(٢) واتە سزادانەکەی دەبێتە کەفارەت بۆ گوناهەکەی-و.

لە عەلییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس تووشی حەددێك بوو و لە دنیا سزاکەی بۆ پێشکەوت، خودا دادپەروەرترە لەوەی دووبارە لە دوارۆژ سزای بەندەکەی بداتەوە، هەر کەس تووشی حەددێك بوو و خودا داپۆشی و لێیخۆش بوو، ئەوا خودا بەڕێزتر و بەخشندەترە لەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای شتێك لێی بووراوە).**

## ٢- دەروازەی: تکاکاری لە حدووددا بوونی نییە

**٣٢٤٦**- (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂: أَنَّ قُرَيْشاً أَهَمَّهُمْ شَأْنُ المَرْأَةِ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ، فَقَالُوا: وَمَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَقَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلاَّ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، حِبُّ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ)؟** ثُمَّ قامَ فَاخْتَطَبَ، ثُمَّ قَالَ: **(إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ، أَنَّهُمْ كانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الحَدَّ. وَايْمُ اللهِ، لَوْ أَنَّ فاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا).** [خ٣٤٧٥ (٢٦٤٨)/ م١٦٨٨]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت): خەم و پەژارەی ئافرەتێکی مەخزوومی کە دزی کرد بوو قورەیشی داگیر کرد، وتیان: کێ دەربارەی ئەو قسە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بکات؟ وتیان: کێ بوێری ئەو کارەی هەیە جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید، خۆشەویسی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ ئوسامە قسەی لەگەڵ کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئایا لە حەددێك لە حەددەکانی خودادا تکاکاری دەکەی؟)**، پاشان هەستا و وتاری دا، و پاشان فەرمووی: **(ئەوەی ئەوانەی پێش ئێوەی تیابرد ئەوە بوو گەر دەسەڵاتدار لە ناویاندا دزی بکردبایە وازیان لێ دەهێنا، گەر لاواز لە ناویاندا دزی بکردبایە حەدیان لەسەر ڕاست دەکردەوە، سوێند بە خودا گەر فاتیمەی کچی محەمەد دزی بکات دەستی دەبڕم).**

## ٣- دەروازەی: حەددی زینا و تاوانی بکەرەکەی

**٣٢٤٧**– (م) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**خُذُوا عَنِّي خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللهُ لَهُنَّ سَبِيلاً، الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ: جَلْدُ مِائَةٍ، وَنَفْيُ سَنَةٍ، وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ: جَلْدُ مِائَةٍ، وَالرَّجْمُ**). [م١٦٩٠]

(م) لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لێم وەریگرن، لێم وەریگرن، خودا رێگەی بۆ ئەوان کردەوە، کچ بە کوڕ سەد جەلد و نەفی کردنی ساڵێك، ژن بە پیاو، سەد جەلد و رەجم کردن)**.

**٣٢٤٨**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا زَنَى الرَّجُلُ خَرَجَ مِنْهُ الْإِيمَانُ، كَانَ عَلَيْهِ كَالظُّلَّةِ، فَإِذَا أَقْلَعَ رَجَعَ إِلَيْهِ الْإِيمَانُ**). [د٤٦٩٠/ ت: بإثر الحديث ٢٦٢٥]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر پیاو زینا بکات ئیمانی لێ دەردەچێت، ئیمانەکە لەسەر وەك پەڵە هەورە، گەر کۆتایی هێنا و دەستی هەڵگرت ئیمانی بۆ دەگەڕێتەوە)**.

**٣٢٤٩**– عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (**الْعَيْنَانِ تَزْنِيَانِ، وَالْيَدَانِ تَزْنِيَانِ، وَالرِّجْلَانِ تَزْنِيَانِ، وَالْفَرْجُ يَزْنِي**). [حم٣٩١٢]

* صحيح، وإسناده حسن.

[وانظر: في أن الزنى سبب في انتشار الأمراض **٣٩٢١**].

لە ئیبن مەسعوودەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەو فەرمووی: **(دوو چاو زینا دەکەن، دوو دەست زینا دەکەن، دوو لاق زینا دەکەن، داوێنیش زینا دەکات)**.

## ٤- دەروازەی: حەددی زیناکەری هاوسەردار بریتییە لە رەجم

**٣٢٥٠**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ـ وَهُوَ جَالِسٌ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ـ: إِنَّ اللهَ بَعَثَ مُحَمَّداً صلّى الله عليه وسلّم بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ

الْكِتَابَ، فَكَانَ مِمَّا أَنْزَلَ اللهُ آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَرَأْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا. رَجَمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ. فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ، أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: وَاللهِ مَا نَجِدُ آية الرَّجْمِ فِي كِتَابِ اللهِ، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللهُ. وَالرَّجْمُ فِي كِتَابِ اللهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أُحْصِنَ، مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الْحَبَلُ، أَوِ الاعْتِرَافُ. [خ٦٨٣٠ (٢٤٦٢)/ م١٦٩١]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە، وتی: عومەری کوڕی خەتاب–لەسەر مینبەری پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتبوو وتی: خودا محەمەدی بە حەق ڕەوانە کرد و کتێبی دابەزاند بۆ سەری، لەوەی خودا دایبەزاند ئایەتی ڕەجم بوو، خوێندمانەوە و ژنەوتمان و لێی حاڵیبووین، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕەجمی کرد و ئێمەش لەدوای ئەو ڕەجممان کرد، دەترسم ڕۆژگار لە خەڵکی درێژە بکێشێت یەکێك بڵێت: سوێند بە خودا، ئایەتی ڕەجم لە کتێبەکەی خودادا نابینینەوە، ئەوکات بە وازهێنان لە فەرزێك گومڕا ببن، ڕەجم لە کتێبەکەی خودادا حەقە لەسەر زیناکەرێك هاوسەردار بێت لە پیاوان و ژنان، گەر بەڵگە ڕاستبوویەوە، یان سکی پڕ بوو، یان بۆ خۆی دانی نا بە تاوانەکەدا.

**٣٢٥١**– (ق) عَنْ جابِرٍ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ زَنَى، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَتَنَحَّى لِشِقِّهِ الَّذِي أَعْرَضَ، فَشَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ، فَدَعَاهُ فَقَالَ: (**هَلْ بِكَ جُنُونٌ؟ هَلْ أَحْصِنْتَ**)؟ قَالَ: نَعَمْ. فَأَمَرَ بِهِ أَنْ يُرْجَمَ بِالْمُصَلَّى، فَلَمَّا أَذْلَقَتْهُ الْحِجَارَةُ جَمَزَ، حَتَّى أُدْرِكَ بِالْحَرَّةِ، فَقُتِلَ. [خ٥٢٧٠/ م١٦٩١]

(ق) لە لە جابرەوە: پیاوێك لە ئەسلەم هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو لە مزگەوت بوو، وتی: ئەو زینای کردووە، پێغەمبەر پشتی تێکرد، کەنارگیر بوو لەو لایەی پشتی تێڵکرد بوو، کابرا چوار شایەتی لەسەر خۆی دا زینای کردووە، پێغەمبەر بانگی کرد و فەرمووی: (**ئایا شێتێتیت تێدایە؟ ئایا ژنت هێناوە؟**)، وتی: بەڵێ، فەرمانی کرد لە نوێژگەکەدا[1] ڕەجم بکرێت، تا بەردەکان ئازاریان دا و هەڵهات، تا "الحرَّة[2]" گیرایەوە و کوژرا.

---

[1] شوێنێ بووە لە دەرەوەی مەدینە نوێژی جەژنەکانیان تێدا کردووە–و.

[2] شوێنێکە لە مەدینە–و.

## ٥- دەروازەی: حەددی زیناکەری بێ ژن و بێ مێرد

**٣٢٥٢-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خالِدٍ الْجُهَنِيِّ رضي الله عنهما، أَنَّهُمَا قالاَ: إِنَّ رَجُلاً مِنَ الأَعْرَابِ أَتَى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنْشُدُكَ اللهَ إِلاَّ قَضَيْتَ لِي بِكِتَابِ اللهِ، فَقَالَ الخَصْمُ الآخَرُ، وَهُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ: نَعَمْ، فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ، وَائْذَنْ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**قُلْ**). قالَ: إِنَّ ابْنِي كانَ عَسِيفاً عَلَى هَذَا، فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، وَإِنِّي أُخْبِرْتُ أَنَّ عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ، فَافتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَوَلِيدَةٍ، فَسَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ، فَأَخْبَرُونِي: أَنَّمَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عامٍ، وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللهِ: الْوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ رَدٌّ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عامٍ. اغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى امْرَأَةِ هَذَا، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا**). قَالَ: فَغَدَا عَلَيْهَا فَاعْتَرَفَتْ، فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَرُجِمَتْ.

[خ٢٧٢٤، ٢٧٢٥ (٢٣١٤، ٢٣١٥)/ م١٦٩٧، ١٦٩٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرە و زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، هەردووکیان وتیان: پیاوێك لە ئەعراب هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، بە خودا داوات لێ دەکەم بە کتێبەکەی خودا قەزاوەتم بۆ بکە، نەیارەکەی تر-کە لە ئەو فەقیهتر بوو- وتی: بەڵێ، بە کتێبەکەی خودا قەزاوەت بکە لە نێوانمان و مۆڵەتم بدە بڵێم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**بڵێ**)، وتی: کوڕەکەم کرێگرتەی ئەمە بووە، زینای لەگەڵ ژنەکەی[1] کردووە، من هەواڵم پێدا لەسەر کوڕەکەم ڕەجم هەیە، بە سەد مەڕ و جاریەیەك فیدیەم داوە، پرسیارم لە ئەهلی زانست کرد، هەواڵیان پێدام: لەسەر کوڕەکەم سەد جەلد و نەفی کردنی ساڵێك هەیە، لەسەر ژنی ئەم پیاوەش ڕەجم هەیە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، بە کتێبەکەی خودا قەزاوەت دەکەم لە نێوانتان، جاریەکە و مەڕەکان ڕەدکراوەن، لەسەر کوڕەکەت سەد جەلد و نەفی کردنی ساڵێك،**

[1] واتە لەگەڵ ژنی ئەم پیاوە-و.

**ئەی ئونەیس بەیانی بچۆ بۆ لای ئافرەتی ئەو پیاوە، گەر دانی نا بە تاوانەکەیدا رەجمی بکە)**، وتی: بەیانی رۆیشت بۆ لای و ئافرەتەکە دانی نا بە تاوانەکەیدا و پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکرد و رەجم کرا.

## ٦- دەروازەی: راستکردنەوەی حەد بەسەر ئەهلی زیمەدا

**٣٢٥٣-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ الْيَهُودَ جاؤُوا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَذَكَرُوا لَهُ أَنَّ رَجُلاً مِنْهُمْ وَامْرَأَةً زَنَيَا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(ما تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَأْنِ الرَّجْمِ)**؟ فَقَالُوا: نَفْضَحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ: كَذَبْتُمْ، إِن فِيهَا الرَّجْمَ، فَأَتَوْا بِالتَّوْرَاةِ فَنَشَرُوهَا، فَوَضَعَ أَحَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ، فَقَرَأَ ما قَبْلَهَا وَما بَعْدَهَا، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ: ارْفَعْ يَدَكَ، فَرَفَعَ يَدَهُ، فَإِذَا فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَالُوا: صَدَقَ يَا مُحَمَّدُ، فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَرُجِمَا.

قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ يَجْنَأُ عَلَى الْمَرْأَةِ يَقِيهَا الْحِجَارَةَ. [خ٣٦٣٥ (١٣٢٩)/ م١٦٩٩]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): یەهوود هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆیان باس کرد پیاوێك لەوان و ژنێك زینایان کردووە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموون: **(لە تەوراتدا دەربارەی رەجم چی دەبیننەوە؟)**، وتیان: رسوا و شەرمەزاریان دەکەین و جەلدیان لێ دەدەین، عەبدوڵای کوڕی سەلام وتی: ئێوە درۆ دەکەن، تەورات رەجمی تێدایە، تەوراتیان هێنا و کردیانەوە، یەکێکیان دەستی خستە سەر ئایەتی رەجم و پێش ئایەتەکە و دوای ئایەتەکەی خوێندەوە، عەبدوڵای کوڕی سەلام پێی وت: دەستت بەرزبکەرەوە، ئەویش دەستی بەرزکردەوە، بینیان ئایەتی رەجمی تێدایە، وتیان: ئەی محەمەد، راست دەکات[١]، ئایەتی رەجمی تێدایە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردن هەردووکیان رەجم کران.

عەبدوڵا وتی: پیاوەکەم بینی خۆی دەدا بەسەر ئافرەتەکەدا لە بەردەباران دەیپاراست.

---

[١] واتە عەبدوڵای کوڕی سەلام راست دەکات-و.

## ٧- دەروازەی: دواخستنی راستکردنەوەی حەد لەسەر ئافرەتی سکپڕ

**٣٢٥٤-** (م) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ أَتَتْ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَهِيَ حُبْلَى مِنَ الزِّنَى، فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ! أَصَبْتُ حَدّاً فَأَقِمْهُ عَلَيَّ. فَدَعَا نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَلِيَّهَا، فَقَالَ: (**أَحْسِنْ إِلَيْهَا، فَإِذَا وَضَعَتْ فَائْتِنِي بِهَا**)، فَفَعَلَ. فَأَمَرَ بِهَا نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَشُكَّتْ عَلَيْهَا ثِيَابُهَا، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَرُجِمَتْ، ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا. فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: تُصَلِّي عَلَيْهَا؟ يَا نَبِيَّ اللهِ! وَقَدْ زَنَتْ؟ فَقَالَ: (**لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً، لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَوَسِعَتْهُمْ. وَهَلْ وَجَدْتَ تَوْبَةً أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جَادَتْ بِنَفْسِهَا للهِ تَعَالَى**)؟. [م١٦٩٦]

(م) لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە: ئافرەتێك لە جوهەینە هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەو لە زیناوە سکی پڕ بووبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا تووشی حەد هاتووم بەسەرمدا جێبەجێی بکە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەلییەکەی بانگ کرد و فەرمووی: (**لەگەڵی چاك بە، گەر سکەکەی دانا بیهێنە بۆ لام**)، ئەویش بەو جۆرەی کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکرد و پۆشاکەکە لەبەردا توندکرایەوە و پاشان فەرمانی پێکرد و رەجم کرا، پاشان نوێژی لەسەر کرد، عومەر پێی وت: نوێژ لەسەری دەکەی، ئەی پێغەمبەری خودا، ئەو زینای کردووە؟ پێغەمبەر فەرمووی: (**بە تەوبەیەك تەوبەی کردووە گەر لە نێوان حەفتا لە ئەهلی مەدینە دابەش بکرێت بەشیان دەکات، ئایا تەوبەیەکت بینیوە باشتر لە تەوبەی ئەو نەفسی خۆی بەخشی بە خودا(تعالی)**).

## ٨- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی کاری قەومی "لوط" هاتووە

**٣٢٥٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ**). [د٤٤٦٢/ ت١٤٥٦/ جه٢٥٦١]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەر کەستان بینییەوە کاری قەومی "لوط"ی ئەنجام دەدا بکەر و بەرکار بکوژن**).

## ٩- دەروازەی: حەددی خواردنەوەی عارەق

**٣٢٥٦-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم ضَرَبَ فِي الخَمْرِ بِالجَرِيدِ وَالنِّعَالِ، وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ. [خ٦٧٧٣/ م١٧٠٦]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) لە خواردنەوەی عارەقدا بە پەلکە دارخورما و نەعل دەیدا لە عارەقخۆرەکە، ئەبوبەکر بە چل دار جەلدی دەکرد.**

- وفي رواية لمسلم: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ الْخَمْرَ. فَجَلَدَهُ بِجَرِيدَتَيْنِ، نَحْوَ أَرْبَعِينَ.

**لە ڕیوایەتێکی موسلیمدا: پیاوێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) عارەقی خواردبووەوە بە دوو پەلکە دارخورما نزیك بە چل داری لێدا.**

- وفي رواية له: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم جَلَدَ فِي الْخَمْرِ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ. ثُمَّ جَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ. فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ، وَدَنَا النَّاسُ مِنَ الرِّيفِ وَالْقُرَى، قَالَ: مَا تَرَوْنَ فِي جَلْدِ الْخَمْرِ؟ فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا كَأَخَفِّ الْحُدُودِ. قَالَ: فَجَلَدَ عُمَرُ ثَمَانِينَ.

**لە ڕیوایەتێکی تری موسلیمدا: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر خواردنەوەی عارەق بە پەلکە دارخورما و نەعل جەلدی کرد، پاشان ئەبوبەکر بە چل جەلدی کرد، کاتی سەردەمی عومەر، و نزیکبوونەوەی خەڵك لە لادێ و گوندەکان، وتی: ئێوە جەلدی عارەق چۆن دەبینن؟ عبدالرحمانی کوڕی عەوف وتی: وای دەبینم بیکەی بە سووکترین حەدد، وتی: عومەر بە هەشتا جەلدی دەکرد[1].**

**٣٢٥٧-** (ق) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: مَا كُنْتُ لأُقِيمَ حَدّاً عَلَى أَحَدٍ فَيَمُوتَ، فَأَجِدَ فِي نَفْسِي، إِلاَّ صَاحِبَ الخَمْرِ، فَإِنَّهُ لَوْ مَاتَ وَدَيْتُهُ، وَذلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَمْ يَسُنَّهُ. [خ٦٧٧٨/ م١٧٠٧ (٣٩)]

---

[1] **واتە توندتر لەو حەددەی لەسەردەمی حەزرەتی ئەبوبەکر هەبوو، لەو سەردەمە بە چل دار جەلد دەکرا-و.**

(ق) لە عەلی کوڕی ئەبی تالبەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: حەددێکم بەسەر کەسێکدا جێبەجێ نەکردووە و بمرێت و لە نەفسی خۆدا هەست بە شتێك بکەم جگە لە هاوەڵی عارەق، گەر بمرێت دییەکەی دەدەم، ئەوەش چونکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ژمارەیە دیاریکراوی تێدا ڕەنگرێژ نەکردووە[1].

**٣٢٥٨**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِنْ سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِنْ سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ، فَإِنْ عَادَ الرَّابِعَةَ فَاقْتُلُوهُ**).

* حسن صحيح.		[د٤٤٨٤/ ن٥٦٧٨/ جه٢٥٧٢/ مي٢١٥١]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر سەرخۆش بوو جەلدی لێ بدەن، پاشان گەر سەرخۆش بوویەوە جەلدی لێ بدەن، پاشان گەر سەرخۆش بوویەوە جەلدی لێ بدەن، گەر بۆ جاری چوارەم گەڕایەوە سەری بیکوژن)**.

## ١٠- دەروازەی: کەراهەتی نەفرەت کردن لە عارەقخۆر

**٣٢٥٩**– (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قال: أُتِيَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ، قَالَ: (**اضْرِبُوهُ**). قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَمِنَّا الضَّارِبُ بِيَدِهِ، وَالضَّارِبُ بِنَعْلِهِ، وَالضَّارِبُ بِثَوْبِهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: أَخْزَاكَ اللهُ، قَالَ: (**لاَ تَقُولُوا هكَذَا، لاَ تُعِينُوا عَلَيْهِ الشَّيْطَانَ**).	[خ٦٧٧٧]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پیاوێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) عارەقی خواردبوو، فەرمووی: **(لێیبدەن)**، ئەبو هورەیرە دەڵێت: هەمان بوو بە دەست لێی دەدا، هەمان بوو بە نەعل، یان بە جلەکانی لێیدەدا، کاتێ ڕۆیشت، یەکێك لە خەڵکەکە وتی: خودا ڕسوا و شەرمەزاری بکات، پێغەمبەر فەرمووی: **(بەو جۆرە مەڵێن، یارمەتی شەیتان مەدەن بۆ سەری)**.

---

[1] واتە: ژمارەیە داری دیاریکراوی تێدا نەهاتووە، حەزرەتی ئەبوبەکر بە چل دار دیاری کرد، حەزرەتی عومەر بۆ هەشتا دار زیادی کرد–و.

**٣٢٦٠**– (خ) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ: أَنَّ رَجُلاً عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ اسْمُهُ عَبْدَ اللهِ، وَكَانَ يُلَقَّبُ حِمَاراً، وَكَانَ يُضْحِكُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَكَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم قَدْ جَلَدَهُ فِي الشَّرَابِ، فَأُتِيَ بِهِ يَوْماً فَأَمَرَ بِهِ فَجُلِدَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: اللَّهُمَّ الْعَنْهُ، مَا أَكْثَرَ مَا يُؤْتَى بِهِ؟! فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَلْعَنُوهُ، فَوَاللهِ مَا عَلِمْتُ إِلاَّ أَنَّهُ يُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ)**. [خ٦٧٨٠]

**(خ) لە عومەری کوڕی خەتابەوە: پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی عەبدولاّ بوو، نازاناوی "حمار" بوو، ئەو پێغەمبەری خودای(ﷺ) دەهێنایە پێکەنین، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر خواردنەوەی عارەق جەلدی کرد بوو، ڕۆژێك هێنرا بۆ لای و جەلد کرا، پیاوێك لە خەڵکەکە وتی: خودایە نەفرەتی لێ بکە، چەند زۆر دەهێنرێ[1]؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نەفرەتی لێ مەکەن، سوێند بە خودا ئەوەی من زانیومە ئەو خودا و پێغەمبەرەکەی خۆشدەوێت).**

## ١١- دەروازەی: حەددی دزی و بڕ و ئەندازەکەی

**٣٢٦١**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَعَنَ اللهُ السَّارِقَ، يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ، وَيَسْرِقُ الحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ)**. [خ٦٧٨٣/ م١٦٨٧]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (خودا نەفرەتی لە دز کردووە، هێلکەیەك دەدزێت و دەستی دەبڕێت، پەتێك دەدزێت و دەستی دەبڕێت).**

**٣٢٦٢**– (ق) عَنْ عائِشَةَ: قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(تُقْطَعُ الْيَدُ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً)**. [خ٦٧٨٩/ م١٦٨٤]

**(ق) لە عائیشەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لە چارەکە دینارێك و بۆ سەرەوە دەست دەبڕێت).**

---

[1] واتە: چەند زوو زوو دەهێنرێ بۆ ئەوەی حەددی بەسەردا ڕاست بکرێتەوە؟! –و.

## ١٢- دەروازەی: وەرگرتنی شت بە برِ و ئەندازەی خۆی

**٣٢٦٣-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ ماشِيَةَ امْرِئٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِ، أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تُؤْتَى مَشْرُبَتُهُ، فَتُكْسَرَ خِزَانَتُهُ، فَيُنْتَقَلَ طَعَامُهُ؟ فَإِنَّمَا تَخْزُنُ لَهُمْ ضُرُوعُ مَوَاشِيهِمْ أَطْعِمَاتِهِمْ، فَلاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ ماشِيَةَ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِهِ).
[خ٢٤٣٥/ م١٧٢٦]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هیچ کەس ئاژەڵانی هیچ کەسی تر بەبێ مۆڵەتی ئەو نادۆشێت، ئایا یەکێك لە ئێوە پێیخۆشە بێنە سەر خواردنەوەکەی، دەفرەکەی بشکێنن و خواردنەکەی بگوێزرێتەوە؟ گوانی ئاژەڵەکانیان خواردن بۆ ئەوان هەڵدەگرن، بۆیە هیچ کەس ئاژەڵانی هیچ کەسی تر بەبێ مۆڵەتی ئەو نەدۆشێت).**

## ١٣- دەروازەی: سزای کەسی پاشگەزبوو لە ئیسلام

**٣٢٦٤-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسى: أَنَّ رَجُلاً أَسْلَمَ ثُمَّ تَهَوَّدَ، فَأَتَى مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ وَهُوَ عِنْدَ أَبِي مُوسى، فَقَالَ: ما لِهذَا؟ قالَ: أَسْلَمَ ثُمَّ تَهَوَّدَ، قَالَ: لاَ أَجْلِسُ حَتَّى أَقْتُلَهُ، قَضَاءُ اللهِ تَعَالى وَرَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٧١٥٧ (٢٢٦١)/ م: الإمارة ١٧٣٣ (١٥)]

**(ق) لە ئەبی موساوە: پیاوێك موسڵمان بوو و پاشان بوو بە یەهوودی، مەعازی کوڕی جەبەل هات و ئەو پیاوە لای ئەبو موسا بوو، مەعاز وتی: ئەمە چی هەیە؟ وتی: موسڵمان بووە و پاشان بووە بە یەهوودی، مەعاز وتی: دانانیشم تا دەیکوژم، ئەوە قەزاوەتی خودا(تعالى) و پێغەمبەرەکەیەتی(ﷺ).**

## ١٤- دەروازەی: حەددی تۆمەت

**٣٢٦٥-** عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَ عُذْرِي، قَامَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى الْمِنْبَرِ فَذَكَرَ ذَاكَ، وَتَلاَ ـ تَعْنِي: الْقُرْآنَ ـ فَلَمَّا نَزَلَ مِنَ الْمِنْبَرِ أَمَرَ بِالرَّجُلَيْنِ وَالْمَرْأَةِ، فَضُرِبُوا حَدَّهُمْ.
* حسن. [د٤٤٧٤/ ت٣١٨١/ جه٢٥٦٧]

لــە عائیشــەوە(خوا لێــی رازی بێــت)، وتــی: کــاتێ عوزرەکــەم[1] دابــەزی، پێغەمبــەر(ﷺ) لەســەر مینبــەر راوەســتا و ئــەوەی بــاس کــرد و خوێندییــەوە—واتــە: قورئــان— کــاتێ لــە مینبەرەکــە دابــەزی فــەرمانی کــرد دوو پیــاو و ژنێــك حــەددیان لێدرا[2].

**٣٢٦٦**– عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَنَّ رَجُلَيْنِ اسْتَبَّا فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِلآخَرِ: وَاللهِ! مَا أَبِي بِزَانٍ، وَلاَ أُمِّي بِزَانِيَةٍ، فَاسْتَشَارَ فِي ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، فَقَالَ قَائِلٌ: مَدَحَ أَبَاهُ وَأُمَّهُ، وَقَالَ آخَرُونَ: قَدْ كَانَ لِأَبِيهِ وَأُمِّهِ مَدْحٌ غَيْرُ هَذَا، نَرَى أَنْ تَجْلِدَهُ الْحَدَّ، فَجَلَدَهُ عُمَرُ الْحَدَّ ثَمَانِينَ. [ط١٥٦٩م]

* إسناده صحيح.

لە عەمرەی کچی عبدالرحمانەوە: لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب دوو پیاو کرا جنێویان بە یەکتر دا، یەکێکیان بەویتریانی وت: سوێند بە خودا، باوکی من زیناکەر نەبووە و دایکی من زیناکەر نەبووە[3]، لەوەدا عومەری کوڕی خەتاب راوێژی کرد، یەکێك وتی: مەدحی باوك و دایکی خۆی کردووە، ئەوانی تر وتیان: باوك و دایکی مەدحی تریان هەبوو جیا لەوەی دەیڵێ[4]، وا دەبینین بە حەد جەلدی بکەی، عومەر حەددی هەشتا جەلدی لێدا.

---

[1] واتە: بەرائەتەکەم—و.

[2] چونکە ئەو دوو پیاو و ژنە بەشدار بوون لە تۆمەتەکە بۆ حەزرەتی عائیشە—و.

[3] دەیویست بە شاراوەیی تانە و جنێو بە کەسی بەرانبەر بدات، واتە باوك و دایکی تۆ زیناکەر بوون—و.

[4] واتە: دەیتوانی مەدحێکی تری دایك و باوکی خۆی بکات نەك ئەو مەدحە کە دەبێتە تانەدان لە کەسی بەرانبەر—و.

## ١٥- دەروازەی: تەمبێ کردن

**٣٢٦٧-** (ق) عَنْ أَبِي بُرْدَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(لاَ يُجْلَدُ فَوْقَ عَشْرِ جَلَدَاتٍ؛ إِلاَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ).** [خ٦٨٤٨/ م١٧٠٨]

(ق) لە ئەبی بوردەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: **(لەسەرو دە جەلدەوە جەلد ناکرێت[1]، مەگەر لە حەددێك لە حەددەکانی خودادا).**

## ١٦- دەروازەی: فەزڵی جێبەجێ کردنی حەددەکان

**٣٢٦٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(حَدٌّ يُعْمَلُ بِهِ فِي الأَرْضِ، خَيْرٌ لِأَهْلِ الأَرْضِ مِنْ أَنْ يُمْطَرُوا أَرْبَعِينَ صَبَاحاً).** [ن٤٩١٩/ جه٢٥٣٨]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کارکردن بە حەددێك لە زەوی باشترە بۆ ئەهلی زەوی لەوەی چل بەیانی بارانیان بەسەردا ببارێت[2]).**

## ١٧- دەروازەی: لێبوردن لە حەددەکان گەر نەگەیشتبێتە لای دەسەڵاتدار

**٣٢٦٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(تَعَافُوا الْحُدُودَ فِيمَا بَيْنَكُمْ، فَمَا بَلَغَنِي مِنْ حَدٍّ فَقَدْ وَجَبَ).** [د٤٣٧٦/ ن٤٩٠٠]

* صحيح.

---

[1] واتە: بۆ تەمبێ کردنی منداڵ یان کەسێکی تر نابێ لەسەرو دە قەمچییەوە لێی بدرێت، مەگەر سنووری خودای بەزاند بێت و داری حەددی هاتبێتە سەر، وەك زینا و تۆمەت و خواردنەوەی عارەق-و.

[2] واتە: ئەوە نەرمە بارانێکی بەیانیانە زەوی بە پیت دەکات و دار و درەخت و ئاژەڵان سوودی لێ دەبینن و ژینگەی دەوروبەر خاوێن دەکاتەوە و سەوز دەبێت-و.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە نێوان خۆتان لە حەددەکان ببوورن، ئەوەی لە حەد دەگاتە لای من واجب بووە).**

**٣٢٧٠**- عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: كُنْتُ نَائِماً فِي الْمَسْجِدِ عَلَيَّ خَمِيصَةٌ لِي، ثَمَنُ ثَلاَثِينَ دِرْهَماً، فَجَاءَ رَجُلٌ فَاخْتَلَسَهَا مِنِّي، فَأُخِذَ الرَّجُلُ، فَأُتِيَ بِهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَمَرَ بِهِ لِيُقْطَعَ. قَالَ: فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: أَتَقْطَعُهُ مِنْ أَجْلِ ثَلاَثِينَ دِرْهَماً؟ أَنَا أَبِيعُهُ وَأُنْسِئُهُ ثَمَنَهَا، قَالَ: (فَهَلاَّ كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ)؟. [د٤٣٩٤/ ن٤٨٩٣/ جه٢٥٩٥/ مي٢٣٤٥]

* صحيح.

لە صەفوانی کوڕی ئومەییەوە، وتی: لە مزگەوت خەوتبووم قوماشێکی خۆمم بە خۆدا دابوو، نرخەکەی سی درهەم بوو، پیاوێك هات و لێی بردم، پیاوەکە گیرا، هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، فەرمانی پێکرد تا ببڕێت[1]، هاتم بۆ لای و وتم: ئایا لەپێناو سێ درهەم دەستی دەبڕی؟ من پێی دەفرۆشم و نرخەکەی دوادەخەم، فەرمووی: **(ئەی بۆچی ئەوەت نەکرد بەرلەوەی بیهێنی بۆ لام؟).**

## ١٨- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی پاڵنانی حەددەکان هاتووە

**٣٢٧١**- عن عائشة قالت: قال رسول الله صلّى الله عليه وسلّم: **(ادْرَؤوا الحدودَ عن المسلمِينَ ما استطعتُم، فإن كان له مَخرجٌ فخَلُّوا سبيلَه، فإنَّ الإمامَ أن يُخطِئَ في العَفْوِ، خيرٌ من أن يُخطِئَ في العُقوبةِ).** [ت١٤٢٤]

ضعيف.

لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەتا دەتوانن حەددەکان لە موسڵمانان پاڵبنێن، گەر دەروویەکی بۆ هەبوو دەستی لەسەر هەڵبگرن، چونکە گەر ئیمام لە لێبوردندا هەڵە بکات باشترە لەوەی لە سزادان هەڵە بکات).**

---

[1] واتە: دەستی ببڕن-و.

## ١٩- دەروازەی: حوکمی ئەو کەسەی جنێو بە پێغەمبەر دەدات

**٣٢٧٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ أَعْمَى كَانَتْ لَهُ أُمُّ وَلَدٍ تَشْتُمُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَتَقَعُ فِيهِ، فَيَنْهَاهَا فَلاَ تَنْتَهِي، وَيَزْجُرُهَا فَلاَ تَنْزَجِرُ، قَالَ: فَلَمَّا كَانَتْ ذَاتَ لَيْلَةٍ، جَعَلَتْ تَقَعُ فِي النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَتَشْتُمُهُ، فَأَخَذَ الْمِغْوَلَ فَوَضَعَهُ فِي بَطْنِهَا، وَاتَّكَأَ عَلَيْهَا فَقَتَلَهَا، فَوَقَعَ بَيْنَ رِجْلَيْهَا طِفْلٌ، فَلَطَّخَتْ مَا هُنَاكَ بِالدَّمِ.

فَلَمَّا أَصْبَحَ، ذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَجَمَعَ النَّاسَ، فَقَالَ: (**أَنْشُدُ اللهَ رَجُلاً فَعَلَ مَا فَعَلَ لِي عَلَيْهِ حَقٌّ؛ إِلاَّ قَامَ**).

فَقَامَ الْأَعْمَى يَتَخَطَّى النَّاسَ، وَهُوَ يَتَزَلْزَلُ حَتَّى قَعَدَ بَيْنَ يَدَيْ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَا صَاحِبُهَا، كَانَتْ تَشْتُمُكَ وَتَقَعُ فِيكَ، فَأَنْهَاهَا فَلاَ تَنْتَهِي، وَأَزْجُرُهَا فَلاَ تَنْزَجِرُ، وَلِي مِنْهَا ابْنَانِ مِثْلُ اللُّؤْلُؤَتَيْنِ، وَكَانَتْ بِي رَفِيقَةً. فَلَمَّا كَانَ الْبَارِحَةَ جَعَلَتْ تَشْتُمُكَ، وَتَقَعُ فِيك، فَأَخَذْتُ الْمِغْوَلَ، فَوَضَعْتُهُ فِي بَطْنِهَا، وَاتَّكَأْتُ عَلَيْهَا حَتَّى قَتَلْتُهَا. فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَلاَ اشْهَدُوا أَنَّ دَمَهَا هَدَرٌ**). [د٤٣٦١/ ن٤٠٨١]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە: نابینایەك دایكی منداڵێكی[1] قسەی بە پێغەمبەر(ﷺ) دەوت و زمانی تێدا بەكاردەهێنا، نابیناكە نەهی لێ دەكرد و ئەو كۆتایی پێ نەدەهێنا، هەڕەشەی لێ دەكرد و دەمكوت نەدەبوو، وتی: شەوێك زمانی پیسی لە پێغەمبەردا(ﷺ) بەكاردەهێنا و جنێوی پێ دەدا نابیناكە خەنجەرێكی هەڵگرت كردی بە ورگیدا و هەڵیكوتایە سەری و كوشتی، منداڵێك كەوتە نێوان دوو لاقی ژنەكە و ئەو ناوەی بە خوێن سوور كرد.**

**كاتێ ڕۆژی لێبوویەوە ئەوەی بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باس كرد، خەڵكی كۆكردەوە و فەرمووی: (بە خودا داوا لە پیاوێك دەكەم ئەو حەقەی هەمە لەسەری و ئەنجامیداوە هەستێتە سەر پێ)، نابیناكە هەستایە سەر پێ و بە ناو خەڵكەكەدا**

[1] واتە: ژنەكەی—و.

هەنگاوی هەڵدەگرت و ئەو هاتبووە لەرزە تا لەبەردەم پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من هاوسەری ئەو ئافرەتەم، جنێوی بە تۆ دەدا و زمانی تێدا بەکاردەهێنای، نەهیم لێدەکرد و کۆتایی پێ نەدەهێنا، هەڕەشەم لێ دەکرد و دەمکوت نەدەبوو، دوو کوڕم لێی هەیە وەك مرواری وان ئەو لەگەڵ من نەرمونیان بوو، دوێنێ دەستی کرد بە جنێو پێدانت و زمانی پیسی تێدا بەکاردەهێنای، منیش خەنجەرەکەم هەڵگرت و کردم بە سکیدا و هەڵمکوتایە سەری و کوشتم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئاگادار بن و بەشایەت بن خوێنی ئەو ئافرەتە بەهەدەر ڕۆیشتووە).

## ٢٠- دەروازەی: حەددەکان لە مزگەوت جێبەجێ ناکرێن

**٣٢٧٣**– عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يُسْتَقَادَ فِي الْمَسْجِدِ، وَأَنْ تُنْشَدَ فِيهِ الْأَشْعَارُ، وَأَنْ تُقَامَ فِيهِ الْحُدُودُ. [د٤٤٩٠]

* حسن.

لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە، ئەو وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد تۆڵەکردنەوە لە بکوژ لە مزگەوت ئەنجام بدرێت، هەروەها هۆنراوەی تێدا بخوێنرێتەوە و حەددەکانی تێدا جێبەجێ بکرێن.

## ٢١- دەروازەی: کەسێك داوای مۆڵەتی زینا بکات

**٣٢٧٤**– عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: إِنَّ فَتًى شَابّاً أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ ائْذَنْ لِي بِالزِّنَى، فَأَقْبَلَ الْقَوْمُ عَلَيْهِ فَزَجَرُوهُ، قَالُوا: مَهْ، مَهْ! فَقَالَ: (**ادْنُهْ**)، فَدَنَا مِنْهُ قَرِيباً، قَالَ: فَجَلَسَ قَالَ: (**أَتُحِبُّهُ لِأُمِّكَ**)؟ قَالَ: لاَ، وَاللهِ! جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ! قَالَ: (**وَلاَ النَّاسُ يُحِبُّونَهُ لِأُمَّهَاتِهِمْ**). قَالَ: (**أَفَتُحِبُّهُ لِابْنَتِكَ**)؟ قَالَ: لاَ، وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ! جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ! قَالَ: (**وَلاَ النَّاسُ يُحِبُّونَهُ لِبَنَاتِهِمْ**). قَالَ: (**أَفَتُحِبُّهُ لِأُخْتِكَ**)؟ قَالَ: لاَ، وَاللهِ! جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ! قَالَ: (**وَلاَ النَّاسُ يُحِبُّونَهُ لِأَخَوَاتِهِمْ**). قَالَ: (**أَفَتُحِبُّهُ لِعَمَّتِكَ**)؟ قَالَ: لاَ، وَاللهِ! جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ! قَالَ: (**وَلاَ النَّاسُ يُحِبُّونَهُ لِعَمَّاتِهِمْ**). قَالَ: (**أَفَتُحِبُّهُ لِخَالَتِكَ**)؟ قَالَ: لاَ، وَاللهِ! جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ! قَالَ: (**وَلاَ**

النَّاسُ يُحِبُّونَهُ لِخَالاَتِهِمْ). قَالَ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهِ، وَقَالَ: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ ذَنْبَهُ، وَطَهِّرْ قَلْبَهُ، وَحَصِّنْ فَرْجَهُ)، فَلَمْ يَكُنْ بَعْدُ ذَلِكَ الْفَتَى يَلْتَفِتُ إِلَى شَيْءٍ. [حم٢٢٢١١ و٢٢٢١٢]

* إسناده صحيح، رجاله رجال الصحيح.

له ئەبی ئومامەوە، وتی: گەنجێکی لاو هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، مۆڵەتم بدە بە زینا کردن، خەڵکەکە روویان لێکردن و هەڕەشەیان لێکرد، وتیان: بێدەنگ، بێدەنگ، پێغەمبەر فەرمووی: **(نزیکی بکەنەوە)**، هەندێ لێی نزیك بوویەوە، وتی: دانیشت، پێغەمبەر فەرمووی: **(ئایا ئەوەت پێ خۆشە لە دایکت[1] ؟)**، وتی: نەخێر، خودا بمکات بە قوربانت، فەرمووی: **(خەڵکیش بۆ دایکانی خۆیان پێیانخۆش نییە)**، فەرمووی: **(ئایا ئەوەت پێخۆشە لە کچەکەت؟)**، وتی: نەخێر، سوێند بە خودا، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(خەڵکیش بۆ کچانی خۆیان پێیانخۆش نییە)**، فەرمووی: **(ئایا ئەوەت پێ خۆشە لە خوشکت؟)**، وتی: نەخێر، خودا بمکات بە قوربانت، فەرمووی: **(خەڵکیش بۆ خوشکانی خۆیان پێیانخۆش نییە)**، فەرمووی: **(ئایا ئەوەت پێ خۆشە لە خوشکی باوکت؟)**، وتی: نەخێر، سوێند بە خودا، خودا بمکات بە قوربانت، فەرمووی: **(خەڵکیش بۆ پووری خۆیان پێیانخۆش نییە)**، فەرمووی: **(ئایا ئەوەت پێ خۆشە لە خوشکی دایکت؟)**، وتی: نەخێر، سوێند بە خودا، خودا بمکات بە قوربانت، فەرمووی: **(خەڵکیش بۆ پووری خۆیان پێیانخۆش نییە)**، وتی: دەستی خستە سەری و فەرمووی: **(خودایە لە گوناهی خۆشببە و دڵی پاك بکەرەوە و داوێنی بپارێزە)**، لەدوای ئەوە ئەو گەنجە لای نەدەکردەوە بە لای شتێکدا[2] .

---

[1] واتە: ئایا پێت خۆشە دایکت زینا بکات؟-و.

[2] واتە: بوو بە کەسێکی عەفیف و پاکداوێن و چاوپارێز-و.

# پێرست

## مەبەستی چوارەم: حوکمەکانی خێزان ٥

## بەشی دووەم: هاوسەری و تێکەڵاوی نێوان دوو هاوسەرەکە ........................ ٣٥

## مەبەستی پێنجەم: پێویستییە زەرووریەکان ١٦٧

## مەبەستی شەشەم : مامەڵەکان ٣٣٧

## پەرتووکی سێیەم: کشتوکاڵ و ئیجارە ........................................................ ٣٩٧



## پەرتووکی چوارەم: پێدان و دۆزراوە ........................................................ ٤١١

## مەبەستی حەوتەم: ئیمامەت و كاروباری حوكم ٤٣٩